# تاك و بنەڕەتە کۆمەڵایەتیەکانی عوساب

ئەریك فرۆم

لە ئینگلیزییەوە: عبدالله سیوەیلی

مێژووی زانست بریتییە لە مێژووی دەستەواژە و ڕاگەیاندنە هەڵەکان. بەڵام ئەم دەستەواژە و ڕاگەیاندنە هەڵانە کە گەشەکردنی فیکر دەستنیشان دەکەن خاوەنی چۆنیەتیەکی تایبەتن: ئەوان بەرهەمهێنن. ئەو دەستەواژانە نەك تەنها هەر هەڵەن بەڵکو ڕاستییەکانی ناویان بە بیروڕای خراپ داپۆشراون و بەرگی چەمکی ناتەواو و چەوتیان لەبەرکراوە. ئەو دەستەواژانە وێنەی عەقڵانین کە هەڵگری تۆوی ڕاستین و لە هەوڵ و کۆششی بەردەوامی مرۆڤایەتیەوە بۆ گەیشتن بە مەعریفەی شیاو و ڕەوا دەربارەی مرۆڤ و سروشت پێدەگەن و شکۆفە دەکەن. زۆرێك لە تێڕوانینە قووڵەکان دەربارەی مرۆڤ و کۆمەڵگا یەکەم جار دەربڕینی خۆیان لە ئەفسانەو چیرۆکە خەیاڵییەکاندا دۆزییەوە، هەندێکی تریش لە گریمانە زانستییەکان و خەملاندنە میتافیزیکیەکاندا دەربڕینی خۆیان دۆزییەوە کە دوای یەك یان دوو نەوە سەلمێنرا کە ڕاستن.

تێگەیشتن لەوەی کە بۆچی پەرەسەندنی فیکری مرۆڤ بەم جۆرە دەست پێدەکات کارێکی گران نییە. ئامانجی هەر بیرکردنەوەیەکی مرۆڤ بریتییە لە گەیشتن بە (هەموو ڕاستی)، بریتییە لە تێگەیشتن لە تێکڕاییەتی دیاردەکان — کە مایەی سەرسوڕمانی مرۆڤن. مرۆڤ تەنها ژیانێکی کورتی هەیە و دەبێت خوازیاری ئەوە بێت وێنەیەکی دەربارەی ڕاستێتی ئەو جیهانەی کە لەو ماوە کورتەدا تیای دەژی، هەبێت. بەڵام مرۆڤ تەنها کاتێك دەتوانێت لەم تێکڕاییەتە تێبگات ئەگەر بێتو ئەو ماوەیەی ژیانی هاوشێوە بێت لەگەڵ ڕەگەزی بەشەریدا. ئەوە تەنها لە پرۆسەی پەرەسەندنی مێژووییدایە کە مرۆڤ هەڵدەستێت بە گەشەپێدانی تەکنیکەکانی سەرنجدان و وەك سەرنجدەرێکیش بابەتگەراییەکی گەورەتر بەدەست دەهێنێت و داتایەکی نوێش کۆدەکاتەوە کە پێویستن بۆ تێگەیشتن لە گشت. لێرەوە کەلێنێك هەیە لە نێوان ئەوەی تەنانەت بلیمەتە هەرە گەورەکان وەك ڕاستی

دەیبینن و ئەو سنورانەی مەعریفە کە پشت بە ڕێکەوتی ئەو قۆناغە مێژووییە دەبەستێت کە تیایدا دەژی. لەبەرئەوەی کە ئێمە ناتوانین لە حاڵەتێکی هەڵواسراویدا بمێنینەوە، ئەوا هەوڵ دەدەین کە ئەم کەلێنە بە ماددەی مەعریفەی بەردەست پڕ بکەینەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو ماددەیە لە ڕووی مەشروعیەتەوە کە ناوەڕۆکی وێنەکە دەبێت هەیبێت، ناتەواو بێت.

هەر دۆزینەوەیەك کە ئەنجام دراوەو ئەنجام دەدرێت خاوەنی مێژوویەکی دوور و درێژە کە ڕاستییەکەی ناوی ڕێباز و دەربڕینی کەم و کەمتر داپۆشراو و شێوێندراوتر و فۆرمەلەی زۆر و زیاتری کامڵ بەدی دەکات. گەشەکردنی فیکری زانستی گەشەکردنێك نییە کە تیایدا دەستەواژە کۆنەکان وەك چەوت و ناراست تووڕ هەڵدەدرێت و لەلایەن دەستەواژەی ڕاست و نوێوە جێگەیان بگیرێتەوە، بەڵکو زیاتر پرۆسەیەکە بۆ دووبارە لێکدانەوەی بەردەوامی دەستەواژە کۆنەکان، کە بە هۆیەوە ناوەڕۆك لە ڕەگەزە شێوێنەرەکان ئازاد دەبێت. پێشەوا مەزنەکانی فیکر، یەکێك لەوانە فرۆید، کۆمەڵە ئایدیایەك دەردەبڕن کە پێشکەوتنی فیکری زانستی بۆ چەندین سەدە دەستەبەر دەکەن. زۆر جار ئەوانەی لە بوارەکەدا کاردەکەن خۆیان دەخەن بەلای یەکێك لەو دوو ڕێگایەی کە شکست دەهێنن لە جیاوازی کردن لە نێوان ئەوەی کە بنەڕەتیەو ئەوەی کە ڕێکەوتە، بە شێوەیەکی توندوتیژ پارێزگاری لە سەرتاپای سیستمی باڵادەست دەکەن، بەم جۆرەش هەڵدەستن بە بلۆك کردنی پرۆسەی دووبارە لێکدانەوەو ڕوونکردنەوە. یان دەکەونەوە هەمان هەڵەی شکستهێنان لە جیاوازی کردن لە نێوان ئەوەی بنەڕەتیەو ئەوەی ڕێکەوتە و بەشێوەیەکی (جامد) لە دژی تیۆرە کۆنەکان بجەنگێ و هەوڵ بدات تیۆری نوێی خۆی جێگەیان بگرێتەوە. لە هەردوو (جمود)ی ئۆرتۆدۆکسی و یاخیبوونیشیدا گەشەکردنی بوونیادنەرانەی دیدگای باڵادەست بلۆك دەکرێت. بەهەرحاڵ ئەرکە ڕاستەقینەکە بریتییە لە دووبارە لێکدانەوەو گۆڕین و ناسینەوەی ئەو تێڕوانینە دیاریکراوەی کە دەبوایە لە چەمکە هەڵەو چەوتەکاندا دیاری بکرایە و بگەیشتایە بە تێگەیشتن ئەمەش بەهۆی سنووردار کردنەکانی فیکرەوە کە نامۆیە بەو قۆناغە مێژووییەی کە تیایدا بۆ یەکەمجار فۆرمەلە کراون. دواتر ڕەنگە ئێمە هەست بکەین کە زۆر جار لە نووسەرەکە باشتر لە خودی ئەو تێدەگەین، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانین کە تەنها لەبەر ڕۆشنایی ڕێبەری کردنی تێڕوانینە ئەسڵییەکەی ئەودا دەتوانین ئەمە ئەنجام بدەین.

ئەم بنەما گشتییە، واتە شێوازی پەرەسەندنی زانستی بریتییە لە دووبارە لێکدانەوەیەکی بوونیادنەرانەی تێڕوانینە بنەڕەتیەکان نەك دووبارە کردنەوەیان، بە دڵنیاییەوە دەربارەی فۆرمەلەکردنە تیۆرییەکانی فرۆیدیش هەر ڕاستە. بە دەگمەن دۆزینەوە (ئیکتیشاف)ێکی فرۆید هەیە کە ڕاستییە بنەڕەتییەکانی لە خۆ نەگرتبێت و کە خۆی وابەستە نەکردبێت بە پەرەسەندنێکی ئۆرگانیەوە لەودیو ئەو چەمکانەوە کە پەردەپۆش کراون.

ئەوەی لێرەدا جێگەی بایەخپێدانی منە بریتییە لە تیۆرەکەی فرۆید دەربارەی بنەڕەتەکانی عوساب (*neurosis*). من لەو باوەڕەدام کە هێشتا ئێمە کەم لە بارەی ئەوەوە کە عوساب پێکدەهێنێت و لەویش کەمتر دەربارەی بنەڕەتەکانی دەزانین. دەبێت زۆر زانیاری فسیۆلۆژی، ئەنترۆپۆلۆژی، سۆسیۆلۆژی کۆبکرێتەوە بەرلەوەی هیواخوازی گەیشتن بین بە هەر وەڵامێکی ئاکام بەخش. ئەوەی کە من لێرە بە دواوە پێی هەڵدەستم بریتییە لە بەکارهێنانی تێڕوانینی فرۆید دەربارەی ئەسڵی عوساب وەك

وێنەیەكی (تەوضیحی) ئەو بنەما گشتییەی كە پێشتر باسم كرد: دووبارە لێكدانەوە بریتییە لە میتۆدی پێشكەوتنی زانستی.

فرۆید وا رادەگەیەنێت گرێی ئۆدیب ( *Oedipus complex*) بەشێوەیەكی حاشاهەڵگر بە كرۆكی عوساب دادەنێت. من لەو باوەڕەدام كە ئەم راگەیاندنە بناغەییترین راگەیاندنە كە دەتوانێت لە بارەی بنەڕەتی عوسابەوە بدرێت، بەڵام پێم وایە كە پێویستی بەوە هەیە كە دووبارە راڤە بكرێتەوە لە چوارچێوەی سەرچاوەیەكدا چێوەبەند بكرێت جیاواز لەو چوارچێوەیەی لە مێشكی فرۆیددا هەبووە. ئەوەی كە فرۆید مەبەستی بووە ئەوەیە كە لەبەرئەوەی كە ئەو ئارەزووە سێكسییەی كە كوڕی بچووك هەیەتی بەرامبەر بە دایكی، دەیخاتە كێبڕكێیەكەوە لەگەڵ باوكیدا، وە بێگومان كە منداڵ لەم كێبڕكێیەدا شكست دەخوات دەكەوێتە گێژاوی دڵەڕاوكێی ئەم شكستەوە و چیتر ناتوانێت زاڵ بێت بەسەر ئەم دڵە ڕاوكێیەشدا، ئیتر لێرەوە گەشەكردنێكی عوسابیانە لە منداڵدا سەرهەڵدەدات.

من لەو باوەڕەدام كە فرۆید لە سەرەتایترین ڕیشەكانی عوساب نزیكبووەتەوە كاتێك ئاماژە بە ململانێی نێوان منداڵ و دەسەڵاتی دایك و باوكانە و شكستی منداڵ بۆ چارەسەركردنی ململانێیەكە بەشێوەیەكی دڵخۆشكەر، دەكات. بەڵام لەو باوەڕەدا نیم كە ئەم ململانێیە بەشێوەیەكی بنەڕەتی هەر بە هۆی كێبڕكێی سێكسییەوە روودەدات، بەڵكو پێموایە لە پەرچەكرداری منداڵەكەوە بۆ فشاری دەسەڵاتی دایك و باوك و ترس و ملكەچكردنی منداڵەكە بۆی، دروست دەبێت. بەرلەوەی من بەردەوام بم لە زیاتر ڕوونكردنەوەی ئەم خاڵە، پێم باشە جیاوازی بكەم لە نێوان دوو جۆر دەسەڵاتدا. دەسەڵاتێك كە بابەتییەو لەسەر توانای كەسەكە وەستاوە لە دەسەڵات و باش كاركردن لە روانگەی ئەو ئەركی ڕێبەری كردنەی كە دەبێت ئەنجامی بدات. ئەم جۆرەی دەسەڵات دەتوانرێت بە دەسەڵاتی عەقڵانی ناوزەد بكرێت. پێچەوانەی ئەمەش ئەو دەسەڵاتەیە كە دەكرێ بە دەسەڵاتی ناعەقڵانی ناو ببرێت. ئەم دەسەڵاتە لەو هێزەوە سەرچاوەی گرتووە كە دەسەڵات هەیەتی بەسەر مەحكومەكانیدا و ئەو ترس و بیمەش كە مەحكومەكانی ئاڵوگۆڕی دەكەن.

زانراوە كە لە زۆربەی كلتوورەكاندا پەیوەندییە مرۆڤایەتییەكان بە زۆری لە لایەن دەسەڵاتی ناعەقڵانییەوە دیاری دەكرێن. خەڵكی لە كۆمەڵگای ئێمە وەك خەڵكانی ناو كۆمەڵگاكانی دی كاردەكەن (بە ئەركەكانیان هەڵدەستن) ئەویش بە خۆگونجاندنیان لەگەڵ ڕۆڵە كۆمەڵایەتییەكانیدا لەسەر حسابی وازهێنان لە ئیرادە، ڕەسەنایەتی، خۆوەكیەت (تلقائیە)ی خۆیان.

لە كاتێكدا هەر مرۆڤێك بە هەموو توانست و ئەگەرەكانیەوە سەرتاپای مرۆڤایەتی دەنوێنێت، ئەوا پێویستە هەر كۆمەڵگایەكی كاركردوو خۆشحاڵە و دەبێت خۆشحاڵ بێت بە خۆ–پارێزی *self - preservation*. ئەو شێوازە تایبەتانەی كە كۆمەڵگایەك كاری پێدەكات لە لایەن ژمارەیەك فاكتەری بابەتی ئابووری و سیاسییەوە دیاری دەكرێت، كە لە هەر خاڵێكی گەشەسەندنی مێژوویدا هەیە. پێویستە كۆمەڵگاكان لە ناو ئەگەر و سنووردارکردنەكانی بارودۆخە مێژووییە تایبەتیەكانی خۆیاندا كاربكەن. لە پێناوی ئەوەی كە هەر كۆمەڵگایەك بە باشی كار بكات، ئەوا دەبێت ئەندامەكانی ئەو كۆمەڵگایە ببنە ئەو جۆرە كاراكتەرەی كە كۆمەڵگاكە بە دڵیەتی و دەبێت بەو شێوەیە رەفتار بكەن كە پێویستە هەم وەك ئەندامانی كۆمەڵگا یان وەك چینێكی تایبەتی ناو

ئەو کۆمەڵگایە. پێویستە ئەوان ئەوە بخوازن کە لە ڕووی بابەتییەوە زەرورە ئەنجامی بدەن. دەبێت هێزی دەرەکی لە لایەن خواستی ناوەکی و ئەو وزە مرۆڤییە تایبەتەوە کە بەسەر خاسیەتەکانی کاراکتەردا دابەشبووە جێگەی بگیرێتەوە. هەتاوەکو مرۆڤایەتی حاڵەتێکی ڕێکخستن بەدەست نەهێنێت کە تیایدا ئارەزووی تاك و ئارەزووی کۆمەڵگا هاوشێوە دەبن، ئامانجەکانی کۆمەڵگا دەبێت لەسەر حسابی تێچوونێکی کەمتر یان زۆرتری سەربەستی و خۆوەکیەتی تاك بەدەست بهێنرێت. ئەم ئامانجە بە پرۆسەی داهێنانی منداڵ و پەروەردە ئەنجام دەدرێت. لە کاتێکدا ئامانجی پەروەردە بریتییە لە گەشەپێدانی توانستەکانی منداڵ، لە هەمان کات خاوەنی فەرمانی کورت کردنەوەی سەربەخۆیی و سەربەستی منداڵە بۆ ئەو ئاستەی کە بۆ وجودی ئەو کۆمەڵگا دیاریکراوە پێویستە. هەرچەندە کۆمەڵگاکان لە ڕووی ئەو ڕادەیەوە کە دەبێت منداڵ تیایدا لەلایەن دەسەڵاتێکی ناعەقڵانییەوە کاری لەسەر بکرێت جیاوازن، کەچی هەمیشە ئەمە بەشێکە لە فەرمانی ڕاهێنانی منداڵ.

منداڵ یەکەمجار بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ کۆمەڵگادا بەریەك ناکەون. منداڵ لە ڕێگەی دایك و باوکییەوە بەر کۆمەڵگا دەکەوێت کە لە پێکهاتەی کاراکتەر و میتۆدەکانی پەروەردەکردنی خۆیانە نوێنەرایەتی ستەرەکتوری کۆمەڵایەتی دەکەن. دایك و باوك ئاژانسی سایکۆلۆژی کۆمەڵگان. دواتر چی بەسەر منداڵدا دێت لە میانەی پەیوەندی بە باوك و دایکییەوە؟

منداڵ لە ڕێگەی باوك و دایکەوە لەگەڵ ئەو دەسەڵاتەدا بەر یەك دەکەون کە لەو کۆمەڵگا تایبەتەی تیایدا دەژی باوە، وە ئەم دەسەڵاتەش دەیەوێت ئیرادە، خۆوەکیەت و سەربەخۆیی ئەو تێکبشکێنێت. بەڵام مرۆڤ بۆ ئەوە دروست نەبووە کە تێکبشکێنرێت، لێرەوە منداڵ لە دژی ئەو دەسەڵاتە دەکەوێتە جەنگین و دەسەڵاتەکەشی لە دایك و باوکیدا خۆی دەنوێنێت. ئەو نەك تەنها بۆ سەربەست بوون لە فشار دەجەنگێت، بەڵکو بۆ ئەوەی کە خودی خۆی بێت، مرۆڤێکی پێگەیشتوو بێت نەك ئۆتۆماتیکی. هەندێ منداڵ لە ئەوانی دی سەرکەوتووترن. زۆرێك لە منداڵان تا ڕادەیەك شکست دەهێنن لە جەنگی بەدەستهێنانی سەربەستیاندا. ئەو شێوازانەی کە ئەم شکستەی لێدەکەوێتەوە زۆرن، بەڵام ئەو شێوازانە هەرچییەك بن، ئەوا ئەو کاریگەری و پاشماوانەی کە لە دوای ئەم شکستەوە بەجێ دەمێنن دەتوانرێت لە قووڵایی هەر عوسابێکدا بدۆزرێتەوە. ئەم کاریگەرییە لە نیشانەیەکدا خۆی دەنوێنێ کە گرنگترین خاسیەتی بریتییە لە لاواز بوون یان ئیفلیج بوونی ڕەسەنایەتی و خۆوەکیەتی ئەو کەسە کە دواتر لاوازبوونی خودی لێدەکەوێتەوە و خودێکی ساختە جێگەی دەگرێتەوە کە تیایدا هەستکردن بە "من خۆم" کاڵ دەبێتەوەو لە لایەن ئەزموونکردنی خود وەك بڕی تێکڕایی ئەو پێشنیارەوە جێگەی دەگرێتەوە کە خەڵك دەربارەی من هەیانە. پاشکۆیەتی جێگەی سەربەخۆبوون دەگرێتەوە، یان وەك ئەوەی دکتۆر سولیڤان بە زاراوەی چۆنێتی ئێردافی (*Parataxical*)ی هەموو ئەزموونە کەسییەکان ناوزەدی دەکات.

پێشنیاری من ئەوەیە کە گرێی ئۆدیب وەك ئاکامی یاخیبوونی سێکسی لە دایك یان باوك (بەپێی ڕەگەزەکە) لێك نەدرێتەوە، بەڵکو وەك جەنگینی منداڵ لەگەڵ دەسەڵاتی ناعەقڵانیدا کە دایك و باوك بەرجەستە بوونی ئەو دەسەڵاتەن. ئەمەش مانای ئەوە نیە کە فاکتەری سێکس ڕۆڵێکی گرنگ ناگێڕێت، بەڵکو جەخت کردنەوە لەسەر خۆزگە

ئینسێستییەکانی منداڵ (ئینسێست: واتە ئارەزووی ئەنجامدانی سێکس لەگەڵ ئەندامانی ناوخێزان وەك دایك، خوشك، برا، باوك – وەرگێڕ) و ئاکامە تراژیدییەکان و تاوانە بنەڕەتییەکەی نییە، بەڵکو جەختکردنەوەکە لەسەر کاریگەری ڕێگرانەی دایك و باوکە لەسەر چالاکی سێکسی ئاسایی منداڵ. فەرمانە فیزیکییەکانی منداڵ – یەکەمجار ئەوانەیان کە زۆر دیارن و ئنجا ئارەزوو و چالاکییە سێکسییەکان — بە لەبەرچاوگرتنە ئاکارییەکان قورستر کراون. وا لە منداڵەکە دەکرێت کە هەست بە تاوانباری بکات لە ڕووی ئەو فرمانانەوە و لەبەرئەوەش کە هاندەری سێکسی هەر لە منداڵییەوە لە هەموو مرۆڤێکدا ئامادەیی هەیە دەبێتە سەرچاوەیەکی بەردەوامی هەست کردن بە تاوان. ئایا فەرمانی ئەم هەست کردن بە تاوانبارییە چییە؟ ئەم هەستە خزمەت بە شکاندنی ئیرادەی منداڵ دەکات و بەرەو ملکەچ بوونی دەبات. دایك و باوك بێ مەبەستانە ئەم هەستە بەکاردەهێنن بۆ ملکەچ پێکردنی منداڵ. لە حاڵەتی شکاندنی کەسێکدا هیچ شتێك هێندەی ئەوە کاریگەر نییە کە بە تاوانبار لە قەڵەمی بدەیت. هەر چەندێك ئەو کەسە زیاتر هەست بە تاوانباری خۆی بکات، ئەوا زیاتر ملکەچ دەبێت چونکە دەسەڵات هێزی خۆی بەهۆی مافی تاوانبارکردنەوە چەسپاندووە. دواتر و لە ڕاستیدا ئەوەی کە وەك هەست کردن بە تاوانباری بەدەردەکەوێت بریتییە لە ترس لە دڵتەنگ کردن یان بێزارکردنی ئەوانەی کە ئەو کەسە لێیان دەترسێت. ئەم هەستکردنە بە تاوانباری بریتییە لەو تەنها هەستەی کە زۆربەی خەڵك وەك گرفتێکی ئاکاریی ئەزموونی دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا گرفتی بنەڕەتی ئاکاری، گرفتی بەدەستهێنانی توانستەکانی کەسێك، لەبەرچاو ون بووە. تاوانباری کورت کراوەتەوە بۆ ملکەچ نەبوون و وەك ئەوە هەستی پێناکرێت کە لە مانا ئاکارییە بنەڕەتیەکەی خۆیدا بێت کە مەبەست لێی خۆ داغانکردنە. بۆ خەست کردنەوەو ڕوونکردنەوەی ئەم خاڵە دەبێت ئەوە بڵێین کە شکست خواردن لە جەنگی دژی دەسەڵاتدا تۆوی سەرهەڵدانی عوساب دروست دەکات، وە نەك تەنها حەزی ئینستیستیانەی منداڵ بەڵکو ئەو هەستە باوەی کە پەیوەستە بە سێکسەوە یەکێکە لەو فاکتەرانەی کە ئیرادەی منداڵ دەکوژێت. فرۆید هەستاوە بە کێشانی وێنەی ئاکامە تراژیدییەکانی حەزە هەرە بنەڕەتییەکانی منداڵ. ئارەزووە ئینسێستییەکانی منداڵ بە شکست دەگەن و زۆر لە منداڵ دەکەن بەرەو جۆرێك لە ملکەچی. ئایا بیانوومان لەبەردەستدا نییە کە وا دابنێین ئەم گریمانەیە بەشێوەیەکی تەمومژاوی تەعبیر لەو ڕێگە تەمومژاوییە دەکات کە ڕەشبینی قووڵی فرۆید لە ڕوانگەی هەر باش بوونێکی سەرەکی لە قەدەری مرۆڤ و بڕوای مرۆڤدا لە سروشتی پڕ بایەخی دەسەڵاتی ناعەقڵانی لێوەی سەرچاوەی گرتووە؟ هێشتا ئەم ئاڕاستەیە تەنها یەك بەشە لە فرۆید. ئەو لە هەمان کاتدا ئەو پیاوەشە کە گوتویەتی "لە تەمەنی باڵغ بوون بە دواوە مرۆڤ دەبێت خۆی تەرخان بکات بۆ ئەرکی مەزنی خۆ ڕزگار کردن لە دایك و باوك". فرۆید ئەو پیاوەیە کە میتۆدێکی عیلاجی ئەفراند کە ئامانجەکەی بریتی بوو لە سەربەخۆیی و سەربەستی تاك.

بەهەرحاڵ، شکست هێنان لە جەنگی بەدەستهێنانی سەربەستیدا هەمیشە عوسابی لێناکەوێتەوە. لەڕاستیدا گەر ئەمە کێشەکە بووایە ئەوا دەبوو زۆرینەی زۆری خەڵکمان بە عوسابی دابنابایە. دواتر، ئایا ئەو بارودۆخە تایبەتانە چین کە ئاکامی عوسابی ئەم شکستە دەخەنەوە؟ هەندێ بارودۆخ هەیە کە من دەتوانم تەنها باس لە یەکێکیان

بکــەم وەك نموونەیــەك: ڕەنگــە منالّێــك زیــاتر بشــــکێنرێت لــــەوانی دی، ململانێــــی نێــــوان دڵەڕاوکێیەکەی و ئارەزووە مرۆڤییە سەرەکییەکانی ڕەنگــە تیــژتر و تەحــەمول نــەکراوبن. یــان ڕەنگــە منالّەکـە گەشـەی داوە بـە هەسـتێکی سەربەسـتی و ئەصالەت کە گەورەترە لە هەستی کەسێکی ئاسایی، بەم جۆرە شکستەکە ڕەنگە زیاتر قبووڵ نەکراو بێت. بەڵام لە جیاتی ڕیزبەندی کردنی بارودۆخی تر کە بۆ عوسـاب لـە بـارە، پـێم خۆشـە پرسـیارەکە ئـاوەژوو بکەمـەوەو بپرسم ئایا ئەو بارودۆخانـە کامانـەن کـە بەرپرسـن لـە ئـەو ڕاسـتییەی کـە زۆر خـەڵك نابنـە عوسـابی سـەرباری شکسـت هێنانیـان لـە جـەنگی بەدەست هێنانی سەربەستیدا؟

لــە ڕوونکردنــەوەی ئــەم خاڵــەدا کــارێکی سوودبەخشـە گـەر جیـاوازی بکـەین لـە نێـوان دوو چـەمکی خەلــەل لەگــەڵ عوســاب. ئەگــەر کەســێك شکســت بهێنێــت لــە بەدەســتهێنانی سەربەســتی، خۆوەکیەت و ئەزموونێکی ڕەسـەنی خود ئەو ڕەنگە بـەوە بناسـرێت کـە خەلــەلێکی قورسـی هەیـە، بـە مەرجێك کە ئێمە گریمانە ئەکەین کە سەربەستی و خۆوەکیـەت بریتین لـە ئامانجە بابەتییـەکانی هـەموو مرۆڤ کە دەبێت بەدەستیان بهێنێت. ئەگەر ئامانجی لەو جۆرە لە لایەن زۆرینەی ئەندامانی کۆمەڵگایـەکی دیـاریکراوەوە بـە دەست نـەهات ئـەوا مانـای ئەوەیـە دیـاردەی خەلـەلی کۆمەڵایـەتی بـاڵی کێشـاوە بەسـەر ئـەو کۆمەڵگایـەدا. تـاك لەمـەدا لەگـەڵ زۆرێـك لـە تاکەکانی تردا هاوبەشە، ئەو بە ئاگا نییە لەوە وەکو خەلــەلێك و ئاسایشــی ئــەو لــە لایــەن ئــەزموونی جیـاوازبوون یـان گۆشەگیربوونیشـەوە هەڕەشـەی لێناکرێـت. ئـەوەی کـە ڕەنگـە لـە دەسـتی بـدات لـە هەسـتێکی شـادمانی بـە بڕشـت و ڕەسـەن لـە لایـەن ئاسایشی گونجان لەگەڵ باقی مرۆڤایەتیدا قەرەبوو دەکرێتـەوە – چـونکە ئـەو دەیانزانێـت. لەڕاسـتیدا خەلەلەکـەی ئـەو ڕەنگـە پایـەدار کرابێـت و لـە پلـەی (چاك) دا دانرابێت لەلایەن کلتوورەکەیەوە و بەمـەش بووبێتـە خـاوەنی هەسـتێکی جـوانی (دەسـکەوت). نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم مەسەلەیە بریتییە لە هەست کردن بە تاوان و دوودڵی کە ڕێبازەکەی کالڤن لە مرۆڤدا وروژاندی. ڕەنگـە بووترێت کـە ئـەو کەســەی لــە لایــەن هەســتی بــێ دەرەتــانی و ناشایسـتەیی خـۆی، لـە لایـەن گومـانی نەوەسـتاوی ئــەوەی کــە ئایــا دووچــاری ســزای هەتاهــەتایی دەبێتەوە یان ئازاد دەبێت لەو سزایە، کەسێك کە بە زەحمـەت دەتوانێـت چێژێك یـان شـادییەکی ڕەسـەن بچــێژێت و خــۆی کــردووە بــە برغویــەك لــە ماکینەیەکداو دەبێت خزمەتیشی بکات، خەلـەلێکی تونــدی هەیــە. هێشــتا ئــەم خەلەلــە لــە ڕووی کلتوورییــەوە شــێوە بەنــدکراوە و وەك شــتێکی بەهاداری تایبەت تەماشا کراوە و بەم جۆرە تاك لـە عوسـاب پـارێزراوە کـە دەبـوو لـە کلتوورێکـدا کـە خەلەلەکـە هەسـتێکی قـووڵی ناتـەواوی و دابڕانـی پێدەبەخشێ، تووش ببوایە.

سـپینۆزا لـە کتێبـی (ئاکـار) دا بـە شـێوەیەکی ڕوون هەســتاوە بــە فۆرمەلــەکردنی گرفتــی خەلــەلی شـێوەبەندکراوی کۆمەڵایـەتی. سـپینۆزا ئەنووسـێت "زۆر خـەڵك لـە لایـەن یـەك وە هـەمان کاریگەرییـەوە داگیر دەکرێن بـەڵام بەشێوەیەکی لێکچوو و نـەگۆڕ. هــەموو هەســتەکانی بەشــێوەیەکی وا بــەهێز کـاری تێدەکرێت کە ئیتر دەکەوێتـە سـەر ئەو باوەڕەی کە ئـەم شـتە تەنانـەت کاتێـك کـە بوونیشـی نییـە هـەر ئامادەیـە. بـەڵام ئەگـەر ئەمـە کاتێـك ڕوویـدات کـە کەسەکە بە ئاگا بێت، ئەوا وێنا دەکرێت کە ئەو کەسە ناتەندروستە.. بەڵام ئەگەر کەسی چاوچنۆك بیری لای پارەو خاوەندارێتی بێت، وە کەسی تەموح

تەنها بیری لای ناوبانگ بێت، ئەوا وەك كەسی ناتەندروست لە قەڵەم نادرێن بەڵكو وەك بێزاركەر و بەگشتی بە چاوی كینەوە سەیر دەكرێن، بەڵام لەڕاستیدا چاوچنۆكی و تەموحی و شتی لەو بابەتە بریتین لە فۆرمی جیاوازی ناتەندروستی، ئەمە سەرباری ئەوەی كە هەمیشە وەك "نەخۆشی" بیریان لێناكرێتەوە." ئەم وشانە چەند سەدساڵێك بەر لە ئێستا نووسراون بەڵام هەتا هەنووكە راستی دەپێكن، ئەمە سەرباری ئەوەی خەلەلەكە وەها لە ڕووی كلتوورییەوە شێوەبەند كراوە تا گەیشتۆتە ئەو رادەیەی كە چیتر بە گشتی وەك بێزاركەر و قێزەوەند بیریان لێناكرێتەوە. ئەمڕۆ كە لە بارەی مرۆڤەوە دەدوێین بۆمان دەردەكەوێت كە مرۆڤ وەك رۆبۆتێك هەست دەكات و ڕەفتار دەكات. مرۆڤ هەرگیز ئەزموونی هیچ شتێك وەك هی خۆی ناكات. مرۆڤ بەتەواوەتی وەك ئەو كەسەی كە بیر دەكاتەوە لێی كە دەبێت وا بێت ئەزموونی خۆی دەكات. دەبینین زەردەخەنە جێگەی پێكەنینی گرتۆتەوە، چرپە چرپی بێ مانا جێگەی دایەلۆگ و گفتوگۆی گرتۆتەوە، بێ هیواییەكی قێزەوەند جێگەی ئازاری ئەسڵی گرتۆتەوە. دەتوانرێت دوو دەستەواژە دەربارەی ئەم كەسە رابگەیەندرێت. یەكەمیان ئەوەیە كە ئەو بەدەست خەلەلی خۆوەكیەت و تاكێتییەوە دەناڵێنێت كەوا دەردەكەوێت بێ چارەسەر بێت. لە هەمان كاتدا ئەكرێ بووترێت كە ئەو بەشێوەیەكی بنەڕەتی لە هەزاران كەسی تر جیا ناكرێتەوە كە لە هەمان پێگەدان. دەربارەی زۆر لەم كەسانە ئەو شێوە بەندییە كلتوورییە كە بۆ خەلەلەكە دابین كراوە لە سەرهەڵدانی عوساب رزگاریان دەكات. بۆ هەندێكیشیان شێوەبەندی كلتووری كارناكات و خەلەلەكە دەگۆڕێت بۆ عوسابێكی توندوتیژ. ئەو ڕاستییەی كە لەم حاڵەتانەدا شێوە بەندی كلتووری بەس نیە بۆ ڕێگەگرتن لە سەرهەڵدانی عوسابێكی دەركەوتە ئەوەیە كە لە زۆربەی حاڵەتەكاندا دەبێت لە لایەن توندوتیژی تایبەت و سترەكتوری ململانێكانی تاكەوە روون بكرێتەوە. من زیاتر لەسەر ئەمە ناڕۆم. ئەو خاڵەی كە دەمەوێت جەختی لەسەر بكەمەوە بریتییە لە پێویستی دەستپێكردن لە گرفتە بنەڕەتیەكانی عوسابەوە بۆ گرفتە بنەڕەتیەكانی خەلەلی شێوەبەندی كلتووری، بۆ گرفتی پاسۆلۆژی "ئاساییێتی".

ئەم ئامانجە مانای ئەوەیە كە شیكەرەوەی دەروونیی تەنها بایەخ بە دووبارە گونجاندنەوەی تاكی عوسابی نادات لەگەڵ كۆمەڵگاكەی خۆیدا. ئەركی ئەو دەبێت بریتیش بێت لە داننان بەوەدا كە ئایدیالی تاك دەربارەی ئاساییێتی دەبێت پێچەوانە بێت لەگەڵ ئامانجی (خۆ – تەحقیق كردن)ی راستەقینەی خۆیدا وەك مرۆڤێك. ئەوە باوەڕ بوونە بە هێزە پەرەسەندنخوازەكان لە كۆمەڵگادا كە تەحقیقی لەم جۆرە دەكاتە شتێكی شیاو، كە بەرژەوەندی كۆمەڵگا و بەرژەوەندی تاك پێویست ناكات بۆ هەتا هەتایە بەربەرەكانی كارانە بن. دەروونشیكاری، گەر دیدی گرفتی مرۆڤ لەدەست نەدات، بەشدارییەكی گرنگی دەبێت كە لەم ئاڕاستەیەدا پێی هەستێت. ئەم بەشداریكردنە كە بە هۆیەوە بواری تایبەتمەندی پزیشكی فرازمەند دەبێت، بەشێك بووە لەو دیدگایەی كە فرۆید هەیبووە.

**سەرچاوە**

*Dictionary*[*www.webster*](www.webster)

# هیومانیزم، پۆست هیومانیزم

## خوێندنەوەیەك لە میتافیزیکی مرۆناسی لە نێوان هایدیگەر و زلۆتەردایك

بەکر عەلی

### سەرەتا

گەر ئێمە لە ناو ئەم کێڵگە بەرفراوانەی مرۆناسیدا، کە گریکەکان پێیان دەگووت ئەنترۆپۆلۆگی و ڕۆمەکان ناویان لێنا بە هیومانیزم کاربکەین، ئەوا بەر لە هەر شت لێکۆڵەرەوە پێویستی بە خستنەڕووی توخمێکی گرنگ و جەوهەری ئەم کێڵگەیە هەیە، توخمێك کە دەشێت بڵێین بریتییە لە کانیاوی یەکەمین و هەمیشەیی ئەم کێڵگەیە، توخمێك کە بۆ خۆی بریتییە لە ئیلەمێنتی سەرەکی و گەوهەری ئەم کێڵگە گرنگەی کە ئێمە زانیاریمان لە بارەیەوە هێندە چڕ نییە. کێڵگەیەك ئێمە کەمجار بە دروستی گاسنی لێکۆڵینەوەی زانینمان لێ گیرکردووە. بەڵکو توخمێك کە بەتەنیا بریتی نییە لە کانیاو و سەرچاوە و منداڵدانی ئەم کێڵگەیە، بەڵکو بریتیشە لە مێژووی تەواوەتی ئەم کێڵگەیە، بریتیشە لە ئایندە و لە چارەنووسی هەتاهەتایی ئەم کێڵگەیە. ئەو توخمەش هەڵبەت جگە لە میتافیزیك شتێکی دی نییە.

میتافیزیك دەستپێکی ئەو بیرکردنەوەیەیە و هەر خۆشی چارەنووسەکەیەتی. کەواتە بۆ چوونە ناو ئەو کێلگەیەوە پێویستە ئێمە لە ڕێی میتافیزیکەوە شوێن پێهەڵگرین. وە بە دروستی لە دەستپێکی سەرهەڵدانی خودی میتافیزیك خۆیەوە ڕێ بکەین.

هەڵبەت لە مێژووی فەلسەفەدا وا دیاریکراوە ساتی پلاتۆن بریتییە لە دەستپێکی ساتەوەختی میتافیزیکی خۆرئاوا، ئەم دەستپێکەش هەر لەو ساتەوەختە درێژ دەبێتەوە تا لەحزەی نیچە، کە ئەم دێت و بەشێوەیەکی ڕادیکالانە کۆتایی بەو کاروانە درێژەی میتافیزیکی پلاتۆنی دەهێنێت. کەواتە ئەمە دەستنیشانکردنێکی گەلێك گرنگە، کاتێك پلاتۆن بە

دامەزرێنەری میتافیزیك دادەنرێت، چونكە هەر لێرەوەیە كە تەواوی بیر و كولتور و عەقلی خۆرئاوا دەبێتە كولتورێكی میتافیزك.

پلاتۆنە دێت و هەقیقەتی "بوون" دەخاتە ئەودیوو دەرەوەی "بوونەوە"، ئەو دێت و (هەقیقەت) لە ناو (ئیدێ)دا بەرجەستە دەكات.

ئیدی لەو ساتەوە مرۆ دەكەوێتە نێوان دوودیو بەندەوە، نێوان دوو وێناوە، نێوان دوو چەمك و دوو پێوانەوە، نێوان زەوی/ ئاسمان، مرۆڤ/ یەزدان، زوبیەكت/ ئۆبیەكت، ڕاستی/ ئیدێ. لێرەوە دیواربەندەكان لە ناوەوەو لە دەرەوەی هەبوونی مرۆییدا هەڵدەچنرێن، مرۆ لە خۆی جودا دەبێتەوە، لە جیهان دادەبڕرێت و ئیدی مرۆڤ دەكەوێتە گەمە ناكۆتاكەی دوالیزمەكانی زوبیەكت/ ئۆبیەكت، ژیان/ مەرگ، بوون/ نەبوون وەكۆتا/ ناكۆتاوە. لە پلاتۆنەوە مرۆ لەسەر ئەو تەوەرە چارەنووسییە یاری دەكات كە جەمسەرێكی لەسەر زەوییەو چ مانایەكی نییە گەر جەمسەرەكەی تری لە ئاسماندا نەبێت. سەبارەت ئەم دەستپێكە میتافیزیكیەش هایدیگەر لە كارێكی گرنگیدا لەژێر ناونیشانی "تێگەی پلاتۆن سەبارەت هەقیقەت" لێكدانەوەیەكی چڕو پڕی ئەم مەسەلەیە دەكات، تا لە دێڕێكی گرنگیدا كۆی تەواوی میتافیزیكی خۆرئاوا بە دەستپێكی پلاتۆنی پێناس دەكات: "دەستپێكی میتافیزیك لە بیركردنەوەی پلاتۆندا لە هەمانكاتدا بریتییە لە دەستپێكی هیومانیزم". (*PLW.49*) هەر بەم كلیلەش ئێمە دەرگای تێزەكەمان دەكەینەوە.

## سەرەتایەك لەمەڕ میتافیزیك و میتافیزیك بەزاندن..

میتافیزیك، ئەم وشە گریكییە لە ڕووی مانداری وشەییەوە مانای "ئەودیو – سروشت" دەگەیەنێت، هەردوو ئەم وشە لێكدراوەش "ئەودیو" وە"سروشت" دەبێت هەریەكەیان بە سەربەخۆ و دواتر پابەند بەیەكتر تێبگەیەنرێت. سەرەتا مرۆڤ بەرلەوەی چ هزرێكی بۆ "ئەودیو" هەبووبێت تەنیا "سروشت" سەرسامی كردووە. سروشتیش دیاردەیەكە، فینۆمێنێكە كۆی فینۆمینەكانی تری لە ئامێز گرتووە. سروشت كۆی مرۆگەل و ئاژەڵگەل و زەوی و ئاسمان و دەریا و دارستانەكان دەگرێتەوە و تێكڕا پێی دەگوترێت سروشت *Natur* واتە سروشت یەكەیەكی ڕەهایە كە هەموو دیاردەكانی تری تێخزاوە. ئێمە و شتەكانی دەوروبەرمان تێكڕاو پێكڕا لەناو سروشتدا ئینتیگراسیۆنمان كردووە. سروشت فینۆمینێكە بە جەوهەر هەڵگری دوو هێزی لێكجوودایە، سروشت هەڵگری ناكۆكییە، هێزێكی دروستكەر و هێزێكی وێرانكەر، هێزی تاریكی و ڕووناكی.. هێزێكی دیار و هێزێكی نادیار و گەلێك دووانەی لێكدژی تریش لەخۆ دەگرێت[1].

لەو ساتەوەش كە مرۆڤ زانستی سروشتی "*Natur Wissenschaft*"ی داهێناوە، ئیدی لەوە گەیشتووە كە وا سروشت پێكهاتێكی ماتریالی دینامیكییەو پرۆسەكانی سروشتیش وەك "باو باران و زەمین لەرزە و شەو و ڕۆژ و وەرزەكانی ساڵ و ...تاد" لەو كردە میكانیكیە دەچن كە لە ناویدا هێزێكی نادیاری دینامیكی هەیە، هێزێك لە ئەودیوی سروشتەوەیەو ئەم پرۆسانە دەبزوێنێت. دروستتر بڵێین سروشت دیاردەیەكی ماتریالی ڕووتی مردووی نەبزوێو نییە بەڵكو دیاردەیەكی زیندووی بزێویشە، سروشت بریتییە لە تەنێكی ڕەق (*Hardware*) كە لە هەناویدا تەنی نەرم (*soft ware*) هەیە ئەم گوزارە كۆمپیوتەریە گونجاوترینە – لەناو سروشت تەنیا مەرگ نییە وەك دۆخی وەستان بەڵكو

ژیانیش هەیە وەك دۆخی جووڵە. سروشت کتومت بریتییە لە ئەودیو سروشت.

واتە سروشت هەڵگری سەرجەم ئەو دووانە لێکدژانەیە کە بەبێ دیدێکی میتافیزیکی ناکرێت لە خودی فیزیك بگەین. لێرەوە مانا و ئەرکی پێشگری "ئەودیو – میتا" بەرجەستە دەبێت. (میتا) بەتەنیا لێکدانەوەی ئاستی سروشت ناکات بەڵکو ڕۆدەچێتە سروشتی سروشتەوە. ئەم دەچێتە ئەودیو سروشتەوەو لەوێدا نیشتەجێ دەبێت و بیرکردنەوەی ئێمەش لەگەڵ خۆیدا نیشتەجێ دەکات. ئێمە لە هایدیگەریشەوە ئەوەمان زانیوە کە ناکرێت لە میتافیزیکێك بگەین گەر بە دیدی میتافیزیك ئەو میتافیزیکە نەخوێنینەوە، لەبەرئەوەی بناغە و چیەتی میتافیزیك هەمیشە دەکەوێتە ئەودیوی خودی میتافیزیکیشەوە. پەی بردن بە میتافیزیك پەی بردنە بەو شتەی لە ئەودیو سروشتەوەیە، پەی بردنە بە چیەتی "ئەودیو". ئەمە ئەرکی تەواوی میتافیزیك بووە، لێکۆڵینەوە لە بوونی هەبوون و لە هەبوونی بوونەوەرەکان. بەڵام لە ساتی پلاتۆنەوە ئەوەی میتافیزیك کاری لەسەر کردووە بریتی بووە لە پێچەوانەی ئەمە. لەبری چەقبەستنە سەر ئارایی "بوون" و بیرکردنەوە لە "بوون" وەك "بوون خۆی کە هەیە"، ئەو بوونی وەك بوونەوەر بینیوە، بەمەش بوونی لەیاد کردووە چەقی بەستووەتە سەر "بوونەوەرەکان و شتەکان". بە دیدی هایدیگەر مێژووی میتافیزیکی خۆرئاوا بریتی بووە لە فڕێدانی "بوون" بۆ ناو خانەی "فەرامۆشکردن و لەیادکردن". ئەوەشی ئامادەبووە بریتی بووە لە ئارایی بوونەوەرەکان، لەو شتانەی کە گەوهەری میتافیزیکیان چەواشە کردووە.

لێرەوە "بوون" دەکەوێتە ژێر تارمایی دێوەزمەی "لەیادکردن"ەوە، ئەوەشی لە سەردەمی پۆستمۆدێرنەدا بەرئەنجامی دەکەین بریتییە لە هەنگاوێکی گەلێك سامناکتری میتافیزیك کە بە لەیادکردنی "لەیادکردنی بوون" کۆتایی هاتووە.

هەر کاتێکیش بیرکردنەوە پەی بەم خەسڵەتە میتافیزیکیە برد ئەوسا توانستی ئەوەی دەبێت میتافیزیك ببەزێنێت. ئیدی لێرەوە ئەو تەمومژە تەڵخەی دەوری بوونی تەنیوە دەڕەوێتەوەو "بوون دەکەوێتە بەر ڕووناکی" ئەمەش کە گوزارەیەکی هایدیگەرییە بەو مانایە دێت کەوا "بوون" وەك "بوون" خۆی بە کراوەیی لە ئارادا دەبێت. ئەمە دەستپێکی ئارایی بوونە، لەگەڵ ئەم دەستپێکەدا دابڕان لەگەڵ ئەوەی "لەمەوبەر"دا دروست دەبێت و دەستپێکی "ئەوەی پاشتر" دێتە ئاراوە. هەرچەند پشتی "دەستپێك" یاخود "سەرەتا" لە دیدی هایدیگەردا دیمەن زیوینێکی بەرگیریی ڕەهەند ئامێزە، واتە دیمەن زێونێکە ئەوە نیە کە لە پشتمانەوە لە مێژ بێت دەستی پێکردبێت، بەڵکو "سەرەتا" وا لە پێشدەمماندا و هەمیشە و لە هەر ساتەوەختێکدا "سەرەتا" بۆ دەستپێکردنی "سەرەتا"یەکی نوێ و بەزاندنی ڕێگا باوە درێژبووەکان ئامادەیە، ئەمەش بریتییە لە لۆگیکی تێپەڕاندنی میتافیزیك یاخود میتافیزیك بەزاندن. ئەوەشی لێرەدا سەبارەت بە مرۆگەری و هیومانیزمە بریتییە لەو پەیوەندیە دیالێکتیکیەی مرۆڤ و بوون بەیەکەوە هەیانە، پەیوەندییەك کە نزیکایەتی هەردووکیان بۆ یەکتری کارەکتەر دەکاتەوە. وەك هایدیگەر دەڵێت: "هەموو ڕێبازێکی لێکۆڵینەوە لە مرۆڤ پێشتر بریتییە لە ڕێبازی لێکۆڵینەوە لە بوون، وە هەموو ڕێبازێکی لێکۆڵینەوە لە بوون پێشتر بریتییە لە ڕێبازی لێکۆڵینەوەی مرۆیی". ئەم پرۆسەیەش بەبێ تێگەیشتنی دروست لە ماهیەتی "مرۆڤ" و "بوون" شیاو نابێت. بۆ ئەم

تێگەیشتنەش ئێمە پێویستمان بە ئامادەبوونی مەرجەکانی تێگەیشتن لە بوون و لە هیومانیزم، کە دوو چەمك و فینۆمینەی ئەورووپین دەبێت. ئەو پێش مەرجانەش ئێمە دەتوانین لەو وەرچەرخانە گرنگانەدا بیاندۆزینەوە کە بەڕووی ناوەندگەرایی مرۆڤدا ڕوویانداوە. وەرچەرخانی گەردوونی وەك لای کۆپەرنیکۆس، وەرچەرخانی بیۆلۆگی وەك لای داروین و وەرچەرخانی سیکۆلۆگی وەك لای فرۆید و وەرچەرخانی جینی وەك لە کایەی زانستی جینتەکنیك و بۆماوەزانیدا دەبینرێت. ئەگەرچی ئێمە پێش نزیکەی دەساڵ لەمەوبەر لە شوێنی دیدا ئاماژەمان بەو وەرچەرخانانە داوە، بە پێویستی دەزانم لێرەشدا بەکورتی باسیان بکەمەوە بە ئاماژەدان بەوەی کەوا یەکەمجار لەلایەن فرۆیدەوە لە چەند وانەیەکیدا بۆ "دەروازەیەك بۆ شیکاری دەروونی"دا وەکو نەخۆشییە بناغەییەکانی مرۆڤ ناوزەدیان دەکات، دواتریش فۆکۆ لە وروژاندنی چەمکی "مردنی مرۆڤ"دا بابەتەکەی بەرفراوانتر و زانیناوی تر کرد.. لێرەدا ئێمەش پانۆرامای ئەو لێدانانەی بەر سەنتەریزمی مرۆگەری کەوتوون دەخەینەوە ڕوو..[٢].

لە ساتێك لە ساتەکانی مێژوودا، مرۆڤ پێی وابوو کە ئەو بریتییە لە چەقی بوون و لەتەوەری گەردوون، بەڵام لە ڕێنیسانسەوە ئەم بیرکردنەوەیە لەسەر چەقگەرایی مرۆیی بەردەوام دەلەقێنرێت و پیادەکێشرێت کە تاکو ئەمڕۆ ئێمە دەتوانین لیستەیەکی درێژ لەمەڕ ئەو لێدانانە، ئەو نەخۆشیانەی مرۆ بنووسینەوە کە سەرەکیترینیان ئەمانەن:

لێدانی یەکەم: ئەو دیدگا کلاسیکیەی لە سەردەمی پەتلیمۆسەوە هەبوو، گوایا مرۆڤ لەسەرزەوی لەناو جیهانێکی داخراودا دەژی کە چەقی گەردوون و جەمسەری بوونە و ئاسمانیش بە خۆری ڕووناك و گەرمی بەخشەوە بەدەوریدا دەسوڕێتەوە، وە مرۆڤ توانای ئەوەی هەیە تەنانەت سوڕانەوەی خۆریش ڕابگرێت، لەگەڵ هاتنی نیکۆلاوس کۆپەرنیکۆس دا(١٤٧٣-١٥٤٣ز) دەڕەوێتەوە. کاتێك شۆڕشە زانستییەکەی لە گەردونناسیدا بەرپاکرد، کە سەلماندی زەوی بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە نەك بە پێچەوانەوە. بەمەش چەمك و تێگەیەکی نوێی بۆ مرۆڤ و جیهان هێنایە ئاراوە، تاوای لە مرۆڤ کرد چیتر شانازی بە بوونی خۆیەوە نەکات کە چەق و تەوەری گەردوون بێت.

بەمەش کۆپەرنیکۆس لە پایەی مرۆیی کەمکردەوەو مرۆڤی کردە تەنیا پنتێکی بچووك لەناو هەسارە گەردوونییەکاندا و شتێکی ئەوتۆشی بۆ مرۆڤ نەهێشتەوە کە مایەی شانازی ئەو چەقگەریە بێت. نیچەش کە دژیارێتی کۆپەرنیکۆس دەکات بەو مانایە نییە کە دژیارێتی زانست بکات، وەك لە (جینیالۆجیای ئاکاردا ل ١٤٩)دا دەڵێت: لەگەڵ کۆپەرنیکۆسدا مرۆڤ بەرەو هەڵدێرێکی لێژ تل دەبێتەوە و لە پنتی دەرچوونی خۆی دوور دەکەوێتەوە. بەڵام بەرەو کوێ؟ بەرەو عەدەم؟ بەرەو هەستکردن بە نەبوونی خۆی؟ دەشێت ئێمە ئەمە بەجوانتر پێناسی ئەو لێدانە کۆپەرنیکۆسییە دابنێین.

لێدانی دووەم: کاتێك چارلز داروین (١٨٠٩-١٨٨٣ز) مێژووی بنەڕەتی جۆرەکان و ڕەگەزەکانی لە ڕووی بیۆلۆگییەوە دانا، کە مێژووی درێژی داستانی دڕندەیی ئەو ژیانەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتاکانی سروشت و گەردوون، لەوێکاتەوە ئیدی مێژووی کورتی مرۆڤ دەستپێدەکات کە تەمەنی لە شەش هەزار ساڵێك تێناپەڕێت و ئەم تەمەنەشی

تەنیا بەدیالۆگی نێوان یەزدان و مرۆڤدا بەسەر بردووە.

بەڵام داروین وای لە مرۆڤ کرد کە زەمەنی ملیۆنێك ساڵ بکاتە تەنیا قۆناغێك لە قۆناغەکانی گەشەی بیۆلۆگیانەی ژیانی مرۆیی لەسەر زەوی، کە داروین بەپێی تیۆری بنەچەی ڕەگەزەکان و یاساکانی گەشەسەندن و ململانێی ژیان بۆ مانەوەو خۆهێشتنەوە، سەلماندی کە لەبەردەم دەروازەی مرۆڤدا مەیموون هەیە. بەمەش داروین مرۆڤی لەو ئیرادەیە داماڵی کە خاوەنی چارەنووس و ئیرادەی خۆی بێت، مرۆڤی لەو وێنەیە داماڵی کە ئادەم و نوح هەیانە. بەمەش بەشێکی تری ئەو شانازی بەخۆوەکردنەی مرۆڤ دەسڕدرێتەوە، کاتێك مرۆڤ شانازی بە بەژنی جوانی خۆیەوە دەکرد و پێشی وابوو یەزدان مرۆڤی لە هاووێنەی خۆی دروستکردووە.

لێدانی سێیەم: کاتێك سیگمۆند فرۆید (١٨٥٦-١٩٣٩) شیکردنەوەی دەروونی داهێنا، ئیدی ئەو ڕێزە کلاسیکیەی مرۆڤ بە (هەست و هۆش) هەی بوو ئاوا دەبێت. ئەو پێی وابوو مرۆڤی عەقڵانی و بەئاگا و ڕەوشتی، واتا مرۆڤێك بەرپرسیار و زاڵ بێت بەسەر بیرکردنەوەکانی و کردەوەکانیدا ئەوە تەنیا وەهم و پووچێتییە. لای فرۆید مرۆڤ ناتوانێت لە ڕێی خۆیەوە خۆی بناسێ و بە خۆی بئاوزێت تاوەکو "نەست و نائاگایی" خۆی نەدۆزێتەوە. چونکە "نەست" جڵەوی بیرو ڕەفتارەکانی دەکات و هەر ئەویشە ماناو تێگەیشتنی پێدەبەخشێت.

لە پاڵ ئەم سێ نەخۆشییە بناغەییەی لە جەستەو گیانی مرۆڤدان، دەشێت چەندین لێدانی تریش ریزبەند بکەین، بە نموونە لێدانی ئاکاری و ئیتیکی، کاتێك مرۆڤ دەستبەرداری بەها دروستەکانی مرۆگەری دەبێت و بەرژەوەندییە ئابووریەکان پتر پەسەندتر دەکات. هەروەها لێدانی ئەپستمۆلۆگی و سۆسیۆلۆگی و ئیکۆلۆگی و... تاد.

ئەنترۆپۆلۆگی هاوچەرخ ئاماژەی بە ژمارەگەلێك لەو لێدانانە داوە و کەچی هێشتا خودی ئەنترۆپۆلۆگیا لە قەیراندایە، هێشتا لەسەر ڕێیەکی زیکزاکییەوە بەرەو ماڵی مرۆڤ دەچێت. هێشتا ڕێگەیەکی دروست بۆ پێناسەکردنی تەواوی مرۆ و مرۆگەری، جگە لەو ڕێگە میتافیزیکیەی تا هەنووکە باڵادەستە، لە ئارادا نییە. هەموو ئەو پێناسە جۆراو جۆرانەی کە لەلایەن هەمەجۆر ڕێبازی فەلسەفییەوە دانراون تێکڕا پێکەوە ڕۆدەچنەوە ناو حەوزی میتافیزیکەوە. لێرەوە ئێمە دەچینە ناو قۆناغێکی گەلێك گرنگ لە تێگەیشتنی ماهیەتی مرۆیی و هیومانیزم کە گەورەترین فیلۆسۆفی سەدەی ٢٠ ئەو قۆناغە دیاریدەکات، ئەویش مارتن هایدیگەرە. لە یەکێك لەو کارانەی کە پوختەی سەرجەمی کارەکان و بیرکردنەوەی خۆی تێدا ڕانان کردووە، دەستنیشانی هەڵەکانی ئەو میتافیزیکەی کردووە کە دەکەوێتە پشتەوەی هیومانیزمی باوەوەو ئاماژەشی بە خواستنی هیومانیزمێکی نوێ داوە، ئەویش لەو کتێبە بچووکەیدا لەژێر ناونیشانی "لەسەر هیومانیزم"[٣].

## پەیامی هایدیگەر لەسەر هیومانیزم و هیومانیزمی نوێ

سەرەتا با ئەوەمان لا ئاشکرابێت کە هایدیگەر لە وەڵامدانەوەی چەند پرسیارێکی "جان بۆڤرێ"ی فەرەنسی کە لە دیدارێکدا لە ڕێکەوتی ١٠ی نۆڤێمبەری ١٩٤٦ لێیکرد، بە نامەیەك وەڵامی دەداتەوەو دواتر دەبێتە نامیلکەیەك بەناوی: لەسەر

هیومانیزم. ئەم نامەیە لە ڕووی سەردەمەکەیەوە کە دروست پاش جەنگی جیهانی دووەم دێت و وەختە بڵێین هێشتا دوکەڵ و زرمەی بۆمبەکان نەڕەویبوونەوە، ئەو پەیامی لەسەر مرۆگەری نارد. نامەکە بە کورتکردنەوەیەکی چڕو پڕی تێکڕای سیستەمی بیرکردنەوەی هایدیگەر دادەنرێت، بە تێگەیشتن لەو نامەیە ئێمە ڕێگەیەکی درێژی نەك هەر فیکری هایدیگەرمان بڕیوە بەڵکو تەواوی فیکری میتافیزیکیش. هایدیگەر لەوێدا کار لەسەر چەمکی بوون، بوونەوەر، ڕووناکی، ڕاستی، شیعر، زمان، ماهیەت وە هیومانیزم دەکات.

هەر لە سەرەتاشەوە جیاوازییەکی گرنگی بنەڕەتیانە لە نێوان خوێندنەوەی زانست بۆ "ڕاستی" و خوێندنەوەی فەلسەفە بۆی دیاریدەکات. ترسی فەلسەفەی نوێش لەوەی نەتوانێت خەسڵەتی زانستیبوون بکاتە بەرخۆی، لە بنەڕەتدا رادانێکە لە ڕێچکەی بیرکردنەوەی ڕەسەنەوە بەرەو جۆرە بیرکردنەوەیەکی تری ناجۆر. واتە مۆدێرنە وای لە فەلسەفە کردووە بۆ ئەوەی باشتر و زووتر ڕەوایەتی پێبدرێت بەهەر جۆرێك بێت پێویستە زانستییانە بیربکاتەوە، گەر وانەبێت ئەوا خەسڵەتی عەقڵانیەتی لێدادەبڕدرێت. ئەمەش تارماییەکی نیهلیستییانەی دنیای مۆدێرنە، هەموو شتەکان دەبێت زانستی بن، سەبارەت هەر دیاردەیەك بدوێین دەبێت زانستییانە بدوێین، لە کاتێکدا زانستیبوونی فیکر جگە لە ترازاندنی جەوهەری ڕەسەنی فیکر لەسەر تەوەری دروستی خۆی چی دی نییە. بیرکردنەوە ڕامان و پەژارەیە لە کاتێکدا زانست بووەتە جۆرێك لە ماهیەتی ئەو تەکنەلۆژیایەی بە"قەوارە و قاوغ – *Ge-stell*" بەرجەستەی میتافیزیك دەکات. زانست تەنیا پێوانەی وردکردنەوەو ژماردن و سەرژمێری دەکات، لێرەوە هایدیگەر دەڵێت: زانست بیرناکاتەوە.

تەواوی پرۆژەی فەلسەفی هایدیگەر هەوڵدانە بۆ ساتارکردنی بیرکردنەوە لە ڕێی گەڕان بە شوێن مانای "بوون"دا. مانای بوونیش بەبێ بیرکردنەوەی قووڵ لە مانای مرۆڤ شیاو نابێت، ئەو فەلسەفەیەش بە دارشەق دەڕوات گەر لەبەردەم لێکدانەوەی بووندا هەبوونی مرۆیی لەیاد بکات، وە بە پێچەوانەوەش دروستە. لێرەوە ئێمە هەوڵدەدەین ئەم نامەیە لەسەر هیومانیزم بخەینە ڕوو، وە ئاستەکانی ئیشکردنی هایدیگەر لەسەر هیومانیزم لەو پەیامەدا ڕانان بکەین. ئەم نامەیەی هایدیگەر دەشێت لە سێ ئاستەوە بخوێنرێتەوە، لە ئاستێکدا لێکدانەوەیەکە لەگەڵ تێگەیشتنی وجودیانەی سارتەر بۆ هیومانیزم، لە ئاستێکی تردا ڕەخنەگرتنە لە سەرجەمی هەموو ئەو پێناسە باوانەی لەسەر هیومانیزم هەن، لە ئاستی سێهەمیشدا پرسێکە بۆ پێناسێکی ئەنترۆپۆلۆگی و ئۆنتۆلۆگی چیەتی و هەبوونی مرۆیی.

### ئاستی یەکەم
### هیومانیزمی ئەکزیستێنشیالیزم "وجودی"

ئەو چەند پرسیارەی بۆڤرێ لە هایدیگەری کردوون پتر بە دەوری هیومانیزم خول دەخۆن. لە پرسیارێکدا دەپرسێت: "بە چ شێوازێك دەکرێت لەم سەردەمەماندا مانای دروستی هیومانیزم بپارێزین؟" ل ٣١. ئێمە وای بۆ دەچین کە پاشخانی زەمەنی ئەم پرسیارە لەو سۆنگەیەوە هاتووە کاتێك جان پۆل سارتەر نووسینێکی پرۆگراماتیکی بچووك لەژێر ناونیشانی "ئایا وجودیەت هیومانیزمە" دەنووسێت کە دیارە لە ساڵی ١٩٤٦ دا لە پاریسدا بڵاوکراوەتەوەو وتووێژێکی فیکری گەورەشی

نابۆوە. لەبەرئەوەشی جیاوازی بنەڕەتییانەی نێوان هیومانیزمی وجودیانەی سارتەر و پێناسە ئۆنتۆلۆگیەکەی هایدیگەر بۆ چیەتی مرۆیی وەکو "دەربوون — *Exisistenz*" لەو نامەیەدا زیاد لە جارێك کار پێکراوە، ئەوا دەتوانین لێرەدا هێڵە سەرەکییەکانی پێناسەکەی سارتەر بخەینە ڕوو.

سارتەر زۆر بە ئاشکرا بۆ پێناسەکردنی چیەتی مرۆڤ ئەم هاوکێشەیە دادەڕێژێت: بوون دەکەوێتە پێش چیەتیەوە. ل ٩-١١ *Ist derEaxis. Huma?* هەڵبەت زۆر بە خێرایی دەکرێت ئەوە بدرکێنین کە ئەم هاوکێشەیەی سارتەر کتومت هەڵگەڕاندنەوەی ئەو هاوکێشەیەی پلاتۆنە کە مێژوویەکی درێژی لە میتافیزیکی خۆرئاوا پەخش کردووە، هاوکێشەی "چیەتی لە پێشەوەی بووندایە". بەلای سارتەرەوە ئەمە بەو واتایە دێت کەوا هەموو مرۆڤێك بریتییە لە وێنەیەکی تایبەتمەندی چەمکی گشتی مرۆڤ. (هەمان سەرچاوە ل٨٥).

مرۆڤ پێشتر فڕێدراوەتە جیهانەوەو چ بەهاو ئامانجێکیشی پێنەدراوە، و دواتر مرۆڤ لە کۆی پەیوەندییەکانی بەوانی ترەوە ماهیەتی خۆی پێك دەهێنێت. بێگومان بەدەر لەو ماهیەتە جێگیرانەی وەك، نەتەوە، زمان، نێر، مێ.. دواتر مرۆڤ خۆی لە بووندا بەرپرسیاری کردەوەکانی دەبێت و ئازادیش دەبێت لەبەردەم هەڵبژاردنەکانیدا، چونکە مرۆڤ "ئازادی بەسەردا سەپاوە." ل١٦.

سارتەر بەم جۆرە ئازادی تاکەکەس دەردەبڕێت: "ئەوەی بۆ خۆمی هەڵدەبژێرم، واتە بۆ گشت مرۆڤی هەڵدەبژێرم". ئەم تێگەیە سارتەری گەیاندە چەمکێکی نوێی هیومانیزم کە بەهیومانیزمی وجودی ناسرا. بە پێچەوانەی هیومانیزمی کلاسیکیەوە کە لە مرۆڤدا دوا ئامانج و بالاترین بەها دەبینێتەوە. دەبینین لە هیومانیزمی وجودیدا مرۆڤ بریتی نییە لە دوا ئامانج چونکە مرۆ هیچ کات لە کردەی بوون ڕاناوەستێت و بەردەوام "شتی دی" بەرهەم دێنێت، بەهای دی و ڕەفتاری دی مامەڵە دەکات. واتە هیومانیزمی وجودی سارتەر پێی وایە: "مرۆڤ هەمیشە لە دەرەوەی خودی خۆیدایە". جیاوازی گەورەی نێوان سارتەر و هایدیگەریش دەکەوێتە سەر تێگەیشتنیان لە "بوون". سەبارەت پابەندبوونی ئونتۆلۆگی هایدیگەر لەو پەیامەدا بێبەری خۆی بەرامبەر ئەوە نیشان دەدات کە سەر بە ڕێبازێك بێت ناوی وجودیەت بێت.

## ئاستی دووەم

## هایدیگەر و ڕەخنە لە هیومانیزمە باوەکان

سەبارەت بە پرسیاری: چۆن دەکرێت لەم سەردەمەدا مانایەك بە هیومانیزم بدەینەوە؟ هایدیگەر دێت و کرۆکی هیومانیزم پێناس دەکات. ئەو دەڵێت: مرۆڤایەتی مرۆڤ بەندە لەسەر چیەتی لێرەوە مرۆڤ "*homo*" دەتوانێت ببێتە مرۆڤانە "*humans*". چونکە لە بنەڕەتدا هیومانیزم بریتییە لە "ڕامان و پەژارە". واتە مرۆڤ مرۆڤانەیە نەك نامرۆڤانە "*inhuman*". بەلام مرۆڤایەتی مرۆڤ دەکەوێتە کوێوە؟ دەکەوێتە ناوچیەتیەوە. ئەی چیەتی مرۆڤ لە کوێوە و بە چی دیاریدەکرێت؟

مارکس وای لێکداوەتەوە کەوا مرۆڤایەتی مرۆڤ دەکەوێتە ناو کۆمەڵگاوە، لە دیدی ئەودا مرۆڤی سروشتی ئەوەیە مرۆیەکی کۆمەڵایەتی بێت. لە کۆمەڵگادا سروشتی مرۆڤ ساتار دەبێت و هەر لەوێشدا پێداویستییە سروشتییەکانی وەك خۆراك، پۆشاك، کشتوکاڵ و بازرگانی و پیشەسازی دەستەبەر دەکات.

مەسیح مرۆڤێتی مرۆڤ لە دیاریکردنێکی یەزدانییەوە دەبینێت. لە کریستیاندا مرۆڤ سەربەم

جیهانە نییە، بەو پێیەی ئەم جیهانە وەك لە تیمۆرەکەی پلاتۆندا هاتووە جگە لە دەروازە و ڕاڕەوێك بۆ جیهانەکەی "ئەودیو – *Jenseits*" چیتر نییە.

یەکەمین بەکارهێنانی ئەم گوزارەیە *Humanitas* لە کۆماری ڕۆمادا بووە. لەو دەمەدا ئەم وشەیە بەرانبەر بە "بەربەر" بەکارهاتووە. لێرەدا ڕۆمەکان بریتی بوون لە هۆمۆ هومانۆس، ئەمەشیان زیرەکانە لە گریکەکان قۆستبووەوە. واتە لە ڕووی مێژووییەوە دەشێت ئێمە یەکەمین هەڵکەوتی ئەم گوزارەیە لای ڕۆمەکان ببینینەوە. ئەوەشی لەسەدەی ١٤و١٥ دا لە ئیتالیا بە ڕێنیسانس ناودەبرێت لە ڕاستیدا بریتییە لە ڕێنیسانسی ڕۆمەکان کە سەبارەت هومانیتاس بوو. لای ڕۆمەکان هەمیشە وێنەگریکیەکان ئامادە بوون "وە بۆ هەمیشە لای ئەوروپاییەکان ئامادە دەبێت"، بەڵام وەك چۆن هیومانێتی ڕۆمەکان هەمیشە ئامادەبووە، بەرانبەر بەمەش هەمیشە مرۆڤی بەربەر لەبەرچاو گیراوە. لەبەرئەوە هەر تێگەیشتنێکی مرۆگەری هیومانیزم پابەندە لەسەر قۆناغی مرۆڤگەری "هیومانیتاس" ڕەوتی درێژەوەبووی هیومنانیزم لە سەردەمە جۆراوجۆرەکانی تریشدا بەدیهاتووە، لە کاتی هیومانیزمی کلاسیکیدا لە سەدەی ١٨ دا لای ڤینکلمان و گوێتەو شیللەریش سیما گریکیەکە زاڵبووە بەسەر وێنەی هیومانیزمەوە.

دەشێت بە شێوەیەکی گشتی بڵێین هیومانیزم بریتییە لەو هەوڵەی تێیدا مرۆڤ ئازاد و ڕزگار دەبێت و ڕێزو شکۆ مرۆڤایەتییەکەشی تێدا دەبینێتەوە. کەواتە شێوەی جۆراوجۆری هیومانیزم هەیە، وە لەبەر جیاوازی سروشتی یان ئەوا بەدیهاتنیشیان جیاوازە. وەك هیومانیزمی مارکس و هیومانیزمی وجودییانەی سارتەر کە پێویست بە گەڕاندنەوەیان بۆ سەردەمی ئەنتیك ناکات. بەهەمان ئەو مانایە مەسیحیەتیش جۆرێکی تری هیومانیزمە، بەو پێیەی تێیدا بوونی مرۆڤایەتی لە چوارچێوەی بوونی پیرۆزایەتیدا دەردەخات. کەواتە ئەم جۆرە جیاوازانەی هیومانیزم بەپێی "ئامانج" و "سۆنگە" ن، بەپێی جۆرو بەپێی هۆکارەکانی بەدیهاتنیان و بە پێی فۆرمی ڕێبازەکانیان دەردەکەون. بەڵام هەموویان لەسەر ئەوە کۆکن کەوا هیومانێتی مرۆڤ لە دیدی تەفسیرکردنی سروشت و مێژوو و جیهانەوە چی دەبێت، واتە "بوونەوەر" لە شێوە گشتییەکەیدا دەناسرێت. هەموو هیومانیزمێك یاخود میتافیزیك دروست دەکات وەیان ئەو خۆی دەبێتە بناغەی میتافیزیك. بەو مانایەی هەر دیاریکردنێکی ماهیەتی مرۆیی گەر پێشتر مەسەلەی هەقیقەتی "هەبوون" نەبێتە پرسیارێکی کراوە لەناو کایەی بیرکردنەوەیدا ئەوە دیاریکردنێکی میتافیزیکییە. لێرەوە هەموو جۆرەکانی سروشتی مرۆڤ لەناو میتافیزیکدا بریتین لە مرۆڤگەری هیومانیزمی، بەم پێیەش هەموو هیومانیزمێك بە میتافیزیك دەمێنێتەوە. ئەمەش ڕەنگە ئەو نەفرەتە پلاتۆنییە بێت کە هایدیگەر بە دروستی دەستنیشانی کردووە بەوەی "لە بیری پلاتۆندا دەستپێکی میتافیزیك لە هەمانکاتدا دەستپێکی هیومانیزمە.".

هایدیگەر لە ڕووی مێژووییەوە هیومانیزم بەسەر سێ قۆناغدا دابەش دەکات: هیومانیزمی ئەنتیك، هیومانیزمی ڕێنیسانس وە هیومانیزمی هاوچەرخ. لە ئەنتیکەوە تا هاوچەرخ هەموو هیومانیزمەکان خاڵێکی هاوبەش دەکەنە مەرجی مرۆڤبوون، ئەوان هەر هەموویان مرۆڤ بە "گیانەوەرێکی ژیر *animal rationale*" دادەنێن. ئەم پێناسەش هەڵگری لێکدانەوەیەکی میتافیزیکییانەی

چیەتی مرۆڤـە، بـەڵام لەگـەڵ ئـەم لێکدانەوەیەشـدا مەرج نییە ئێمە ئەوە بە پێناسێکی چەوت دابنێین. بەڵام بەو پێیـەی مرۆڤ بە گیانـەوەرێك دادەنێت ئەوا بە مانایـەکی تـر مرۆڤ دەکاتـە زینـدەوەرێك لـە نێوان زینـدەوەرانی تـردا، کـە بـە مانایـەکی دی دەبێتـە بوونەوەرێك لە نێوان بوونەوەراندا. لێرەوە هایدیگـەر پێی وایە هەموو هیومانیزمەکانی بەرلەخۆی، بەهۆی میتافیزیك بوونیانەوە، مرۆڤێتی مرۆڤیان داوەتە پاڵ مرۆڤێتییەکـەی. ئـەم بیرکردنەوەیـەی هایدیگـەر لـەو دیدگایەوە دێت کەوا میتافیزیك هیچ کات جیاوازی لە نێوان "بوون" و "بوونـەوەر" دا نـەکردووە، بـەڵکو "بوون"ی وەك "بوونەوەر" بینیوە، بەهەمان شێوەش مرۆڤـی وەك "بوونــەوەر" ناسـیوە. بـەم پێیــەش میتافیزیـــك مـــرۆڤ دەگەڕێنێتـــەوە بـــۆ بنەچـــە ئاژەڵییەکەی نەك بۆ ڕووە مرۆڤانەییەکەی.

هــەروەها لـــە نووســـینێکی تریـــدا بـــەناوی "سەردەمی وێنـەی جیهان" باس لـەوە دەکات چۆن بـۆ یەکـەمجار لەسـەردەمی نوێـدا جیهـان دەبێتـە "وێنـە" و مـرۆڤیش دەبێتـە زوبیـەکت، لـە ئـەنجامی ئەمەشـــەوە ئـــەنترۆپۆلۆگیاو هیومـــانیزم مانـــا مێژووییەکانیان دەرخستووە.

هایدیگـەر بنـەما میتافیزیکیـەکانی "مـرۆڤ" لـە ڕەوتــی جیـاوازی مێژوویـیانـەی خۆیـدا لـە نێـوان ســـەردەمی ئـــەنتیك و نوێـــدا لای پرۆتـــاگۆراس و دیکـارت دەبینێتــەوە. هــەروەها ســەرباری هــەموو جیاوازیەکی نێوان "ئەنتیك" و "نوێکات" هایدیگـەر دیوێکی تر لەو مێژووە دەگێڕێتـەوە، ئـەویش ئەوەیـە کە میتـافیزیکی دیکارت لـە میتـافیزیکی پلاتـۆنی — ئەرستۆییەوە هاتووە. بە مانایـەکی تـر، لای دیکـارت هیومانیزم ساتەوەختی بوژانەوەو گەشانەوە و ئەورا (*Aura*)ی خۆی و ساتی ئەکتیڤێتی خـۆی دەژێنێـت. بەڵام لەگەڵ نیچەدا ئـەم هیومانیزمـە ساتی کزێتـی و پاسـیڤێتی و کۆتـایی هـاتنی خـۆی پیشـان دەدات. نیچــە کۆتــایی بــەو هیومانیزمــە درێــژە پلاتۆنیــە دەهێنێـت و بانگەشـەی هیومـانیزمێکی تـەواو نـوێی جیـاواز دەکـات. واتـە کـاروانی هیومـانیزم بـەم سـێ وێســـتگەیەدا تێپـــەڕیوە، لای پلاتـــۆن دەســـت پێـدەکات و لای دیکـارت دەگەشـێتەوەو لای نیچـە کۆتایی دێت.

بـــەپێی هیومـــانیزمی کلاســـیك هـــەموو ئـــەو ڕوانینانەی لەسـەر مـرۆڤ هـەبوون، مرۆڤیـان لـە نێوان بوونەوەرەکاندا بینیوە. لە کاتێکدا لەبەرئەوەی مـرۆڤ گاە وەك تاك گـاە وەك کۆمـەڵ گـاە وەك گـەل گـاە وەك مرۆڤایـەتیش دەردەکـەوێت ئـەوا هـەموو جۆرەکـانی هیومانیزم لەسەر ڕێی دووروونزیکی خۆیدا بە دەوری خودی مرۆڤدا سوڕ دەخوات، تـاوەکو میتـافیزیکیش پتر خۆی تـەواو بکـات ئـەوا هیومـانیزمیش، یـان وەك گریکەکان پێی دەڵێن ئەنترۆپۆلۆگی، پتر دەگەڕێتـەوە لای ناوەنـدی فەلسـەفە. (هایدیگـەر، دیـدی ئـەفلاتۆن بــۆ ڕاســـتی. ل ٥٠). لێـــرەوە دەبیـــنین هایدیگـــەر هاوبەندیـــەکی تونـــد لـــە نێـــوان هیومـــانیزم و میتافیزیکدا گرێدەدات.

## تێگەی نوێی هایدیگەر بۆ هیومانیزم

مرۆڤ تەنیا لەناو چیەتی خۆیدا هەیە کە تێیـدا لەلایــەن بوونــەوە دەدوێنرێــت. ئەمــە تێگەیشــتنی جەوهەرییانـەی بیرکردنـەوەی هایدیگـەرە. "دوانـدن" ڕەفتار و بیرکردنەوەی مـرۆڤ دیاریـدەکات و وادەکات زمان ببێتە "ماڵی بوون" و مرۆڤیش تەنیا لەو ماڵەدا "نیشـــتەجێ" بکـــات. مـــەرجی بیســـتنی ئـــەم دوواندانـەش بریتییـە لـە "هاوسـێیەتی بـوون"، وە مرۆڤیش لە هاوسێی بووندا نیشتەجێیە، ئـەوا مـرۆڤ بانگەوازی "بوون" دەبینێت. لێـرەوە دەبیـنین دیـدی هایدیگەر بە پێچەوانەی میتـافیزیکی ئەرخاییشـەوە

"دێرینەوە" تەماشای مرۆڤ دەکات، کە پێی وا نییە مرۆڤ بوونەوەرێك بێت لە نێوان بوونەوەرانی تردا، بەڵکو ئەو وەکو پەیوەندی و جیاوازی و شوناسی بەبوونەوە تەماشای مرۆڤ دەکات. واتە چیدی لای ئەو مرۆڤ زوبیەکتێك، ژیرییەك، یان "من"ێك یاخود "رۆح" یا "کەس"ێك نییە، بەڵکو ئەو "لێرەبوونە — دازاین". دازاین واتە بوونی بەرچاو، بوونێك کە خۆی "دەر" خستبێت و خۆی "والاّ" کردبێت، لە نێوان هەموو بوونەوەرانیشدا تەنیا مرۆڤ توانای خۆ "دەر"خستنی هەیە. بە نموونە، بەرد، درەخت، یەزدان هەن، بەڵام وەکو بوونی مرۆیی نین، مرۆڤ خۆی دەردەخات و خۆی پیشاندەدات و خۆی دەسەلمێنێت، لەبەرئەوە هەبوونی مرۆیی هەبوونێکی دەرەکییە کە ئێمە بە "دەربوون — *Existenz*" ناوی دەبەین. بوونی مرۆڤیش بریتییە لە "بوون — لەناو — جیهاندا" کە خەسڵەتی ئەم لەناو جیهان بوونەش بریتییە لە "غەم و پەژارە — *Sorge*". مرۆڤیش هەم هاوسێی بوونەو هەم "شوان"ی بوونە. لەهەر یەکێکیش لەم ناونیشانە ئۆنتۆلۆگییانەدا "بوون" وەکو جەوهەری مرۆڤ و "مرۆڤیش" وەکو جەوهەری "بوون" دەردەکەوێت. وەك ئەو دەڵێت: "ماهیەت لەناو دەربووندایە". بەمەش هایدیگەر خۆی لەو گەمە میتافیزیکییەی پلاتۆن و سارتەر دوورەپەرێز دەکات، کاتێك ئەوان شەڕی "پیشینایەتی بوون و ماهیەت" دەکەن.

بۆیە ئەو ڕەخنە لەو شێوە پرسیارانەش دەگرێت کە بە دروستی مرۆڤ وەك "بوون" تەماشا ناکەن، شێوە پرسیاری: "مرۆڤ چییە؟" ئەمە جگە لە پرسیارکردن لە "شتایەتی" بوونی مرۆڤ چیدی باس ناکات، یان پرسیاری "مرۆڤ کێیە؟" تەنیا بریتییە لە "کەسایەتی" بوونی مرۆڤ و بەس.

تەنیا پرسیاری ئۆنتۆلۆگییانە دەشێت ماهیەت و هەبوونگەری مرۆڤ بخاتە بەرباس. هایدیگەر دەڵێت: "ڕاوەستان لەبەر ڕووناکی بووندا بریتییە لە دەربوونێتی مرۆڤ". واتە مرۆڤ تاکە بوونەوەرە لەبەر ڕووناکی بووندا بێت، چونکە بەتەنیا مرۆڤ لە پانتاییەکی "کراوەو ئاشکرا"دا هەیە. هەموو شوێنێکی کراوەش شوێنێکە، بەپێی لۆگیك، ڕووناکی بەردەکەوێت.

لە دەرەوە ڕاوەستان واتە لە دەرەوە بوون *Aus-stehen* کە هایدیگەر لە "گەڕانەوە بۆ بناغەی میتافیزیك"دا (ئێمە وەرمانگێڕاوەتە سەر کوردی و لە گۆڤاری ڕەهەند ژمارە ١١ ساڵی ٢٠٠٠) لێکدانەوەی وردی لەسەر کردووە و خودی لە "دەرەوە" بوون بە "کرانەوە" دادەنێت. واتە کێشەی مرۆڤ هەبوونێکی "دەرەکی"یە بە واتای هەبووی مرۆیی بەوە دەناسرێتەوە کە بە کراوەیی لە ئاشکراییدا هەیە. مرۆڤ بەوە دەناسرێتەوە کە لە بوونەوەیەو لەناو بوونیشدایە.

سەبارەت بە تێگەی دەربوون یاخود بوونئارا *Existenz* ئێمە جیاوازیەکی قووڵ لە نێوان سارتەر و هایدیگەردا شك دەبەین، هەروەهاش سەبارەت تێگەی چیەتی *Wesen* لای هایدیگەر تەواو جودایە وەك لای سارتەر. لای هایدیگەر چیەتی، ماهیەت بریتی نییە لەو مانا باوەی جەوهەر *essentia* ی لاتینی کە سارتەر پێی وابوو. بەڵکو چیەتی بریتییە لە دەربوونێتی دازاین، کە بەپێی کاتدارێتی خۆی دیاریدەکات، وەك بوونێکی کۆتادار کە ڕووەو "مردن" دەڕوات، بەمەش لە شێوەی ڕوودانێکدا دەردەکەوێت. لێرەوەیە هایدیگەر جیاوازی لە نێوان "گەڕانەوە" بۆ میتافیزیك و "هەڵگەڕانەوە"ی میتافیزیکدا دەکات. ئەوەشی سارتەر دەیکات جگە لە "هەڵگەڕاندنەوە"ی ڕستەکەی پلاتۆن چیتر نییە،

کاتێك دەڵێت: "بوون پێش چیەتی دەکەوێت". بە تێگەیشتنی هایدیگەر ئەمە بریتی نییە لە بەزاندنی میتافیزیك بەڵکو بریتییە لە شێوەیەکی تری میتافیزیك، لەبەرئەوەی "هەڵگەڕاندنەوەی ڕستەیەکی میتافیزیکی هەر بە میتافیزیك دەمێنێتەوە".

ئەوەشی لە هایدیگەرەوە پێی دەزانین بیرکردنەوەیە لە "بناغە"ی میتافیزیك تاوەکو خودی میتافیزیك لە چیەتی میتافیزیك جیابکرێتەوە، تاوەکو چیدی کۆتایی بەو تێگەیشتنانە بهێنین کە لە پلاتۆنەوە درێژبووەتەوە و بێگومان سارتەریشی تێوەگلاوە، ئێمە بەوە دەزانین کە جەوهەر و زوبستانسی مرۆڤ بریتییە لە دەربوونێتی و لە خۆ ئاشکرایی مرۆڤ. دەربوون نە بریتییە لە بەدیهاتنی جەوهەر وەك لای پلاتۆ دیارە وە نە جەوهەر بریتیە لە بەدیهاتنی دەربوون وەك لای سارتەر دیارە. لێرەدایە کە بیرکردنەوەی گەورە کتێبی "بوون و کات"ی هایدیگەر بە ئاراستەی دژە هیومانیزم کاردەکات، بە مەبەستی ئەوە نا کە لە بەهای مرۆڤایەتی مرۆڤ کەم بکاتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی خودی هیومانیزم "تەواو بەرز" مرۆڤایەتی مرۆڤی نەنرخاندووە. ئیدی شکۆ و پایەبەرزی مرۆیی لەوە نییە کە مرۆڤ وەك "زوبیەکت"ێك بێت بەڵکو لەوەدایە کە ئەرکی مرۆیی بریتییە لەوەی "پاسەوانی هەقیقەتی بوون" بێت، وە مرۆڤیش ئاغای بوونەوەرەکان نییە بەڵکو ئەو "شوانی بوون"ە. (لەسەر هیومانیزم ل ٢٩-١٩).

"بیرکردنەوە و زمان و نیشتەجێبوون" ئەو سێ تەوەرەن کە بە دەوری هەقیقەتی بوون خول دەخۆن، پەیامەکەی هایدیگەریش ڕاگەیاندنی ئەوەیە. مرۆڤ بیردەکاتەوە لە مرۆڤبوونی خۆی، زمانیشماڵی بوونە و مرۆڤیش لەو ماڵەدا نیشتەجێیە. بەڵام مرۆڤی هاوچەرخ ئەو ماڵەی فەرامۆش کردووە، چیدی بیر لە بوون ناکاتەوە ئەمەش بەرەنجامەکەی بووە بە "بوون لە یادکردن". فەرامۆشکردن و لەیادکردنی بوون لە خۆیاندا بوونەتە شێوازی میتافیزیکی مۆدێرن سەبارەت بوون. نیشتمانی مرۆڤی مۆدێرنیش کەوتۆتە ناو ئەو فەرامۆشییەوە، بەڕادەیەك مرۆ چیدی سەرباری ئەو هەموو خانوو باڵاخانانەی ڕۆژانە دروستی دەکات کەچی هێشتا لە ماڵی بووندا نیشتەجێ نییە وەك ئەو دەڵێت ئیدی "بێ نیشتمانی دەبێتە چارەنووسی جیهان". ئەم بێ نیشتمانیەش نە دەکرێت لە ڕێی ئایدیۆلۆژیاکانی وەك ئینتەرناسیۆنالیزم و نە لەڕێی ئیندیڤیدوالیزم و نە لە ڕێی ناسیۆنالیزم و نە لەڕێی ئەمریکانیزم و نە لە ڕێی کۆمۆنیزمەوە ببەزێنرێت.

لەبەرئەوەی هەموو ئەو ئایدیۆلۆژیایانە مرۆڤ بە "خود/ شت – *Subjekt*" دادەنێن و لە هەمووشیاندا مرۆڤ جگە لە "گیانەوەری ژیر – *animal rational*" چیدی نییە. لێرەوە هایدیگەر هەر لە کتێبی "بوون و کات"ەوە دژی ئەم میتافیزیکە ئەوروپییە بیردەکاتەوە و وەکو فریشتەیەکی زیز دێت و چیدی ئەم تەنیا میتافیزیکە وەلا دەخات کە سروشتی بیۆلۆگی و زوولۆکی *Zoologie* دەبەخشێتە مرۆڤ و پەیامێکی نوێی پێدەدات کە بەخشینی هەقیقەتی خۆیەتی بەوەی ئەو هەڵگری سیفەتی ئۆنتۆلۆگی وجودییە. ئەو پەیامەی هیومانیزمی هایدیگەر پێمان دەڵێت: مرۆڤ پێویستە بەوە بزانێت کە ئەو فڕێدراوەتە بوونەوە و دەرفەتی ئەوەی هەیە ببێتە مرۆڤ وەك مرۆڤ و لە نزیك بوون و لە هاوسێیەتی بووندا نیشتەجێ بێت و بشبێتە پاسەوانی بوون.

وەك بینیمان هەموو هیومانیزمەکان زانیاریەکی گشتی دەکەنە مەرجی پێشینەیی بۆ ماهیەتی مرۆیی. بەڵام ئێمە لێرەدا دەپرسین، ئایا ئێمە

ڕێگەیەکی دروست دەگرینەبەر کاتێك چیەتی مرۆیی بەوە دیاری دەکەین کە بیگەڕێنینەوە بۆ چیەتییە ڕووەکی و گیانەوەریەکان و لە پاڵیدا شتێکی مرۆڤانە، کە عەقڵە، بۆ سەربار بخەین؟ ئایا کاتێك میتافیزیکی باو مرۆڤ بە "گیانەوەرێکی ژیر — *rational animal*" دادەنێت توانیویەتی بەمە سەرجەمی ماهیەتی مرۆیی دیاری بکات؟ لە ڕاستیدا سەرباری بایەخی ئەم پێناسە لەبەردەم ئەنترۆپۆلۆگیدا، بەڵام وەکو تر جگە لە کەمکردنەوەی چیەتی مرۆیی چیتر نییە. چونکە ئەم پێناسەیە چاوی لەوە پۆشیوە کە مرۆڤ مرۆڤ بێت. زانستی کیمیك و فیسیۆلۆگی و بیۆلۆگیش هەڵەدەکەن کاتێك دەڵێن، لە ڕێی پشکنینی زانستییەوە مرۆڤ وەك بوونەوەرێکی ئۆرگانی سروشتی پێناس دەکرێت، چونکە ماهیەتی مرۆیی پابەندی ئەم لەشە ئۆرگانییە نییە کە چووەتە ژێر نەشتەری شیکاری زانستی مەرجداریەوە. لێرەوە کاتێك جان بۆفریێ لە هایدیگەر دەپرسێت، "چۆن مانا بە هیومانیزم بدەینەوە؟" هایدیگەر پێی وایە ئەم پرسیارە لە خۆیدا ئەوەمان بۆ ڕادەگەیەنێت کەوا هیومانیزمی باو چ مانایەکی نەماوە، بەڵکو بەسەرچوو، بۆیە ئەو پێی وایە پێویستە ئێمە سەرلەنوێ پێناسێکی تری هیومانیزم بکەین. بەڵام لێرەوە پرسیارێکی دی دەرئەنجام دەکرێت" داخۆ ئەو هیومانیزمەی سەرلەنوێ پێناس دەکرێتەوە، کە ئێمە بەدژیاری هیومانیزمی پێشووی دادەنێین، داخۆ هەمان ناوی خۆی دەپارێزێت یاخود نا؟

هایدیگەر پێی وایە مرۆڤ زۆر لەوە "زۆرترە" کە تەنیا مرۆڤ بێت و بەس، ماهیەتی مرۆییش تەنیا لەمەدا ڕاناوەستێت. چونکە وشەی "زۆرترە" وەك ئەو دەڵێت، نابێت وەك وشەیەکی پاشکۆیی سەربارخراو بۆ پێناسەکە هزر بکرێت، بەڵکو دەبێت بە ڕوخساری بناغەیی ئەو پێناسەیە تەماشا بکرێت. واتە "زۆرترە" بریتییە لە بنەڕەت و لە چیەتییە گەوهەرییەکەی مرۆڤ و بەبێ ئەم "زۆرترە" تێگەیشتنمان لەسەر مرۆڤ و چیەتیەکەی دروست نابێت. لێرەوە دەبینین هیومانیزمی باو مرۆڤی خستووەتە ناو وێڵگەیەکی میتافیزیکەوە، لە کاتێکدا تێگەیشتنە هایدیگەرییەکە مرۆڤ دەکاتە مرۆڤ، مرۆڤ دەکاتە هاوسێ و شوانی بوون. لەبەردەم سەرلەنوێ پێناسەکردنەوەی هیومانیزمیشدا دەتوانین ئەم ڕستەیە هەڵبهێنجێنین" هیومانیزم واتە چیەتی مرۆڤ بریتیە لەو شتەی کە بۆ هەقیقەتی بوون شتێکی جەوهەرییە. پێموایە ئەم ڕستەیە ناوکی بیرکردنەوەی هایدیگەر پیشان دەدات. لەوەشدا کە هەموو جۆرەکانی هیومانیزم دواجار لەناو وێڵگە میتافیزیکیەکاندا مرۆڤیان ڕاهێناوە و جگە لە شکست و نەهامەتیش چیدی بەدوادا نەهاتووە، ئەوا ئێستا پاش پتر لە ٥٠ساڵ تێپەڕین بەسەر ئەو پەیامەی هایدیگەردا فیلوسۆف پیتەر زلۆتەردایك دێت و خوێندنەوەیەکی نوێ بۆ هیومانیزم دەکات و بە وەڵامدانەوەیەکی هایدیگەریش ڕێساکانی هیومانیزمی داهاتوو ڕادەگەیەنێت. لێرەوە پێویستە شیکاری هیومانیزم وەك خوێندنگای ڕاهێنان و پەروەردەکردنی مرۆیی، وەك ڕامکردن و دەستەمۆکردنی مرۆیی بکرێت. خوێندنگایەك تاوەکو ساتی هایدیگەر شکست دەهێنێت لە دەستەمۆکردنی مرۆڤ، خوێندنگایەك بە ئاراستەیەکدا مرۆڤدۆستانە بووە و بە ئاراستەیەکیشدا مرۆڤی دڕندەو شەڕانگێزی ڕاهێناوە. خوێندنگایەك کە مرۆڤی فێرکرد بە بەرد ئاگر بدۆزێتەوەو بە تەکنەلۆژیا بۆمبای ئەتۆمی دابهێنێت، خوێندنگایەك لە هیرۆشیماوە بۆ هەڵەبجە لوتکەی هیومانیزمی مۆدێرنەمان بۆ ئاوێنە دەکاتەوە

كە چەند دڕندەگەر و شەڕانگێز و وێرانخوازە. خوێندنگایەك لەگەڵ گەشەی تەكنەلۆگی و زانستی و بەتایبەت زانستی جینەكان و بۆماوەزانیدا، ئاسۆیەكی تری زەبەلاح لەبەردەم نەك دەستەمۆكردنی مرۆڤدا، بەڵكو چاندن و پیتاندنی مرۆییدا دەكاتەوە، واتە جینتەكنیك پێناسێكی نوێی هیومانیزم دادەهێنێت و وای دەبینێت كە مرۆڤ "شیاوی نەشتەرگەرییە — *operable*" و مرۆڤ دەشێت لە خودی جەستەی مرۆڤ، *Hard ware* ی مرۆڤ دروست بكرێت بەپێی چەند پێوانەیەكی پێشتریش خەسڵەتە *Soft ware* یەكانی هەڵدەبژێردرێت.

زلۆتەردایك لەم ئاسۆیەدا كاردەكات و ڕێساكانی ئەو باخەی ئایندەی مرۆڤمان بۆ باس دەكات، كە تێیدا مرۆڤێك ڕادەهێنرێت كە شەڕانگێز و بەربەر نییە، مرۆڤێك مرۆڤدۆستە و دڕندە نییە.

## زلۆتەردایك و
## گوتاری هیومانیزم، پۆست—هیومانیزم

هەڵبەت هیومانیزم لە هەرسێ ئەو سەردەمەی كە پێیدا تێپەڕی، "ئەنتیك، ڕێنیسانس وە سەردەمی نوێ" هەر لە جوغزی میتافیزیكدا قەتیس مابوو، تاوەكو هایدیگەر، پێشتریش نیچە، هات و ئەو جوغزەی واڵا كردەوە. ئەمە ڕوانینی فەلسەفی بوو لە كاروانی هیومانیزم. بەڵام ئایا هیومانیزم لە ڕوانینی كولتورییەوە چی دەگەیەنێت، ئەو میتافیزیكەی خۆرئاواش كە تاوەكو هایدیگەر درێژ دەبێتەوە، بەلای زلۆتەردایكەوە بریتییە لە "ئەفسانە". لە كولتوری ئەفسانەشدا ڕامكردنی مرۆڤ ڕامكردنێكی میتافیزیكی پەتییە. كاتێك گریكەكان هێشتا هەر "مرۆ — ئەنترۆ — *Anthro*" یان دەناسی، پێیان وابوو گریكەكان تاكە گەلی شارستانین و بەدەر لە گریكەكان دڕندە و بەربەرن. ئەم ئەفسانەیە درێژ دەبێتە ناو وێناو هزری ڕۆمەكان و ئەمانیش پێیان وایە مرۆڤی مرۆڤدۆست "هیومانیتوس" لە ڕۆمادا پەروەردە دەكرێت و لە دەرەوەی ڕۆما تەنیا "بەربەر" هەن. پاشان لە مۆدێرنەدا ئیدیۆلۆگییە تۆتالیتێرەكان هیومانیزم مۆنۆپۆلی گروهێكی دیاریكراو دەكەن، لەگەڵ سەرهەڵدانی كۆلۆنیالیزم و ئیدیۆلۆگی فاشیزم و نازیزمیشدا كۆدی هیومانیزم لەناو ئەفسانەی ناسیۆنالیزمدا بەرجەستە دەكرێت. واتە دەبینین مێژووی كولتوریانەی ئەوروپای خۆرئاوا ئەو مێژووە ئەفسانە ئامێزە بووە كە چەقی قورسایی لەسەر تەوەری خۆی بینیوەتەوەو بەدەریش لە خۆی، لە پەراوێزەكاندا، بەربەر و ناهیومانیتۆس هەن. ئەم ئەفسانەیە وای لەو ئێدیۆلۆگیە كردووە كە دنیا مۆنۆپۆلی نەتەوەیەك، ڕەگەزێك یان عەقڵێكی دیاریكراوی باڵادەست بكات و بەئاراستەیەكی تریشدا هیومانیزم بریتی بووە لە ئافەرۆزكردن و بەسووكدانانی دنیای دەرەوەی خۆی. ئەم ئەفسانەیە هەر درێژەی هەیە و هەردەم لەناو گەلێك گوتاری جۆراوجۆردا دەبینرێتەوە، وەك دەبینین فەیلەسوفی فەرەنسی فیلیپ لاكۆ — لابارتێ زۆر بە بەڵگەوە دەڵێت "نازیزم هیومانیزمە"، وە یان سیاسەتمەدارێكی ڕەگەزپەرستی وەك یۆرگ هایدەر لە پایزی ١٩٩٩ دا شەڕی هەڵبژاردنەكەی لە هەموو نەمسادا بە دروشمی هیومانیستی بەرێكرد، هەر ئەم هایدەرە چەند ڕۆژێك بەر لە ڕمانی دكتاتۆرێكی ترسنۆك و سەقەتی وەك سەدام، سەردانی بەغدای كرد، دیارە لەبەر هیچ نا لەبەرئەوەی هاوبیری یەكترن، یان لە شەڕی ئەفگانستاندا بینیمان ئەمریكا هێشووە بۆمبای دەباراندو لە هەمانكاتیشدا شیرینی بۆ مناڵە

بێبەش لە شیرینییەکان دەباراند. واتە هیومانیزم چووەتە ناو گوتاری سیاسی و کولتوری و فیکری و کۆمەڵایەتی و ئاینیشەوە. خودی هیومانیزم بووە بە تەکنیکی پێوانەکردنی ئاستی کولتور بەرزی دنیایەك و ژیار نزمی دنیایەکی تر. ئەو کۆمەڵگایانەی لە تەکنەلۆژیادا پێشکەوتوو و باڵادەست نین بە کۆمەڵگای بەربەر ناودەبرێن و ئەوانەشی کۆمەڵگای پیشەسازین بە کۆمەڵگای ژیاری و لوتکە ژیاری و مرۆڤدۆست ناودەبرێن.

لێرەوە دەبینین کاتێك هیومانیزم دەبێتە تەکنیکی پێوانەکردنی ئاستی ژیاری ئیدی خەسڵەتێکی ئیدیۆلۆگی تۆتالیتێری وەردەگرێت، خەسڵەتێك کە تەنیا چەق لەسەر باڵای "خود" دەبەستێت و "بەرامبەر" وەك "پەراوێز" تەماشا دەکات. مەترسی مرۆڤایەتی، مەترسی کۆمەڵگاکان لە تێکشکانی دیالۆگی نێوانیان، لەیەکتر سڕینەوەی ڕادیکاڵانەوە، لەم خاڵە ترسناکەوە سەردەردەکات.

فیکری نوێ لەبەردەم ئەم زەنگەسامناکەدا دەبێت گوێبیستی ئەو زرنگانەوەیە بێت کە لەو زەنگەوە دەکەوێتەوە. هایدیگەر لە بەرەبەیانی کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمدا گوێبیستی ئەو زەنگە بوو، توانی ئەو هیومانیزمە بخوێنێتەوە کە تا هەنووکە میتافیزیکی باو سەرقاڵی کردووین و گەوهەری هیومانیزمێکی نوێشمان لەو قوڕاوەدا بۆ دەربهێنێت و پرشنگدانەوەی ئەم گەوهەرەش لە پەیامێکی ئۆنتۆ وجودیانەی مرۆییدا پەخش بکاتەوە. هەروەها پاش تێپەڕبوونی پتر لە ٥٠ ساڵ فیلۆسۆف پیتەر زلۆتەردایك دێت و لە گوتارێکیدا بەناوی "چەند ڕێسایەك بۆ باغی مرۆڤ — وەڵامدانەوەی هایدیگەر" کە لە سیمپۆسیۆنێکی نێونەتەوەییدا لە ژێر ناوی "ئەودیوی بوون — فەلسەفە لە پاش هایدیگەر" لە کۆشکی ئێلماو *Elmau* سازدرا، گوێبیستی ئەو زەنگەی هایدیگەر دەبێت کە بۆ مەرگی هیومانیزم و بۆ ئاگادارکردنەوەمان لە هاتنی پۆست — هیومانیزم لێیدا[٤].

ئەو گوتارە سەرەتا بەر لە دوو ساڵ لە جێیەکی تردا زلۆتەردایك خوێندبوویەوە، بەڵام دەنگدانەوەیەکی ئەوتۆی نەبوو، بەڵام لەم کۆنگرەیەدا کە خوێندیەوە بووە مایەی تەقینەوەیەکی فیکری گەورەی ناو ناوەندە ڕۆشنبیری و سیاسیەکانی ئەڵمانیا. هەر زوو لە ڕۆژنامەی *die zeit* چاپکراو دواتریش وەك نامیلکە چاپکرا. گوتارەکە بریتییە لە وەڵامدانەوەی هایدیگەر، پەیامی "لەسەر هیومانیزم" ئەم گوتارە تەقینەوەیەکی ئەوتۆی نایەوە بەڕادەیەك دەگوترێت لە مێژە هیچ تێمایەکی فەلسەفی هێندە میدیای سەرقاڵی خۆی نەکردووە و لە ماوەیەکی کورتیشدا پتر لە ٥٠٠ وتاری لەسەر نووسرا. کە زوربەی زۆری هێرشی توندی چەپەکان بوون، بەتایبەت ئەوانەی سەربە قوتابخانەی "تیۆری ڕەخنەیی" هابرمازن، گەلێکیان خوێندکار و دۆستی هابرماز بوون، بەڕادەیەك تەنانەت خودی هابەرمازیش کەوتە هێرش کردن و بگرە وەك زلۆتەردایك ئاشکرای کرد هەموو ئەو هێرشە ناڕەوایانە لە فیتنەی هابرماز بوون. ئەمە کێشەیەکی فیکری ئەوتۆی دروستکرد لە نێوان هابرماز و زلۆتەردایك دا، کە ئەمی دووایان پەیامێك بنووسێت و تێیدا "مەرگی تیۆری ڕەخنەیی" ڕابگەیەنێت[٥].

## پوختەیەکی گوتارەکە

یەکەم رستەی گوتارەکە بە رستەیەکی نووسەر و شاعیری ئەڵمانی "جان پاول"[٦] دەست

پێدەکات کە دەڵێت: "کتێبان نامەی ئەستوورن بۆ دۆستان"، لێرەوە زلۆتەردایك مێژووی هیومانیزم وەکو مێژووی ئەو نامەیە یان ئەو پەیامە دۆستئامێزانەیە دەنووسێتەوە. ئەو پێی وایە هیومانیزم لە تەسکترین و فراوانترین مانایدا دەگەڕێتەوە بۆ کردەی "ئەلفەبێتاندن — *Alphepetisierung*". واتە هەر لە سەردەمی گریکەکانەوە بریتی بووە لە یانەیەکی تایبەت بە "فێرکردن"، واتە هیومانیزم خوێندنگای پێکهێنان و پەروەردەکردنی فێرکاریانەی مرۆڤ بووە.

نووسین، لەو دەمەوەی کە داهێنراوە، ئیدی بووە بە سەرەکیترین و قووڵترین هۆکاری پەیوەندی گەیاندن، قووڵترین هۆکاری دۆستایەتی دروستکردن، قووڵترین هۆکاری خۆدروستکردن و خۆپەروەردەکردن. لەو دەمەشەوە کە فەلسەفە وەك ژەنرێکی ئەدەبی هەیە ئیدی مرۆڤایەتی تووشی پەتای نووسین لەسەر "خۆشەویستی" و "دۆستایەتی" دەبێت. بەڕادەیەك ئیدی فەلسەفەش لەوە دەکەوێت کە سەبارەت "حیکمەت خۆشویستن" بدوێت، بەڵکو فەلسەفە دەخوازێت ئەوانی تر، کەسانی دی ڕووەو ئەم "خۆشەویستی"یە ببزوێنێت. ئەمە مێژووی نووسینی فەلسەفەیە هەر لە سەرەتاوە تاوەکو ئەمڕۆ. فەلسەفەش دەشێت بەردەوام وەکو زنجیرە نامەیەك بنووسرێتەوە و لە میانەی وەچەکانەوە بەرەو ڕێی "دۆستاندن" ببرێت. ئەمەش گەوهەری هیومانیزمی ئەنتیك بوو کە بریتییە لە سازکردن و ڕامکردنی مرۆیی لە ڕێی پەروەردەی ڕۆحییەوە

بەڵام ئەم هیومانیزمە لەم کایە ئەدەبییەدا نەچەسپاوەو بەس، بەڵکو لەگەڵ دروستبوونی "دەوڵەتی نەتەوە"دا خەسڵەتی سیاسەت و پۆلیتیکیشی لەخۆ دەگرێت. لەو کاتەوەی گەلانی سیاسی خوێندنیان کردبووە چەك، ئەوا ئەلفەبێتاندن بریتی بووە لە خۆچەککردن. خزمەتی سەربازی گشتی و خزمەتی خوێندنی ناچاری کلاسیکیانەش بریتی بوون لە ڕەگەزە سەرەکییەکانی دەوڵەتی مەدەنییانەی نەتەوە. بەلای زلۆتەردایکەوە ئەم ڕەگەزانە لە ١٧٨٩ "شۆڕشی فەرەنسی"یەوە تاوەکو ١٩٤٥ "کۆتایی جەنگی دووەم" درێژەی هەبووە.

"نووسین" لە تەواوی ئەو قۆناغەدا سەرەکیترین کۆمیونیکاسیۆن بووە، لێرەوە زلۆتەردایك باس لە کولتوری "نووسین" لای گریکەکان دەکات، ئەم نووسینانە وەکو "نامە/ پەیام" نێردراون و دواتر ڕۆمەکان دەبنە "وەرگر"ی ئەم پەیامە و لە کایەی ئەدەبییەوە دەیگوێزنەوە ناو کایەی سازکردنی مرۆڤی "جەنگاوەر"، لە خوێندنگاوە دەیگۆڕن بۆ مەیدانی جەنگ، هەر بۆیە ڕەگەزی سەرەکی ئیمپراتۆریەتی ڕۆما "جەنگاوەر" بوو. دواتریش هەر لەمانەوە کولتوری ئەوروپی پەیدا دەبێت.

هەڵبەت گریکەکان سەرسامی ئەم دۆخە بوون، چونکە لە گەمەی "نووسین"دا نووسەر وەك ئەو "نێرەر"ە بێ ئاگایەیە کە ناتوانێت پێشبینی "وەرگرەکانی" خۆی بکات. "نێرەر" پەیامی دۆستایەتی خۆی دەنێرێتە دەرەوە، بەرەو دونیای ڕەوانە دەکات، بەبێ ئەوەی تەنانەت وەرگرانیش بناسێت، وە ئەگەر ناسینیشی ئەوا هێشتا لەبەردەم گوتاری دۆستانەی ئەودا هەلی ئەوتۆ هەیە کە تیایدا ئەو خوێنەرانەشی کە هێشتاکە لەدایك نەبوون، یەکیان بخات. ئەم حاڵەتەش نوێنەری دیاردەیەکی گرنگ دەکات کە بە "دوور خۆشویستن" ناودەبرێت، کە ئەمەش چەمکێکی نیچەییە، کاتێك زەردەشت دەڵێت: "ئەی هاوڕێیان فێرتان ناکەم هاوسێتان خۆشبوێت، بەڵکو دوورەکانتان خۆشبوێت". چونکە

نووسین پردێك نییە لە نێوان دۆستاندا هەڵچنرابێت، بەڵکو ئەرکی نووسین "دروستکردنی" دەروازەیە بۆ چوونە ناوکردەی "دۆستاندن"ەوە. نووسین دەنووسرێت و لەپاش ناردن و بڵاوبوونەوەی مرۆگەلێك بۆخۆی دەکاتە دۆست، نووسین دروستکردنی ئەو حاڵەتە راستەقینەیەیە کاتێك نیچە "بە ڕێکەوت" کتێبی "جیهان وەك خواست و هزر"ی شۆپنهاوەری چنگ کەوت لەگەڵ خوێندنەوەیدا گوتی: ئەم کتێبە تەنیا بۆ من نووسراوە. دروست وایە ئەو خوێنەرەی کتێبێك دەکەوێتە بەردەستی، دەتوانێت ئەو کتێبە بە بانگنامەیەك بۆ دۆستایەتی دابنێت.

لە کرۆکی هیومانیزمدا ئێمە ئەو خەسڵەتە گرنگەی مرۆ دەبینینەوە کەوا "توانای خوێندنەوە" سیمایەکی گرنگی پێناسەی مرۆڤە. ئەم توانایەش یاریدەدەرێکی گەورەیە بۆ ئەو مرۆڤانەی دەخوازن دەست بەسەر سروشتدا بگرن. واتە خوێندنەوە و خۆفێرکردن بۆ دەستەڵات. لێرەوە یەکردەی مرۆڤاندن بەر لە هەرشت بریتییە لە کردەی ئەلفەبێتاندن. بەمەش هیومانیزم دەبێتە مۆدێلێکی ئەدەبی بۆ کۆمەڵگا، دەبێتە خوێندنگایەك کە لە ڕێی پەروەردەکردن و فێرکردنی عەقڵی و رۆحیەوە، رۆحی بەرگری و جەنگاوەری دەستەمۆ دەکات. ئیدی لێرەوە کۆمەڵگای ئەدەبی پەلدەهاوێت بۆ کۆمەڵگای سیاسی. لەو گوتارەشدا زلۆتەردایك سەفەرێکی فەلسەفی و کلتوری و سیاسییانە بە ناو گۆڕانە کۆمەڵایەتی و مۆدێلە سیاسیەکانی مێژووی دێرینی ئەوروپادا دەکات، هەر لە ڕۆژگارەکانی یۆنان و ئیمپراتۆری ڕۆماوە بەرەو چاخەکانی ناوەند و سەدەی ١٩ و ٢٠ یش باس لەوە دەکات چۆن خوێندن و خوێندەواری لە ڕێی نووسینەوە پەیامە هیومانیزمەکەی خۆی پەخش کردووە و دەوڵەتی نەتەوەییش لە هیومانیزمدا چ پەیکەرێکی هەبووە و دواتریش پرۆسەی خوێندن لە پرۆسەی نەتەوە خولقاندندا کاریگەری توندی دەبێت، بگرە نەتەوە هاوچەرخەکان جگە لە وێنەیەکی کاریگەرانەی کۆمەڵێکی خوێنەر و خوێنەوار هیچی تر نین، ئەو کۆمەڵەی لە ڕێی هەمان نووسینەوە بوون بە کۆمەڵێك لە دۆست. لەم وەرچەرخانەوە، لە کۆمەڵگای ئەدەبییەوە بۆ کۆمەڵگای سیاسی، کۆمەڵگای سەردەم دوو خەسڵەتی سەرەکی خۆی بە بەردەوامی لەگەڵ خۆیدا هێناوە، یەکێکیان هیومانیزمی چەکداری و سەربازی ئەوی تریان هیومانیزمی خوێندەواری. جارێك دەبێت گەنجان لە تەمەنێکدا خزمەتی ئیلزامی سوپایی بەجێبهێنن و جارێکیش پرۆسەی خوێندن، کە پرۆسەیەکی ئامۆزشی و پەروەردەیی رۆحییە بەجێبهێنن. لای ناپلیۆنیش دەبوو هەموو سەربازێك خوێندەوار بووایە. بەمەش هیومانیزم بەرگی دڕندایەتی لەبەر مرۆڤ دادڕی و بەبەرگی ماڵیبوون و دەستەمۆیی و رامکراوی پەروەردەییەوە بەرگپۆشی کرد. لێرەدا هیومانیزم بریتی بووە لەوەی مرۆڤ لە بەربەریەت دەرباز بکات، لەڕووی ڕۆحیەوە ڕۆشنی بکاتەوەو لە ڕووی جەستەییشەوە بەهێزی بکات.

وەك زلۆتەردایك دەڵێت: "تێزی پەنهانی هیومانیزم بریتییە لە داماڵینی دڕندەیی مرۆڤ، ئەم تێزە پەنهانەش پێمان دەڵێت، کە خوێندەواری دروست، مرۆڤی دەستەمۆکراو دروست دەکات". (چەند ڕێسایەك بۆ باخی مرۆڤ ل ١٧).

بە دیوێکی تریشدا هیومانیزم کوشتاری بەردەوامی ئەو مرۆڤانەمان دەخاتەوە بیر کە وەك ئەڵقەیەك لە نێوان ڕەوتی دڕندایەتی مرۆڤ و لە نێوان دەستەمۆیی و سازەندەیی مرۆڤدا هەن. لەم دوو ڕەوتەوە مرۆڤ وەك گیانەوەرێك کە لە ژێر

کارتێکردنەکانـەوە سـەردەردەهێنێت، دەناسـرێت. واتە لەژێر کارتێکردنی خوێندندا مرۆڤی دەستەمۆ و سازمەند سـەردەردەهێنێت، وە خوێنـدن و نووسـین وەك پرۆسـەی سـەرەتایی گەیانـدن سـتراتیژێکی سـەرەکین لەبـەردەم خسـتنەگەڕی تواناکـانی تـری مرۆڤدا. تاوەکو "خوێندن" و "نووسین" نەبێت مرۆڤ توانای بەکاربردنی چ توانست و هێزێکی تـری خـۆی نییـە. لـە کردەی خوێنـدنـدا مـرۆڤ ڕام دەکرێـت، ساز دەکرێـت، فێردەکرێـت، سـەرەتاکانی هیومـانیزمیش لـەم کانییـەوە هـەڵقوولاون. ئـەم کانیـاوەش لـە زەوی گریکەوە هەڵقولاوەو بە کۆماری ڕۆمـدا ڕێ دەکات و لە حەوزی ئەوروپای خۆرئاوادا کۆدەبێتـەوەو دواتر دەڕژێتەوە ئۆقیانووسی ئەمریکاوە.

بـەڵام ئـەمڕۆ چـیدی "نووسـین" تاکـە هۆکـاری گەیانـدن نیـە، ئـەمڕۆ کۆمـەڵگای جـەماوەری لەسـەر بنەمایـەکی تـری کۆمیونیکاسـیۆن خـۆی دامەزرانـدووە، ئەمڕۆ کۆمیونیکاسیۆنی ئەلـەکترۆنی کۆتایی بە کەلتوری نووسین هێناوە.

لای هایدیگـەریش زانیمـان کـەوا تراژیـدیای سەردەم لە نێوان سێ جۆری چالاك لـە توندوتیـژی و زەبری ئەنترۆپۆ – سەنتەری (مرۆڤناوەندخوازی) کە بـریتین لـە بۆلشـەویزم، فاشـیزم وە ئـەمریکانیزم، بەرجەسـتە دەبێـت. لـە راسـتیدا فاشـیزم بریتیـە لـەو هێـزەی ڕێ بـۆ میتافیزیـك خـۆش دەکـات، لـە دیـدی ئـەودا فاشـیزم ئاوێتەیەکـە لـە هیومـانیزم و دڕندەگەرایی، ئەم پارادۆکسەش پێکهاتووە لە هێزی "ڕێگـرتن" وە هێـزی "هانـدان" وەك زلۆتـەردایك ناوی دەنێت.

ئـەمریکانیزمیش جۆرێکـە لـە زەبروزەنگێکـی ئەنترۆسـەنتەریزمی[٧]. لێـرەوە دەبیـنین هیومـانیزم لەبەردەم پەیامەکەی خۆیدا کە بریتییە لـە راهێنـان و سـازاندنی مرۆیـی، بـۆ هەمیشـە بـە دڵسـۆزی نامێنێتەوە. بەڵکو ئـەو دەبێتـە بەشدارێکی سـەرەکی لـە خولقێنـەری ڕەوتـی توندوتیـژی مرۆیـی. بەشدارێکی گەورە و بنەڕەتی لە خۆچەککردنی مـرۆڤ بە چەکی "خودگـەرایی – زوبیـەکتیتێت". لێـرەوە چ هایدیگەر و چ زلۆتـەردایك شکسـتی هیومـانیزم، وەك خوێنـدنگای رامکردنـی مـرۆڤ، دیـاری دەکـەن. بـەڵام گـەر هیومـانیزم وەك خوێنـدنگای رامکردنـی مرۆیـی شکسـتی هێنابێـت ئیـدی چ شـتێکی دی دەتوانێـت مرۆڤ دەستەمۆ بکات؟ ئیدی چی مـرۆڤ رادەهێنێـت و ماڵی دەکات گەر ئەو هەموو هەولانەی تاوەکو ئێستا بـۆ سـازاندنی مرۆیـی دابێتـی بـەرەو پـاوانکردنی بوونەوەرەکانی دی، بەرەو جـۆرێکی تـری بەربـەرێتی بردبێت؟ چی مرۆڤ رام دەکات گـەر هـەموو ئـەزموونی مرۆڤایەتی بـۆ پـەروەردەکردن و چاککردنی ڕەگـەزی مرۆیـی هێشـتا میتافیزیـك و خودگـەرایی بالادەست بێت بەسەریەوە؟ پەروەردەکەر کێ و لە پێناوی چیدا پـەروەردە دەکـات؟ لێـرەوە پێدەچـێت چـیدی هیومانیزمی باو کۆتایی پێ بێت و ئیدی شـێوازێکی دی لە هیومانیزم بێتە ئاراوە، شێوازێك کە لە زانست و بەتایبـەت زانسـتی بۆمـاوەو جینتـەکنیك کـەناڵی سـەرەکی چـوونە نـاوەوەی ئـەو هیومانیزمـە ئایندەییەیە. جینتەکنیك دەشێت ببێتە دەروازەیەکی گـرنگ و پێویسـت لەبـەردەم ناسـینی مـرۆڤ و ئەنترۆپۆلۆژیـدا. چیدی دەبێـت فەلسـەفەش واز لـەو تەوقە ئاسنینە بهێنێت کە لە گەردنی خۆی کـردووە، تەوقی مۆرال و پەیوەندی بە تەکنیك و زانستەوە. بە پێچـەوانەوە فەلسـەفەش پێویسـتە هاوکـار بێـت لـەو شۆڕشـە جینەتیکییـە، بۆ ناسـینی زیـاتری پەیکـەری مرۆیی، بۆ چاککردنی زیاتری ڕەگەزی مرۆیـی. ئەمـە پـەیامی سـەرەکی زلۆتەردایکـە، کاتێـك کۆدێکسـی ئەنترۆپۆتـەکنیك، دادەڕێـژێت بـەو مانایـە دێـت کـە تـەکنیك و جینتـەکنیك ئیـدی باشـترین کلیلـی دەرگـا

کلۆمدراوەکـەی مـرۆڤ دروسـتکردنە. واتـە لـەبری ئـەوەی کـە ئـەنترۆپۆلۆژی بـاو تـەنیا لێکدانـەوەی ماهیەتی مرۆڤی کردووە، ئیدی پۆست هیومانیزم لە ڕێی جینتەکنیکەوە خودی مرۆڤیش دەگۆڕێت.

لـەدایکبوون لـەرووی بیۆلۆگییـەوە، واتـە هاتنـە ناوجیهان، میتافیزیکیشـی تـاوەکو ئێسـتا لـەم دیـدە بیۆلۆگییـە گیانداریـیـەوە تەماشـای هـەبووی مرۆیـی کـردووە، هـەر لەمەشـەوە شۆڕشـی ئـەنترۆپۆجینی سەریهەڵداوە. لە کاتێکدا "هاتنە جیهان" بریتییـە لـە خۆخسـتنەدەرەوە *Ex-sistenz* کـە هایدیگـەر رانـانی کردووە و لێوەی رەخنەی لە گشت ئەنترۆپۆلۆگیاکان گرتووە و دواتریش خەسڵەتی ئۆنتۆلۆژی بە دازاین بەخشـیوە. واتـە مـرۆڤ ئـەو بوونەوەرەیـە کـە لـە گیانـــەوەربوونی خـــۆی تێدەپـــەڕێت و، بـــەم تێپەڕاندنـــەش خەســـڵەتی گیانـــەوەری خـــۆی بەجێـدەهێڵێت و مانایـەکی ئۆنتۆلـۆگی بـە خـۆی و جیهانەکەی دەدا. کە هاتیشە جیهان مانای وایە ئەو هـەڵگری کـردار و جووڵەیـە بـەرەو دەرەوە و بـەرەو جیهـــان. مـــرۆڤ دروســـت ئـــەو پێناســـە بەناوبانگـەی نیچــەیە کــە دەڵێــت، گیانــەوەرێکی نەچەسـپیوە. یـان وەك زلۆتـەردایك دەڵێـت: مـرۆڤ بووەتـە ئـەو لـەدایکبووەی کـە لـە شـیرەخۆرییەوە جیهانخۆری سازکردووە[٨].

## جینتەکنیك و پۆست هیومانیزم

ئەگـەر سـەردەمی نوێ وە بـە دروستی سـەدەی ٢٠، لە رووی نوێکارییەوە، سەدەی فیزیك بێت، ئەوا لە دوا بەرەنجامەکانی بیری زانستی و فەلسـەفی ئەم سەدەیەوە بۆمبی ئەتۆمی دەرەنجام دەکرێت. بـەڵام بـەپێی ئەو ئاسۆ سـەرەتاییانەی لـە کۆتـایی سـەدەی بیستەوە دەرکەوتن، دەشێت سـەدەی ٢١ بـە سـەدەی بیۆلۆگی و جینتەکنیك دابنرێت و نوێکاری لە بواری زانستیشـدا لـە ئەنـدازەی بۆماوەزانیـدا وێنـەکانی خۆی بڕەنگێنێت و لەپاش تاقیکردنەوەی پیتاندنی رووەکـی و ئاژەڵییـەوە ئیـدی لـە پێنـاوی چاککردنی سیاسەتی چەشنی مرۆییدا، پیتاندنی مرۆڤ باڵاترین دەرەنجامی ئەو شۆڕشە زانسـتییەی خۆرئاوا بێت. ئەگەرچـی زینـدەوەرزانی بـەر لـە ١٥٠ سـاڵ شۆڕشـی خـۆی بـەرپاکرد و لـە زانسـتی توێکارییـەوە بـەرەو بیۆتـەکنیك – زیندەتـەکنیك رەوتـی کـرد. بـە تایبـەت کاتێك واتسۆن و کریك بنەماکانی بۆماوەیی *DNA* ی سروشتی یان لە ڕێی مرۆڤەوە دۆزیەوە، ئیدی لـەوێ سـاتەوە ئاسـۆی نوێکـاری لەبـەردەم بیۆتەکنیکـدا والاتر بووە، هەر لە بۆماوەیی رووەکی و ئاژەڵییـەوە تـا دەگاتــە بۆمــاوەی مرۆیـــی. ئــەم دەرەنجامــە فونداMێنتالــەی شۆڕشـــی بیۆتـــەکنیك، بووەتـــە زانسـتێکی شـیاو لـە تێگەیشتن و لـە گـۆڕانی خـودی مرۆڤ خۆی، بەڕادەیـەك بووەتـە کێڵگەیـەکی سـەیر لـە پێشـدەم بیرۆکـە ئەنترۆپۆلۆژیەکانـداو جـۆرە فـۆرم و هاوکێشـەیەکی نـوێی بـەرپاکردووە لـە پەیوەنـدی زانســـت بـــە فەلســـەفەوە، لـــە ئاشـــتکردنەوەی سورشتناس و بیریاران لەگەڵ یەکدیدا.

ئـەوەی ئیدیۆلۆگییـە رادیکـاڵ و تۆتالیتێرەکـان پێیان نەکرا بـۆ بەرهـەمهێنانی مرۆیـەکی گوێڕایـەڵ و دەسـتەمۆ، ئـەمڕۆ دەشـێت بیۆتەکنـەلۆگی توانسـتی سازدان و رامکردنی مرۆڤـی لـەو جـۆرەی لـە هـەناوی خۆیـدا هـەڵگرتبێت. چـاندن و پیتانـدنی خانـەکان و دروسـتکردنی مرۆڤـی کلـۆن *Klon* لـە میتۆدەکـانی زانســـتێکی نـــوێی وەك جینتەکنیکدایـــە. ئیـــدی دیـاریکردنی مـرۆڤ بـەپێی رەچـەتەیەکی دیـاریکراو دەبێت، چۆن بخوازرێت ئاوەها مرۆڤ دروستدەکەن، لەسـەر پسـوولەکانیش هەمیشـە داوای چەشـنێکی باڵاو سەرکەوتوو، زیرەك، جوان، ئازاو پاك دەکرێت، جینتـەکنیك هەڵدەسـتێت بـەم کردەیـە. دیـارە لێـرە

خەسڵەتەکانی مرۆڤیش دەستکاری دەکرێن، یاخود دروستتر بڵێین، پێشتر دادەنرێن، بەمەش کێڵگەیەکی تری گەلێك جیاواز لەبەردەم مرۆناسیدا پەیدا دەبێت، کە ئەرکی نوێی بریتی دەبێت لە بەهەند وەرگرتنی ئەم شۆڕشەو بگرە بەشداریش بێت لەچاودێریکردنی ئەو گۆڕانکاریانە. ئەم گوتارەی زلۆتەردایك هەوڵێکە لەو بوارەدا، بە مەبەستی قووڵبوونەوەی پتر لە جینتەکنیك و بەکارهێنانی ئەم دیاردە نوێیە بۆ زیاتر چاککردنی ڕەگەزی مرۆیی. ئەم شۆڕشە چیدی بواری ڕێلێگرتنی نەماوە ئیدی ئەرکی فەیلەسوفان و زاناکانە کە کۆنترۆڵی ئاراستە چاکخوازیەکەی بکەن و ڕێگریش بن لە سەرهەڵدانی ڕووە بەدکارەکانی. ئەو شۆڕشە بە مەبەستی چاککردنی رەگەزی مرۆییەو زیاتر رازاندنەوەی باخی مرۆڤە(٩).

ئەو گوتارە سەرباری باسکردنی ماهیەتی مرۆیی و فۆرمەکانی پەروەردەکردنی مرۆڤ، مەسەلەی جینتەکنیك و بۆماوەو پیتاندن وەکو ڕوویەکی هەنووکەیی گوتارەکە دەردەکەون. ئەگەرچی وتووێژ سەبارەت جین شتێکی نوێ نییە، بەڵام لە بواری فەلسەفەدا و خۆتەرخانکردنی فەلسەفە بۆ ئەم بوارە شتێکی نوێیە، ئەمە بە چاوپۆشین لەوەی کە گوتاری – باغی مرۆڤ – تەنیا ناڕاستەوخۆ سەبارەت جینتەکنیك دواوە، کەچی هێشتا هەر دەکرێت ڕەهەندێکی بیۆتەکنیکی لە پشتەوەی ئەم گوتارەوە ببینینەوە، بەتایبەت سەبارەت دۆخی ئەمڕۆ کە دامەزراوە زانستی و ئەکادیمیەکان سەرگەرمی دێباتەی کۆپیکردنی مرۆڤن، ئەگەرچی هەندێك دامەزراوی ئایینی و سیاسی و ئەکادیمی بەرپەرچی تەواوی ئەم دیاردەیە دەدەنەوە، بەڵام هێزی دێباتەکە توندترە لە هێزی بەرپەرچدانەوەکە، بۆیە گومان لە بەدیهاتنی ئەم پرۆسەیە نییە. لە مێژووی زانستیدا گەلێك لەو دۆزینەوە زانستیانە هەر لە گالیلیەوە بیگرە تا بۆمبای ئەتۆمی لە سەردەمی خۆیاندا بەرپەرچ دراونەتەوە، بەڵام دواتر دەبینین ئەو کۆمەڵگایانە بۆمبای ئەتۆمی بەرهەم دەهێنن کە لە پلەیەکی گەلێك نزمی تێگەیشتنن لەسەر فیزیك و کیمیك و ماتماتیك و گەلێك شتی تریش لە هیندستان و پاکستان و ئێران و گەلێك وڵاتی شێتی تریش ئەتۆم بەرهەم دەهێنرێت. سەرەتا هەموو ئەو دۆخە نوێیانە زۆر فوندامێنتالانە بەرپەرچ دەدرێنەوە، هەمووشی لەبەرخاتری هیومانیزم. بەڵام خودی ئەم وەهمە و بەتایبەت وەهمی خودگەرایی هانی ئەو حکومەتە شێتانە دەدات کە هەستن بە کاری شێتانەی لەو جۆرە. کێشەیەکی لەم جۆرە زلۆتەردایك دروست پێی دەڵێت "گێچەڵی باڵا".

ئێستا ئێمە بۆنی هەواڵێکی میتافیزیکی نوێ دەکەین، دەبینین دێباتەیەکی نوێی میتافیزیك هاتووەتە ئاراوە. لەپاش دروستکردنی بەرخی "دۆلی" ئیدی هەموو شتەکان ئاماژەی هاتنە ئاراوەی "مرۆڤی دەستکرد" دەکەن، ئیدی مرۆڤی کلۆن *Klon-mensch* دەبێتە یەکەمین مرۆڤ لە دوای مەسیحەوە کە "یەزدان" ئەفرێنەری نییە، بەڵکو خودی مرۆڤ ئەفرێنەرێتی.. ئیدی مرۆڤی مرۆڤ دەئەفرێنرێت. واتە مرۆڤێك نا کە وەکو ئەزموونی "ئادەم" دروست بکرێت، بەڵکو مرۆڤێکی لە مرۆڤ دروستکراو دەبێت، لەبەرئەوەی مرۆڤ شیاوی نەشتەرگەرییە *Operable*. واتە هەروەك چۆن ئەو مەڕەی دۆلی لە کلۆنەوە دروستکرا چیدی مەڕێك نیە لەلایەن مەڕێکەوە لەدایك بووبێت، بەڵکو مەڕێکە لە جینەکانی مەڕێکی ترەوە دروستکراوە، بەم پێیەش ئیدی دایك نازێت و ئەو مرۆڤەشی لە کلۆندا دروست دەکرێت چیدی لەدایکبووی مرۆڤ نابێت،

لێرەوە یەکێك لەو مەترسییانەی کلۆن لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێت هەڕەشەی سڕینەوەی دایکایەتی دەبێت.

ئیدی ئەو ئەرکەی تاوەکو ئێستا لەناو لۆگیکی جینالۆگیدا هەبووە بەجۆرێکی تەواو جیاوازتر دەکەوێتەوە. بەم مانایەش زلۆتەردایك دوورابیەکی فەلسەفی ئایینی بە دۆخی گەشەکردنی هەنووکە دەبەخشێت. دیارە ئەمەش جۆرە بیرکردنەوەیەکی دروستە چونکە ئێمە ئەمڕۆ لە کایەیەکدا دەژین کە لە سەردەمی پلاتۆنەوە بە "ململانێی زل" ناسراوە، ململانێی نێوان ڕۆح و ماشینە یاخود وەك زلۆتەردایك ناویدەنێت بە ململانێی نێوان زوبیەکتیڤ و ماشینیزمی بالاّ. ڕووپێوکردنی ئەو سنوورەش دەکەوێتە نێوان ئەم دووانە لێکدژەی کە بریتیە لە ئاکامێك لە ئاکامەکانی ڕۆشنگەری سۆسیۆلۆگی و سیکۆلۆگی و زانستی سروشتی مۆدێرن. لەم ململانێیەشدا ماشینیزم کەرتێکی زۆر گەورەتری لەچاو زوبیەکتی ترادیسیۆنیدا بەدەستهێناوە. ئەمە کرۆکی کاروانی بیرکردنەوەی خۆرئاوایە، بەرەنجامی ئەو هیومانیزمەیە کە مێژووی ٢٥ سەدەی لەو ململانێیەدا بەسەربردووە. مێژوویەك کە خۆی بە ڕابەر و ڕێنیشاندەری تەواوی کولتورەکانی تر دادەنێت، مێژوویەك کە پێی وایە لەلایەن تەواوی کولتورەکانی ترەوە لاسایی دەکرێتەوە. هیومانیزم بریتییە لەم توندڕەوی و فوندامێنتالییەی کولتوری خۆرئاوا، بریتییە لە ئاینی سیاسیانەی ئەم کۆمەڵگا بەجیهانیبووە، ئەم کۆمەڵگایەی کە خۆی زۆر بە چاك و بە جوان و بە چەق دادەنێت. کەچی لە بواری پیادەکردنی ئەم ئێدێیانەدا گەلێك پارادۆکس و ناکۆکی دەبینرێتەوە. هەر بۆیە مەسەلەی "ئیتیك – ئاکار" هیچ کات لەناو مێژووی بیری خۆرئاوادا تەباو وێڕا نەهاتۆتە پێش.

خۆرئاوا ئەرستۆکراتییانە بیر لە هیومانیزم دەکاتەوە، بەلاّم گەلێك دڕندانە "مامەڵە" و "ڕەفتار"ی پێدەکەن.

لە پەیوەندی دژیاریانەی نێوان "ئیتیك/ تەکنیك" لە خۆرئاوادا هیچ کات هاوشان بەیەکتری ڕەوتیان نەکردووە، بەڵکو هەمیشە تەکنیك زاڵتر بووە بەسەر ڕووبەری ئیتیکدا، خۆرئاوا هەمیشە ویستوویەتی وەك شوانە چاکەکان چاکخواز بێت، بەلاّم زۆر چاکیش وەك شوانە بەدەکان بژی، ئەم دووالیزمەش ئاماژە بەوە دەدەن کەوا هەموو دێباتەکانی ئەمڕۆ لەسەر "ئیتیك" دەنگ و ئاوازێکی هەڵەیان هەیە، لەبەرئەوەی هەر وەك بیری کلاسیکی هێشتا بەندی پێوانە کلاسیکیەکانی ئاکارن، هێشتا "ئیتیك" لە بیری مۆدێرندا نەیتوانیوە فۆرمێکی نوێ بدۆزێتەوە کە بەرەو دێباتەیەکی ئایندەییانەی ئەنترۆپۆلۆگی ڕەوت بکات، بیرکردنەوەی مۆدێرنەش هێشتا لە "ئاکاردا" تەنیا پێوانەی "باوەڕ" و "بەها" بەکاردەهێنێت کە ئەم دوو پێوانەیەش جگە لە سروشت و ریتوالی بێ بیرکردنەوەیی لە لۆگیکێکی تری ئیتیك چیتر ناگەیەنێت. لە ڕاستیدا دێباتەی ئیتیك یا ئەوەتا تەواو شتێکی پووچ و بێ مانایە یان ئەوەتا شتێکی تەواو قورسە، وە لە نێوان ئەم دووانەدا خاڵێکی ناوەند نییە. ئەوەشی ئێستا لە فەزای ئەم دێباتەیەدا بالاّدەستە پووچێتێکییە (وەك زلۆتەردایك دەیبینێت) بۆیە ئەو پاشەکشە لەو دێباتەیە دەکات و لە پرۆژە گەورەکەیدا لە سێینە کتێبی "کایە" هەوڵی ئیتیکێکی ئایندەیی نوێی داوە. لە جوانترین پێناسی ئەو ناکۆکییەی بیری خۆرئاوادا زلۆتەردایك دەڵێت: "قەیرانی ئیتیکییانەی مۆدێرنە لەوەدایە کە وەك ڕووەکخۆر بیردەکەنەوە و وەك گۆشتخۆر دەژین".

بەشێکی گوتاری "باغی مرۆڤ" تەرخانە بۆ باسکردنی گواستنەوەی هیومانیزم لە کۆمەڵگای ئەدەبییەوە بەرەو کۆمەڵگای سیاسی. ڕاگەیاندنی کۆتایی هاتنی هیومانیزمی خوێندەوار و چەکدار، ئەو هیومانیزمەی کە تیایدا "زمان – نووسین" تاکە میدیۆمی گەیاندن و پەیوەندی بوو چیدی بەسەرچوو، وە ئیدی میدیا نوێکان، رادیۆ، تەلەفزیۆن وە ئینتەرنێت کۆتاییان بە "نووسین" هێناوە، یان دروستتر بڵێین "نووسین" بە پەراوێز و مارگینال بووە. لێرەوە ئەو گوتارە دەخوازێت سەبارەت کۆمەڵگایەکی پۆست لیتەراری (ئەدەبی) قسە بکات، کە ئەمەش بانگهێشتێکە بۆ دەستپێکی پۆست هیومانیزم، چونکە هیومانیزم وەك مۆدێلی پەروەردەکردن لە ڕێی "نووسین"ەوە مێژووی خۆی بەسەربرد.

سەبارەتیش بە پرۆگرامی جینتەکنیك لەو گوتارەدا دەبینین وا باس دەکرێت کە جینتەکنیك ڕووبەری نوێ لەبەردەم مرۆڤناسی و ئەنترۆپۆلۆگیدا دەدۆزێتەوەو هیومانیزمێکی نوێ ڕادەگەیەنێت.

کەواتە ئێستا لەبەردەم ئاوێنەی جینتەکنیکدا دەبێت وێنەی مرۆڤی ئایندە چۆن بەرجەستە بکرێت، گەر مرۆڤ لە ڕێی کردەی جینتەکنیکەوە تەماشای وێنەی ئایندەی خۆی بکات ئایا چۆن دەردەکەوێت؟

لەپاڵ ئەوەدا کە جینتەکنیك جۆرێکی نوێی ئەنترۆپۆلۆگی لێ دەکەوێتەوە، ئەو کردارە نەشتەرگەریە پزیشکیانەشی وەك نەشتەرگەری دڵ و گورچیلە و سی و ئەندامەکانی تری لەش و نەشتەرگەریە جوانکاریەکان، کۆی ئەم نەشتەرگەریانەش گەر بە بونیاد گۆڕینێکی ئەنترۆپۆلۆگیانە دابنرێن، ئەوا بە دیوێکدا بریتییە لە جۆرێك لە خۆکۆڵۆنیکردن و خۆزەوتکردن و خۆناموکردنێکی سامناك و، بە دیوێکی تریشدا بریتیە لە دەرفەتی درێژکردنەوەی ژیان بەسەر ئەو سنوورە سروشتیەی لەمەوبەر مرۆڤ هەیبووە، مرۆڤی مۆدێرنیش لە ڕێی گومڕاییەکانیەوە تووشی پەتای تەمەن درێژی بووە، زانستی پزیشکی و بایەخدانی مرۆڤی هاوچەرخ لە کۆمەڵگا خۆشنوودەکاندا لە ڕادەبەدەر بە "تەندروستی" وایان لە مرۆڤ کردووە خەون بەوەوە ببینن تەمەنی "ئەیوب" یان هەبێت[10]. سەبارەت تێگەیشتنیش لەم دوودیوەی جینتەکنیك و پەیوەندی بە ئەنترۆوە زلۆتەردایك کۆدێکسی ئەنترۆپۆتەکنیك دادەڕێژێت، کە چەمکێکی بنەڕەتی گوتارەکەی زلۆتەردایکە و لە بەرئەنجامی شکستی ئەنترۆپۆلۆژیای کلاسیکییەوە هاتووە. هیومانیزمی کلاسیکی لە ئاستی تیۆرو پراکتیکدا ڕاڤەی مرۆڤی کردووە و هەوڵی دروستکردن و پەروەردەکردنی مرۆڤی داوە، کە بە ئاستێکدا توانیویەتی مرۆیەکی "خوێندەوار" دەستەمۆ بکات و بە ئاستەکەی تردا لە رووی جەستەییەوە مرۆڤێکی "جەنگاوەر" دروست بکات. بەڵام ئەو کۆدێکسەی زلۆتەردایك مانای ئەو هیومانیزمە ئەرخاییە "دێرینە" دەگۆڕێت و لە رێی تەکنیکی "دەستەمۆکردن" و "چاندن"ەوە مرۆیەکی چاك و پاك دروست بکرێت. ئەنترۆپۆتەکنیك پێمان دەڵێت" هیومانیزم تەنیا دۆستایەتی لە نێوان مرۆگەلدا ناسازێنێت، وە مرۆڤ هەر بریتی نییە لە پەروەردەکەر و راهێنەر و بەخێوکەری مرۆڤ، بەڵکو هیومانیزم لە ناوخۆیدا هەڵگری ئەو خەسڵەتەیە کەوا مرۆڤ لە هەموو کاتێکدا بریتی بووە لە توندوتیژیەکی بەرزیش بۆ خودی مرۆڤ خۆی. "چەند ڕێسایەك بۆ باخی مرۆڤ. ل٤٥".

یەکێکیش لەو ڕەخنانەی لە گوتاری "باخی مرۆڤ" گیرا، بریتی بوو لەوەی گوایا زلۆتەردایك

بانگەشە بۆ جۆرێك لە چاندنی مرۆیی دەکات لەبری رامکردن و دەستەمۆکردنی مرۆیی، بەو پێیەی چیدی لە سەردەمی ئینفۆرماتیکدا مرۆڤ دەستەمۆ ناکرێت. لە کاتێکدا تەوەری باسەکە لای زلۆتەردایك ئەم تێگەیشتنە هەڵناگرێت، بەڵکو بە پێچەوانەشەوە ئەو نکوڵی لەوە دەکات کە نەخشەیەکی لەو جۆرەی نیاز بێت، بەڵکو گەر دەقەکەی ئەو بە وردی و قووڵییەکی فیکری بخوێنرێتەوە ئەوا نیاز و مەبەستێکی تەواو جیاوازتری هەیە، مەسەلەکە لای ئەو، وەك فەیلەسوفی بەرلینی "تۆماس ماخۆ" رونی کردۆتەوە، بریتیە لەوەی کێلگەی ئەنترۆپۆتەکنیك بە کراوەیی رابگیرێت و بخرێتە ژێر پرسیاری ئەوەی، مرۆڤ بەکام مەرجانەو بەکام پێوەرانە هەیە. واتە ئەگەر ئێمە بڵێین مرۆڤ بریتییە لە ئەفرێنراوێك، ئەوا دەستبەجێ لەبەردەمماندا ئەو وەڵامە ئەرخاییە قووت دەبێتەوە، گوایا مرۆڤ ئەفرێنراوێکی خوداییە. بەڵام ئەنترۆپۆتەکنیك چیدی ئەم وەڵامە قبوڵ ناکات، بۆیە ئەو دەپرسێت مرۆڤ لەچییەوە و لە کوێوە بەرهەم دەهێنرێت؟ لێرەوە زلۆتەردایك لەپاش گوتاری "باغی مرۆڤ" چەند وانەیەك لە پەیمانگای گوێتە سەبارەت ڕوونکردنەوەی زیاتری ئەو کۆدێکسە دەدات و لەژێر ناونیشانی "خانووی شووشەیی مرۆڤ"دا باس لەوە دەکات کە چۆن هیومانیزم هێشتا سەبارەت چەمکی "گەشەسەندن" ساویلکانە بیردەکاتەوە و تاوەکو هەنووکەش مانایەکی تەواوی "گەشەسەندن"ی نەکردووە و هەردەم لە پشتەوەی ئەم وشەیەوە، خودایەك، وەکو ئیستعارە و مەجاز، ئامادەیە. لێرەوە زلۆتەردایك دروست لە ڕێی ئەنترۆپۆتەکنیکەوە "تەکنیکی مرۆڤناسی" دەخوازێت بپرسێت "بەڕاستی مرۆڤ چی بەسەرهاتووە؟".

ئەنترۆپۆتەکنیك وەکو گوزارەیەك ئەو ڕەفتارانە دەگرێتەوە کە کاریگەریان بەسەر مرۆڤ پەروەردەکردنەوە هەیە. هەر لە پەروەردەکردنی خێزانی و خوێندنگایی و کۆمەڵگاییەوە تاوەکو دەگاتە "مەشق" و "راهێنان" پێکردنە سەربازییەکان. لێرەوە زلۆتەردایك پێی وایە مرۆڤ دروستکردن لە سەردەمانی زووەوە لە ئارادا بووە و دواتریش لە سەرەتاکانی سەردەمی رۆشنگەریدا دروستکردنی بیۆلۆگییانەی مرۆڤ سەریهەڵداوە، هەر زوو دیکارت پێی وابوو دەبێت "مرۆڤ ببێتە ئاغا و گەورەی سروشت" تاوەکو مرۆڤ لەو ژمارە بێشوومارەیەی نەخۆشیەکانی ڕزگار بکرێت، بۆیە پرۆژەی شێوەگۆڕینی بیۆلۆگییانەی مرۆڤ بریتی نییە لە دارمانی ڕۆشنگەری هێندەی بریتییە لە درێژەپێدان و تەواو پڕبوونی رۆشنگەری. بۆیە زلۆتەردایك دێت و ئەنترۆپۆتەکنیك پابەند دەکاتەوە بە جینتەکنیك و پێی وایە جینتەکنیك بریتیە لە پلەی داهاتووی ئەنترۆپۆتەکنیك. بەمەش ئێمە دەکەوینە ناو قۆناغێکەوە کە تێیدا دووبارە لەگەڵ ئامرازەکانی بیۆلۆگی مۆدێرندا گرێدەدرێینەوە بە تەکنیکە "ڕەقەکانەوە – *Hardware*"، ئەو تەکنیکانەی لە سەردەمی بەردیندا هەبوون و هەر لەوێشەوە بەرەو گەشەپێدان و کرانەوەی پەیکەری مرۆڤ ڕەوتیان کرد*. واتە لە کاتێکدا مرۆڤ ئەوسا لەشی خۆی بێ ئاگایانەو بێ بەرنامانە دەگۆڕی، ئەمڕۆ دەبینین بە کەرەسەی نوێ جینتەکنیك دەشێت بەو کارە هەڵبستێت و بە ئاگاییشەوە بچێتە ناو "بۆماوە"کانی مرۆڤەوە. واتە سەبارەت جینتەکنیك دەبێت فەلسەفیانە بیربکەینەوە، تاوەکو هۆشمەندانە کار بۆ پاراستنی "چەشن"ی و پوختی مرۆیی بکرێت. ئەمەش ڕەنگە خاڵێکی سەرەکی دەقەکە بێت.

ئەگەرچی زۆربەی ڕەخنەگران وەها تێگەیشتن، زلۆتەردایك دەخوازێت لە ڕێی چوونە "ناو" "بۆماوە"كانەوە مرۆڤ بپیتێنێت. ئەمەش بەدحاڵیبوونێكی ساردی ئەو جۆرە بیركردنەوانە بوو كە هێشتا سەبارەت هیومانیزم ئەرخاییانەی بیردەكەنە. زلۆتەردایك لە وتوێژێكیشدا ئەوە ڕادەگەیەنێت كە ئەو هەرگیز پلێدۆیە و بانگەشە بۆ ئەوە ناكات بە یارمەتی جینتەكنیك مرۆڤ بپیتێنرێت و بڕوێنرێت. لە كاتێكدا ئەو دەخوازێت لەگەڵ گەشەكردنی جینتەكنیكدا پرسی ئەنترۆپۆلۆگیش هاوتا بەو كاریگەر و چالاك بێت، نەك بە كزی لە ژوورە تەنگەبەرەكانی مێژوودا ڕۆنیشێت. جگە لەوە ئێمە نابێت لەوە خۆمان غافڵ كەین كەوا ئەوەی مەترسی دەهێنێت تەكنیك نیە، وەك هایدیگەر پێمان دەڵێت، بەڵكو ئەو هێزەی هەڕەشەئامێزانەیە كە لەناو ماهیەتی مرۆڤ خۆیدا هەیە.

لەڕاستیشدا زلۆتەردایك خۆی ڕەخنە لە ڕۆشنگەری دەگرێت كە لە پرۆژەی پەروەردەكردندا شكستی هێناوەو ئەم شكستیەش بە پڕی لە جەنگی دووەمی جیهانیدا تەواو دەبێت. كاتێك ئێمە دەركمان بەوەكرد كە دیكتاتۆرەكانی پەروەردەكردن هەموویان لەلایەن پلاتۆنەوە نەخشەیان كێشراوە و بیرۆكەی "هەڵبژاردەیی و پوختەكاری *Selektion*"كە لە ئەكادیمیاكەی پلاتۆنەوە درێژ دەبێتەوە تاوەكو ڕایشەكەی هیتلەر ئاماژەیەكە لەسەر ئەوەی كەوا بیرۆكەی "مرۆڤچاندن" بیرۆكەیەك بوو نازیزم دایڕشتبوو. بەڵام ئەو ڕۆشنگەریەی لە دوای ١٩٤٥ەوە لەدایك دەبێتەوە مێژووی بەر لە خۆی دەخاتەوە بەر ڕەخنە و ئەو هەڵانەشی كە لە بیرۆكەی "پێشكەوتن"ی تەكنەلۆگییەوە كەوتنەوە دەخاتە ڕوو، ئەم ڕۆشنگەرییە بریتییە لە تێپەڕاندنی ئەو قۆناغە و دەرچوون بەرەو قۆناغێكی نوێ، لێرەوە گوزارەی دوا نوێگەری و پۆست هیومانیزم دێتە ئاراوە.

هەنووكەش لە میانەی پڕۆگرامی جینتەكنیكەوە دێباتەیەكی گەورە نەك هەر لە كایەی زانستدا هەڵگیرساوە، بەڵكو كێڵگەی مۆراڵ و سیاسەت و فەلسەفەشی گرتۆتەوە.

مرۆڤ دروستكردن بە جینتەكنیك جەخت كردنە لەسەر حەتمیەتی بیۆلۆگیانەی مرۆیی و لەسەر ئەوەی ئیدی لە پەیكەری مرۆڤەوە مرۆڤ دروست دەبێت، ئیدی مرۆڤ ئەفرێنەری مرۆڤە. لێرەشەوە جارێكی تر چەمكی "ئەفراندن" دەكەوێتەوە بەر باس و ڕەنگە لە میانەی جینتەكنیكەوە، دەلالەتە ئایینیەكانی خۆی ون بكات. ئەمەش دەبێتە بەگژدا چوونەوەیەكی ڕەهای هەموو تیۆلۆگەكان كە یەزدان تاكە ئەفرێنەرە لایان. دروستی ئەم دێباتەیەش پابەندە بە ئایندەی پرۆگرامی جینتەكنیكەوە.

ئەوەشی –گوتاری باغی مرۆڤ– فێرمان دەكات ئەوەیە كەوا مرۆڤ هەر لە "ناوەوە"دا دەستكاری ناكرێت بەڵكو لە "دەرەوە"شیدا دەستكاری دەكرێت. مرۆڤ هەر بوونەوەرێكی فیزیكی نییە لە سروشتدا بەڵكو بوونەوەرێكی میتافیزیكیشە لە جیهاندا. پابەندیش لە نێوان ئەم دووانەیەدا نیچە لە پەرەگرافێكدا سەلماندوویەتی: "سەبارەت پاڵەوانەكان هەموو شتەكان دەبنە تراژیدی، سەبارەت نیوەیەزدان هەموو شتەكان دەبنە گەمەیەكی ساتیری، بەڵام سەبارەت بە یەزدان، شتەكان دەبنە چی؟ ڕەنگە ببنە (جیهان)؟".

## پەراوێز و سەرچاوەكان

١–ئێمە لە وتارێكی تردا باسمان لەو دووانە لێكدژانە كردووە كە بووەتە كۆدێكسی بناغەیی میتافیزیكی

خۆرئاوا. بڕوانە گۆڤاری "بوون – ژمارە (١) ١٩٩٣" لە "رەخنەی عەقڵی خۆرئاوا – گۆڕانی دووانە لێکدژەکان – بەکر عەلی".

ڕوویەك لە بایەخەکانی ئەو گوتارە بەلای منەوە لەوەدایە کە لە بڕگەکانی کۆتاییدا ئاماژە بەوە دراوە کەوا "وێنەی مرۆڤ" لەناو ڕەوتی ئەو کاروانە درێژەی میتافیزیکدا بە تێپەڕینی بەناو سەرجەم ئەو وەرچەرخانانەدا کە لە هیومانیزمدا بینیوێتی خوێندنەوەی داهاتووی ئەو پرۆژەیە دەبێت. وا نزیکەی دەساڵ بەسەر ئەو گوتارەدا ئەم خوێندنەوەیە خۆی دەسەلمێنێت.

٢–بڕوانە گۆڤاری "کات ژمارە (٣–٤)" وتاری: "تارماییەکانی مرۆڤ لە فەلسەفەدا. بەکر عەلی". هەر لەو وتارەدا ئاماژەمان بەو هیومانیزمە ئایندەییە داوە کە هەوڵی تێپەڕاندنی هیومانیزم و مرۆڤی باو، مرۆڤی سست دەدات و کۆدێکسی "مرۆڤی مرۆڤ" مان داڕشتووە بۆ تێگەیشتن و دیاریکردنی مرۆڤێکی چالاك و دروست، کە ئەم چەمکە لەناو پرۆگرامی جینتەکنیکدا پلانی بۆ دادەڕێژرێت، بێگومان بە پشتبەستن بە بیرکردنەوەی فەلسەفی.

*3-M. Heidegger. Uber den Humanismus. Vittorio Klostermo Frankfort am Main 1949.*

٤–شایانی باسە ئەم گوتارە بۆ یەکەمجار ساڵی ١٩٩٧ لە بازل دراوە، بەلام تا جاری دووەم چ دەنگدانەوەیەکی نەبوو. *P. Sloterdijk. Regeln fur den Menschenpark Suhrkamp 1999*

٥–هەندێك ئەم شەڕەی نێوان زلۆتەردایك و هابەرمازیان چوواند بە شەڕی نێوان شۆپنهاوەر و هیگڵ.

٦–جان پاول "١٨٢٥–١٧٦٣" شاعیرێکی لیریکی ناوداری ئەڵمانییە کە نیچە لەبارەیەوە گوتویەتی: "جان پاوڵ شتی زۆر دەزانی، بەلام زانستی نەبوو، ئەو لە هەموو کایە جۆراوجۆرەکانی هونەر لە بواری هونەر تێدەگەیشت، کەچی ئەو خۆی هونەری نەبوو، بەشێوەیەکی گشتی، ئەو چەپکە گیایەکی توند بەستراو بوو کە شەوانە دەکرا بەسەر ڕەزە نەرمەکانی شیللەر و گوێتەدا، ئەو مرۆڤێکی ئاسوودە و میهرەبان بوو.

جان پاوڵ، وەکو پلاتۆن، دەخوازێت لە شێوەی یەزداندا بێت، کاتێك دەڵێت: "من تەنیا یەك "من" دەناسم، ئەویش خودایە، ئەوانی تر هەموو سەگن".

٧–لە راستیدا فاشیزم جگە لە فۆرمێکی کۆنترۆڵکردنی ئینفۆرماسیۆن چیدی نییە. فاشیزم، وەك زلۆتەردایك دەڵێت، بریتیە لە فۆرمێکی ڤیستیڤاڵ ئامێزانەی بەزەبر بۆ چەپاندنی کۆلێکتیڤی. دەشێت ئێمە ئەمە لە دیمەنی بەعسیزمدا ببینینەوە کاتێك، وەزیری پڕوپاگەندە "محەمەد سەعید سەحاف" ئۆرکسترای ئەم ڤیستیڤاڵەی بەڕێوەدەبرد.

٨–بەپێی میتافیزیك مرۆڤ ئاژەڵێکە لە نێوان ئاژەلانی تردا. بەلام مرۆڤ چیدی ئەم قۆناغە ئاژەڵییە کە زلۆتەردایك بە "بەر مرۆڤ – *Vormensch*" ناوی دەنێت، تێدەپەڕێنێت. قۆناغی "بەر مرۆڤ" لە ڕێی بەکارهێنانی دەستوێژ و ئامراز و کەرەسەی سروشتەوە دەستی بەخۆی کرد. لە ڕێی دروستکردنی ئامڕازی بڕین و پیاکێشانەوە ئیدی "بەر مرۆڤ" دوورایيەکی خستە نێوان خۆی و سروشتەوە. هاوشان لەگەڵ داهێنانی ئەم ئامرازانە، ئەم تەکنیکە سەرەتاییە ڕەقانە، مرۆڤ توانی ئامرازی نەرمیش دابهێنێت وەك "زمان" و "نیشانەو ئاماژەکان". بەمەش تەنیا پانتایی کردەکانی مرۆڤ بەرفراوان نەبوو، بەڵکو مرۆڤ هۆشیاریشی بەرفراوان بوو.

لێرەوەیە مرۆڤی ساپینیس *Homo Sapiens* کە ئاژەڵەکەی ئەوسا بوو پەیدا دەبێت کە هۆگری کولتور و ڕۆشنبیری دەبێت، لەبەرئەوەی بەبێ تەکنیك هیچ شتێك شیاوی مانەوە نەبوو لە ژیاندا. مێژووی تەکنیکیش لە بنەڕەتدا بریتییە لە مێژووی زاڵبوون بەسەر سروشتدا،

کە دەبینین ئەم مێژووە تا ئەمڕۆش هەر بەم لۆگیکە دەبزوێت. چونکە مرۆڤ هەمیشە ئەوەی خواستووە ئەرکی سەرشانی خۆی کەم کاتەوە.

ئاگر مرۆڤی گومڕا کرد ئیدی مرۆڤیش هۆگر و پابەندی بووە. شارستانیەت خۆی بریتییە لە مێژووی ئەم "گومڕاکردنە"، کە ئاگر دۆزرایەوە مرۆڤ ئاگردانی بۆ دروستکرد، کە ئاگردانیشی بۆ دروستکرد پێویستی بە مقاش بوو. لێرەوە چیرۆکی تەکنیك سەریهەڵداوە.

سەبارەت بە مێژووی مرۆڤ و جیهان زلۆتەردایك گەورەترین پرۆژەی فیکری بەئەنجام گەیاندووە، لە پرۆژەی سێینەکتێبی "کایە"دا کە لەچەند هەزار لاپەڕەیەك پێکهاتووە ئەو مێژووە دەنووسێتەوە. هەروەها لە چەند وانەیەکیدا لە پەیمانگای گوێتە کورتەیەکی چڕی ئەو پرۆژەیە و پابەند بە جینتەکنیك یاخود دروستتر بڵێم، ئەنترۆپۆتەکنیك و هۆمۆتەکنیك، کاری بەم چەمکانە کردووە لە کتێبێکدا لە ژێر ناونیشانی "خانووی شووشەیی مرۆڤ"دا بڵاویکردۆتەوە.

*P, Sloterdijk. Das Menschentreibhaus. Weimar 2001*

٩-بەدەر لە زلۆتەدایك گەلێك بیریارو فیلۆسۆفی ناودار لەم کایەیەدا کاردەکەن، دوو ساڵی دوای گوتارەکەی زلۆتەردایك، هابەرماز کتێبێکی لەسەر جین و سروشتی مرۆیی بڵاوکردەوە، پاشان فرانسیس فۆکۆیاما کتێبێکی گەورەی لەسەر ئەم مەسەلەیە دەرکرد کە لەسەر هەمان ڕیتمی کتێبەکەی پێشووی "کۆتایی مێژوو" بوو لەژێر ناونیشانی "کۆتایی مرۆڤ". کە وتوێژی نێوان پرۆگرامی سیاسی و بیری یۆتۆپی و ئەرکە مۆرالییەکان و گەشەی زانستی وروژاندووە.

*Francis Fukayama. Das Ende des Menschen. Berlin 2002.*

١٠-لەم رووەوە دەبینین کۆمەڵگای پۆستمۆدێرن بەرەو کۆمەڵگایەکی دەرمانخوازی *Medikokratisch* دەچێت. کە دەبینین ئەندێشەی تەندروستی و وەهمی بەژن جوانی و تەمەن درێژی بوونەتە ئەلتەرناتیڤی ئایین، هەر لەم ڕۆژگارەدایە ژیاندرێژی بووە بە کەڵکەڵە و بە هەڵبژاردنێکی گشتی و جەماوەری. لای مرۆڤی نوێ زۆر حساب هەیە ناکرێت بە بۆشایی و کراوەیی بمێنێتەوە، ئەگەر نا چونکە بەرەو سەرخانێکی میتافیزیکی تەواو دەچێت. ئەوەشی پزیشکایەتی و میدیتیسن تاوەکو ئێستا بۆ ژیان درێژی کاریگەری هەبووە، زۆر لە ئەرکە میتافیزیکییەکەی ژیانمان دەبات، چونکە چیدی هێندە داواکردنی ژیانی بەدینەهاتووە پێویست نابێت، وەکو لە سەدەی ناوەڕاستدا وابوو، بەڵکو مرۆڤی مۆدێرنە دەخوازێت وەکو ئەیوب بمرێت! پیر، بەڵام تێر بوو لە ژیان.

لەمەشدا بناغەی گرێی میدیکۆکراتی مت بووە.

سەبارەت درێژەی ئەم بابەتە زلۆتەردایك لە هەردوو کتێبی "خانەی شووشەیی مرۆڤ" و "خۆر و مەرگ"دا لێکدانەوەی وردتر و زۆرتری ئەنترۆپۆلۆژیای مێژوویی و ئەنترۆپۆلۆژیای ئایندەیی کردووە. بڕوانە:

*P. Sloterdijk. Hans – Juergen Heinrichs: Die Sonne Und der Toc Suhrkamp 2001.*

-ئەم بابەتە بە دوو ئێوارەکۆڕ لە ڕۆژانی ١٦-
١٨/٤/٢٠٠٣ لە بەرلین پێشکەش کرا.

# فەسڵێك لە کتێبی "ڕێبازی دیکتاتۆرەکان"

ئینیاتسیۆ سیلۆنێ
لە فارسییەوە: عەبدولخالق یەعقووبی

## پیلانی کودەتایەك دوابەدوای شۆڕشێکی سەرنەکەوتوو

جەنابی دەبلیۆ. نازانم بۆچی فاشیسم بۆ یەکەمجار لە وڵاتێکی وەك ئیتالیادا سەری هەڵدا کە شارستانییەتی بە کۆمەڵ، بەو جۆرەی لە باسی پێشووتاندا شیتانکردەوە، لەودا بە ئەندازەی ئەمریکا گەشەی نەسەندووە؟

تومازۆی سەگانی. هەر ئەم پرسیارە سەبارەت بە زەمینە کۆمەڵایەتییەکانی شۆڕشی یەکێتی سۆڤیەتیش هاتۆتە گۆڕێ. بەڕای من ئەو وەڵامەی ترۆتسکی داویەتەوە بۆ گشت حاڵەتە وێکچووەکان پڕ بە پێستە. بەو جۆرەی ترۆتسکی نووسیوێتی، ئەو زنجیرەی توانا و تاقەت و پتەوبوونەکەی تاقی دەکرێتەوە هەمیشە لە سەری ئەو ئەڵقەیەوە دەپچڕێ کە لە ئەڵقەکانی دیکە ناسکتر و لاوازترە. بارودۆخی ئێمە لە دوایین ڕۆژانی شەڕی یەکەمی جیهانی بێننەوە بیر: شەڕ پێوەندییە کۆنەکانی نێوان وڵاتان و چینە جۆراوجۆرەکانی خەڵکی تێکدابوو. ئەو وڵاتانەی کە زەخیرە و پاشەکەوتێکی ئەوتۆیان نەبوو، وڵاتانی شکست خواردوو، وڵاتانێکی وەك ئیتالیا کە ژێرخانێکی سست و لەرزۆکیان بوو، ئەو وڵاتانەی لە سایەی سەری پەیمانی ئاشتییەوە پێکهاتبوون، هەر هەموویان تووشی ژیانێکی زۆر شێواو و شپرزە بوون. ئەو شتانەی دوای ئەم دۆخە ڕوویاندا دیارە هەر دەبوایە ڕوویاندابوایە، چونکی هەمیشە بۆ چارەسەرکردنی هەر قەیرانێك دەکرێ ڕێگاچارەی جۆراوجۆر بدۆزیتەوە، دەشزانین لەم چەشنە بارودۆخانەدا، تاقە ڕێگای خەیاڵی و نەگونجاو و نەشیاو پاراستنی "ئەو دۆخەیە کە هەیە". بەڵام زۆربەی دیموکرات و لیبراڵەکان تووشی ئەم وەهم گەراییە بوون، چونکی بێ نەزمی و

ناڕێك و پێكی كۆمەڵگایان تەنیا بە حاڵەتێكی رۆحی، وەك دەڵێن دەركەوتی دەروونی شەڕ دەزانی و هیواداربوون تەمی ئەم حاڵەتە بەرەبەرە بڕەوێتەوە و هەر ئەو بارودۆخەی ژیانی ساڵی ١٩١٤ سەرلەنوێ سەقامگیر ببێتەوە. بەڵام كۆمەڵگا ئیتر ئەو كۆمەڵگایەی جاری جاران نەبوو.

جەنابی دەبلیۆ. یەكێك لە هەلومەرجە لەبارەكانی وەرێخستنی كودەتا، پێداویستی رزگاركردنی كۆمەڵگایە لە مەترسی و هەڕەشەی شۆڕشێكی كۆمۆنیستی، كە ئێوە باستان نەكرد. ئەرێ ئەمەتان بە ئەنقەست بوو؟ هەروا كە دەتوانن مەزەندەی بكەن، ئەم مەسەلەیە بۆ من زۆر گرنگە. وەی بە حاڵی من ئەگەر چاوەڕێی ئەوە بم مەترسییەكی وا لە ئەمریكا بێتە گۆڕێ.

تومازۆی سەگانی. دڵنیاتان دەكەم ئەو مەرجەی باسی دەكەن بە هیچ كلۆجێك بۆ سەركەوتنی كودەتایەك پێویست نیە.

جەنابی دەبلیۆ. بەڵام موسولینی و هیتلەر هەردووكیان لافی ئەوە لێدەدەن وڵاتی خۆیان لە مەترسی شۆڕشێكی كۆمۆنیستی نیزیكە روودان رزگار كردووە.

تومازۆی سەگانی. كەس بەرتان پێناگرێ ئێوەش پاش سەركەوتن، ئەفسانەیەكی لەم دەستە ساز بكەن و بیخەنە سەر زاری خەڵك. شكی تێدا نیە قەیرانی سیاسی ئاخر و ئۆخری ساڵی ١٩٢٢ لە ئیتالیا و بەهاری ١٩٣٣ لە ئەڵمان هێشتا دەكرا لە چەند رێگایەكەوە چارەسەر بكرێت، بەڵام ئیتر ناكرێ بڵێین بە دەستەوەگرتنی دەسەڵات لە لایەن كۆمۆنیستەكانەوە یەكێك لەم چەند رێگاچارەسەركردنەی ئەو قەیرانانە بێت.

پرۆفیسۆر پیكاپ. جەنابی سەگانی، بەڕای من ئێوە بە ئارەزووی خۆتان پاش و پێش بە مەسەلەكان دەكەن. ئێوە چۆن دەتوانن حاشا لەوە بكەن كە لەم دوو وڵاتەدا، كرێكاران زیاتر لە هەموو كەسێك ئامادەی خەبات بوون و چەكیان دانەنابوو؟ ماركیسستەكان خۆشیان نكوڵیان لەم راستییە نەدەكرد، ئەگەر "مانیفێست"ی كۆنی ١٨٤٨-یش وەلا بنێین، لە ساڵانی پێش و پاش شەڕی یەكەمی جیهانی، بەشێوەی جۆراوجۆر، هەڕەشە و گوڕەشە و خەبات خوازی خۆیان دووپات كردبۆوە. بە باوەڕی ئەوان، مرۆڤایەتی لەو ساتەوەختەدا لە دەس ئاشتی و ئاسوودەیی "ئازاری دەبینی" و ژۆرژ سۆرێل (*George Sorel*) لە كتێبی (چەند سەرنجێك سەبارەت بە توند و تیژی) لە خۆی دەپرسی، چۆن چۆنی دەكرێت كڵپەی شەوق و شەنگی رووە و كوژانەوەی بورژوازی ببووژێندرێتەوە. لە راستیدا، ئامانجی توندوتیژی كرێكاری ئەوە بوو كە بورژواكان لە شوێنكەوت و مەوقعییەتی چینایەتی خۆیان ئاگادار بكاتەوە. خواستی سۆرێل ئەوە بوو كە سەرمایەداران بە زەروورەت و پێداویستی چاككردنەوەی كۆمەڵایەتی پەی ببەن و بە مەسەلەی وەك دەستەبەركردنی بیمەی دەرمانی و پەككەوتەیی و دامەزراندنی ئەنجومەنی وەرزشی و دابینكردنی ماڵ و خانووی باش بۆ كارمەندان رووی خۆش نیشان بدەن. هەوڵی بورژوازی بۆ كەمكردنەوەی هێز و توانای خۆی دڵی سورێل دێنێتە ئێش. خۆشبەختانە، توند و تیژیی كرێكاری دەیتوانی وا لە سەرمایەداران بكات كە ئەركی خۆیان وەك بەرهەمهێنەر، سەر لە نوێ بێنێتەوە گۆڕێ. بە باوەڕی سورێل، كۆمەڵگای سەرمایەداری ئەو كاتە بە قۆناغی "كەماڵی مێژوویی" خۆی دەگەیشت كە سیستمی سەرمایەداری و چینی كرێكار بە رۆحییەتێكی شەڕان خوازییەوە ئاوقای یەك ببن و ئاشتی لە نێوانیاندا مەحاڵ بێت. ئەم خەباتە، كە لە

دەیان ساڵ لەمەوبەرەوە مزگێنییەکەی درابوو، دواجار وەدی هات و سەری گرت. بە گوتەی سورێل، کۆمەڵگا لە هەندێ ڕێگای جۆراوجۆرەوە بە کەماڵی مێژوویی خۆی گەیشت. مارکیسستەکان زۆر کتوپڕ و بە هۆی گەلێ بارودۆخی چاوەڕواننەکراوەوە، لە ڕووسیا سەرکەوتن، لە باڵکان و باڵتیك و ئیتالیا و ئەڵمان و ئەمریکای باشوور شکستیان خوارد و وەلانران. لە وڵاتانی دیکە خەبات تازە دەستیپێکردووە و ناکرێ بڵێین مارکیسستەکان بێکار دانیشتوون و دەس لە گونان درێژتر هەر خەریکی تەماشا کردنن. جا ئێستا مەسەلەکە ئەوەیە بۆچی مارکیسستەکان، کاتێك لەو خەباتەی کە خۆیان دایانمەزراندووە شکست دەخۆن، لە توندوتیژی لایەنەکەی دیکە ئاهوناڵەیانە.

تومازۆی سەگانی، جەنابی پرۆفیسۆر، بەهەڵەداچوون گەر سورێل بە نوێنەری بزوتنەوەی کرێکاری بزانن. سەرەڕای ئەوەی زیاتر لە خودی فەرەنسە، لە ئیتالیا دەستی دەڕۆیشت، کەچی پەیڕەوانی ئەو تەنیا چونکە گروپێکی ڕووناکبیر بوون و ئەمانە ساڵی ١٩١٤ سەر بەو گروپانە بوون کە لە پێناوی تێوەگلانی ئیتالیا لە شەڕ پڕوپاگەندەیان دەکرد و ساڵی ١٩١٩ یەکێك بوون لە بناغەدانەرانی یەکەمین دەستەکانی سەر بە فاشیست. بەڵام لە بۆچوونەکانی سورێل سەبارەت بە توندوتیژی تێناگەین مەگین ئەوەی سەرنج بدەینە تیۆرییە سەرەکییەکەی. ئەم تیۆرییەش دەڵێ، ناتوانین دژایەتییە ڕاستەقینەکانی کۆمەڵگا لە پشت کۆمەڵێك دەمامکی ڕیاکارانەوە بشارینەوە، بەهۆی ئەوەی لە ڕێگای ئەم کارەوە ناوەڕۆکی ڕاستەقینەی ژیانی کۆمەڵایەتی وەپشتگوێ دەخرێ و ئاستی ئەخلاقی و فیکری دادەبەزێت و تەنانەت ڕێژەی بەرهەمهێنان کەم دەبێتەوە. هەر لەم سۆنگەیەوە سۆرێل زۆر زۆر دژی سوسیالیسمی پارلیمانی و هاوکاری کردنی ریفۆرم خوازان بوو، باسی خەباتی بێ نێونجی چینایەتی دەهێنایە ئاراوە، واتە ململانێیەکی ڕاستەوخۆ لە نێوان کرێکاران و سەرمایەداران. بەڵام بە سەرنجدان بەیەك خاڵ دەتوانین نیشان بدەین کە توندوتیژیی فاشیستی هیچ چەشنە وێکچوونێکی لەگەڵ ئەو توندوتیژییەی کە سۆرێل باسی دەکات، نیە: ئەو دەورەی توندوتیژی فاشیستی دەیگێڕێ ئەمەیە کە تەوەرەی خەباتی سیاسی لە جیاوازیگەلی ڕاستەقینە و مێژوویی حیزب و چینەکان لاڕێ بکات، لەبری ئەو یەکێتییەکی دەسکرد و ساختەچییانەی نەژادی و نەتەوایەتی دابنێت. هەر بۆیە، توندوتیژیی فاشیستی بە هەندێ کەرەسەی دیکە و کۆمەڵێك دەرەنجامی تر، هەر ئەو دەورەی گێڕا کە بەر لە شەڕ ریفۆرمیسمی کۆمەڵایەتی وەئەستۆی گرتبوو، واتە هەر ئەو بزوتنەوەیەی کە سۆرێل بە سەلەفی و غەیرە ئەخلاقی دەزانی. بەڵام لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا، دەبێت دیسان بە پێداگرییەوە بڵێم کە ئەم تیۆرییە، کە دەڵێ لە ئەڵمان و ئیتالیا، فاشیسم سوسیالیسمی شکست داوە، تیۆرییەکی هەڵەیە. بە پێچەوانە، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بڵێین سەرهەڵدانی فاشیسمو نازیسم لە سۆنگەی شکستی سوسیالیسمەوە بوو.

پرۆفیسۆر پیکاپ. ئەی کەوایە لەم دوو وڵاتەدا، کێ سوسیالیسمی شکست دا؟

تومازۆی سەگانی. سوسیالیسم بە دەستی خۆی، خۆی شکست دا. لە سەروبەندی بێ نەزمی و ناڕێکوپێکی سیاسی و کۆمەڵایەتیی بەرهەمهاتوو لە شەڕ، چ لە ئەڵمان و چ لە ئیتالیا، هەر لە یەکەمین مانگەکانی پاش تەواوبوونی شەڕ و کێشە، کۆمەڵانی خەڵك سوسیالیسمیان بە تاکە هێزێك دەزانی کە لە دەستی دەهات خواستی ئەوان وەدی

بێنێ و نەزم و تەکووزی و ڕێکوپێکییەکی تازە بە کۆمەڵگا ببەخشێ. بەڵام بزوتنەوەی سوسیالیسم لەم دوو وڵاتەدا بەسەر دوو جۆر خواستی فیکریی گشتیدا دابەش ببوو. خواستی یەکەم، گەڕیانێکی شۆڕشگێڕانە بوو، کە لانی کەم لە قسەدا، چاوی لە زەوتکردنی سامان و سەرمایەی چینی دەوڵەمەند و دامەزراندنی دیکتاتۆری پرۆلیتاریا بوو. خواستەکەی دیکە، بزاڤێکی ریفۆرم خواز بوو کە باشتربوونی بە کاوەخۆ و ئاشتی خوازانەی بارودۆخی ژیانی چینی هەژاری دەویست. هەر بۆیە نە ریفۆرم خوازان بەدوای چاککردنەوەی کاروباری کۆمەڵگادا کەوتن، نە شۆڕشگێڕان ئاگری شۆڕشیان کردەوە. لە ئەڵمان، سوسیال دیموکراتەکان لە پەناوە دەستی یارمەتییان بۆ سەرکوتکردنی بزوتنەوەی ئیسپارتاکیستەکان درێژ کردەوە، تەنانەت لە بواری سەقامگیرکردنی ئازادییە دیموکراتییەکانی وڵات دەستیان نەدایە کارێکی جیدی ئەوتۆ، چ بگا بەوەی لەجیاتی ئابووری تێکشکاوی سەرمایەداری، ئابووری سوسیالیستی نیشتەجێ بکەن. لەجیاتی ئەوە، وەك چۆن بە شێوەی سیمبۆلیك باسیان کردووە، "ئیمپراتۆر ڕۆیشت و ژنرالەکان مانەوە". لە لایەکی تر، بارودۆخی شۆڕشگێڕانە هەرگیز ماوەیەکی دوور و درێژ ناخایەنێ و ئەگەر حیزبێکی شۆڕشگێڕ دەسبەجێ ئەم هەلە نەقۆزێتەوە، کۆمەڵانی ناهومێدی خەڵك پشتی تێدەکەن و هەوساری دەسەڵات دەدەنە دەست حیزبی نەیاری ئەو حیزبە شۆڕشگێڕە، یان لانی کەم بە نابەدڵی و بە ڕۆحێکی بێ هەڵوێست قبووڵی دەکەن. لە ئیتالیا، ئەم گۆڕانی بارودۆخە کاتێك بەسەردا هات کە کارخانەکان داگیر کران و لەگەڵ چۆڵبوونیان کەفوکوڵی هەستی کرێکاران دامرکایەوە، (بەیەکجاری) هیوا بڕاو بوون و بەو ڕاستییەیان زانی ئەو حیزبەی پشتیان پێبەستبوو تەنیا هەر قسان دەکا و هیچ. سوسیالیسمی ئەڵمان، تا ئاخر و ئۆخرەکانی ساڵی ١٩٢٣ هێشتا توانایی و تاقەتی ئەوەی هەبوو دەوری خۆی لە بووژانەوەی سیستمی کۆمەڵگادا بگێڕێت. بەڵام ئەم بزوتنەوەیەش دواجار بێ ئەوەی خەبات بکات تەسلیم بوو. هەر بۆیە، چینی کرێکاری ئیتالیا و ئەڵمان ئەو کاتە ناچار دەبوو پێملی یەکەمین هێرشە توندو تیژەکانی فاشیسم بێ کە ڕێکخراوەکانی خۆی بە ناڕێکوپێکی خەریکی پاشەکشێ بوون و سەنگەرەکانی پێشەوەی خۆیان چۆڵ دەکرد، واتە هەر ئەو سەنگەرانەی کە لە یەکەمین مانگەکانی پاش تەواوبوونی دژایەتی و ناتەبایی، نەك بڵێی بە زۆر، بەڵکو زیاتر بە هۆی دەستەپاچە بوونی دوژمنەوە، بە پەلە داگیرکردبوو.

دواکەوتووترین دەستەکانی سەرمایەداری دەستبەجێ ئەم هەلەیان قۆزتەوە، بۆ ئەوەی قورسایی بەشێکی زۆری شپرزەیی و شێواوی ئابووری وماڵی کۆمەڵگا بخەنە سەرشانی خەڵك و لە ڕێگای کەمکردنەوەی کرێ و هەقدەستەکان لە بەرامبەر سەنعەتی بیانی سنگ دەرپەڕێنن. هەر لەو سەروبەندەی کە تەمی مەترسی شۆڕش بە هۆی شپرزەیی و شێواوی ناوەوەی بزوتنەوەی سوسیالیسم ڕەویبۆوە و هێشتا کەس فاشیسمی بە هێزێکی سیاسی لەقەڵەم نەدەدا، سەرمایەداری پشتی هیتلەر و موسولینی گرت، بۆ ئەوەی پاشەکشێی ڕێکخراوەی کرێکاری تووشی شکستێکی تەواو بکات و ریفۆرم و چاکسازی کۆمەڵایەتی کە لە ڕادەبەدەر خەرجی هەڵدەگرت لە یەکەم هەناسەدا خەفە بکات. ئەم لایەنەی بەربەرەکانی کردن، لە ئیتالیا زیاتر دەبینرا،

لەبەرئەوەی خێراتر تەشەنەی دەسەند و لە ژێر چاودێری ئەو ڕێبەرە فاشیستەدا بوو کە ڕوانینێکی سیاسیی ڕووهەڵماڵراوتری هەبوو. گومانی تێدا نیە سەرهەڵدان و تەشەنەسەندنی فاشیسم، دوا بەدوای قۆناغی سەرەتایی نیشتمان پەرەستانەی، زیاتر هەڵوێستێك بوو لە بەرامبەر ریفۆرم خوازی کۆمەڵایەتی تا لە بەرامبەر سوسیالیسمی شۆڕشگێڕانەی کۆمۆنیسم. جووتیاری دەوڵەمەند و نیمچە بازاڕی و سەنعەتکاری ساڵی ١٩٢١ تێکەڵ بە دەستە فاشیستییەکانی موسولینی بوون تا دژی ئەو ڕێکخراوە ریفۆرم خوازانەی سەرئێشەیان سازدەکرد، خەبات بکەن، ئەو ڕێکخراوانەی کە بەتایبەت سوود و بەهرەی دامەزراوەگەلی بچووکی سەنعەتی و بازرگانییان تەواو کەم کردبۆوە. هەر بەم هۆیە بوو کە هەڵوێستی فاشیستەکان لە ناوچەکانی دۆڵی "پو" لە باکووری ئیتالیا، لە چاو شوێنەکانی تر، توند و تیژ بوو، چونکی ریفۆرم خوازەکان لەم ناوچانەدا، بە درێژایی چل ساڵ کارو ئیشی ئاشتی خوازانە، توانیبوویان تۆڕێکی بەربلاو لە لیژنەی دووکانداران و ئیدارەی هاوکاری و ڕێکخراوەی یارمەتی پێدان پێکبێنن و بەشێکی زۆری چالاکی و کاروباری ئابووری ناوچەکە بە دەستەوە بگرن و لە هەندێ شوێن بە مانای ڕاستی وشە دەسەڵاتی ڕەهای خۆیان داسەپێنن. پیاو دەیزانی توند و تیژی فاشیستەکان لەبەر چییە. شۆڕشگێڕێتی بە قسە، لەگەڵ ڕێپێوان و خۆنیشاندانی پڕ لە زەنازەنا و بێ ئاکامی، تەنیا چرای دارتێلی شەقام و جاروبار دەست و قاچ و قولی پۆلیسەکانی دەخستە مەترسییەوە، بەڵام ریفۆرم خوازی، کە ئیمکاناتێکی سیاسی ئەوتۆی بە دەستەوە نەبوو، داوای کاری بە کاوەخۆ و ڕێکوپێك و بەپێی یاسای دەکرد، هەڕەشەی لە شتێکی گەلێك پیرۆزتر دەکرد، ئەو شتە سوودی سەرمایە شەخسییەکان بوو، بەڵێ، سوودی سەرمایەیەکی کەمی تاکەکەسی، نە ئەو بانکە گەورانەی کە خودی ریفۆرم خوازەکانیش قەرزیان لێوەردەگرتن. بورژوازی دەیزانی کە یاسای وڵات لە بەرامبەر شۆڕشگێڕێتی بە قسە پشتیوانی لێدەکات، بەڵام بۆ پاراستنی خۆی لە ریفۆرمیسمی ئاشتی خوازی پەیڕەوی یاسا پێویستی بە گروپەکانی ڕەشەکوژی فاشیسم بوو تا ئەو یاسایەی کە لە بەرامبەریدا بێ دەسەڵات بوو تێکبشکێنێ. توندو تیژی فاشیستی دواتر ڕووی لە سوسیالیستە شۆڕشگێڕ و کۆمۆنیستەکانیش کرد، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە ئەم دەستانە لە بەسەرداهاتنی شۆڕشێکی دەستاوبەجێ هیوابڕاو ببوون و ئەرکی پاراستنی بارودۆخی ماڵی ژیانی کرێکارانیان وەئەستۆ دەگرت و بە ڕۆحییەتێکی وەها شەڕخوازانەوە بۆ هەقدەستەکان هاتنەوە نێو مەیدانی خەبات کە حسێب و کتێبی هەلخوازانەی ڕێبەرانی ریفۆرم خوازی تێکدەدا، لە حاڵێکدا ئەم ڕێبەرانە لە ترسی دەستدرێژی فاشیستەکان، ئامادەی قبووڵ کردنی پەیمانێکی ئاشتی لەگەڵ ئەو دەستە شۆڕشگێڕانە بوون. سەرەڕای ئەمانە، گۆڕانکارییەکانی دوایی و پێچەڵپێچ بوونی بارودۆخەکە نابێ ئەم هەقیقەتە بەراییەمان لەبیر بباتەوە کە: فاشیسم بزوتنەوەیەکی دژی شۆڕش بوو، دژی ئەو شۆڕشەی نەکرا.

جەنابی دەبلیۆ. قسەکانتان وێدەچێ شیاوی پەسەندکردن بێت. بەڵام بەڕاستی پێتان وایە گەڵاڵەیەکی وەها گشتی بۆی هەبێت لە شوێنێکی دیکەش دووپات بێتەوە؟

تومازۆی سەگانی. بەهەرحاڵ دەتوانم بیروبۆچوونی خۆم بەم چەشنە چڕ بکەمەوە:

یەكەم مەرجی هاتنە سەركاری سیستمێكی توتالیتاریستی، سەقەت بوونی سیستمی دیموكراتیكی وڵاتە، واتە سەرهەڵدانی ناهەماهەنگییەكی چارەسەرنەكراوی نێوان سیستمی سیاسی كۆن لە لایەك و بارودۆخی كۆمەڵایەتیی لە بنەڕەتەوە گۆڕاو لەلایەكی دیكە، مەرجی دووهەم ئەوەیە كە تێكشكانی حكوومەت زیاتر لە هەر شت بە قازانجی حیزبی ئۆپۆزیسیۆن بێت، وەك تاكە حیزبێك كە توانای دابینكردنی نەزم و تەكوزییەكی تازەی هەیە و كۆمەڵانی خەڵك بۆ لای خۆی رابكێشێ، مەرجی سێهەم ئەوەیە كە ئەم حیزبە ئامادەیی بەڕێوەبردنی ئەو ئەركە ئەستەمەی چاوەڕوانی لێدەكەن نەبێت، تەنانەت ببێتە هۆی تەشەنەسەندنی بێ نەزمی و ناڕێكوپێكی دۆخی هەنووكە، یانی ئەو هیوایەی پێیان بوو تەواو بكاتە ناهومێدی. جا كە ئەم بارودۆخانە هاتنە كایەوە و كەس نەیتوانی دان بە جەرگیدا بنێ، حیزبی توتالیتاریستی دێتە نێو مەیدانەوە. ئالێرەدایە ئەم حیزبە ئەگەر رێبەرێكی كەری نەبێ زۆر بۆی هەیە دەسەڵات بكەوێتە دەستی.

جەنابی دەبلیۆ. وەرن با سەبارەت بە قۆناغی سێهەمی ئەو گەڵاڵەیەتان پتر بدوێین، واتە ئەو قۆناغەی كە تێیدا حیزبی ئۆپۆزیسیۆنی سوننەتی كە بەڕواڵەت سوسیالیست یان موحافیزەكار، یان دیموكراتە تووشی نوشوستی و تێكشكان بووە. ئەو پرسیارەی بۆ من هاتۆتە پێش ئەوەیە كە ئایا ئەزموون و تەجرەبەی وڵاتانی ئیتالیا و ئەڵمان و ئەمریكای لاتین و بالكان دەتوانێت لە وڵاتانی دیكەشدا كاریگەر بێت؟ چونكە نابێ ئەم راستییە لەبیر بكەین كە تا ئێستا فاشیسم لەو وڵاتانەدا سەریهەڵداوە كە لەواندا رەگ و ریشەی دیموكراسی ئەوەندە پتەو و بەهێز نەبووە؟

پرۆفیسۆر پیكاپ. بمبوورن ئەگەر دەپەڕمە نێو قسەكانتەوە. بەڕای من، لایەنی لاوازی دیموكراسی لە چاو فاشیسم لە ناتەواوی ئامانجی دیموكراتیكدایە كە ئەسڵی هیچ و پووچی حاكمییەتی خەڵك بەڕاست و رەوا دەزانێت.

تومازۆی سەگانی. بەڕای من، لایەنی سەرەكی كزی و لاوازی سیستمی دیموكراتیك لە زەمانی ئێمەدا پارێزكار بوونێتی. كاتێك كۆمەڵگا لە حاڵی بزوتن و رۆیشتندایە، ئەوەی سڵ بكات و رابوەستێ تیا دەچێت. جیاوازییەكی گەورە هەیە لە نێوان دیموكراتەكانی سەردەمی ئێمە و دیموكراتەكانی رابردوو، كە بۆ دەستەبەركردنی ئازادی خەڵك و یەكسانی حقوقی و سیاسی هاووڵاتیان، لە نێو سەنگەری شەقام و لە شەڕی ناوخۆ و شەڕی سەربەخۆیی خەباتیان كرد. ئەم جیاوازییە پێوەندی بە مرخی تاكەكەسەوە نییە. لەو سەردەمانەدا، یەكسانی سیاسی و حقوقی هاووڵاتیان شتێكی تازەو نوێ بوو، بۆ خۆی وەك ئامانجێك لەقەڵەم دەدرا. هەر بەم هۆیە سەرنجڕاكێشبوونی ئەم ئامانجە هەموو ویژدانێكی بەئاگای دەوروژاند و ئەم خەڵكانە، ئارمانی كۆمەڵانی خەڵكیان پەسەند دەكرد و لەگەڵ ئەوان دژی دەربار و دەرەبەگایەتی و كڵێسا و دەسەڵاتی بیانی خەباتیان دەكرد. دیموكراتەكانی ئیمرۆژە ئیتر ئامانجێكیان نییە تا لە پێناویدا خەبات بكەن. ئەوان میراتگری پێشینانی خۆیانن. ئەو بزوتنەوە رووە و هەڵكشانەی كە بە كەڵكی شۆرش دێت، شان و شكۆ بە گەورە پیاوانی خۆی دەدات و دەیانكاتە كۆمەڵێك پاڵەوانی ئەفسانەیی پێشەنگ: گەورە پیاوانی وەك: كرامول و روبسپیر و جێفرسۆن و لێنین. بەڵام دیموكراسییەكی رووە و تیاچوون، كە لە سۆنگەی سازان و هەڵكردن لەگەڵ ئەم و ئەو خۆ لەسەر قوون بەند دەكات،

دەشێ قەناعەت بە هەندێ سیاسەتمەداری هیچەکەو پووچەکەی وەك خاکتا و برۆنینگ و لاوال و چەمبرلن بێنێ. هیچ دووریش نییە هەرچی زەمان بەسەردا بێت، ئەم سیاسەتمەدارانە لەمەش کە هەیە سووك و چرووکتربن. هەڵبەت لەوانەیە دیموکراسی بورژوازی بەردەوام هەروا پیاوی گەورە و خاوەن پلەو پایە بەخۆیەوە ببینێ، بەڵام من پێموایە ئەم شتە زیاتر لە وڵاتانێك پێش دێت کە لەودا دیموکراسی هیچ کات لە گۆڕێدا نەبووە: وڵاتانی فیۆدالی، نیمچە فیۆدالی، ژێر دەستە، ئەو وڵاتانەی تازە گەیشتوونەتە بەر دەروازەی شۆڕشی بەناو بورژوایی. سون یات سن و گاندی لەبەرچاو بگرن و لەگەڵ وەزیرە دیموکراتەکانی خۆمان، کە ناوم هێنان، بەراوردیان بکەن: ئەمانە هەموویان سەر بە بزوتنەوەیەکی مێژوویی تاقانەن، بەڵام سوت یات سن و گاندی لە بەرەبەیانی ئەم بزوتنەوەیە و ئەو وەزیرانە لە ئێوارە و دەمدەمانی ئاوابوونیدان. کورتی ببڕمەوە، رێبەرانی سیاسی ئەوروپا خاوەن سەر لە بەری تایبەتمەندییەکانی ئەو چینە سیاسییەن کە چیتر ئەرکیان بەسەر شان نەماوەتەوە.

پرۆفیسۆر پیکاپ. گوبلز گوتوویەتی سەرکەوتنی نازیسم، تا ڕادەیەکی زۆر لە سۆنگەی کەرێتی و گەمژەیی نەیارانییەوە بووە. ئەم نەیارانە گشت لایەنەکانی دەسەڵات، واتە سپاو پۆلیس و بوروکراسی و سیستمی بانکی و رادیۆ و رۆژنامە و زۆرینەی کورسی پارلیمانی لەدەستدا بووە، بەڵام نەیانتوانی کەڵکی لێوەربگرن.

تومازۆی سەگانی. ئەگەر لەم روانگەیەوە لە کێشەکە بکۆڵینەوە، وێدەچێ گۆڕانی هەر رژێمێك بەهۆی کەرێتی دەسەڵاتدارانی پێشووی بێت کە لە ناکاو شکستیان خواردووە. هەندێ مێژوونووس هەن تێدەکۆشن ئەوە بسەلمێنن کە ئەگەر لویی شازدەهەم فلان یان فیسارە شێوەی رەچاو نەکردبایە و ئەگەر قەیسەرەکانی رووسیا ساڵی ١٩١٧ بەریان بە فلانە رووداو گرتبا، شۆڕشی فەرەنسە و شۆڕشی یەکێتی سۆڤیەت نەدەقەومان. دەکرێت ئەم شتانە بە ئاسانی بۆ هەرچی شۆڕشی دیکەشە بگوترێت، چونکە شۆڕشەکان لە گۆشەنیگای کەسانی ساویلکە و رووگەشبینەوە هەمیشە خاوەن هەندێ لایەنن کە مرۆڤ سەرەندەریان لێدەرناکات. راستە کە چینی دەسەڵاتدار، تا دوا رۆژی گۆڕانی رژێم، سەرلەبەری ئەو ئامڕازانەی کە بۆ پاراستنی خۆی پێویستی پێیان هەیە بەدەستەوەیە، بەڵام ویست و ئیرادە و توانایی و ئازایەتی بەکارهێنانی ئەو ئامڕازانەی دۆڕاندووە، لە کاتێکدا خواست و ئیرادە و توانایی و بوێری بەشێکن لە خەسڵەتە بنەماییەکانی دەسەڵاتدارێتی. چینی دەسەڵاتدار، بەر لەوەی بە کردەوە تێکبشکێت و لابچێت، لە باری دەروونییەوە تێکشکاوە، چینێکی قوون قورس و تەمبەڵ و تەوەزەل و گەمژەیە و چاوی دوو هەنگاو ئەولاتر بڕناکات. تەنیا بە هۆی نەجووڵان و نەبزوتنەوە لەسەر قوون بەند دەبێت و دەستەویەخەی کۆمەڵێك نەخۆشی تەمەنی پیرییە، وەك فۆرمالیسم و یاساپەرستی. لەسەر پەرەستنی هەندێك فۆرمولی بێ ناوەڕۆك بەردەوام دەبێت و لە رێگای لەبەرچاوگرتنی رواڵەتی یاسا و داب و دەستوورەکانەوە خۆی دەپارێزێ، بەڵام سەرو مڕی ئەم یاسا و داب و دەستوورانە پێش ئەوەی بە قازانجی دیموکراسی بێت، بە قازانجی نەیارانی دیموکراسی دەشکێتەوە و ئەو دەسکەوت و دەرەنجامەی لێدەکەوێتەوە رێك بە پێچەوانەی ئەو شتەیە کە لە سۆنگەیەوە بەدی هاتووە.

پرۆفیسۆر پیکاپ. بەکارهێنانی یاسای دیموکراتیك بۆ تەفروتوناکردنی دیموکراسی، ئەوە

راست ئەو شێوازەیە فاشیست و نازییەکانیش بە باشی سوودیان لێوەرگرت. هیتلەر لە کتێبی (خەباتی من) دا نووسیویێتی، دیموکراسی، لە باشترین دۆخدا، ئامرازێکە بۆ سەقەتکردنی دوژمن. ساڵی ١٩٣٥، دوو ساڵ دوای ئەوەی نازییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست، گوبلز بە حاڵەتێکی خۆستایشتکەرانەوە باسی ئەم کایە پڕ لە سەرکەوتنەی خۆیانی کرد و نووسی: "ئێمە هەمیشە رامانگەیاندبوو بۆ بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات لە ئیمکانات و دەرەتانەکانی دیموکراسی کەڵك وەردەگرین و پاش بەدەستەوەگرتنی دەسەڵات، هیچ کام لەو ئیمکاناتەی کە خۆمان لە ئۆپۆزیسیۆن بەکارمان دێنان ناخەینە بەر دەست نەیارانی خۆمان". هەڵوێستی کۆمۆنیستەکان لە بەرامبەر یاسا، لە وڵاتانی دیموکراتیکدا، کەم و زۆر هەر ئەمەیە.

تومازۆی سەگانی. دیموکراتەکان بەم راستییە دەزانن، بەڵام هیچیان لە دەست نایات. چینی دەسەڵاتداری رووەو تیاچوون بەپێی ئەسڵی "ئیمرۆ دەرفەتە و گونت بە سبەی نەبزوێ" دەژین و چارەسەری گرنگ هەمیشە دوادەخەن و حەواڵەی سبەی دەکەن. هەر وەختێك ناچار بێت بڕیاری خۆی بدا، هەندێ کۆمۆسیۆن و لیژنە دەستنیشان دەکات، تا ئەو کاتە کۆتایی بە لێکۆڵینەوە و شیکردنەوەکانیان بێنن کە ئیتر بارودۆخەکە گۆڕابێت. مانای ئەم دواخستنانە ئەوەیە: دوای باران کەپەنك. ماناکەی تری ئەوەیە کە پیاو پێی وابێت بە وەعودە نەگرتنی بەرپرسایەتی و خۆ لە قەرەنەدانی ئەرك و وەزیفە، رووی خۆی لای مێژوونووسانی داهاتوو سپی دەکات. بە باوەڕی دیموکراتەکانی ئەو وڵاتانەی دەستەویەخەی قەیران بوون، ئەوپەڕی هونەری دەسەڵاتداری لەوەدایە زللەکان نۆشی گیان بکەیت بۆ ئەوەی شەقت لە قوونێ نەکەوێ، واتە ئەوەی لە بەرامبەر بەڵای بچووکتردا تاقەت بێنێ، واتە ئەوەی رۆژ لەگەڵ رۆژ پێملی پێکەوە سازانی تازە بێت. بۆ ئەوەی لە توندوتیژی دژایەتییەکان کەم بکەیتەوە و هەوڵ بدەیت هەرشتێك ئاشتی هەڵیناگرێ بە ئاشتی بگەیەنی. دوژمنانی دیموکراسی لەم مەسەلەیە سوودی تایبەتی خۆیان وەردەگرن و رۆژ لە دوای رۆژ رووهەڵماڵراوتر دەبن، لەبەرچاوی خەڵك پیلان دادەڕێژن، چەك کۆدەکەنەوە، گروپە چەکدارەکانی خۆیان دەبەنە سەر شەقام و مانۆڕیان پێدەنوێنن، دە بەیەك هێرش دەکەنە سەر رێبەرانی چەپەڵی ئازادیخواز. دەوڵەت، "بە لەخۆبوردوویی و لەبەرچاوگرتنی هەموو لایەنەکان کە نەکا ببێتە هۆی خراپتربوونی بارودۆخەکە" ئەم رووداوانە شەرمەزار دەکات و "بە خاتری شەرەف و ئابڕووی نیشتمان" هیوادار دەبێت "ئەم رووداوانە بە ئەنقەست بەدی نەهاتبێتن"، و لە قوولایی دڵەوە داوا لە هاووڵاتیان دەکا دەستی دەوڵەت بگرن سەرلەنوێ نەزم و رێکوپێکی و ئارامی و ئاسوودەیی بگەڕێننەوە. ئەوەی بۆ رێبەرانی دیموکرات گرنگە، خۆبواردن لەو قسە و رەفتارانەیە کە لەوانەیە هەندێ دەمارگرژ بڕەنجێنێ و بارودۆخەکە خراپتر بکا. ئەگەر هێزی پۆلیس بەوە بزانێ کە هەندێ رێبەری سیاسی و لەشکری دەستیان لەگەڵ دەستی رێکخراوەیەکی دژی حکوومەتدا تێکەڵە و راستەوخۆ لە کۆکردنەوەی چەکدا دەستیان هەبووە، دەوڵەت لەوانەیە ئازایەتییەك لە خۆی بنوێنێ و هەندێك لە کەسانی ژێردەست کەلەبچە بکات بۆئەوەی هەڕەشەیەکی کردبێت. بەڵام هەرگیز کاری بەکاری رێبەران نەداوە، چونکە ئەم کارە ریسوایی و رووڕەشی بەدواوەیە و هیچ سوودێکی بۆیان نییە.

سەرەڕای ئەمە، پێیانوایە ئەگەر وەك سەر بە ژێر بەفردا بکەن، دەتوانن بەلا لە خۆیان دوور بخەنەوە. وەك چۆن کۆماری تازە پێگەیشتووی ئیسپانیا لە سێن خۆرخۆ[1] خۆش بوو و ژانراڵە سەڵتەنەت خوازەکانی لە پلەی رێبەرایەتی سپادا هێشتەوە، لە کاتێکدا هەموو کەس دەیزانی ئەوان خەریکن کودەتایەك وەڕێ بخەن. هەر بەمجۆرە، موسولینی هیچ کات بە خاتری توندوتیژی گروپە فاشیستییەکان، کە لە ژێر دەسەڵات و گوێ لە مستی دەستووری ئەو بوون، لێیان نەپرسییەوە. ئەو ئەفسەر و ژانراڵانەی کە بوونە ئەندامی فاشیسم لە سپادا مانەوە. لە ئەڵمانیاش حاڵ و باڵەکە هەر بەم چەشنە بوو. کۆماری ئەڵمان "بۆ دەستەبەر کردنی ئەمنیەتی گشتی"، پاش کودەتای سەرنەکەوتووی ١٩٣٠ و کودەتای بێ ئاکامی هیتلەر لەساڵی ١٩٣٣ لە لودێندۆرف (*Ludendorff*) خۆش بوو. هەروەها، رێبەرانی رێکخراوەی رەشەکوژیی "کۆنسول" کە دەستووری کوشتنی ئێرز بێرگر (*Erzberger*) و راتنائۆ (*Rathenau*)، دوو وەزیری دەوڵەتیان، دەرکردبوو ئازادیان کردن، لە حاڵێکدا، تەواو روون ببۆوە ئەوان لەم کوشتارەدا دەستیان هەبووە و بەرپرس بوون.

جەنابی دەبلیۆ. لە بێرلین چاومان بە بارون فون کیلینگێر (*killinger*) و دوك فون کۆبورگ ( *Duc von coburg*) کەوت کە هەرتکیان رێبەری رێکخراوەی "کۆنسول"–ن. هەرتکیان زۆر بە شانازی و شەرەفەوە و بە تێر و تەسەلی باسی چۆنێتی دەرکردنی حوکمی ئەو رەشەکوژییانەیان کرد و گوتیان تەنانەت هەر لەو رژێمە دیموکراتەی رابردوودا، بە ئاسانی توانیبوویان لەسەر مەسەلەی بەرپرسایەتی خۆیان لە هەمبەر ئەم رەشەکوژییانەدا سەرپۆش دابنێن. راستییەکەی ئەوەیە چاونەترسی ئەوان لەگەڵ ترسنۆکی پیاوانی دەوڵەتیی کۆماری ئەڵمان دەگونجاو یەکتری دەخوێندەوە.

تومازۆی سەگانی. دیموکراتی واش هەبوون نەدەترسان و خەساو نەبوون و بە قیمەتی گیانی خۆیان و قبووڵکردنی زیندان و شاربەدەری و ئاوارەیی بە هەموو ئەسڵێکی باوەڕ و ئیمانی خۆیان وەفادار دەمان. بەڵام ئەمانە تەنیا و تەریك کەوتبوونەوە، ئیتر نەیاندەتوانی پشت بە سەنگەرە سوننەتیەکانی خۆیان، واتە چینی نێونجی و هەروەها کرێکاران، ببەستن، ئەو کرێکارانەی کە هۆمێدی شۆڕشگێڕانەیان جێگای بۆ ناهومێدی چۆڵ کردبوو.

جەنابی دەبلیۆ. پێتان وانییە ئەزموونی ئەڵمان و ئیتالیا عیبرەتێك بێت بۆ دیموکراتەکانی ولاتانی دیکە؟

تومازۆی سەگانی. چ عیبرەتێك؟ تا ئەو کاتە بارودۆخ باش بێت، هەموو دڵنیان هەندێ شت هەرگیز لە ولاتی ئەواندا ناقەومێ، ئەو کاتەش کە رەشەبا هەڵیکرد، هەرکام لە کونێکەوە بۆی دەرباز دەبن. راستییەکەی ئەوەیە کە چینێکی دەسەلاتداری رووەو تیاچوون، راست و رێك تووشی هەموو ئەو نەخۆشیانەی قۆناغی پیری و پەککەوتەیی، یەك لەوان کەرێتی، دەبێت. نێکێر[2] دایم بە گوێی شای دادەدا و لە مەترسی ئاگاداری دەکردەوە، بەلام کەڵکی نەبوو. مەگین باسی ئەو هەموو خەتەر و مەترسییە بە گوێی نیکۆلای دووهەم، قەیسەری رووسیا، نەگەیشتەوە؟ بۆ ئەوەی لەم بەگوێدادان و بە گوێ گەیشتنانە بگات، پێویست بوو چیتر قەیسەر نەبێت. چینێکی دەسەلاتداری رووە و تیاچوون نەك هەر توانا و دەرەتان و ئیرادە و ئازایەتی بەکارهێنانی ئامڕازی دەسەلاتداری و خۆپاراستنی لەبەرامبەر دوژمنی لاسار دەدۆڕێنێ،

بەڵكو تەنانەت توانایی تێگەیشتنی بارودۆخیشی پێنامێنێ و ئیتر ناتوانێ دەسەڵاتی بەسەر بارودۆخێكدا بێت كە بەردەوام لە حاڵی گۆڕاندایە. سەرلەبەری ئەم مەسەلانە رووهێنانە رێگاچارەی توتالیتاریستی ئاسان دەكاتەوە.

جەنابی دەبلیۆ. بۆچی زۆرتر لەبری "فاشیستم" واژەی "توتالیتاریسم" بەكاردێنن؟ نەكا بۆ ئەوە بێت دەتانەوێ كۆمۆنیستەكانیش وەپشت گوێ نەخەن؟

تومازۆی سەگانی. راستە، وایە. جیا لەوە، ناشێت شیمانەی بوونی مەیل و خواستی توتالیتاریستی لە نێو هەندێ دەستەودایرەی دیموكرات و لیبرالیش لەبەرچاونەگرن؟

جەنابی دەبلیۆ. بەراستتانە؟ جگە لەوەی، بەپێی قسەكانی ئێوە، شیمانەیەكی لەمجۆرە بەرای من هەر ناگونجێت و مومكین نییە، بەراستی پێتانوایە دیكتاتۆری دیموكراتیك واهەیە ببێ و بكرێ؟

تومازۆی سەگانی. بۆچی نا. مەبەستی من دیكتاتۆرییەكی لە چەشنی دیكتاتۆری ژاكوبن[٣]- یەكانە، واتە رژێمێك كە بەهۆی دۆخی دواكەوتوویی كۆمەڵانی خەڵك، ئامانجی تەواو دیموكراتیكە، بەڵام شێوازی دژی دیموكراتیك دەگرێتەبەر. لەوانەیە ئەم شێوازە، لە داهاتوو، حازر بەدەسترین شێوازی دەسەڵات بۆ رێبەرانی دیموكراتیكی نەتەوەكانی ژێردەستی زلهێزەكانی دنیا، لە كاتی گەیشتن بە سەربەخۆیی، بێت.

جەنابی دەبلیۆ. ببوورن دەمەوێ باسی شتێك بكەم كە پێوەندی بە شەخسی خۆتانەوە هەیە بەڕای من ئێوە حیزبێكی لەم جۆرەتان پێ باشتر بێت.

تومازۆی سەگانی. ئێستا ئیتر نا. واتە لەو كاتەوەی كە زانیم لە جەنگەی كاردا، وردە وردە ئامراز و كەرەسە جێگای ئامانج و مەبەست دەگرنەوە.

## پەراوێزەكان

١-ژنراڵ خۆزێ خۆرخۆ (*Jose Sanjurjo*)، ساڵی ١٩٣٦، لەگەڵ ژانراڵ فرانكۆ زەمینەی وەدیهاتنی بزوتنەوەی لەشكری ئەفسەرانی ئیسپانیای خۆش كرد.

٢-ژاك نێكێر (*Jacques Necker*)، سیاسەتمەدار و بانكداری دەستڕۆیشتووی سەردەمی لویی شازدەهەم.

٣-ژاكوبن (*Jacobins*)، گروپێكی شۆڕشگێڕی توندڕەو و كۆمارخواز، كە پاش شۆڕشی مەزنی فەرەنسە سەریهەڵداو خوازیاری چەقبەستنی جار لەگەڵ جار زیاتری دەسەڵاتی شۆڕشگێڕانە بوو بۆ گەیشتن بە ئامانجی خەبات دژی نەیارانی شۆڕش.

## سەرچاوە

مكتب دیكتاتورها، اینیاتسیو سیلونە، ترجمەی مهدی سحابی، تهران
نشر البرز، چاپ سوم، ١٣٦٩، صص ٤٧-٣٥

## ئاماژە

سەر لەبەری ئەم كتێبە كراوە بە كوردی و بەم زووانە وەك كتێب، دەكەوێتە بەردەستی خوێنەران.

# كەلتووری كودەتا سەربازییەكان و میلیتاریزەكردنی دەوڵەت!!

كەریم عەبد
لە عەرەبییەوە: ئەدیب نادر

لە بونیادی دەوڵەتی عێراقیدا كەموكووڕیەكی یاسایی هەیە، كە ئەوە كەلتووری توندڕەوی پەسەند كرد. كەلتووری كودەتا و كودەتا چەواشەكان، واتا هەر خۆی بە بەردەوامی ئۆردووی بەكێش دەكرد كە دەست وەربداتە كاروبارە سیاسییەكانەوە، هەتا دەرگاكانی دەوڵەت بەرامبەر بە تانكەكان ئاوەڵا بمێننەوە.

بۆ ئەوەیش كە لە پێشینەكانی ئەم دیاردەیە حاڵی بین، بێگومان دەبێت لێرەدا ئەوە دووپات بكەینەوە: كە كەلتوور شێوازی ژیانە، واتا گشت مرۆڤێك یاخود كۆمەڵگایەك لە میانی شێوازی ژیانییەوە گوزارشت لە چۆنێتی كەلتوور و ئاستەكانی دەكات.

ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێت كە سروشتی سیستەمی دەوڵەت و شێوازی بەدیهێنانی بەڕادەیەكی دیار و بەرچاو كارتێكراو دەبن بە چۆنێتی و ئاستی كەلتووری باوی كۆمەڵایەتی. بەڵام ئەم كەلتوورە لە كوێوە دێت و چۆن پێكدێت؟! لەبەرچیش شەقڵێكی دیاریكراو بەخۆوە دەگرێت؟! چۆنیش دەتوانرێت ئاستی ئەم كەلتوورە بەرزبكرێتەوە بۆ ئەوەی لە كاری دەوڵەت و پەیوەستی بە كۆمەڵگاوە پۆزەتیڤانە رەنگبداتەوە، بۆ ئەوەی لە دەوڵەتی رەعیەتەوە بگۆڕێت بۆ دەوڵەتی هاوڵاتی، بە مانا شارستانیەكەی چەمكی هاوڵاتی؟!

یەكەم: لەلای لایەنە لەبەرچاوگیراوەكاندا تاقە وەڵامێك نییە بۆ ئەم پرسیارانە. بەڵكو فرە وەڵامدانەوە هەیە بەپێی بوونی ئاراستەكانی كۆمەڵگا و رەوتەكانی. ئەم جۆراوجۆرییەیش خۆی بناغەیە بۆ پاساودانی گفتوگۆ و پێداویستییەكەی. بەڵام كەلتووری گفتوگۆ بە سانایی نایەتە دی، ئاتاجی بە قوربانیدان هەیە، چونكە گەیشتن بە ئاستێكی كەلتووری گەشەسەندوو پەیجۆری ئەوە لە

کۆمەڵگا دەکات کە قوربانی بۆ ئەم پێشکەوتنە بدات، بەتایبەتی دوای سەرنەکەوتنی پرۆژە شۆڕشگێڕییەکان کە لە ڕێی کودەتاو بڕیاری بالادەستییەوە تەقەلای پێشخستنی کۆمەڵگایان داو کۆمەڵگایان گۆڕی بۆ حەقلی ئەزموونەکان، ئاکامەکانیش نەگەتیڤ یاخود بە گوزارشتێکی ووردتر کارەساتاوی کەوتنەوە.

دووەم: قەیران لە عێراقدا، وەك کۆمەڵگاو وەك دەوڵەتیش، هۆیەکەی ڕەتکردنەوەی ئەم پرەنسیپەیە، واتا پرەنسیپی گفتوگۆو بەرپرسیارێتی هاوبەش. چونکە هەموو لایەنێك دەیەوێت وەڵامەکان و تێگەکانی خۆی جێگای وەڵامەکان و تێگەکانی دیکە بگرێتەوە.

سێیەم: هەموو وەڵامدانەوەیەکی پرسیارە ناوبراوەکان، وێنایەك بۆ ژیان بە گشتی، بۆ مێژوو و کەلەپوور و ئابووری و ڕۆڵی ئایین و ئاکارو یاساو پەیوەندییە نێودەوڵەتیەکان.. هتد لەخۆ دەگرێت. لەسەر بناغەی ئەم وێناکردنەیشدا دەربڕینی شیکارەکان و پرۆژە سیاسی و فیکرییەکانی قەیرانەکانی کۆمەڵگاو ئاتاجەکانی جێبەجێ دەبن، بۆیە دەبینین کە ململانێی کەلتووری هەمیشە پێشی پێشەوە داگیر دەکات، داگیری دەکات بەو سیفەتەی کە ململانێیەکی ئایدۆلۆژی لێکدوورکەوتنەوەییەو گفتوگۆیەکی کەلتووری نییە کە مەبەستی دۆزینەوەی لەبارترین شەقڵ بێت بۆ بەرژەوەندیەکانی وڵات و کۆمەڵگا، هەروەکو لە کۆمەڵگا دیموکراتییە ژیاریەکاندا ڕوودەدات.

ئەو ئاڵۆزکارییەی کە توندڕەوی هەڵدەگیرسێنێ و تەرخانی دەکات، زۆرجار لە وورد نەبوون لە دیاریکردنی ناونیشانەکان و تێگە وابەستەکان بە بەرژەوەندی کۆمەڵ و پێداویستیەکانیەوە سەرهەڵدەدات. چونکە ئێمە هەردەم دەربارەی ناسنامەی شارستانی ڕژێم و ڕەوایەتییە دەستوورییەکەی و بەرنامە هەلمووسە وابەستەکانی بە بەرژەوەندی هاولاتیان و ئایندەیانەوە نادوێین، بەڵکو دەربارەی (نیشتمانپەروەری) فەرماندە یاخود ڕژێم دەدوێین بەو پێیەی کە ئەو (نیشتمانپەروەرییە) پاساوی بنچینەیی دەسەڵاتە!! بە چەشنێك بۆ فەرماندەی (نیشتمانپەروەر) ڕەوایە وڵات لە کارەساتێکەوە بەرەو کارەساتێك بەرێت و لە ڕژێمەکەیشیدا بمێنێتەوە هەتا دامودەزگای ڕاگەیاندن هەبێت گەواهی بۆ (نیشتمانپەروەری) و (خۆشەویستییە) بێڕادەکەی بدەن بۆ عێراق!! لێرەیشەوە شەڕەنگێزترین گۆڕانکاری لە چەمکی ئەولەویاتەکانی دەوڵەت و ڕژێمێك کە بەڕێوەی دەبات دەستی پێکرد، هێشتایش بەردەوامین بە جوداوازیەوە دەربارەی نیشتمانپەروەری و نانیشتمانپەروەرێتی شا فەیسەڵی یەکەم یاخود عەبدولکەریم قاسم یاخود سەدام حوسەینەوە دەدوێین، بەبێ ئەوەی بپرسین کە ئەو نیشتمانپەروەرێتییە چی پێشکەش کردووە بۆ جێگیرکردنی دابونەریتە دیموکراتییەکان و کەلتوورێکی شارستانی کە دەولەت و کۆمەڵگا ڕزگار دەکات لە بۆحرانە درێژ خایەنەکانی هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی هاوچەرخی عێراقییەوە لە ساڵی ١٩٢١دا!!

ئەگەریش بگەڕێینەوە دواوە، ئەوا دەبینین کە ململانێ لەسەر دیاری کردنی چەمکی ئەولەویاتەکان لە دواییدا نەهاتە ئاراوە، بەڵکە هەر لە ڕۆژەکانی سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتەوە سەری هەڵدا، کە لە ماوەی کۆنگرەی قاهیرەی ئازار (مارسی) ١٩٢١دا کە بە سەرپەرشتی وینستۆن چێرچڵی وەزیری کۆڵۆنیەکانی ئینگلستانی ئەو دەمە و دەستەی

ئەفسەرە بەریتانییە بەرپرسەکانی بەڕێوەبردنی عێراق، بە ئامادەبوونی شازادە فەیسەڵ و جەعفەری عەسکەری و حەزقیال ساسۆنەوە (بڕوانە تاریخ الوزارات للحسنی، بەرگی یەکەم لاپەڕە ٣٥ و دواتر) ڕێکخستنی جێبەجێ کرا، کە تیایدا بەرژەوەندییە بەریتانیەکان داسەپێنران، بە فشاری پێداویستییە ئاسایشییەکەی بۆ دەستبەسەرداگرتنی بارودۆخی نێوخۆ لەلایەن هێزە ناوخۆییەکانەوە، بەخشینی ئەولەویەت بۆ دامەزراندنی ئۆردوو، کە چارەکێك لە داهاتی عێراقی بۆ تەرخان کرا!! کە بوو بە سۆنگەی فەرامۆش کردنی یاخود بەپەراوێزکردنی بایەخدان بە لایەنەکانی دیکەی وەکو پەروەردە و فێرکردن و تەندروستی، بێجگە لە دامەزراندنی پێودانگەکانی پیشەسازی و راپەڕاندنی کشتوکاڵی و ئەوەی کە زۆرجار بە پڕۆژەی گەشەکردن ناو دەبرێت، ئەو کارەی بە جیددی دنەی کۆمەڵە پڕۆتستۆیەکی دا، لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە، دژی خیانەتکردنی ئەو عێراقیانەی لە دامەزراندنی دەوڵەتدا بەشدار بوون، لەسەر بەچێتر زانینی ئەولەویەتە بەریتانییە ئاسایشییەکان لەسەر حسێبی پێداویستییە نیشتمانیە ناسراوەکان و، لە خۆڕایش نەبوو کە پاش سێدەیە لە دامەزراندنی سوپادا (ئەنجوومەنی ئاوەدانکردنەوە) دامەزرا!! کە (ئەنجوومەنێکی ئاوەدانکردنەوە) بوو بەبێ ئەوەی میکانیزمی جێبەجێکردنی هەبێت کە لەسەر ئاستی وڵاتدا پێی ڕاپەڕموێت، بە حوکمی کەمیی کادر و توانستە ماددییە تەرخانکراوەکانی پڕۆژە گریمانکراوەکان!!

بەم شێوەیە لە عێراقدا ئەوەی کە دەکرێت ناوی لێبنرێت ئۆرۆستۆکراتیەتی میلیتاری نەشونوومای کرد، لەبری نەشونوومای بۆرژوازیەتێکی بەرهەمهێن یاخود سەرمایەی کشتوکاڵی گەش و نووماکەر، هەتا کەلتووری سەربازیی دالانەکانی دەوڵەت دابگرێتەوەو وەکو هزرێك و شێوازێکی ڕۆڵ بینین بیگونجێنێ بۆ ئەوەی پتر لە کامپی سەربازییەوە نزیك بێتەوە وەکو ئەوەی لە دەوڵەت و بەپێی ئەو چەمکە یاسایی و دەستووریانەی خەسڵەتە مەدەنیەکانیان هەیە، ئەمەیش دواتر بەردەوام بوو بۆ ئەوەی لەسەر دەستی ڕژێمی بەرقەراربوودا بەهەمان ڕیزبەندی سەربازی و کەلتوورەکەیی و پێداویستییە ئاسایشییەکەیدا پێش بکەوێت کە لە میان ستایشی کەسێتی فەندەمێنتاڵی و بەفیز و لەخۆبایی بوونی ناسراو لەلایەن بڕێك لە ئەفسەرە عێراقیەکانداو، لە میان شکۆدارکردنی (پاڵەوانێتی) و خۆهەڵنانە زەبەندەکانیدا بۆ ئەوەی (مەسەلەی نەتەوایەتی) یاخود درۆ نەتەوایەتیەکان ئەولەویەت داگیربکات، بەر لە چارەسەرکردنی تەنگژەی خانووبەرە و گواستنەوە درێژخایەنەکان لە عێراقدا!! چونکە دەوڵەت دەیان ملیار دۆلار لە پیشەسازی سەربازیدا خەرج دەکات کە دەرەنجامێکی کارەساتاویی لێکەوتۆتەوە، لە کاتێکدا شکستی کشتوکاڵیی گەیشتە پلەیەك پیاز و تەماتە ئیمپۆرت بکرێت!! پرسیارەکەیش ئەوەیە: چۆن ڕژێمێك بۆی دەکرێت لە سەرفیرازکردنی وڵاتێکی عەرەبی داگیرکراودا هاریکاری بکات ئەگەر پەکی کەوتبێت لە سەرفیرازکردنی کۆمەڵگاکەی خۆی لە بۆحرانە ڕۆژانەییە درێژخایەنەکانیدا، کە چارەسەرکردنی مومکینە، بەڵام بەبێ کەڵك و سوود؟! ئا ئەمەیش زۆرجار بە هەڵاتن بەرەو پێشەوە ناودەبرێت، کە ئەوەیش بەڵگەی دەستەنگی ڕژێمە لە بەرەنگاربوونەوەی بۆحرانە ناوخۆییە بەمیرات بۆ ماوەکەی.

ئەگەریش هەروەکو نموونە هێنانەوە، یەکێك لەو مەسەلانەی کە هێشتایش کێشەی لەسەرە، کە

لێرەدا مەبەستمان (مەسەلەی کوردە)، دەبینین کە پێکدادانی تێگەکان لەبارەیەوە پێکدادانێکی توندوتیژ بووە، کە توندڕەوی کەلتووری لە ڕیزی پێشەوە هاتووە و بۆتە هۆی ڕێخۆشکردن بۆ تێکڕای توندوتیژیەکانی داهاتوو، لە ڕووی پۆلیسی و سەربازیشەوە، ئەوەیش ڕەنگدانەوەی سەرجەمی سیاسەتەکانی دەوڵەت بووە، کە دەوڵەتێکی سێنترالّیی ستەمکارانە بوو، کە لە کەلتوورەکەیدا بوار نییە بۆ پڕۆژەی وەکو خودموختاری یاخود هەرشتێکی لەو بابەتە.

هەندێك لە هێزە سیاسیەکان داخوازی چارەسەرکردنێکی ئاشتیانەی مەسەلەی کوردیان کرد، بۆ ڕاگرتنی شەڕی ناوخۆیی بەرپابوو دژی کوردەکان لە ژێر پارێزگاری دەوڵەت و بە یارمەتی ئۆردوو و پۆلیس. ئەم هەندەیش وای بۆ ئەچوون کە پڕۆژەی چارەسەرکردن لە ڕێگەی دەربڕینی دروشمە ڕاستەقینەکانەوە شیاوە، کە ڕەهەندی نیشتمانی و هیومانیان هەیە. ئەمەیش خۆی لە خۆیدا شتێکی گرنگە و لەگەڵ ئەو تێگە یاساییانەدا گونجاوە کە لە جیهانی شارستانیدا کارپێکراون، بەڵام بۆحرانەکە لەوەیش فرە قووڵتر بوو، چونکە بۆحرانێك بوو وابەستە بە بونیادی دەوڵەتی سێنتراڵی و تێگەکانییەوە، کە موفرەداتەکانی جەنگی ناوخۆیی بێ لێبڕ هەبوون و کارتێکەر بوون لە وەزارەتی کەلتوور و ڕاگەیاندن هەروەکو چۆن لە وەزارەتی بەرگری و ناوخۆدا بوون و کارتێکەریان هەبوو، هەمیشە ترسێکی ناڕاستەقینە لە دابەشکردنی عێراقدا پاساوی بۆ دەکرد، زۆر جار لە ڕێگەی دەربڕینی ئەوەی کە ناودەبرێت بە (ئیلتیزاماتی نەتەوەیی عێراق) بەرز دەکرایەوە کە چاودێریکەر ناتوانێت لەوە بگات کە بۆچی هێشتایش ئەو ئیلتیزاماتانە، کە هێندە شتی لەبەردەست نییە جەختیان لەسەردا بکات، دەکەوێتە پێش شتە بایەخ پێدراوەکانی دەوڵەت لەسەر حسێبی مافەکانی هاولاتی و ئازادییە گشتییەکان و کرەك کردنی چارەسەری قەیرانەکانی دیکە و لەگەڵیشیاندا قەیرانی گەلی کورد و تراژیدیا بەردەوامەکەی؟!

بەڵام سەرسامی و پرسیارکردنی وێ ناچێت بەکەڵك بن لێرەدا، چونکە لە هەموو ئەوەدا هۆیەکە تەنها پابەند نەبوو بە بەرزەفت کردنی مافە ڕەواکانی کوردەوە، بەڵکو کەمدەستیی یان نەبوونی کەلتووری یاسایی لە بەرنامەی ئەم دەوڵەتەدا، کردی بە دەوڵەتی تەنگژە بێ چارەسەریەکان و هیچ ئەڵتەرنەتیڤێکیشی نییە بێجگە لە پرۆگرام کردنی تەنگژەکان و ترانسفێرکردنیان بەسەر کۆمەڵگادا، بۆ ئەوەی جەخت لەسەر ئەوە بکات کە دەوڵەتێکە لە توانایدا نییە ماف بە هیچ کەسێك ببەخشێت، کورد بێت یاخود ئاشووری یاخود تورکومان یاخود عەرەب. بەڵکە بەردەوام بوو لە بەرهەمهێنانی پشێوی بەدرێژایی مێژووەکەی لە ماوەی هەشتا ساڵی ڕابوردوویدا کە زیانێکی ڕاستەوخۆی بەسەرلەبەری لایەنەکان گەیاندووە کە لە نێو ئەوانیشدا ئەو توێژانەی کە لە میانی سەردەمە جیاوازەکانەوە بە دەسەلاّت کارتێکراو بوون.

بەڵام لە ڕاستیدا بەرهەمهێنانی پشێوی و بە گشتی کردنی لەسەر هەمووانیدا چی دەگەیەنێت؟! لەبەرئەوەیش کە هێشتا لەمەڕ مەسەلەی کوردەوەین دەتوانین بڵێین: ئەو جەنگە ناوخۆییەی کە دەوڵەت دژی کوردەکان بەرپای دەکات، ئەم دەوڵەتە وا لێ دەکات لەگەڵ سروشتە خودسەرییە قەیراناوییەکەیدا هاوئاهەنگ بێت، پتر لەوەی هیچ چارەسەرێکی دیکە ئەوەی بۆ دابین بکات، ئەوەیش کە بابەتیانە ڕوویدا ئا ئەمەیە کە: لەبەرئەوەی دەوڵەت لەسەر بنچینەیەکی پۆلیسی – سەربازی

بنیات نراوە كە بەرووبوومی داهاتەكان پاڵپشتی دەكەن، بە گوێرەی خۆی پێداویست و پێداگریش نەبوو كە جیددی بێت لە ئافراندنی ڕاپەڕینێكی نەشونوومایی و بازاڕی كاری چالاك و بەتوانست بۆ پێشوازی كردنی بێكاران و نەوە تازەكان، ئەمە بە واتای بەرزكردنەوەی ئاستی بژێوی و ئاستی هۆشیاری پیشەیی و یاساییەوە، هەتاكو ئەوانە سەرجەم ببنە هۆی بەگەڕخستنی خوولی ئابووری نیشتمانی لەناو شار و ئاواییەكاندا، كە دەرگا لە فراژی بۆرژوازیەتێكی بەرهەمهێن ئاواڵە دەكا كە سەرومڕ پێشدەكەوێت و نایشتوانێت بە متمانە بێت لەسەر بەرژەوەندیەكانی ئەگەر بێت و ئامادەییەكی سیاسی ڕێكوپێك و كاریگەری لە نێو كۆمەڵگا و لە نێو دەوڵەت و سێنتەری بڕیارەكاندا نەبێت، ئەمەیش لەسەرەخۆ هەڕەشە لە كڕەكیی كەلتووری و مۆركی پۆلیسی — سەربازی سیستەمی دەوڵەت دەدات، لەبەرئەوە بابەتیانە تەگەرەی وەبەرخرا بۆ نەهێشتنی فراژیكردنی وەكو ئا ئەو بۆرژوازیەتە بەرهەمهێنەرەو، لە جیاتی ئەویش بۆرژوازیەتێكی بیرۆكراتی هاوپەیمانی دامودەزگا ئاسایشی و سەربازیەكان دانرا.

چونكە لەبری گەشونووما، دەوڵەت ئەستەمی نەبینی لەبەردەم ئەو ژمارە بێ هاوتایەی دانیشتوانی بێكار و نیمچە بێكاری گوندەكان، ئە ئاوایش هەمیشە بەردەوام بوو لە كردنەوەی دەرگای كامپەكان بۆیان چ وەكو سەربازی زۆرەملێ و بەویستی خۆ (مكلف و مطوع) بۆ بەهێزكردنی مەیلە سەربازییەكەی لەلایەك و پاڵپشت كردنی پەلامارە بەردەوامەكەی دژی كوردستان لە لایەكی دیكەوە. لێرەیشدا دەتوانین خواست و ویستی شا فەیسەڵی یەكەم بهێنینەوە یاد: (بە ژمارە زێتركردنی هێزی ئۆردوو بەشێوەیەك كە لە توانایدا هەبێت هەموو ڕاپەڕینێكی چەكدارانە سەركوت بكات بەلای كەمەوە لەیەك كاتدا لە دوو ناوچەی لێكدابڕاودا هەڵبگیرسێت).

بەم شێوەیەیش ڕژێمی دەعبا خۆی بە ملكەچی ئامڕازگەلێك دەبینێتەوە كە ڕەنگە هۆشی پێبكات یانێ هۆشی پێنەكات، هەتا لە كارەساتێكەوە بۆ كارەساتێك بەكێشی بكات، لە كاتێكدا كەلتوورە ئاوەژوو بووەكەی لە پاساودانی توندڕەوی و ڕێگاپێدانی بەردەوام بێت، بۆ جێپێدانی لەبری نەشونووما و گفتوگۆی ئاشتیانەو سەقامگیربوون، ئاوا شكۆداركردنی توندڕەوی و فیزو لەخۆبایی بوونی هاودەم بۆ بەرزكردنەوەی مەیلە پۆلیسییە — سەربازییەكان كە خۆی لە خۆیدا دەبێتە بەهایەك بۆ ئەوەی لە بایەخی دیموكراتیەت و كەلتووری یاسایی كەم بكرێتەوە بەو پێیەی گوایە فڕوفێڵ و بێمانایییە.

ئەگەریش بگەڕێینەوە بۆ پرسیارەكانی پێشوو كە ئەوانیش: ئەم كەلتوورەی كە هەموو ئەو تەنگژانە دەگرێتە خۆی لە كوێوە هاتووە؟! و چۆنیش پێكهات؟! و لەبەرچی بەجۆرێكی تایبەتی ئەم شەقڵەی لەخۆگرت؟! بەم شێوەیە دەبینین كە وەرامەكان، یان شێوازەكانی تێگەیشتن و پرۆژەی ئەو چارەسەرانەی كە لە بەرامبەر ئەم پرسیارە — دیاردانەدا خۆیان دەربڕی، جیاوازبوون، هەیە پێی وایە كە ئەمە هەمووی لە دووتوێی ناونیشانی ململانێی چینایەتیدا جێگیر دەبن، یاخود هەبێت ئەوە بەدی بكات كە سەرلەبەری مەسەلەكە خودانی مۆركێكی چارەنووسییە، یاخود هۆیەكەی ئەوەیە كە كۆمەڵگا لە ئایین دووركەوتووەتەوە، یاخود سێیەمین كەس بە هۆیەكانی شكست و ئەو دابڕادابڕیەی ڕاڤەكردووە كە نەتەوەی عەرەب لە سایەیدا دەناڵێنێ.

بەلام هەر کۆمەڵگایەك لەم جیهانەدا، لە کۆمەڵگای عێراقیی دارما و بگوزەریم، نابێت بکرێت بە حەقلی ئەزموونکاری، بۆ ئەوەی تاقمەکان دوابەدوای یەکدا بێن و چارەسەرەکان لەسەر پاشماوە و شوێنەوارەکانیدا تاقیبکەنەوە، چونکە ئەمە مەسەلەیەکە کۆمیدیایەکی ڕەش داگەڕاو دەگرێتە خۆی، بەلام موخابن کۆمیدیایەکی واقیع ئامێزە!! چونکە ئەم تاقمە عێراقیانە، هەروەکو دۆخیان لە کۆمەڵگا لێکچووەکاندا، مەحکووم بە مەیلی سەنگەرگرتن و دوورکەوتنەوە مانەوە، بەڵکە تۆقین لە ئیترانی جوداواز و، هەموو وەرامێکیش مایەوە بەوەی کە قەیرانەکە لە یەك لاوە بەدی بکات و هەروەها ئەوەیش بەدی بکات کە وەرامەکانی دیکە هەڕەشە لە بوون و گەوهەری خۆی دەکات!! ئەم هەموو پاشەکشەیەیش خۆی ڕووخساری سیاسی دواکەوتنی کەلتووری یاساییە هەروەکو چۆن دوایی تر بوو بە دەستەواژەیەك سەبارەت بە قەیرانی بونیادی حیزبی لە بناغەوە، هەروەکو لە پەراگرافێکی دواتردا ئەوە دەخەینە ڕوو.

هیچ کۆمەڵگەیەك نییە ئارەزووی ئەوە بکات کە بە دواکەوتوویی بمێنێتەوە، بەلام میکانیزمی ئەم دواکەوتنەی کە لە سەردەمی عوسمانیەکانەوە ماونەتەوە و ، ئێستای ململانێی نێودەوڵەتی لەسەر دەسەلات و بەرژەوەندیەکان لە جیهاندا، خۆی سەرومڕ دەبێت لە حوکم کردن بەسەر هاوکێشەی کۆمەلایەتیدا ئەگەر بێت و هەڵوەشاندنەوەی لە ناواخنەوە نەیەتە دی.

ڕژێمی ئێستای بەغدا لەگەڵ خۆیدا یەکێك لەو وەلامانەی هێنا، ئەزموونیش بە ڕاستییە مەلمووسەکانەوە سەلماندی کە ئەوە یەکێك بوو لە شێواوترین و دواکەوتووترین و خەتەرناکانەترین وەلام.

لەبەرئەوە ئەم ڕژێمە هەستا بە پەرەپێدانی مەیلی پۆلیسی_ سەربازی و بە پرۆگرام کردنی لە ڕووی کۆمەلایەتییەوە، بە تایبەتی لە کۆتایی هەفتاکانەوە و، بە قاڵبێکی زۆر بەلەز، میکانیزمەکانی بە پەراوێز کردن و دوورخستنەوە و سڕینەوەی سەرلەبەری لایەنە نیشتمانیەکانی دیکەی داهێنا، بە تەرخانکردنی دیاردەیەکی خەتەرناك کە لە جیهانی سێیەمدا بۆتە شتێکی ناسراو، کە ئەویش دیاردەی ڕژێمی پۆلیسییە لەو بابەتەی کە کاتێك دەڕووخێت هەڵوەشاندنەوەی پێکڕا هەڕەشە لە دواڕۆژی دەوڵەت و نیشتمانیش دەکات، بە تەرزێك کە لایەنەکانی دیکە خۆیان لە دوورگە سیاسییە دابڕاوەکاندا ئەبیننەوە و ڕووبەڕووی پاشماوەی دەوڵەتێك ئەبنەوە کۆکردنەوە و چاککردنەوەی کارێکی سانا نییە، هەروەکو لە سۆماڵیا و ئەفگانستاندا ڕوویدا.

عێراقیش خەریکە دەبێتە نموونەیەکی دیکەی پتر بە ئاژاوە و دارمان و خەتەرناك بۆسەر (بەرژەوەندیەکانی) چەندانێك لە لایەنە ناوچەیی و نێودەوڵەتیەکان، کە لە بەردەمیاندا، لە سۆنگەی پەرش و بلاوی ئۆپۆزیسیۆنی عێراقی و لێکدابڕاوییەوە، شتێکی ئەوتۆ بەدی ناکات، جگە لە هێشتنەوەی ڕژێم و لە هەمان کاتدا درێژەدان بە (بەرەنگاری) لەگەڵیدا، لە چاوەدوویی هەڵبژاردنی ئەڵتەرنەتیڤ_ لێکچوویەك لە ناوەوەی دەزگاکانی خودی ڕژێمدا!! واتە دیسان ئۆباڵ دانەوە بە ئۆردوو. هەر ئەمەیش بوو کە ڕژێم زوو دەرکی پێکرد، بۆیە دەستی کرد بە گۆڕانکاریی چۆنێتی لە دابوونەریتی ئۆردووی عێراقی، بەوە توانستی بەرپابوونی کودەتایەکی سەربازی لە دژی خۆیدا شکاند، بە خستنی چارەنووسی ئەفسەرە گەورەکان لەژێر بەزەیی دەزگاکانی موخابەرات کە

ڕاستەوخۆ بە سەدام حوسێنەوە وابەستەیە کە بەرزترین پایەی سەربازی بەخۆی بەخشی بەبێ ئەوەی لە ڕاستیدا تاقە ڕۆژێکیش لە ئۆردوودا خزمەتی کردبێت.

لە گاڵتەجاڕیەکانی ئەزموونیش، ساڵەهایە، ئاهەنگ گێڕان لە یادەوەری دامەزراندنی ئۆردوودا بۆتە دنەدەری تاڵاووژان، لەبەرئەوە خەونی سەربازی عێراقی، ئەفسەر بێت یاخود سەرباز، بووەتە هەڵاتن لە عێراقیش نەك بە تەنها لە ئۆردوو!! بەڵگەیش بۆ ئەوە بوونی هەزارەها سەربازە لە دەرەوەی عێراقدا کە لە ناویشیاندا ژمارەیەکی بەرچاو و دیار هەن لە گەورە ئەفسەران، ئەمە دوای ئەوەی ژمارەیەك لە پابەندانی ڕژێم کە دوا بە دوای یەك وەزارەتی بەرگرییان گرتەوەخۆ کە پایەیان لە نێوانی جێگری عەریف و مۆتۆڕ سواردا بوو، کە ئابڕووی ئۆردووی عێراقیان لەکەدار کرد بە لاپەڕەی ڕەش و نەنگاوەری جینۆسایدی گەلی کورد و بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی دژی مەدەنییە بێ دیفاعەکان، سەرباری قەسابخانە و ئەتککردنی شار و موقەدەساتە ئیسلامیەکانیش کە لە میانی سەرکوتکردنی ڕاپەڕینی ئازار (مارسی) ١٩٩١دا ڕوویدا کە زۆربەی شارەکانی گرتبووە بەر.

ڕوواو ڕووی ئەمانەیش هەموو، ئەو پرسیارە هەرە بە بایەخانەی ڕووبەڕووی ئەفسەرە عێراقیەکان ئەبنەوە ئەوەن کە: گەلی عێراق چ کەڵکێکی بینیووە لە دەستێوەردانی ئۆردوو لە سیاسەتەوە؟! و چی دەستگیری ئەفسەران خۆیان بووە لە کودەتا و کودەتا چەواشەکانەوە؟! و ئێستایش (ئەفسەرانی ئازاد_ الضباط الاحرار) لە کوێندەرێن چارەنووسیشیان چییە؟!

ئایا چەرمەسەریەکانیان هاوتای یەك نەبوو سەرباری هەموو ئەو ناکۆکیانەی کەوتە میانیانەوە؟! ئایا گەلی عێراقی نرخی تێوەگلانیانی لە سیاسەتەوە نەداوە و هێشتایش هەر نایدات؟! کەلتووری کەسایەتیە تەماکارەکان و سەرەڕۆییە سەربازییەکانیان بە کوێمان ئەگەیەنێ؟! ئەگەریش بۆ هەندێك لە ئەفسەرەکان بلوێت هاریکاری بکەن لە ڕزگارکردنی عێراق لە کابووسی ڕژێمی حاڵدا، ئایا خۆیان سەرلەنوێ بە دەسەڵاتەوە هەڵدەپەسێرن، هەتا ڕاڕایی و پشێوییەکان هەتاوەکو بێکۆتایی بەردەوام بن؟! لە ڕاستیشدا چی دەمێنێتەوە دوای ئەمانە هەمووی لە تێگەی نیشتمانپەروەری؟!

بەڵام ئەو پرسیارانەی کە دەکرێ هەنووکە خۆیان بخەنە بەردەم ئۆپۆزیسیۆنی سیاسیەوە، لە ڕاستیدا هەر پرسیارە دێرینەکانن، پرسیارەکانی خودی واقیعن بە سیفەتی ئەوەی واقیعێکی بێبەرەییە لە بۆتەی هاوکێشە حاڵیەکانیدا، لە توانای کەسیشدا نییە بە ئارەزووی خۆی دەساژۆی بکات. ئەگەریش پرۆسەی ڕووخاندنی ڕژێمی حاڵی"سەرەتا" بێت بۆ هەموو چارەسەرێکی ئایندەیی لەبار، لەگەڵ ئەوەیشدا ووتنی ئەوەی هێشتنەوەی ڕژێم پەسەندکراوترە لە ڕووخاندنی کە دەبێتە هۆی، هەروەکو هەندێك گریمانی دەکەن، شەڕی ناوخۆیی و هەڵوەشاندنەوەی عێراق یاخود دابەش کردنی، ئەوە وتەیەکی بێ جێ و مانایە لەڕووی یاساییەوە، واقیعیش نییە لەڕووی سیاسیەوە.

بێجێیە لە ڕووی یاساییەوە، چونکە نالۆژیکی و نائاکاریشە هێشتنەوەی گەلی عێراق لە ژێر بەزەیی یەکێك لە دڕندەترین ڕژێمەکان لە مێژووی مرۆڤایەتیدا. هەروەها لە ڕووی سیاسیشەوە بێجێیە، چونکە بوونی ئەم ڕژێمە خۆی عێراقی هەڵوەشاندەوە و لەژێر کۆنترۆڵی خۆیدا شەڕی ناوخۆیی بەرپابووی لە نێوانی توێژی

حوكمڕانەكان و كۆمەڵگای عێراقیدا بە گشتی دنەدا. قەیرانەكەش چارەسەر ناكرێت و بەرپرسیارەكانی وەئەستۆ ناگیرێت تەنها لەلایەن ئۆپۆزیسیۆنێكی نیشتمانیەوە نەبێت كە پرۆژەیەكی دیموكراتیانە وەخۆ بگرێت و عێراق بە دەوڵەت و كۆمەڵگاوە لە هەموو كردەوەیەكی تۆڵە ئەنگێز یاخود پرۆژەكانی دابەش كردن بپارێزێت، بە چەشنێك كە بتوانێت هۆكاری دەرەكی لەسەر ئاستی عەرەبی و نێودەوڵەتیدا بخاتە كار بۆ بەرژەوەندی پرۆژە دیموكراتییە ئاشتیخوازیەكەی، برینی ڕێگاش لەبەردەم گشت توێژێك یان دەستەیەك كە دەیەوێت عێراق بخاتە نێو هەراج كردنە نێودەوڵەتیەكان لە پێناوی ویستە خودییەكان كە بە دەمامك گەلێكی جیاوازەوە مەبەستی دەستبەسەرداگرتنێكی نوێتر بێت، بەلاّم بریتی بێت لە گەوهەری ڕژێمی حاڵی حازر خۆی.

تالاّوەكانی ئەزموونی عێراقی ڕۆنانی چەمكێكی یاسایی ڕوون (بۆ نیشتمانپەروەری) لە هەمووان دەخوازێت لەبەر ڕۆشنایی ئیلتیزامی هەموو هاونیشتمانێك بە یاساكانی دەوڵەتی مەدەنییەوە، كە جیاكردنەوە لە نێوان كۆمەڵگای مەدەنی بە دامودەزگا خۆماڵییە فرە شێوەكانیەوە، لە نێوان كۆمەڵگای دەوڵەت یاخود كۆمەڵگای سیاسیەوە جێبەجێ دەبێت و، لە نێوان كاروباری سەربازی و توانستی ئەفسەرەكان لە ناوەوەی كەمپەكان و گرنگییەكانی بەرگری ئۆردوو، چونكە دەوڵەت خۆی بناغەیە، كەمپیش بەشێكی پابەندە پێیەوە نەك بە پێچەوانەوە. ڕەوایش نییە عێراق بگۆڕدرێت بۆ كامپێكی سەربازی و عێراقیەكانیش لەژێر "گەهی گشتی_انذار جیم" دا بمێننەوە بەناوی بیانووە نەتەوەییە درۆزنەكان كە لە خراپترین شێوەی درۆدا بێت.

## كریم عبد:

لەدایكبووی ساڵی١٩٥٢ لە عێراقدا. لە ناوەڕاستی حەفتاكانی سەدەی پێشووەوە كەوتووەتە بلاّوكردنەوەی بەرهەمە ئەدەبی و ڕەخنەییەكانی. لە ساڵی١٩٧٩دا عێراقی بەرەو تاراوگە بەجێهێشتووە و گرنگترین دەنگی ئەدەبی و ڕۆشنبیری هەشتاكانی تاراوگەیە. هەتا ئێستاكێ چەندەها كۆمەڵە شیعر و چیرۆك و كورتە ڕۆمانی بەچاپ گەیاندووە و دەستێكی باڵای هەبووە لە ڕاپەڕاندنی چەندین چالاكی ڕۆشنبیری و ئەدەبی لە تاراوگە و حاڵی حازریش لە شاری لەندەن نیشتەجێیە.

## سەرچاوە


كريم عبد: الدولة المأزومة و العنف الثقافي
عراق ما بعد الحقبة الثورية و أسالة المستقبل
ص٤٩_٦٠
دار الفرات للنشر و التوزيع_ بيروت_ لبنان ٢٠٠٢

# زمان و کلتور

## کلتور چییە؟

**جۆن لاینز**

له ئینگلیزییەوە: هادی محەمەد

وشەی "کلتور" (وە هاوتاکەی لە زمانە ئەوروپییەکانی تردا) چەند مانایەکی پەیوەندیداری هەیە کە لێرەدا بۆمان گرنگە دوان لەوانە ناوزەد بکەین و لێکیان جیابکەینەوە.

بەر لە هەموو شتێك، واتایەك هەیە کە تیایدا "کلتور" کەم تا زۆر ئاوەڵواتای "شارستانیەت"ە، وە لە دارِشتنێکی کۆنتر و توندرِەوانەی هاودژەکەیدا، پێچەوانەی "بەربەریەت"ە. ئەمە ئەو واتایەیە کە لە ئینگلیزیدا کارایە لە ئاوەڵناوی "*cultured*"دا (رۆشنبیر یان بە ئەدەب -و-). دواجار ئەمە دەوەستێتەوە سەر وێناکردنی کلاسیکی بۆ ئەوەی کە چ شتێك خاوەن ئیمتیاز (*excellence*)ە لە هونەر و ئەدەب و ئاکار و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکاندا. پاش ژیاندنەوەی لەلایەن مرۆڤپەروەرانی رێنیسانسەوە، چەمك و وێناکردنی کلاسیکی لە لایەن بیریارانی رۆشنگەری سەدەی هەژدەیەمەوە جەختی لێکرایەوە و بەسترایەوە بە تێرِوانینیان بۆ مێژووی مرۆڤایەتی وەکو پێشرِەوی و پەرەبەخۆدان.

+ ئەم تێرِوانینە بۆ مێژوو لەلایەن هێردەرەوە، هەروەکو زۆر لە ئایدیاکانی رۆشنگەری، بەرەنگاری کرایەوە، ئەو هێردەرەی کە سەبارەت هاوتا ئەڵمانیەکەی ووشەی "کلتور" دەڵێت "هیچ شتێك لەم وشەیە درِدۆنگتر نییە، وە هیچ شتێکیش لە پیادەکردنی بەسەر هەموو نەتەوە و زەمەنەکاندا چەواشەکەرتر نییە". ئەو بەشێوەیەکی تایبەت رەخنەئامێز بوو لە بەرامبەر ئەو گریمانەیەدا کە کلتوری ئەوروپی سەدەی هەژدەیەم، کە ئایدیا فەرەنسیەکان و زمانی فەرەنسی باڵادەستبوە بەسەریدا، ئاستی باڵای پێشرِەوی و پێشکەوتنی مرۆیی دەنوێنێت. لەم بارەیەوە جێی سەرنجە تێبینی ئەوە بکەین کە گوزارشتی "*langue de culture*" کە وەرگێرِانە حەرفییەکەی "زمانی

کلتور"ە، بەشێوەیەکی باو لەلایەن لێکۆڵیارە فەرەنسی زمانەکانەوە بۆ جیاوازیکردن لە نێوان ئەو زمانانەدا کە لە ڕووی کلتورییەوە بە پێشکەوتووتر و ئەوانەی بە کەمتر پێشکەوتوو لە قەڵەم دەدرێن، بەکار دەبرێت. هەروەها گوزارشتی "*Kultursprache*" لە زمانی ئەڵمانیدا بە هەمان شێوە بەکاردەهێنرێت. هەرچەندە هاوتایەکی قبوڵکراو نییە لە ئینگلیزیدا، ئەو هەڵوێستەی کە بەکارهێنانی وەها گوزارشتگەلێکی لەسەر دەوەستێت کەمتر باو نییە لە کۆمەڵگە ئینگلیزی زمانەکاندا. هەروەکو لە نەسکێکی پێشودا بینیمان، زۆرینەی زمانناسان لەمڕۆماندا ئەو تێڕوانینەیان هەیە کە زمانی سەرەتایی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەم پرسە شایانی سەیرکردنەوەیە لەگەڵ گەڕانەوەیەکی تایبەت بۆ ئەو شتەی کە دەکرێت ناوی لێ بنێین چەمك یان وێناکردنی کلاسیکییانە بۆ کلتور. لە خوارەوە ئەمە ئەکەین.

+ بە درێژایی زۆربەی ئەم نەسکە، دەبێت وشەی "کلتور"، نە بە واتا کلاسیکییەکەی راڤە بکرێت، بەڵکو بەو واتایەی کە دەکرێت درشتانە (واتە نەوەك کتومت -و-) بە واتا ئەنسرۆپۆلۆژییەکەی وەسف بکرێت. بە فیعلی ئەمە ئەو واتایەیە کە هێردەر پێشنیاریکردووە پێویستە زاراوەکەی پێ بەکاربهێنرێت" بەڵام نزیکەی هەشتا ساڵ دوای ئەوە ئەو ئەنسرۆپۆلۆژیستانەی بە ئینگلیزی ئەنوسن ئەم بەکارهێنانەیان پەیڕەو کرد. لەم واتایەی دووەمدا، "کلتور" بەبێ هیچ مانایەکی زەمەنی بۆ پێشڕەویکردنی قۆناغ بە قۆناغی هێڵئاسای مرۆڤ لە بەربەریەتەوە بۆ شارستانیەت، وە بەبێ هیچ حوکمدانێکی بەها ئامێزی پێشوەخت سەبارەت بە چلۆنایەتی ئیستاتیکی و فیکری هونەر و ئەدەب و دامەزراوەکان و....هتدی کۆمەڵگەیەکی دیاریکراو، بە کاربراوە. لەم مانایەی زاراوەکەدا، کە لە ئەنسرۆپۆلۆژیاوە تەشەنەی بۆ زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تر کردوە، هەر کۆمەڵگەیەك کلتوری خۆی هەیە" وە پێدەچێت لقە گروپە جیاوازەکانی ناو کۆمەڵگەیەك لقەکلتوری ناوازەی تایبەت بە خۆیان هەبێت. برەوپێدانی هێردەر بۆ وشەی "کلتور" بەم واتایە بەستراوەتەوە بە تێزەی ئەوەوە بۆ پشتپێکبەستنی زمان و کلتور لەلایەکەوە و وە لەلایەکی ترەوە بەستراوەتەوە بەو تێڕوانینەی ئەوەوە کە زمان و کلتوری نەتەوەیەك دەرکەوتەکانی ڕۆح یان عەقڵی ناوازەی نەتەوەیی ئەو نەتەوەیەن. زۆر نوسەرانی تری بزوتنەوەی رۆمانتیکی هەمان بیروبۆچونیان هەبووە. ئەمە هێڵێکە لە پەرەسەندنی مێژویی ئاڵۆزی ئەوەی بە گریمانەی ساپێر-ۆرف ناودەبرێت کە نەوەیەك لەمەوبەر زاڵبووە بەسەر هەموو باسەکانی سەبارەت بە زمان و کلتور هەروەکو چۆن زاڵبوو بەسەر باسەکانی زمان و فیکردا.

+ هەرچەندە زاراوەی "کلتور" ئێستا بەشێوەیەکی بەرفراوان لە زانستە سروشتیەکاندا، بەتایبەت لەلایەن ئەنسرۆپۆلۆژیستانەوە، بەکاردەبرێت بەو مانایەی کە هەر ئێستا دەستنیشانکرا، دەکرێت، بەشێوەیەکی تەکنیکی بە چەند رێگەیەکی جیاواز پێناسە بکرێت. بەپێی ئەو پێناسەیەی کە ئێمە دواتر ئیشی لەسەر ئەکەین، ئەکرێت کلتور وەکو مەعریفەیەکی کۆمەڵایەتییانە - وەرگیراو وەسفبکرێت" واتە وەکو ئەو مەعریفەیەی کە کەسێك بە فەزڵی ئەندامبونییەوە لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا هەیەتی (هدسن ١٩٨٠: ٧٤) پێویستە لێرەدا دوو خاڵ سەبارەت بە بەکارهێنانی وشەی "مەعریفە" باسبکرێت. یەکەم دەبێت وا لێی تێبگەین کە هەردوو مەعریفەی پراکتیکی و پرەپۆزیشناڵی دەگرێتەوە: واتە هەردوو" زانینی

کردنی شتێك و زانینی ئەوەی کە شتێك وایە یان وا نییە. دووەم" ئەوەندەی پەیوەندی بە مەعریفەی پرەپۆزیشنالییەوە هەبێت، ئەو حەقیقەتەیە ئەو شتەی کە بەڕاست دادەنرێت، ئەوە بە هەند وەردەگیرێت، نەوەك راستبوون یان هەڵەبونی فیعلی ئەو شتە. لەوەش زیاتر، بە نیسبەت زۆربەی کلتورەکانەوە، ئەگەر هەمووشیان نەبێت، پێویستە رێگە بەجۆر یان ئاستی جیاواز لە راستی (*Truth*) بدەین" بۆ نمونە کە راستی تەسریحێکی ئاینی یان میتۆلۆژی بە شێوەیەکی جیاواز لە راستی بەلاغێکی حەقیقەتئامێزی راستوڕەوان هەڵدەسەنگێنرێت. ئەگەر لەم گۆشەنیگایەوە سەیری بکەین، زانست خۆشی بەشێکە لە کلتور. وە لە گفتوگۆکردندا لەسەر پەیوەندی نێوان زمان و کلتور نابێت مەعریفەی زانستی لەبەرتر لە مەعریفەی ئیدراکی هاوبەش یان گشتی (*Common-Sense*) یان تەنانەت لە خورافەش، دابنرێت.

+ بووەتە نەریت کە جیاوازییەك بکرێت لە نێوان گواستنەوەی کلتوری و بایۆلۆژی (واتە جینی). ئەوەندەی پەیوەندی بە زمانەوە هەبێت، زۆر مومکینە کە بەهرەیەکی فیتری (*innate*) هەبێت بۆ وەرگرتنی زمان (أکتساب اللغة). بەدەر لەوەی ئەمە وابێت یان نا، مەعریفەمان بۆ زمانی دایکمان لە ڕێگەی کلتورەوە ئەگوازرێتەوە: ئەو مەعریفەیە بە فەزڵی ئەندامبونەوە لە کۆمەڵگەیەکی دیاریکراودا وەردەگیرێت، ئەگەر بەزەرورەت مەسەلەکە فێربونیش نەبێت. سەرەڕای ئەوەش، تەنانەت ئەگەر بەهرەیەکی زمانی لە ڕێگەی جینەوە — گوازراوەش هەبێت، ئەمە وەرگرتن و زانینی زمانێکی لێناکەوێتەوە ئەگەر ئەو داتایەی کە بەهرەی زمانەکە ئیشی لەسەر ئەکات لەلایەن ئەو کۆمەڵگایەوە دابین نەکرێت کە منداڵەکەی تێدا نەشونما ئەکات وە لە هەلومەرجێکدا، کە ئەمەیان جێگەی ئارگیومێنت لەسەرکردنە، کە کاریگەری قورس بەسەر پێشکەوتنی ئیدراکی و سۆزداری منداڵەکەوە بەجێنەهێڵێت. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ئەوەی کلتورییە و ئەوەی بایۆلۆژییە لە زماندا پشتپێکتربەستون. لە راستیدا، گەر بیری لێبکەینەوە ئاشکرا دیارە کە توانستی زمانی کەسێك، بە چاوپۆشی لە بنەمای بایۆلۆژی ئەو توانستە، دەکەوێتە نێو مەودای پێناسەمانەوە بۆ کلتور. وە ئەگەری ئەوە زۆرە کە تایپەکانی تری مەعریفەی کۆمەڵایەتییانە وەرگیراو — لەوانە ئەفسانە، بیروبڕوای ئایینی و هتد — هێندەی زمان بناغەی بایۆلۆژی تایبەت بە مەخلوقات (انواع *species*) یان هەبێت. پێویستە ئەم خاڵەمان لەپێشچاوبێت لە کاتێکدا کە وەرگرتن و بونیادی زمان رەچاو دەکەین، لە رووی بەرامبەرکێ (المقابلة)ی نێوان ئەوەی بایۆلۆژییە و ئەوەی کلتورییە. ئیتر چیدی مومکین نییە بەزمانی جیاوازییەکی زەق لە نێوان سروشت (*nature*) و پەروەردەکردن (*Nurture*)دا بیربکەینەوە.

## گریمانەی ساپێر-وۆرف

ئێدوارد ساپێر (١٨٨٤-١٩٣٩)ی گەورە زماناس و ئەنسرۆپۆلۆژیستی ئەمریکی و بنجامین لی وۆرف (١٨٩٧-١٩٤١)ی قوتابی ئەو، میراتگری تراديسيۆنێك بوون لە فیکری ئەوروپیدا (کە ئەگەری ئەوە زۆرە فرانز بواز بکەوێتە نێوەندی ئەو دووانەوە ١٨٤٨-١٩٤٢) کە هەروەکو بینیمان رۆڵێکی گرنگی بینی لە سەرهەڵدانی بونیادگەریدا. ئەم تراديسيۆنە لانیکەم دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمانی هێردەر، وە ویلهلم ڤۆن هەمبۆڵدتیش یەکێك بووە لە کۆنترین و بە نفوزترین نوێنەرەکانی. نیشانەی جیاکەرەوەی ئەم تراديسيۆنە جەختکردنیەتی لەسەر بەهای

ئیجابی فرە جۆرێتی کلتوری و زمانیی، وە بە شێوەیەکی گشتی هۆگربوونی بە پرەنسیپەکانی ئایدیالیزمی رۆمانتیکییەوە.

+ سەرباری دوژمنایەتیی لەگەڵ کلاسیزم و یونیڤێرساڵیزم (گەردونایەتی) و هزرایی (*intellectualism*) لە رادەبەدەری رۆشنگەریی، ترادیسیۆنی هێردەر – هەمبۆڵدت ئەو دوژمنایەتییەی نەگەیاندوەتە ئاستی راگەیاندنی ئەوەی شتە یونیڤێرساڵییەکان (گەردونییەکان) لە زمان و کلتوردا بوونیان نییە. لانیکەم هەمبۆڵدت بوونی هەردوو گەردونی و تایبەتی لە زماندا جەختکردووەتەوە. ئەو فرەجۆرێتی بونیادی زمانەکانی (واتە فۆرمی ناوەکییانی) وەکو بەرهەمی بەهرەیەکی عەقڵ کە گەردونیانە کاراو چالاکە و بەشێوەیەکی تایبەت مرۆییە، سەیردەکرد. لەبەر ئەم هۆیەیە کە چۆمسکی توانی سەرەتاکانی زایەندگەرایی (*generativism*) و بەشێوەیەکی تایبەتتر سەرەتاکانی تێگەی خۆی بۆ ئیبداع (*creativity*) لە هەمبۆڵدت ("کە پێگەی ئەو راستەوخۆ دەکەوێتە ناو دژە تەوژمی فیکری راشناڵی و رۆمانتیکییەوە وە کە کارەکەی لە زۆر رووەوە خاڵی ترۆپك و کۆتایی ئەو پێشکەوتنانەیە" چۆمسکی ١٩٦٦: ٢)دا ببینێتەوە. ئەمە هەر چۆنێك بێت. ڤێرژنی وێناکردنی هێردەر – هەمبۆڵدت بۆ پەیوەندی نێوان زمان و فیکر کە سەرناوی "گریمانەی ساپێر – وۆرف"ی لەلایەن زمانناس و ئەنسرۆپۆلۆژیست و دەروونناسە ئەمریکییەکانەوە لە پەنجاکاندا بۆ لێنراوە، عادەتەن بەستراوەتەوە بە تێزەی رێژگەرایی زمانییەوە[1]. هەرچەندە ئەمە لە خۆیدا هاوەڵێکی لکاوی پێویستی بونیادگەرایی نییە، ئەم تێزەیە یەکێك بوو لە گەشترین سیماکانی ڤێرژنە ئەمریکییەکانی، لەوانە ڤێرژنی قوتابخانەی پۆست بلومفیلدی.

+ هەروەکو پێشتر بینیمان، هێردەر قسەی لەسەر پشتپێکتر بەستنی زمان و فیکر دەکرد. هەمبۆڵدت لە رێبازی حەتمیەتی زمانیی[2] (واتە ئەوەی کە زمان فیکر دیاری دەکات –و–) نزیکتر دەبێتەوە. گریمانەی ساپێر – وۆرف، هەروەکو عادەتەن بەمشێوەیە دەخرێتەڕوو، رێبازی حەتمیەتی زمانیی بە رێژگەرایی زمانیی (*Linguistic relativity*)ەوە دەبەستێتەوە (سنورێك نییە بۆ فرەجۆرێتی ستراکتۆریی زمانەکان). دەکرێت گریمانەی ساپێر – وۆرف لە توندترین ڤێرژنیدا بەم شێوەیەی خوارەوە دەربڕدرێت:

أ–ئێمە ئێستا و بۆ هەتا هەتایە لە هەموو بیرکردنەوەماندا "لە ژێر رەحمەتی ئەو زمانە دیاریکراوەداین کە بووەتە ناوەندی دەربڕین و گوزارشتکردن بۆ کۆمەڵگاکەمان" چونکە تەنها ئەوەمان لەدەستدێت ببینین و ببیستین یان ئەگەر واش نەبێت ئەزمونبکەین لە رووی ئەو کاتیگۆری و جیاوازیانەوە کە لە زماندا کۆد کراون.

ب–ئەو کاتیگۆری و جیاوازیانەی کە لەیەك سیستمی زماندا کۆدکراون خەسڵەتی بێوێنە و بێهاوتای ئەو سیستمەن و قابیلی پێوانەکردن و بەراوردکردن نین بە هەمان ستاندەر (*incommensurable*)ی ئەوانەی سیستمەکانی تر.

+ روون نییە کە چ ساپێر یان ۆرف رایان لە گریمانەکە ئەبوو لەم شکڵەیدا. هەرچەندە من گوزارشتەکانی ساپێر خۆیم تێکهەڵکێشی ئەو داڕشتنەی سەرەوە بۆ تێزەی حەتمیەتی زمانی، کردووە، ئەو بڕگە بەناوبانگەی کە ئەو گوزارشتانەی تێدا هاتوە (١٩٤٧: ١٦٢) چەند گوزارشتێکی

پارسەنگدەریشی تێدایە كە لە زەحمی ئەو گوزارشتانە كەمدەكەنەوە.

+ شایانی تێبینیكردنە ڤێرژنی توندڕەوانەی گریمانەكە كە ئەمێستا خرایەڕوو، ئەگەرچی بەسەختیش داڕێژراوە، لە خۆیدا ئەگەری جووتزمانیی (*bilingualism*) وەدەرنانێت. پێدەچێت یەكێك بێت و ئارگیومێنتی ئەوە بكات كە كەسی قسەكەر بە دوو زمان دوو تێڕوانینی لەگەڵیەك ڕێكنەكەوتووی هەیە بۆ جیهان و لە یەكێك لەو تێڕوانینانەوە دەیگۆڕێتە سەر ئەویتریان هەر كە لە زمانێكیانەوە دەیگۆڕێتە سەر ئەویتریان. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر راستبێت، گریمانەكە لە فۆرمە توندەكەیدا لە ململانێدایە لەگەڵ ئەو راستییە ئاشكرایەدا كە كەسانی جووتزمان هیچ نیشانەیەكی ئاشكرای ئەوە نیشان نادەن كە ئیشكردنیان (رەفتاركردنیان –و–) تێڕوانینی ریشەییانە ناتەبای بۆ جیهان پێوە دیارە، وە زۆر جار بانگەشەی ئەوە ئەكەن كە ئەتوانن هەمان شت بە هەركام لە دوو زمانەكە بڵێن. وەرگێڕەكانیش، زۆر جار ئەگەر بە هەمیشەییش نەبێت، لەسەر ئەوە ڕێكدەكەون كە ئەوەی بە زمانێك ووتراوە یان نوسراوە ئەتوانرێت بە زمانێكی تر بوترێت یان بنوسرێت. (گوزارشتی پارسەنگدەری "زۆر جار ئەگەر هەمیشەش نەبێت" ئێستا باسی لێوە دەكرێت).

+پێدەچێت هیچ كەسێك لەم ڕۆژانەدا داكۆكی نە لە حەتمیەتی توندڕەوانە و نە لە ڕێژگەرایی توندڕەوانە بكات. بەڵام زۆر هەیە بوترێت لە بەرژەوەندی ڤێرژنێكی سوكتری – وە لە رووی فەلسەفییەوە كەمتر سەنجڕاكێش –ی گریمانەكەی ساپێر–وۆرف كە تیایدا هەردوو تێزە پێكهێنەرەكەی تەعدیلكراون. با بە حەتمیەت دەست پێبكەین.

+ بایەخدانی سایكۆلۆژیستان بە كاریگەری زمان لەسەر فیكر دەكەوێتە پێش مێژووی داڕشتنی گریمانەكەی ساپێر– وۆرفەوە بەو شێوەیە. دەمێكە ئەوە زانراوە كە هەبونی وشە و گوزارشتی گونجاو كاریگەری لەسەر یادەوەری و ئیدراك هەیە. بۆ نمونە تاقیكردنەوەكان ئەوەیان نیشانداوە كە یادەوەریە بینراوەكان لەبارن بۆ ئەوەی بشێوێنرێن بۆ خاتری ئەوەی جوتبونیان (تطابق) لەگەڵ گوزارشتە بەشێوەیەكی باو بەكارهێنراوەكان جوتبونێكی نزیكتر بێت" وە كە خەڵك لەبارن تێبینی ئەو شتانە بكەن (وە بیریان بكەوێتەوە) كە لە زمانەكەیاندا قابیلی كۆدكردنە: واتە ئەو شتانەی كە ئەكەوێتە مەودای ئەو وشە و گوزارشتانەی بەشێوەیەكی حازربەدەست لەبەردەستدان و هەن. قابلیەتی كۆدكردن بەم مانایە، مەسەلەی رادەیە (پلەیە –و–). شتێك كە ئەكەوێتە مەودای دەلالەی تاكە وشەیەكی باوەوە (بۆ نمونە وشەی "*uncle*" لە ئینگلیزیدا) (واتە مام یان خاڵ –و–) زۆر زیاتر قابیلی كۆدكردنە لە شتێك كە وەسفكردنی پێویستی بە دەستەواژەیەكی بەشێوەیەكی تایبەت بنیاتنراو هەیە (بۆ نمونە *parents male sibling*)(٤).

+ ئەوە باش زانراوە كە موفرەداتی زمانەكان كەم تا زۆر نائایزۆمۆرفن(٥). تا ئەو رادەیەی ئەمە وایە، شتگەلێك زیاتر قابیلی كۆدكردنن لە زمانێكدا لەوەی لە زمانێكی تردا. بۆ نمونە هەروەكو چۆن ئەڵێن زمانی ئەسكیمۆ تاكە وشەیەكیان نییە بۆ بەفر، بەڵكو زۆر وشەی جیاوازیان هەیە بۆ جۆری جیاواز لە بەفر، وا دیارە زۆربەی زمانە ئوستralیەكان وشەیەكیان نییە بە مانای "لم" بێت، بەڵكو چەند وشەیەكیان هەیە كە دەلالەت لە جۆرە جیاوازەكانی لم دەكات. هۆی ئەمە تاڕادەیەكی باش ئاشكرایە لە هەریەك لە حاڵەتەكاندا. جیاوازی نێوان جۆرێك و

جۆرێکی تر لە بەفر یان لم گرنگییەکی زۆری هەیە لە ژیانی رۆژانەی ئەسکیمۆدا لە لایەکەوە، وە بۆ دانیشتویەکی ئەسڵی ئوستراڵی لە لایەکی ترەوە. زمانی ئینگلیزی هیچ وشەیەکی تری دیاریکراوتری نییە جگە لە "بەفر" و "لم". لەگەڵ ئەوەشدا لەوانەیە، بۆ نمونە، ئەوانەی خەریکی خزینی سەر سەهۆڵن کە پێدەچێت بەقەدەر ئەسکیمۆییەك جۆرە جیاوازەکانی بەفر بەلایانەوە گرنگ بێت، ئەتوانن گوزارشتگەلێکی وەکو "بەفری بوڵکە[٦]" و "بەفری بەهار" و هتد، بەکاربهێنن کە بە فەزڵی بەکارهێنانی زۆر و جێگیری دەلالەتەکەی لەناو گروپێکی دیاریکراودا، لە حاڵەتی بوون بە لێکسیم[٧] نزیك ببێتەوە و وا بکات کە دیاردەگەلێکی دیاریکراو تارادەیەکی زیاتر قابیلی کۆدکردن بن بۆ ئەوان زیاتر لەوەی بۆ ئەندامانی کۆمەڵگەی ئینگلیزی زمان بەگشتی.

+ دەبێت ئەو خاڵەی کە ئەمێستا باسکرا لە یادماندا بمێنێتەوە. قابلیەتی کۆدکردن بە زەرورەت جێگیر و چونیەك نییە لە سەرتاسەری جڤاتێکی زمانیدا — بەتایبەتی کاتێك مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵگایەکدا دەکەین کە هێندەی قسەکەرانی ئەسڵی ئینگلیزی ئاڵۆز و پرووشە و هەمەرەنگ بێت. هەمیشە و هەردەم، هاوپەیوەندی نێوان زمان و کلتور لە ئاستێکی زۆر گشتیدا کراوە لەگەڵ گریمانەکردنێکی (ضمني) یان ئاشکرا کە ئەوانەی هاوزمانن دەبێت بە پێویست هەمان کلتور کۆیان بکاتەوە. بە ئاشکرا ئەم گریمانەکردنە هەڵەیە سەبارەت زۆر زمان و زۆر کلتور. ئەوەشی کە گرنگی لەوە کەمتر نییە ئەو راستییەیە کە قابلیەتی کۆدکردن تەنها مەسەلەی هەبونی لێکسیمی تاکە وشەیی نییە. لەگەڵ ئەوەشدا، بە مەرجێك ئەوەمان لەیادنەچێت کە ئێمە، لە رووی پرەنسیپەوە، قسە لەسەر گروپی دیاریکراو ئەکەین زیاتر لەوەی قسە لەسەر سەرجەم نەتەوەکان بکەین، وە کە پێدەچێت کانگا پڕ بەرهەمەکانی سیستمی زمان یارمەتی ئەندامانی گروپێك بدات کە قابلیەتی کۆدکردنی ئەو شتانەی کە گرنگییەکی تایبەتی هەیە بۆیان، زیاد بکات، لەوانەیە بتوانین بەردەوام بین لە سودوەرگرتن لە چەمکی قابلیەتی کۆدکردن وەکو ئەوەی کە خەسڵەتێکی گشتی (*global*) سیستمەکانی زمان بێت.

+ کاتێك گریمانەکەی ساپێر–وۆرف لە لایەن سایکۆلۆژیستانەوە لە پەنجاکانی سەدەی رابردوودا لێیکۆڵرایەوە، ئەوە نیشاندرا کە قابلیەتێکی زیاتری کۆدکردن بۆ جیاوازیگەلی دیاریکراو لە رەنگدا لە زمانێکدا زیاتر لە زمانێکی تردا، کاریگەری چاوەڕوانکراوی هەبووە لەسەر یادەوەری و ئیدراك (*Perception*). بۆ نمونە تاکزمانانی قسەکەر بە زمانی زونی (*zuni*) کە زمانێکی هیندی — ئەمریکییە کە جیاوازی نێوان پرتەقاڵی و زەرد کۆدناکات، نارەحەتییەکی زیاتر ئەبیننەوە چ لە قسەکەرانی تاك زمان بە زمانی ئینگلیزی یان ئەو زونی زمانانەی کە ئینگلیزیش ئەزانن، نارەحەتییەکی زیاتر ئەبیننەوە، پاش ماوەیەکی دیاریکراو لە زەمەن، لە دووبارە ناسینەوەی ئەو تەنانەی کە رەنگەکەی بەشێوەیەکی حازربەدەست قابیلی کۆدکردنە لە ئینگلیزیدا، بەڵام لە زونیدا وانین. لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەرییەکە بە جۆرێك نییە کە قسەکەران بە زمانی زونی نەتوانن وێنەی جیاوازی نێوان تەنێکی زەرد و تەنێکی پرتەقاڵی بکەن، ئەگەر داوایان لێکرا بەراووردی بکەن.

+ ئەتوانین بڵێین ئەم تاقیکردنەوانەی لەمەڕ باس بەشێوەیەکی جوزئی گریمانەکەی ساپێر–وۆرفیان تەئکید کردۆتەوە، بەڵام بەڵگەیان دەستەبەر

نەکردووە بۆ ڤێرژەنە توندڕەوانەکەی. هەمان شت بۆ ئەو تاقیکردنەوانەی کە لە پەنجاکان و سەرەتای شەستەکانی (سەدەی رابردوودا) ئەنجامدران راستە، لەو تاقیکردنەوانە ئەو تاقیکردنەوەیەی کە بەشێوەیەکی تایبەت سەرنجڕاکێشە و بۆ تێستکردنی کاریگەری جیاوازییەکانی بونیادی گرامەری، زیاتر لە بونیادی لێکسیمی پەتی، دانراوە (سلۆبن، ١٩٧١: ١٣١). لەگەڵ ئەوەشدا ڤێرژنێکی سوکتری گریمانەکەی ساپێر – وۆرف تەئکید دەکەنەوە: ئەویش ئەوەیە کە بونیادی زمانێك کاریگەری دەبێت بۆ سەر ئیدراك و یادکەوتنەوە. وە نابێت ئەمە لەبیر بکرێت. پێناچێت جێگەی سەرسوڕمان بێت کە ئەکرێت کردنی جیاوازیگەلی دیاریکراو لە زمانێکدا ئاسانتر بێت لە کردنیان لە زمانێکی تردا. بەڵام ئەمەش هەر راستە: وا دیارە کە ئەم جیاوازییە کاریگەرییەکی سنورداری هەیە لەسەر ئیدراك و یادەوەری لە نێو زمانەکاندا، وە لەسەر بیرکردنەوەی رۆژانەمان.

+ بە حوکمی ئەوەی تێزەی حەتمیەتی زمانیی چیدی بەو چڕوپڕییەی نەوەیەك لەمەوبەر باسی لێوەناکرێت، زەحمەتە بزانین هاوسەنگی رای زانستییانە دەکەوێتە کوێوە بە نیسبەت ئەو ڕێبازەوە. پێدەچێت جێی خۆی بێت بڵێین کە زۆرینەی دەروونناس و زماننناس و فەیلەسوفان قبوڵی ئەوە دەکەن کە زمان بەڕاستی ئەو تەرزە کاریگەرییەی هەیە لەسەر یادەوەری و ئیدراك و فیکر کە ئەمێستا ئاماژەی پێدرا، بەڵام خانەگومان دەبن لە هەر ڤێرژنێکی توندتری گریمانەکە کە زمان کاتیگۆری یان پاترنەکانی فیکر[8] دیاریدەکات. لەوانەیە ئەوەشی بۆ زیاد بکەن کە زۆری ئەو ئارگیومنتەی وۆرف و ئەوانی دی بەکاریانهێناوە لە بەرژەوەندی ڤێرژنێکی توندتر و میتافیزیکییانە سەرنجڕاکێشتری تێزەکە، خراپ وەرگێڕان و بازنەیەتی (*circularity*)[9] لە زەبری ئەو ئارگیومێنتە کەم دەکەنەوە. بۆ نمونە، وۆرف خۆی بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە هیندییە – هۆپییەکان[10] کە زمانەکەیان کاتیگۆری گرامەریی بۆ زەمەن (*tense*) تێدا نییە، بە تێگەیەکی ریشەییانە جیاوازەوە بۆ زەمەن ئیش دەکەن، جیاواز لەو تێگەیەی کە قسەپێکەرانی زمانە ئەوروپییەکان ئیشی پێئەکەن. بەڵام بەڵگەی قایلکەر نادات بەدەستەوە بۆ هەبوونی جیاوازی لە رەفتار و پاترنەکانی بیرکردنەوەیان بۆ پاساودانی ئەم بانگەشەیە. هەروەها ئەوەش جێگەی قسەلەسەرکردنە کە ئەو زیادەڕەوی کردووە بە جیاوازی نێوان کاتیگۆرەی گراماتیکی دەم (*mood*) (مەبەست دەمەکانی کردارە –و–) لە زمانی هۆپیدا و ئەوەی کە وەکو تەقلید بە زەمەن (*tense*) پۆلێنکراوە لە زمانە ئەوروپییەکاندا. بە هەمان شێوە نەبونی ژمارەکانی زیاتر لە چوار لە زۆربەی زمانە ئوسترالیەکاندا زۆر جار وەکو بەڵگەی نەتوانینی قسەکەران بەو زمانگەلە بۆ هەڵکردن لەگەڵ چەمکی ژمارەدا، سەیر کراوە. بەڵام دەردەکەوێت دانیشتوانە ئەسڵیە ئوسترالیەکان کە زمانی ئینگلیزی وەکو زمانی دووەم فێر دەبن، قورسی نابیننەوە لە ژمارەکاریدا و دەتوانن بەکاریبهێنن بۆ ژماردن و ئەنجامدانی ژمێریاری بەو خێراییەی کە قسەکەرێکی دایك زمانی ئینگلیزی ئاسایی ئەنجامی دەدات (دیکسۆن، ١٩٨٠: ١٠٧). خولاسە، وا دیارە سەرباری ئەو جەختکردنەوانەی کە بۆ سەلماندنی پێچەوانەی ئەمە دەخرێنەڕوو لە لایەن لایەنگرانی حەتمیەتی توندڕەوەوە هەتا ئێستا هۆیەکی بەجێ نەدۆزراوەتەوە بۆ دەستبەرداربون لە تێڕوانینە تەقلیدیترەکە کە دەڵێت قسەکەرانی زمانە جیاوازەکان بەشێوەیەکی جەوهەری هەمان

تێڕوانینیان بۆ جیهان، یان هەمان چوارچێوەی چەمکامێز (مفاهیمی) یان هەیە، ئەوەندەی پەیوەندی بە چەمکە قوڵتر و لە رووی فەلسەفییەوە سەرنجڕاکێشترەکانی وەکو کات و فەزا و ژمارە و مادە و.. هتدەوە هەبێت.

+ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمە ئەوەی لێناکەوێتەوە کە قسەکەرانی زمانە جیاوازەکان هەمان تێڕوانینیان بۆ جیهان هەیە سەبارەت بەو چەمکانەی کەمتر بنەڕەتین. لەبەرئەوەی زۆر لەو چەمکانەی کە ئیشیان پێئەکەین کلتوریانە سنوربەندن (*culture bound*) بەو واتایەی کە بۆ تێگەیشتنیان پشتدەبەستن بە مەعریفەی کۆمەڵایەتییانە گوازراوە، چ پراکتیکی بێت و چ پرەپۆزیشناڵی، وە لە کلتورێکەوە بۆ کلتورێکی تر ئێجگار دەگۆڕێن. بۆ نمونە چەمکگەلێکی وەکو "راستگۆیی، گوناه، خزمایەتی، شەرەف، ...هتد" وەربگرە. ئەوە راستییەکی قبوڵکراوە کە ئەم تەرزە چەمکانەی کە کلتوریانە سنوربەندن لانیکەم تاڕادەیەکی زیاتر قابیلی کۆدکردنن لە هەندێك لە زمانەکاندا وەکو ئەوەی لە زمانی تردا. نەیارانی تێزەی رێژەگەرایی زمانیی دەڵێن کە زۆری ئەو جیاوازیانەی لە بونیادی لێکسیمی و گرامەری زمانەکاندا دەبینرێنەوە بە جۆرێکە شتگەلێك کە ئەتوانرێت لە زمانێکدا بوترێت ناتوانرێت لە زمانێکی تردا بوترێت. ئایا ئەمە راستە؟

+ هەروەکو بینیمان زۆرجار مومکینە قابلیەتی کۆدکردن زیادبکرێت لە ڕێگەی هەڵێنجان لە کانگاکانی ئەو سیستمە زمانییەوە و بنیاتنانی گوزارشتگەلی ئاڵۆز کە بە فەزڵی بەکارهێنانی چەند بارەوە لە سیاقگەلێکی دیاریکراودا، لەوانەیە ئیتر هەمان ئەو دەستنیشانکراوێتییەی مانا وەربگرن و بەدەستبهێنن کە لێکسیمەکان هەیانە. نموونەکەمان "بەفری بوڵکە و بەفری بەهاری و ...هتد" بوو بۆ ئەو گروپە ئینگلیزی زمانەی خەریکی خزینی سەر سەهۆڵن. پرۆسەی زیادکردنی قابیلیەتی کۆدکردن بەم ڕێگەیە پشت دەبەستێت بە بەرهەمداریێتی سیستمەکانی زمان و ئەوەی چۆمسکی بە ئەفراندنی بە ڕێسا – رکێفکراو ناوزەدی کردوە. ئەم پرۆسەیە پرۆسەیەکە کە هەمیشە و هەردەم بەردەوامی هەیە لە رەفتاری زمانی رۆژانەدا. زۆر لەو گوزارشتە ئاڵۆزانەی کە بەمشێوەیە بنیاتنراون وایان لێدێت کە بەشێوەیەکی بەرفراوانتر بەکاربربێن (پێشبڕکێی چەکسازی، دارمانی عەسەبی، خوگیر بە مادە بێهۆشکەرەکانەوە، خواست و خستنەڕوو، مانەوەی لەبەرتر، ...هتد) و کاتێکیش دێتە پێشەوە کە فەرهەنگسازێك بێت و زۆر جێی خۆیەتی بڵێت ئەو گوزارشتانە خۆیان بە هەقی خۆیان، گەر بتوانین ئەم دەربڕینە بەکاربهێنین، هاتونەتە ناو موفرەداتی ئەو زمانەوە. ئەم پرۆسەیە روویەکە لەوەی پێشتر وەکو قابلیەتی فراوانبون و قابلیەتی گۆڕینی زمانەکان ئیشارەتیان پێکرا. وە تێبینی ئەوەش دەکرێت کە ئەگەرچی ناتوانرێت لە قۆناغە سەرەتاییەکانیدا بوترێت هیچ کاریگەرییەکی هەبووە لەسەر سیستمی زمان، بەڵام لە ئاکامدا دەبێتە هۆی فراوانبونێك لە موفرەداتی زماندا. دیارە دەبێت ئێمە هەر ڤێرژنێکی تێزەی رێژەگەرایی زمانیی رەتبکەینەوە – وە لەبەر هەمان هۆ هەر ئارگیومنتێك کە خۆی وانیشاندەدات پوچەڵی دەکاتەوە – کە حساب بۆ ئەم جۆرە لە قابلیەتی فراوانبون و قابلیەتی گۆڕین نەکات.

+ رێگەیەکی تری فراوانکردنی سیستمی زمان خۆی رێگەی خواستنی لێکسیمە لە زمانەکانی ترەوە. بەڵام ئەوەی گرنگیەکی تایبەتی هەیە لەم سیاقەی ئێستادا ئەو شتەیە کە بە وەرگێڕانی – خواستن[11] ناودەبرێت. دیارترین جۆری وەرگێڕانی

– خواستن وەرگێڕانی بەشە بنەڕەتییە پێکهێنەرەکانی وشەیەك یان دەستەواژەیەکی بیانی دەگرێتەوە. بۆ نمونە، هەر کە دەستەواژەی ئینگلیزی "*summit conference*" (کۆنگرەی لوتکە) کەم تا زۆر کرابووە دەستەواژەیەکی قاموسی، یەکەم شت لە بەکارهێنانی دیپلۆمات و رۆژنامەنوساندا لە رێگەی ئەو پرۆسەیەی کە لە پەرەگرافی پێشودا روونکرایەوە، لە رێگەی وەرگێڕانی وشە – بۆ – وشەوە برایە زۆر زمانی ترەوە: لە فەرەنسیدا "*conference au sommet*" وە لە ئەڵمانیدا "*Gepfelkonferenz*" و هتد.

+ ئەم نمونەیە خاڵێکی تری گرنگ رووندەکاتەوە ئەویش ئەوەیە کە هەبوونی ئەو وشانەی کە بەشێوەیەکی رەسمی پەیوەندیدارن پێکەوە، وەرگێڕانی – خواستن ئاسان دەکات، هەرچەندە ئەو وشانەی لەمەڕ باس پێدەچێت تەواو هەمان مانایان نەبێت بێجگە لەو سیاقانەی کە پرۆسەی وەرگێڕانی – خواستن خۆی دروستیکردوون. هەبوونی پەیوەندی رەسمی لە نێوان وشەی "*conference*" "*conference de presse*" و "*presse-conferenz*" و "*press conference*" لە لایەکی ترەوە بێگومان کاریگەری هەبووە لەسەر هەڵبژاردنی ئەو دەستەواژانە، وە هەموو وشەکان، گەر لە رووی دایکرۆنییەوە[12] قسە بکەین، هەموویان وشەی خوازراون لە لاتینییەوە.

+ هەروەکو لە نەسکێکی دواتردا روونەدەکرێتەوە، جۆری ناسك (مرهف) تر و دیارتر هەیە لە وەرگێڕانی – خواستن کە بە فەزڵی بەریەککەوتن (*contact*)ی کلتورییەوە دێنە ناوەوە. ئەو خاڵەی کە دەبێت لێرەدا ئاماژەی پێبدرێت ئەوەیە کە فراوانکردنی موفرەداتی زمانێك لە ڕێگەی خواستنەوە، وە گۆڕینی مانای ئەو وشە و دەستەواژانای کە هەیە لە رێگەی وەرگێڕانی – خواستنەوە، گۆڕانکاری لە بونیادی لێکسیمی سیستمی زماندا دەگرێتەوە. ئەگەر ئەم خاڵە پێی لێنرا، ئەوا یەکسەر ئەوە دەردەکەوێت کە نە تەنها هەندێك شت لە هەندێك زماندا زیاتر قابیلی کۆدکردنن لەوەی لە زمانی تردا، بەڵکو کە شتگەلێك هەن ناتوانرێت بە هیچ جۆرێك لە زمانگەلێکی دیاریکراودا بوترێن، تەنها لەبەرئەوەی ئەو موفرەدانەی لە رێگایانەوە ئەو شتانە دەوترێت بونیان نییە. بۆ نموونە هەزارەها زمان هەن کە تیایاندا ناتوانرێت رستەی "*they are playing cricket*" بوترێت لەبەر ئەم هۆیە، وە لە هەموو زمانەکاندا، بێجگە لە ئینگلیزی، کە ئەتوانرێت ئەمەی تێدا بوترێت لەبەرئەوەیە کە یان وشەی "*cricket*" خۆی یان ماناکەی خوازراوە، وە لە زۆربەی حاڵەتەکاندا، هەروەها وشەی "*play*" یان ماناکەی بە هەمان شێوە خوازراوە. دەستکاریکردنی موفرەدەکانی زمان لە ڕێگەی خواستن یان وەرگێڕانی – خواستنەوە واتە گۆڕینی زمان بۆ زمانێکی تاڕادەیەك جیاواز. لەوانەیە لە یەکەم سەیرکردنەوە ئەم خاڵە خاڵێکی تاڕادەیەك هیچ دیاربێت. بەڵام هەروەکو دواتر دەبینین سەرەنجامێکی مەزنتری لەو سەرەنجامەی بەشێوەیەکی گشتی مەزەنەدەکرێت، لێدەکەوێتەوە. چونکە بەشێکی باشی ئەوەی وەکو وەرگێڕانی ئاسایی حسابی بۆ دەکرێت، بە زەرورەت، وەرگێڕانی–خواستنە. نەتوانینی دەرککردن بەوەی ئەم شتە وایە هانی ئەو رایەی داوە کە رادەیەکی زیاتر لە قابلیەتی وەرگێڕان لە نێو زمانەکاندا[13] لە ئارادایە لەوەی کە لە راستیدا هەیە.

+ تەنها جیاوازیگەلی بونیادی لێکسیمی نییە (لەوانە، دیارترینیان، کەلێنی لێکسیمی: نەبوونی

وشـەی گونجـاو) وەرگێڕانـی کتومـت لـە نێـوان زمانەکانـدا زەحمـەت ئـەکات و هەنـدێك جـاریش مەحاڵ. ئەکرێت زمانەکان، وە زۆر جاریش هەروان، گرامەریانـە نائـایزۆمۆرفبن سـەبارەت بـەو کاتیگۆریانـەی لـە رووی دەلالییـەوە پەیوەندیـدارن وەکـو زەمـەن و دەم[١٤] (دەمـەکانی کـردار -و-) و ژمارە. ئەو راستییەی کە ئەم شتە وایە پێناچێت لە گۆشـەنیگایەکی فەلسـەفییەوە، ئەوەنـدەی وۆرف و شوێنکەوتووەکانی پێیان وابووە، گرنگ بێت — ئەمە ئەگەر باسی کەسانی پێشخۆی وەکو ترێندێلنبێرگ نەکەین کە پێشتر لە نەسکێکی تردا کۆتکرا. بەڵام تاڕادەیەکی زۆر هەمان ئەو سەرەنجامانەی هەیە، ئەوەندەی پەیوەندی بە لە وەرگێران هاتنەوە هەبێت، کە نائایزۆمۆرفی لێکسیمی هەیەتی.

+ با نمونەیەکی سادە وەربگرین: گەر بە وردی قسە بکەین مەحاڵە هیچ دەستەواژەیەکی ناویی (*noun phrase*) ئینگلیزی کە ئامرازی شوناسی (*the*) تێدا بێت وەربگێڕدرێت بۆ سەر زمانی رووسی (یان لە راستیدا بۆ زۆربەی زمانەکانی جیهان) بەو پێیەی کە زمانی رووسی ئەو جیاوازیە یان جیاوازیگەلە دەلالییەی نەکردۆتە شتێکی گرامەریی کە لە ئینگلیزیدا کراونەتە شتێکی گرامەریی لە رێگەی ئامادەیی و نائامادەیی ئامرازی (*determiner*) (واتە دیاریکەر کە مەبەستی لێرەدا *the* -و-)، ئەمە لەلایەك، وە بەرامبەرکێی نێوان ئامرازی شوناس و ئامرازی نەناس لەلایەکی ترەوە. ئەوەی بە کردەوە روودەدات ئەوەیە کە وەرگێڕ عادەتەن سەرجەم ئەو زانیارییە دەسڕێتەوە کە ئامرازی شوناسەکە هەڵگریەتی. ئەگەر نەتوانرا (ئەم زانیارییە ونبووە — و-) لە سیاقەکەدا بگەڕێنرێتەوە، وە واشهەڵسەنگێنرا کە گرنگیەکی ئەوتۆی هەیە پێویستە وەرگێڕانەکە بیگوازێتەوە، ئەوا ناچار دەبێت شتێکی بۆ زیاد بکات زیاتر و لەسەروو ئەوەوە کە بە فیعلی لە دەقە سەرچاوەکەدا وتراوە. بۆ نمونە لەوانەیە ئاوەڵناوێکی ئیشارەت بەکاربهێنێت مانای "ئەمە" یان "ئەوە" بگەیەنێت. لە زۆربەی سیاقەکاندا، ئاوەڵناوی ئیشارەتکردن لە ئینگلیزی و زمانەکانی تریشدا دیاریکراوترە لە مانادا لە ئامرازی شوناس.

+ ئەتوانرێت نموونەی تری زۆر سەرنجڕاکێشتر بهێنرێتەوە. بواس (١٩١١) لەو پێشەکییە ئێجگار کاریگەرەدا کە ناوبراو بەشداری پێکرد لە کتێبی (*Handbook of American Indian Languages*) جەختی لەسەر هەردوو جیاوازیگەلی لێکسیمی و گرامەری لە بونیاددا کردوەتەوە. (بەو موناسەبەیەوە، بواس بوو کە لێرەدا ئەو نمونەیەی هێنایەوە کە چەند وشەیەك بەکاردەهێنرێت بۆ بەفر لە زمانی ئەسکیمۆدا کە لەو کاتەوە لە بێئەژمار کتێبگەلی قوتابخانەیی گفتوگۆ گشتییەکانی سەر زمان و کلتوردا، چەند بارە کراوەتەوە. بواس چەند نمونەیەکی تری هەن کە بە هەمان ئاست قایلکەرەن سەبارەت بە جیاوازییە پەیوەندیدارەکان لە بونیادی لێکسیمیدا). بەشبەحاڵی جیاوازییە گرامەرییەکان، بواس رستەی سادەی ئینگلیزی "*The man is sick*"ی بە نمونە هێنایەوە نیشانی دا کە چۆن وەرگێڕانی بۆ زمانە هیندییە — ئەمریکییە جیاوازەکان (زمانی کواکیوتل، ئێسکیمۆ، پۆنکا) وەرگێڕ ناچاردەکەن زانیاری بخەنە سەر و بۆی زیاد بکەن (زانیاری جیاواز بۆ هەریەك لە زمانەکان) کە لە ئەسڵیەکەدا نین: بۆ نمونە ئەگەر بتەوێت بە هەڵبژاردنی کاتیگۆرییەکی گرامەری دیاریکراو زیاتر لە کاتیگۆرییەکی تر ئاماژە بەوە بدەیت ئایا ئەو کەسەی کە باسدەکرێت لە قسەکەرەکەوە دیارە یان نا، وە یاخود لەسەر پشت راکشاوە یا بێدەنگ و

سەنگە یان ئەجوڵێت و بەم شێوەیە، یان دیسان بۆ ئیشارەتکردن بەوەی کە قسەکەر خۆی ئەتوانێت جەخت بکات لەسەر زانیارییەکە بەپێی تێبینیکردنی ڕاستەوخۆ یان پشت بە وائەڵێنی خەڵکی دی دەبەستێت. (ئەم خەسڵەتە لە زمانی کوردیشدا هەیە. لە حاڵەتی گێڕانەوەی ڕووداوێکدا ئەگەر قسەکەر خۆی بینیبێتی بە ڕابردووی سادە ئەیگێڕێتەوە ئەگەر لە خەڵکی بیستبێت ڕانەبردوی تەواو "*present perfect*" بەکاردەهێنرێت لە گێڕانەوەیدا –و–)

+ دوابەدوای بواس، زۆر زماننناسی تر، لەوانە ساپێر و وۆرف، لە چەند بڵاوکراوەیەکیاندا هەمان خاڵی گشتیان باسکردووە و بەشێوەیەکی قەناعەتپێکەرانە ڕاستی ئەو خاڵەیان نیشانداوە. بەڵام ئەوەی کە نیشان نەدراوە ئەوەیە کە هیچ هاوپەیوەندییەك هەیە لە نێوان جیاوازییەکانی بونیادی گرامەری و جیاوازییەکانی عەقڵیەتی قسەکەرانی زمانە لە ڕووی گرامەرییە جیاوازەکاندا. بەمەرجێك ئێمە ئەم حەسرکردن (*qualification*)ە گرنگە بۆ مەسەلەکە ئەنجامبدەین و پێی لەسەر دابگرین، پێویستە لەسەرمان بەپێی بەڵگەی ئامادە، دەنگی خۆمان بدەینە ڤێرژنێکی تەعدیلکراوی تێزەی ڕێژەگەرایی زمانیی.

+ لەبەرئەوەی ئێمە بەشێوەیەکی سەرەکی گرنگی بە زمان و کلتور ئەدەین لەم نەسکەدا، پێویستە ئەوەش بوترێ کە بە هیچ جۆرێك ناتوانرێت هەموو جیاوازییە گرامەری و لێکسیمییەکان لە نێو زمانەکاندا بەشێوەیەکی قایلکەرانە بگێڕدرێنەوە بۆ جیاوازییە کلتورییە هەنوکەیی، یان تەنانەت ڕابردووەکانی نێوان قسەپێکەرانیان. ئەکرێت لە وەرگێڕان هاتن[١٤] هەرەس بهێنێت بەدەر لەوەی جیاوازی هاوپەیوەند هەبێت یان نەبێت لە کلتوری دوو جڤادە زمانییەکەدا. بۆ نموونە، قورسە پاساوی ئەو ڕایە بهێنیتەوە کە هەبون یان نەبونی ئامرازی شوناس (بۆ نمونە لە ئینگلیزی و ڕووسیدا) هاوپەیوەندن لەگەڵ جیاوازیەکی کلتوری دەستنیشانکراودا. بەڵام بێگومان جیاوازیگەلێکی زۆر هەیە لە هەردوو بونیادی گراماتیکی و لێکسیمیدا کە دەکرێت ببەسترێنەوە بە جیاوازیگەلێکەوە لەو کلتورانەدا کە پەیوەستن بە زمانگەلی دیاریکراوەوە. ئەم خاڵە لە ڕێگەی دوو نمونەی تاڕادەیەك جیاوازەوە لەم دوو بەشەی داهاتوودا، ڕووندەکرێتەوە. ئەوکات لە بارێکی باشتردا دەبین بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو ڕۆڵەی کە کلتور وەکو پێکهێنەرێکی بنەڕەتی دەیگێڕێت لە دیاریکردنی بونیادی زمانەکاندا.

## زاراوەکانی ڕەنگ

+ چەند هۆیەك هەن بۆ پشکنینی موفرەداتی ڕەنگ بە پەیوەند لەگەڵ تێزەی ڕێژگەرایی زمانییدا. هەتا ئەم دواییانەش، ئەو پانتاییە سەرەکییە بوو کە لەلایەن بونیادگەرانەوە بەکاردەهێنرا بۆ نیشاندانی ئەو ڕاستییەی کە زمانە مرۆییەکان لە ڕووی لێکسیمییەوە نائایزۆمۆرفن. نیشاندانەکەش ئاسانترە و کاریگەرییەکەشی سەرنجڕاکێشترە لەوەدا کە دەتوانین مانای وەسفی پەتی زاراوەکانی ڕەنگ لە مانا گوزارشتئامێز و کۆمەڵایەتییەکەی دابڕین بەبێ زەحمەتێکی ئەوتۆ. لەوەش زیاتر، وا دیارە مانا وەسفیەکە پەیوەندیدارە بە جیهانی فیزیکیی ئەزمونی ڕۆژانەوە، لە ڕووی دەلالەتکردنەوە بە ڕێگەیەکی زۆر ڕاستەوخۆتر لەوەی کە مانای وەسفی لێکسیمەکان ئەیکەن لە زۆر لە بوارە سیمانتیکییەکانی تردا. هەر لەبەر ئەم هۆیەش بوو کە موفرەداتی ڕەنگ لەلایەن دەروونناسانەوە لە

پەنجاکاندا هەڵبژێردرا لە میانەی توێژینەوەیاندا لە گریمانەی ساپێر – وۆرف.

+ شەبەنگی ڕەنگ یەکبەدوایەکێکی فیزیکییە. هەروەها یەکبەدوایەکێکی بینراوە (بصری) بەو واتایەی کە هەر ڕەنگێکی قابیلی جیاکردنەوەی شەبەنگەکە، بەرەبەرە و لە سنوری جیاکردنەوەی بەسەری (بصری)دا، بەشێوەیەکی تێبینی نەکراو، دەچێتەوە سەر ڕەنگە دراوسێکانی. بۆ نمونە شین، بەم مانایە،بەرەبەرە و بەشێوەیەکی تێبینی نەکراوە دەچێتەوە سەر سەوز، سەوزیش بۆ زەرد و بەم شێوەیە. وا گریمانە دەکرێت، کە هەموو زمانەکان وشەگەلێك بۆ بەکارهێنەرانی ئەو زمانانە دەستەبەر دەکەن کە یارمەتیان ئەدات ئیشارەت بە رووبەرگەلێکی دیاریکراو بکەن لەم یەکبەدوایەکە بەسەرییەدا: لە زمانی ئینگلیزیدا، وەها زاراوەگەلێکی بنەڕەتیی ڕەنگ وەکو "رەش، سپی، سور، سەوز، شین، قاوەیی ...هتد"، وە وەها زاراوەگەلێکی نابنەڕەتی یاخود ئاستی دووەمی ڕەنگ وەکو "*turquoise*" (پیرۆزەیی) و "*vermilion*" (ئال) و "*puce*" (مارۆنی یان جگەری) ...هتد (دیارە وەرگێڕانیان بۆ کوردی بە نزیکییە ناکرێت دەقاودەق بێت لەبەر ئەو هۆیانە کە نوسەر خۆی باسیان ئەکات –و–). ئەوەی وەکو زاراوەی بنەڕەتی ڕەنگ حسابی بۆ دەکرێت، وەکو هاودژێك بۆ زاراوەی نابنەڕەتی یان ئاستی دووەمی ڕەنگ، والاْیە بۆ مشتومڕ، بە حوکمی ئەوەی کە چەند پێودانگێکی مومکین هەیە کە دەتوانرێت پیادەبکرێن. بۆ نمونە "پرتەقاڵی" بە فەزڵی بەستنەوەیەوە بە ڕەنگی میوەوە، لەوانەیە بە زاراوەیەکی بنەڕەتی ڕەنگ سەیر نەکرێت، هەروەکو ڕەنگی "*appricot*" و "*lemon*"[١٥]، بە ڕەنگێکی نابنەڕەتی حساب دەکرێت. لەلایەکی دییەوە، پێودانگەلی تر – لەوانە زۆر بەکارهێنانی وەکو زاراوەی ڕەنگ و ئاشنایەتی ئەو بەکارهێنانە بۆ ئەندامانی عاممەی جڤادی زمانیی – بێگومان ئەمانگەیەنێتە ئەوەی بڵێین کە "پرتەقاڵی" زاراوەیەکی بنەڕەتی ڕەنگە لە زمانی ئینگلیزیدا، وە ڕێی تێدەچێت کە بەپێی چەند پێودانگێکی دیاریکراو هەندێك زمان زاراوەی بنەڕەتی ڕەنگیان هەر نەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا، زۆربەی زمانەکان هەیانە، وە بەشێوەیەکی گشتی، ئاسانە بڕیار بدەین کامانەن. با جیاوازی لە نێوان زاراوەی بنەڕەتی ڕەنگ و زاراوەی نابنەڕەتی ڕەنگدا بەشتێکی سەلمێنراو وەربگرین.

+ ئەوە ڕاستییەکی زانراو و بێ چەند و چونە کە زمانەکان لە رووی ژمارەی ئەو زاراوە بنەڕەتیانەی ڕەنگەوە کە هەیانە، جیاوازن. هەروەها ئەوەش زانراوە کە سەربەخۆ لەم ڕاستییە، وەرگێڕانی وشە بە وشەی زاراوەکانی ڕەنگ لە سزمانەکاندا زۆر جار مەحاڵە لەبەرئەوەی هیچ وشەیەك لە زمانێکدا کتومت هاوجووت (مطابق) نییە لەگەڵ وشەیەکدا لە زمانەکەی تردا. بۆ نمونە وشەیەك نییە لە زمانی فەرەنسیدا کە کتومت ئەو مانایە بگرێتەوە کە وشەی "*brown*" لە ئینگلیزیدا دەیگرێتەوە: تاکە وشەیەك نییە لە رووسی یان ئیسپانی یان ئیتالیدا کە هاوجووت بێت لەگەڵ "*blue*" دا: وە تاکە وشەیەك نییە لە زمانی هەنگاریدا کە هاوجووت بێت لەگەڵ "*red*" دا، وە بەم شێوەیە. ڕاستیگەلی لەم جۆرە زۆر جار بە نمونە هێنراونەتەوە، هەتا کۆتایی شەستەکان، وەکو بەڵگەیەك نە تەنها لەسەر لەبەراوورد کردن نەهاتن[١٦] یان نائایزۆمۆرفبونی سیستەمە لێکسیمییە جیاوازەکان، بەڵکو وەکو بەڵگەیەك لەسەر هەڕەمەکێتی ئەو دابەشکردنانەی کە سیستەمە زمانییە جیاوازەکان دەیکەن لەو شتەدا کە ووتمان

یەکبەدوایەکێکی فیزیکی و هەروەها بەسەریشە (واتە یەکبەدوایەکێکی سایکۆفیزیکی).

+ لەبەرئەوەی ئێستا هۆیەك هەیە بۆ گومانکردن لەوەی ئایا ئەم دابەشکردنانە هەرەمەکین، هەروەها هۆیەك هەیە بۆ جەختکردن لەسەر ئەوەی لە بەراوردکردن نەهاتنی بونیادی موفرەداتی زمانە دیاریکراوەکان لە رووی زاراوە بنەڕەتییەکانی رەنگەوە لەو زمانانەدا، پوچەڵنەکراوەتەوە و تەنانەت نەشخراوەتە ژێر پرسیارەوە. بۆ نمونە رستەی ئینگلیزی "*My favorite color is blue*" ناتوانرێت وەربگێڕدرێت (بە هەر مانایەکی ئاسایی زاراوەی "وەرگێڕان") بۆ سەر رووسی مەگەر هەرەمەکیانە بریاربدەین لە نێوان وشەکانی "*sinij*" و "*goluboj*" کە بەنزیکی یەکەمیان واتا "شینی تێر" و دووەمیان "شینی کاڵ"ە. لە پراکسیسدا، زۆرجار وەرگێڕەکان ناچار دەبن بڕیاری هەڕەمەکی لەمجۆرە بدەن: وە بۆ ئەو مەبەستەی لەبەردەستیدایە، عادەتەن ئەو بڕیارانە عاقیبەتی خراپی نییە. ئێمە عادەتەن وەرگێڕان وەکو ئەو پرۆسەیە ئەبینین کە لانیکەم سیاقی پرەپۆزیشناڵی (تەسریحی) ئەوەی وتراوە یەکبینە رادەگرێت. بەڵام بڕێکی باش لە وەرگێڕانی ئاسایی وا ناکات، وە بەپێی سروشتی شتەکانیش، ناتوانێت وا بکات.

+ لە ساڵی ١٩٦٩دا بێرلین و کای کتێبێکی گرنگیان بڵاوکردەوە بە ناونیشانی زاراوە بنەڕەتییەکانی رەنگ کە تیایدا بەڵگەیان هێنابووەوە بۆ نیشاندانی ئەوەی کە لێکچوون و جیاوازی لە نێوان زمانەکاندا لە رووی چۆنیەتی دابەشکردنیانەوە بۆ شەبەنگی رەنگ هێند هەرەمەکی نەبووە کە وێناکراوە. بەر لە هەموو شتێك، ئەوان سەرنجیان بۆ لای گرنگی رەچاوکردنی ئەو شتە راکێشا کە ئەوان بە مانای ناوەندی (*focal meaning*) زاراوە، زیاتر لە مانا پڕەکەی (*peripheral meaning*)، ناوزەدیان کرد، (واتە مانای مەرکەزی و مانای دووری زاراوەیەك -و-). ئەوەندەی پەیوەندی بە زاراوەکانی رەنگەوە هەبێت، ئەتوانرێت تەئکید لە مانا ناوەندییەکانیان بکرێت لە رێگەی پرسیارکردن لە قسەکەرانی (ئەو زمانەوە -و-) کە ئیشارەت بکەن بەو شتەی ئەوان بە نموونەیەکی باشی ئەو رەنگەی دەزانن کە لەبەر باسدایە، لەسەر چارتی رەنگەکان. ئەگەر وا بکەین ئەوا دەردەکەوێت کە رادەیەکی زۆر لە رێکەوتن هەیە لە نێوان قسەکەرانی دایکزماندا لەسەر مانای ناوەندیی زاراوە بنەڕەتییەکانی رەنگ لە زمانەکەیاندا، لە کاتێکدا لەوانەیە قورسیەکی زۆر ببیننەوە لە دیاریکردنی سنوری نێوان زاراوەیەك و زاراوەیەکی تر یان لەوانەیە رێکنەکەون لەناو خۆیاندا لەسەر ئەنجامەکانی هەر هەوڵێکیاندا بۆ دانانی سنور لە شوێنێکی دیاریکراوی یەکبەدوایەکەدا. بۆ نمونە، لەوانەیە قسەکەرانی زمانی ئینگلیزی نەتوانن رێکبکەون لەسەر سنوری نێوان شین و سەوز لەسەر چارتی رەنگەکان (یان لە پراکتیزەکردنی وشەکانی "شین" و "سەوز" دا لە ژیانی رۆژانەدا). بەڵام قورسی نابیننەوە لەوەدا کە بڵێن کام شتە شین یان سەوزی نمونەییە، یان ناوەندییە. هەتا ئێستا، ئەوەی بێرلین و کای ئاشکرایان کردووە تەبایە لەگەڵ ئەو تێڕوانینەی، کە پێشتر لەلایەن زۆرینەی بونیادگەرەکانەوە پەیڕەوکرابوو، کە هەر زمانە و دابەشکردنە هەڕەمەکیەکانی خۆی فەرز دەکات لەناو یەکبەدوایەکی رەنگەکاندا.

+ بەڵام ئەوەشیان دۆزییەوە کە زمانە جیاوازەکان رێکدەکەون لەسەر رووبەرە ناوەندییەکانی زاراوە بنەڕەتییە دیاریکراوەکانی

رەنگەکان وە کە ئەمەش راست دەردەچێت سەربەخۆ لە ژمارەی زاراوەکانی رەنگ لە سیستمەکاندا. بۆ نمونە. نە تەنها روبەری ناوەندیی "*red*"ی ئینگلیزی یان "*rouge*" (واتە سوور)ی فەرەنسی هەمان شتن (کە ئینگلیزی و فەرەنسی هەمان ژمارەیان لە زاراوەی بنەڕەتی ڕەنگ هەیە)، بەڵکو لە زمانێکیشدا کە ژمارەیەکی زۆر کەمتر لە زاراوەکانی رەنگی هەبێت لەوانەیە رەنگێکیان هەبێت کە رووبەرە ناوەندییەکەی هاوجوت بێت لەگەڵ "*red*"ی ئینگلیزی و "*rouge*"ی فەرەنسیدا. لەوەش سەنجڕاکێشتر ئەو راستیەیە – ئەمە ئەگەر راستی بێت – کە تەرتیبێکی گشتی جوزئی، یان هەرەمیەتێك هەیە لە نێو زاراوە مومکینەکانی رەنگی زمانەکاندا. بۆ نمونە، هەر زمانێك کە تەنها سێ زاراوەی رەنگی هەبێت، ئەو زاراوانەی دەبێت کە ناوەندەکانیان جووت دێنەوە (مطابق) لەگەڵ ناوەندەکانی "رەش و سپی و سور"دا: هەر زمانێك کە شەش زاراوەی رەنگی هەبێت، ئەوا سەرباری ئەو سیانە، ئەو زاراوانەی دەبێت کە ناوەندەکانیان هەمان ناوەندەکانی "سەوز و زەرد و شین" دەبێت. ناوەندی زاراوەی حەوتەمی رەنگ لە سیستمێکی حەوت زاراوەییدا، دەڵێن زاراوەی قاوەییە. (هەروەکو لە سەرەوە ئاماژەی پێدرا زمانی فەرەنسی تاکە وشەیەکی نییە بۆ قاوەیی بەڵکو "*brun*"ی هەیە کە چەند کۆت و بەندێکی سیاقی لەسەرە، وە بە شێوەیەکی روو لە زیاد لەوانەیە "*marron*" دەلالەت لە رووبەری ناوەندیی قاوەیی بکات). دوای ئەمەش مۆر و پەمەیی و پرتەقاڵی و خۆڵەمێشی دێت، بەڵام بەبێ هەبوونی هیچ تەرتیبێك لەناو ئەو سێتەدا، واتە سیستمێکی هەشت زاراوەیی لەوانەیە زاراوەیەکی هەبێت بۆ مۆر و سیستمێکی تر زاراوەیەکی هەبێت بۆ پەمەیی و بەم شێوەیە.

+ گریمانەکەی بێرلین–کای مشتومڕێکی زۆری لێکەوتەوە، ئەوەندەی پەیوەندی بە بنەما ئەزمونییەکەیەوە هەبێت. بەڵام هەتا ئێستا، بێجگە لەو وردەکارییانەی کە لێرەدا باسیان لێوە نەکراوە، لە تێستی ئەزمونگەرایی تریشدا دەرچووە. دوو خاڵی گشتی هەیە کە ئەتوانرێت بوروژێنرێت سەبارەت بە گریمانەکە، کە هەردووکیان پەیوەندیدارن بە تێزەی رێژەگەرایی و پەیوەندی نێوان زمان و کلتورەوە.

+ یەکەمیان ئەوەیە کە هەرچەندە لەوانەیە لقە – بونیادێك (*substructure*)ی گەردونی هەبێت لە موفرەداتی رەنگدا، ئەوا تەواو ئاشکرایە کە بونیادێکی فەوقی (*superstructure*) ناگەردونیش هەیە[١٧]. جیاوازی نێوان ئەو زمانانەی کە سیستمێکی بەرێژە دەوڵەمەندیان هەیە و ئەو زمانانەی کە سیستمێکی بە رێژە هەژاریان هەیە لە رووی زاراوە بنەڕەتییەکانی رەنگەوە، هەر دەمێنێتەوە. هەروەها، وەها بەڵگەیەك لەسەر تەرتیبی جوزئی گەردونی لە سێتی زاراوە بنەڕەتییە مومکینەکانی رەنگدا، هەروەکو بینیمان، وەستاوەتە سەر شەش یان حەوت رەنگی بەشێوەیەکی زۆر باو لیستکراو. بە لەقەڵەمدانی ئەوەی ئەو روبەرانە، وردتر بڵێین ئەو ناوەندانەی پەیوەستن پێیانەوە، لە رووی ئیدراکییەوە زەقن بۆ مرۆڤ بە فەزڵی، لانیکەم بەشێوەیەکی جوزئیش بێت، پێکهاتەی نیورۆفیزیۆلۆژیان (عصبي – وظيفي)، ئەوا روبەری تر هەن کە ناگەردونین و لە ڕووی ئیدراکییەوە کەمتر زەقن لە یەکبەدوایەکی رەنگەکاندا، کە تەعریفی لێکسیمیان دراوەتێ و بە تەواوەتی ئاوێزانی ئەو ڕووبەرانە کراون کە گەردونیانە زەقترن لە موفرەداتی رەنگی زمانگەلی دیاریکراودا. لەو گفتوگۆیانەوە کە لەلایەن ئەنسرۆپۆلۆژیستانەوە کراون لەسەر رەنگ،

تەواو روونە کە زەقێتی کلتوری هەروەها زەقێتی ئیدراکیی پشتبەستوو بە بایۆلۆژی، بەنیسبەت گریمانەکەی بێرلین – کای و سەربەخۆش لێی، رۆڵێك دەگێڕن لە دەستنیشانکردن و ناسینەوەی زاراوەکانی رەنگدا" وە هەروەکو بینیمان، بەشێوەیەکی گشتی لایەنی بایۆلۆژی و کلتوری دوو لایەنی پشتپێکبەستوون لە وەرگرتن (اکتساب)ی زماندا. دواجار، زۆر بەکارهێنانی رۆژانە هەیە بۆ زاراوەکانی رەنگ – نە تەنها ئەو بەکارهێنانەی کە بەشێوەیەکی زۆر دیار رەمزین (وەکو سپی بۆ پاکیی، سور بۆ مەترسی و رەش بۆ تازیباری و هتد) – کە پشتبەستوون بە کلتور، بەو واتایەی کە کەسێك ناتوانێت وەریانبگرێت بەبێ ئەوەی هاوزەمان ئەو مەعریفە کۆمەڵایەتییەش وەربگرێت کە پەیوەندیدارە پێیانەوە. بایەخی ئەم هەقیقەتە لەلایەن زۆر لەو زمانناس و سایکۆلۆژیست و فەیلەسوفانەوە کەم ڕاگیراوە کە گفتوگۆیان لەسەر گریمانەکەی بێرلین – کای کردووە. وا دیارە ئەوەی بۆ موفرەداتی رەنگ راست دەردەچێت بۆ هەر پانتاییەکی لێکسیمیش راست دەردەچێت کە بمانەوێت هەڵیبژێرین. ئەگەر لقە – بونیادێکی گەردونی هەبێت بۆ جیاوازییە سیمانتیکییەکان لەناویدا (واتە لەناو پانتاییە لێکسیمیەکەدا –و–) ئەوا بونیادێکی فەوقی ناگەردونی و پێدەچێت زۆر چڕوپڕتریش هەبێت کە پشتبەستووە بە کلتور.

+ خاڵی دووەم پەیوەندی هەیە بە تێگەی روبەرە ناوەندییەکان (*focal areas*)ەوە، یان ناوەندەکانەوە. هەرچەندە دەستپێکردنمان قسەکردن بوو لەسەر رەنگ وەکو یەکبەدوایەکێکی بەسەریی (*visual continuum*)، ئەوە روون بووەوە هەستکردنێکی گرنگ هەیە بەوەی ئەم شتە راست نییە. پێکهاتەی بونەوەری بەشەریی (هەروەکو هەموو گیانەوەرەکانی تر) بە جۆرێکە کە لە رووی نیورۆفیزیۆلۆژییەوە وەڵام (استجابە)ی هەبێت بۆ هاندەر (مثیر)ی دیاریکراو و نەیبێت بۆ هی تر. لەوانەیە ئەمە، لانیکەم بەشێوەیەکی جوزئی، بناغەی زەقێتیی زیاتری هەندێك ناوەندی رەنگ و گەردونیبوونەکەیان بێت (کلارك و کلارك: ١٩٧٧" ٥٢٦). ئەو ناوەندانە رۆڵی خاڵگەلێکی مەرجەعی دەگێڕن کە بەنیسبەتیانەوە (واتە بەنیسبەت ئەو ناوەندانەوە) بونیاد بەسەر باقی یەکبەدوایەکە فیزیکییەکەدا فەرز دەکەین، ئەوەندەی کە ئێمە بونیاد فەرز بکەین بەسەریدا. ئەو ناوەندانە دەوری پرۆتۆتایپ (نموذج اولي) دەبینن لە وەرگرتنی زاراوەکانی رەنگدا. بۆ نمونە: ئێمە فێری مانای "سور" دەبین لە رێگەی ئەوەوە کە یەکەمجار دەیبەستینەوە بە ناوەندەکەیەوە ئینجا بە درێژکردنەوەی دەلالەتەکەی بەرەو دەرەوە لە ناوەندەکەیەوە بە پانتاییەکی تارادەیەك دەستنیشان نەکراودا. بەڵام مانای پرۆتۆتایپی یان ناوەندیی "سور" بەردەوام دەبێت لەوەدا کە رۆڵی خاڵی لەنگەرگرتن بگێڕێت بۆی لە دوای ئەوەوە، وە حەز دەکەین بیبەستینەوە بە شتێکەوە کە ئاشناین پێی لە ژینگەی رۆژانەماندا: بۆ نمونە دەکرێت سور، پرۆتۆتایپیانە و بەم مانایە، بە پەیوەند لەگەڵ خوێن یان ئاگردا پێناسە بکرێت (هەروەکو بە راستی زۆر فەرهەنگ بەم شێوەیە پێناسەی ئەکات). جارێکی دی، ئەوەی بۆ زاراوەکانی رەنگ راست دەردەچێت بۆ موفرەداتیش بەشێوەیەکی گشتی راست دەردەچێت. جیهانی ئەزمون خۆی وەکو یەکبەدوایەکێکی لە جیاکردنەوە نەهاتوو ناخاتە روو بۆمان. هەروەکو لە نەسکێکی پێشتری ئەم کتێبەدا بینیمان، لەلایەن ئێمەوە کاتیگۆریزە دەکرێت،

لانیکەم تا ڕادەیەکی دیاریکراو، بۆ ئەو شتانەی کە وەکو تەقلید پێیان دەوترێت جۆرە سروشتییەکان (*natural kinds*).

+ هەروەها ئەوەشمان بینی کە، یەکەم" زۆربەی لێسکیمەکان لە هەموو زمانەکاندا دەلالەت لە جۆرە سروشتییەکان ناکەن: وە دووەم شت ئەوەیە کە دەلالەتکردن لەوانە، پێویستی بە پشتگیریی کلتوری هەیە. ئەو ڕاستییەی کە مادەگەلی دیاریکراو جۆری سروشتین بە فەزڵی پێکهاتەی فیزیکییان (بۆ نمونە خۆی) یان مەخلوقاتی بایۆلۆژی دیاریکراون بە فەزڵی توانایان بۆ بەخێوکردن و زۆرکردنی جۆرەکانیان (بۆ نمونە پڵنگ)، مەسەلەیەك نییە، ئەوەندەی پەیوەندی بە بونیادی لێکسیمی زمانەوە هەبێت، ئەگەر ئەم مادەگەل و مەخلوقاتانە ئیعترافێکی کلتورییان بەمجۆرە پێنەدرابێت. ئیشکردنی ئەم دواییە چ لەسەر سیمانتیکی فەلسەفی و چ لەسەر سایکۆ – زمانناسی و سۆسیۆ– زمانناسی سەرنجیان بۆ لای ڕۆڵی کلتورییانە چەسپاوی پرۆتۆتایپەکان (نموذج أصلي أو اولي) ڕاکێشاوە لە پێناسەکردنی مانای وشەکان چ دەلالەت لە جۆرە سروشتییەکان بکەن یان نا، بە مانای تەقلیدی زاراوەکە.

## ڕاناوەکانی موخاتەبەکردن

+ ئەو دیاردەیەی لەم بەشەدا گرنگی پێدەدەین زۆری لەسەر وتراوە، لە لایەن زمانناسان و خەڵکانی ترەوە، چ وەکو دیاردەکە خۆی و چ وەکو حاڵەتی مەودایەکی فراوانتری ئەو جیاوازییانە (*distinctions*)ی وەکو کلتور دیاریکراون لە زمانە جیاوازەکاندا. ئەم دیاردەیە لێرەدا هەڵبژێردراوە لەبەرئەوەی، لانیکەم لە یەکەم سەیرکردنەوە، جۆری ئەو مانایەی لە گۆڕێدایە، مانای کۆمەڵایەتی و تەعبیری (گوزارشتکەر)، لە ناکۆکییەکی توندداییە لەگەڵ مانای وەسفی زاراوەکانی ڕەنگدا.

+لە مۆدێرنترینی زمانە ئەوروپییەکاندا، هەرچەند ئەگەر لە ئینگلیزی ستاندەریشدا وا نەبێت (کە ئەم زاراوەیە لەلایەن زۆربەی گروپەکانەوە بۆ زۆر مەبەست بەکاردەهێنرێت)، جیاوازییەك هەیە لە نێوان ئەو شتەی کە وەکو تەقلید پێی دەوترێت ڕاناوە نەجیبەکان و ڕاناوە ئاساییەکانی موخاتەبەکردن: لە فەرەنسیدا "*vous*" و "*tu*"، لە ئەڵمانیدا "*sie*" و "*du*"، لە ئیتالیدا "*lei*" و "*tu*"، لە ڕووسیدا "*vy*" و "*ty*"، لە ئیسپانیدا "*usted*" و "*tu*" و هتد.

(لە کوردیدا تۆ و ئێوە یاخود جەنابت یان جەنابتان –و–). دڵنیانین سەرچاوەی ئەم جیاوازیکردنە چییە. وەلێ ئەوەش دەوترێت کە لە لاتینییەوە سەرچاوەی گرتووە لە ماوەیەکی دواتری ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانیدا یان لە سەرەتای سەدەکانی ناوەڕاستدا، وە کە لە سەردەمە جیاوازەکاندا لەلایەن زمانەکانی ترەوە وەرگیراوە. لە دابەشبونی ئێستایدا لە سەرتاسەری زۆربەی زمانەکانی ئەوروپادا، تەواو ئاشکرایە ئەنجامی خواستنە (*borrowing*). لە ڕاستیدا خواستن لە ئارادا بووە لەسەر چەند ئاستێك، بە حوکمی ئەوەی هەمیشە یەکەمجار لە لاتینییەوە وەرنەگیراوە وە بە درێژایی سەدەکان ئەو زمانانەی کە ئەم جیاوازیکردنەیان هەبووە کەوتونەتە ژێر کاریگەری تەعدیلکەری ئەو زمانانەی ترەوە کە ئەوانیش ئەم جیاوازیکردنەیان هەبووە. لێرەدا خواستن تەقریبەن هەمیشە لە ئاکامی تەشەنەی کلتورییەوە بووە (*cultural diffusion*). بۆ خاتری گونجان و تەبا لەگەڵ ئەوەی کە ئێستا ئیجرائێکی باوە، ئیشارەت بە ڕاناوە ئاسایی و نەجیبەکان، بە چاوپۆشی لەو زمانەی مامەڵەی لە

تەکدا دەکەین، بە بەکارهێنانی "تۆ" و "ئێوە" یەك لەدوای یەك، دەکەین.

+ سایکۆلۆژیستانی کۆمەڵناسی لە بەکارهێنانی "تۆ" و "ئێوە" یان کۆڵیوەتەوە لە رووی چەمکەکانی دەسەڵات و هاریکاری (*solidarity*)، لەلایەکەوە، وە لە رووی بەکارهێنانی ئاڵوویر (متبادل) و نائاڵوویر (غیر متبادل)ەوە، لەلایەکی ترەوە. بەشێوەیەکی گشتی ئەتوانین بڵێین کە بەکارهێنانی نائاڵوویر دەلالەت لە جیاوازییەکی پێلێنراوی پلەوپایە ئەکات. لەو کۆمەڵگایانەدا کە بەکارهێنانی نائاڵوویر لە گۆڕێدایە کەسێکی لە رووی کۆمەڵایەتییەوە سەروتر یاخود (ئەگەر سەرووتریش نەبێت) بەهێزتر، "تۆ" بەکاردەهێنێت لەگەڵ ئەو کەسەدا کە لە خوار خۆیەوەیەتی، بەڵام لەلایەن ئەوانەوە بە "ئێوە" موخاتەبە ئەکرێت. بەڵام بەکارهێنانی نائاڵوویر لە زۆربەی زمانە ئەوروپییەکاندا و لە سەدەی نۆزدەیەمەوە رووی لە نەمان کردووە، بێجگە لە حاڵەتی منداڵ و گەورە کە ئەندامی هەمان خێزان نەبن، وە لە یەك یان دوو حاڵەتی تری تایبەتدا. ئەمەش مێژووییانە بەشێکی بە بڵاوبونەوەی هەڵوێستگەلی یەکسانخوازی یان دیموکراتی تر لێك دەدرێتەوە لە کۆمەڵگە خۆرئاواییەکاندا، وە بەشێکی بە گرنگی روو لە زیادبووی فاکتەری هاریکاری، کە نە تەنها بەکارهێنانی ئاڵوویر بەمجۆرە جیایدەکاتەوە، بەڵکو بەشێوەیەکی تایبەتتر بەکارهێنانی ئاڵوویری "تۆ" جیادەکاتەوە. لە زۆر وڵاتانی ئەوروپادا، بەشێوەیەکی دیاریش لە فەرەنسادا، بەکارهێنانی "تۆ" لە نێوان هاوەڵان و ناسیاواندا، لەم ساڵانەی دواییدا، بەشێوەیەکی ئێجگار زۆر زیادی کردووە، لە هەموو ئاستە کۆمەڵایەتییەکاندا، بەڵام بەتایبەتی لە نێو گەنجان و ئەوانەی لە رووی سیاسییەوە تێڕوانینێکی لیبراڵیتر یان سەر بە باڵی چەپیان هەیە. ئەوە شتێکی زۆر دەگمەنە لەمڕۆماندا، بۆ نمونە، کە ژن و مێرد "ئێوە" لەگەڵ یەکدیدا بەکاربهێنن، یان هەبونی بەکارهێنانی نائاڵوویر لە نێوان دایك و باوك لەلایەك و منداڵ لەلایەکی تردا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە لە ناو هەموو خێزانە فەرەنسییەکانی چینی سەرەوەدا مومارەسەکراوە لە سەردەمەکانی پێشوودا" وە بەتەواوەتیش لەناو نەچووە.

+ دەبێت جەخت لەسەر ئەوە بکرێت کە ئەو تەعمیمانەی ئەمێستا کران لەسەر وەرچەرخان (*switch*)ی بەرەبەرە لە دەسەڵاتەوە بۆ هاریکاری وەکو فاکتەری باڵادەست لەو گۆڕانەی کە روویداوە لە بەکارهێنانی "تۆ" و "ئێوە" دا لە زمانە ئەوروپییەکاندا لە ماوەی نزیکەی سەد ساڵی رابردوودا، لە سروشتدا ئامارئامێزن (*staistical*). بێگومان مەسەلەکە ئەوە نییە کە یەکێك بێت و بتوانێت بە وردییەکی تەواوەوە پێشبینی بکات بەوەی ئایا دوو تاکەکەس "تۆ" یان "ئێوە" بەکاردەهێنن لە بارودۆخێکی دیاریکراودا تەنها بەپێی زانیاری دەربارەی چینی کۆمەڵایەتیان، تەمەنیان، سێکسیان و وابەستەیی سیاسییان و هتد. هەروەها جیاوازیگەلێك هەنە لە نێو ئەو شتەی کە وادیارە گروپگەلی کۆمەڵایەتی هاوشێوەبن لە وڵاتگەلێکی جیاوازی ئەوروپادا لە رووی ئەو سەربەستییەوە کە "تۆ" بەکاردەهێنرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو گۆڕانەی لەسەرەوە باسکرا بێگومان روویداوە لە چەند سەردەمێکی تاڕادەیەك جیاوازدا و بە رادەی جیاواز.

+ نمونە هێنرایەوە بۆ روونکردنەوەی ئەو راستییەی کە هاوپەیوەندییەکی، چ سینکرۆنی[١٨] و چ دایکرۆنی، هەیە یان ئەکرێت هەبێت لە نێوان

بونیادی کۆمەڵایەتی و نە تەنها موفرەداتدا، بەڵکو لە نێوان بونیادی کۆمەڵایەتی و بونیادی گراماتیکی زمانەکانیشدا. ئەم هاوپەیوەندییە زۆر چڕوپڕترە لە زمانەکانی تردا وەکو زمانی یابانی و هیندی و جاوی (زمانی خەڵکی دورگەی جاوە —و—)، زیاتر لەوەی کە لە هەر زمانێکی تری ئەوروپیدا هەیە. بەڵام شایانی وتنە کە لە زمانی ئیتالی و ئیسپانیدا، بە پێچەوانەی، بۆ نمونە فەرەنسی، ئەڵمانی یان رووسییەوە لە چەند تەرکیبێکی گراماتیکی دیاریکراودا جیاوازییەکی تایبەت بە فۆرمۆڵەی داخوازی/ مەرجداری[١٩] هەیە کە پەیوەستە بە جیاوازیکردنی نێوان "تۆ" و "ئێوە" وەوە“ واتە لە چەند دیالیکتێکێکی باشووری ئیتالیدا، جیاوازیکردنێکی تریش هەیە لە ناو "ئێوە"دا ئەگەر بکرێت بڵێین جیاوازی نێوان "*lei*" و "*voi*"، کە لە هەندێك، نەوەك لە هەموو، ئەو زمانانەی کە جیاوازی نێوان "تۆ" و "ئێوە" یان تێدایە، جیاوازییەکی تاك/کۆی سەربەخۆ هەیە کە پەیوەستە پێیەوە (ئەم حاڵەتە لە کوردیشدا وایە —و—) کاتێکیش مەسەلە دێتە سەرئەوەی کە "تۆ یان ئێوە" چی ئەگەیەنێت لە زمانێکی دیاریکراودا، پێویست بە وردودرشتی زیاتر ئەکات سەبارەت بونیادی کۆمەڵایەتی و رۆڵە کۆمەڵایەتییەکان، لەوەی تێگە گشتییەکانی دەسەڵات و هاریکاری دەیگرنەوە. هەروەها دەبێت زانیاری بدرێت سەبارەت بە راڤەکردنی "تۆ" و "ئێوە" لە بونیادی گراماتیکی هەر زمانێکدا و بەکارهێنانیان لەگەڵ و بەبێ پێشناو (لەقەب) و ناو و زاراوەکانی تری موخاتەبەکردن. لەگەڵ ئەوەشدا خاڵە گشتییەکە روونە: مانای کۆمەڵایەتی و تەعبیری "تۆ" و "ئێوە" بەشێوەیەکی زۆر روون پشتبەستووە بە کلتور“ مەسەلەکە مەسەلەی مەعریفەی کۆمەڵایەتییانە وەرگیراوە. مەعریفەکەش پراکتیکییە زیاتر لەوەی پرەپۆزیشناڵی (*propositional*) بێت: ئەو مەعریفەیە ئەکەوێتە مەودای لێزانی (*know-how*)ی کۆمەڵایەتییەوە.

\+ ئەکرێت "تۆ" و "ئێوە" لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر شتێك لە مانادا بگۆڕێن. ئەتوانین بەڵگەی تاڕادەیەك سەرنجڕاکێشی ئەمە لە ئەدەبی روسی سەدەی نۆزدەیەمدا ببینینەوە، بە شێوەیەکی دیار لە رۆمانەکانی تۆڵستۆیدا. مەسەلەکە ئەوەیە کە لەو کاتەدا دایگلۆسیا[٢٠] هەبووە لە نێو ئەندامانی چینی ئەرستۆکراتی رووسیدا، لەوەدا کە فەرەنسی زمانی سەرەوە (رۆشنبیران) بووە و روسیش زمانی خوارەوە (کەم ڕۆشنبیران)[٢١]. کاتێك کە بە زمانی فەرەنسی لە نێو خۆیاندا قسەیان کردووە، "ئێوە" یان بەکارهێناوە لەگەڵ یەکتردا، بە چاوپۆشی لە بۆندەکانی خێزان و هاوڕێیەتی کە پێدەچێت یەکیخستبن. لەمبارەیەوە ئەوان پەیڕەوی بەکارهێنانی ئەو سەردەمەی چینی سەرەوەی فەرەنسایان دەکرد. بەڵام کاتێك بە رووسی قسەیان دەکرد، "تۆ یان ئێوە" یان بەکاردەهێنا، بەشێوەیەکی ئاڵۆیر لە نێو خۆیاندا، وە بەشێوەیەکی نائاڵۆیر لەگەڵ ئەوانەی لە رووی کۆمەڵایەتییەوە لە خوار خۆیانەوەن و ئەوانەی بەرفەرمانیانن. فاکتەرگەلێکی مەودا — دوور و مەودا — کورت بەکارهێنانی ئاڵوێریانی دیاریدەکرد. فاکتەری مەودا — دوور ئەو فاکتەرەیە کە بەشێوەیەکی گشتی وەکو هاریکاری دیاریکراوە بەپێی خزمایەتی و هاوڕێیەتی و هاوسەرێتی و هتد. کاریگەرییەکەی ئەوە بووە کە ژنان و پیاوان یان "تۆ" یان بەکارهێناوە یان بەکاریان نەهێناوە لەگەڵ هەریەك لە ناسیاوەکانیاندا (نوسەر دیاری ناکات کە ئەگەر "تۆ" یان بەکارنەهێناوە ئەی چیان

بەکارهێناوە؟ —و—). فاکتەری مەودا — کورتیش مەزاج (*mood*) یان سۆزداری ئەو لەحزەیە بووە: بۆ نمونە زمانی روسی، بە پێچەوانەی زمانی فەرەنسییەوە، بواریداوە بەوەی بتوانین تەواو سەربەستانە لە "تۆ"ی مەودا — دووری هاریکاریی و نێوانخۆشییەوە تێپەڕین بۆ "ئێوە"یەکی مەوداکورتی ئێجگار پڕ مانای توڕەیی و نامۆیی" وە هەروەها، هەرچەند ئەمەیان گرنگی بۆ ئێمە نییە لێرەدا، بواری دایە هاریکاری مەودا — کورت کە بە لەمپەرە کۆمەڵایەتییەکاندا تێپەڕێت، گەر بتوانین بڵێین، لە چەند لەحزەیەکی ئێجگار سۆزداری و سەرکەوتندا بەسەر پاترنی بەکارهێنانی مەودا — دوری نائاڵوویێر. (نازانم مەبەستی نوسەر لەم بەشەی رستەکە چییە، بەڵام سیاقی تەسریحی رستەکە چۆنم وەرگێڕاوە ئاوا ئەڵێت، وا لێرەدا ئینگلیزییەکەی ئەخەمە پێشچاو:

*- and also, though this does not concern us here, it allowed short-term solidarity to break through the social barriers, as it were, in certain highly emotional moments and triumph over the long-term non-reciprocal pattern of usage.*.

+ تۆڵستۆی تەواو ئاگاداری جیاوازییەکانی جیاوازیکردن بوو لە نێوان "تۆ و ئێوە" لە زمانی روسی و فەرەنسیدا، بە حوکمی ئەوەی کە پراکتیزە دەبوو بەسەر ئاخاوتنی ئەو چینەدا کە ئەو وابەستەی بوو. نە تەنها رێزی لەو جیاوازیانە دەگرت لە نوسینەکانیدا، بەڵکو لە بۆنەکاندا بە روونی سەرنجی خوێنەرانی خۆی بۆ لایان رادەکێشا. هۆی ئەوەی کە بۆچی وای دەکرد، بەتایبەت لە رۆمانەکانی دواییدا، ئەوە بوو زۆری دایەلۆگەکان کە هەرچەند بە زمانی روسی دەردەکەون لە ئەسڵەکەدا، مەبەستی لێیان تێگەیشتنیان بوو (لای خوێنەر —و—) وەکو ئەوەی فەرەنسی بن. عادەتەن مومکینە، بەپێی بەڵگەی ناوەکی، لەوانە مەعریفەی مرۆڤ دەربارەی گۆڕاوە سۆسیۆ— زمانییەکان، بۆ دەرەنجامکردنی ئەوەی ئایا بەشێکی تایبەت لە تێکستەکە دەبێت وەکو ئەوە لێکبدرێتەوە کە زمانی فەرەنسی بنوێنێت یان نا. یەکێك لە پەیکەکان ئەو راناوەی موخاتەبەکردنە کە بەکاربراوە. بۆ نمونە لە ئانا کارنینادا، لەو دایەلۆگانەی کە هەرکام لە کاراکتەرە سەرەکییەکانی تێدایە شێوازی "تۆ" (بێجگە لە دوو حاڵەت کە لە سیاقەکەدا قابیلی لێکدانەوەن) دەلالەتی بێ سێ و دووە لەوەی کە بە زمانی روسی قسە دەکرێت. وەلێ، بەکارهێنانی شێوازی "ئێوە" لە خۆیدا ئەوە ناگەیەنێت کە دایەلۆگەکە دەبێت والێکبدرێتەوە کە بە فەرەنسی ئەنجامدراوە. پێش هەموو شتێك، هەموو کاراکتەرە سەرەکییەکان لە پەیوەندی "تۆ"دا نین لەگەڵ یەکدی. دووەم، ئەو گۆڕینانەی روودەدەن دەلالەت لەوە ناکەن کە گۆڕانی مەودا— دوورن لە "ئێوە" وە بۆ "تۆ" لە ئاستی دیار و زۆر پڕماناداد، بەڵکو، هەروەکو لە سەرەوە باسکرا، لەوانەیە گۆڕین لە "تۆ" وە بۆ "ئێوە" روودەدات لە کاتی دەمەقاڵەیەکدا کە بە زمانی رووسی دەکرێت — ئینجا گەڕانەوە بۆ "تۆ" ئیشارەت بێت بە ئاشتبونەوە یان نەرم و نیانی.

+ روسییەکانی ئەو چینەی کە تۆڵستۆی وابەستەیان بو، وە کە بۆ ئەوانیشی دەنوسی، لەو سەردەمەی لەمەڕ باسەکەمان، کەم تا زۆر ئۆتۆماتیکییانە کاردانەوەیان دەبو بۆ ئەو پەیکانە (لەو پەیکانە تێدەگەیشتن). ئەوان جوتزمان بوون لەوەدا کە بە رووسی و فەرەنسی قسەیان دەکرد و بەشبەحاڵی جیاوازیکردنی نێوان "تۆ" و "ئێوە"،

دوو سیستمی تەواو جیاواز و لە بەراوردکردن نەهاتویان بەکاردەهێنا لە ژیانی ڕۆژانەیاندا، بەڕادەیەك، بە زانینی ئەوەی ئایا شێوازی "ئێوە" لە تێکستەکەدا واتای "ئێوە"ی فەرەنسی یان "ئێوە"ی رووسی هەبوو، بێ دوودڵی و تاڕادەیەکی زۆریش نەستیانە (بدون وعی) کاردانەوەیان بۆ ئەو حاڵەتانە هەبووە کە تیایدا گواستنەوە ڕوویداوە لە "ئێوە"ی روسییەوە بۆ "تۆ"ی رووسی یان بە پێچەوانەوە. زۆر لەو گواستنەوانە مەغزایەکی گەورەیان هەیە، وە هەندێکیشیان، نەوەك هەموویان، بە ڕوونی بەم شێوەیە لەلایەن نوسەرەوە تێبینیان لەسەر دراوە. خوێنەرانی مۆدێرنی ئەو کارە (ئەدەبییە -و-) زۆر شتیان لەکیس دەچێت گەر نەتوانن حەساسیەتی هەبونی کاردانەوەی شیاو وەدەستبهێنن بەو تەرحەی کە هاوسەردەمانی رووسی – زمانی تۆڵستۆی بەدەستیان هێناوە.

+ ئێستاش هەرکەسێك تەرجەمەیەکی ئینگلیزی (ئەو کارە -و-) دەخوێنێتەوە، ناتوانێت ئەو گواستنەوە بەمەغزایانەی لەدەست نەچێت: چونکە هیچ کلۆجێك نییە بۆ بەئینگلیزی کردنیان، بێجگە لە پەنابردنە بەر بەکارهێنانی "*thou*" و "*you*" بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و بە درێژایی دەقەکە "تۆ و ئێوە" بنوێنن. بەڵام زەحمەتە بڵێین ئەمە وەرگێڕانە. ناشتوانرێت شتێکی وەکو هەمان کاریگەری بەدەستبهێنرێت بە خستنەسەری زاراوەکانی خۆشەویستکردن (تحبب) یان گوزارشتگەلێکی دی موخاتەبەکردن وەکو ناوی ئەو کەسە خۆی (*first name*)، بۆ سەر دەقەکە. وەرگێڕانی ئینگلیزی ستاندەر جاروبار ئەمە دەکات. بەڵام دەتوانرێت خێرا ئەوە نیشان بدرێت کە ناتوانێت ئەو کاریگەرییەی هەبێت.

+ ڕەنگە وای بۆ بچین وەرگێڕانی بۆ فەرەنسی باشتر مامەڵە لەگەڵ کێشەکەدا بکات: وە بە مانایەك لە ماناکان، ئەتوانێت وا بکات – بەوەی بە شێوەیەکی ڕێکوپێك پێچەوانەی ئەوە بکات کە تۆڵستۆی دەیکرد. بەڵام لە کاتێکدا کە خوێنەری رووسی ڕۆژگاری تۆڵستۆی جوتزمان بووە لە هەردوو زمانی روسی و فەرەنسیدا، عاممەی خوێنەری فەرەنسی تۆڵستۆی وانین. هەرکەسێك کە وەرگێڕانێکی فەرەنسی دەخوێنێتەوە کە تیایدا بەشێوەیەکی ڕێکوپێك "*vous*" بەکارهێنراوە بۆ "*vy*"ی روسی وە "*tu*" بەکارهێنراوە بۆ "*ty*"ی روسی، دەبێت هەندێك لە ڕاناوەکان بە پێوانەی سیستمی روسی و هەندێکی تریان بە پێوانەی سیستمێکی فەرەنسی تەواو جیاواز ڕاڤە بکات – نەوەك سیستمی فەرەنسی ئەمڕۆ بەڵکو هی سەد ساڵ لەمەوبەر. پێویست ناکات جوتزمان بێت، بەڵام بە دڵنیاییەوە، دەبێت تاڕادەیەکی پێویست و لە رووە پەیوەندیدارەکانەوە، دوو کلتور (*bicultural*) بێت.

+ ئەمەش مەبەستی نمونەکەیە. زۆربەی زمانەکان، ئەگەر هەمووشیان نەبێت، جیاوازی دەخەنە روو لە بونیادی گراماتیکی یان لێکسیمییاندا کە بە فەزڵی هاوپەیوەندییان لەگەڵ ئەو جیاوازییە وەزیفیانەی کە لەو کلتورەدا یان لەو کلتورە فەرعیەدا هەیانە کە ئەو زمانەی تێدا بەکاردەهێنرێت، ئەو مانایەی هەیانە هەڵدەێنجن. مانا بەشێوەیەکی باو، ئەگەر بە زەروەتیش نەبێت، کۆمەڵایەتییە و گوزارشتکەرە، زیاتر لەوەی وەسفی بێت. بەڵام ئەوەی لە بەشی پێشودا وترا سەبارەت کۆبونەوەی لقە – بونیادێکی گەردونی مومکین لەگەڵ بونیادێکی فەوقی ناگەردونی پشت بەستو بە کلتور، بە نیسبەت ئەم تەرزە مانایەشەوە ڕاست

دەردەچێت. هەروەکو بینیمان جیاوازیکردنی "تۆ و ئێوە"ی رووسی جیاوازە لە جیاوازیکردنی "تۆ و ئێوە"ی فەرەنسی. بەڵام ئەتوانرێت، تا ئاستێك، جیاوازییەکە روونبکرێتەوە بۆ ئەوانەی نە رووسی و نە فەرەنسی دەزانن، بە زمانی چەمکی زۆر گشتی، ئەگەر گەردونیش نەبێت، کە پەیوەندی هەبێت بە پلەی کۆمەڵایەتیی و خزمایەتی و خۆشەویستی و هاوڕێیەتیو هتد ەوە. تاڕادەیەکی زۆر بە هەمان شێوە، ئەنسرۆپۆلۆژیستان و سۆسیۆ- زمانناسان و ئەوانەی لێدوانی ئەدەبی ئەدەن ئەتوانن، کەم تا زۆر ئەوەندەی پێویست بێت، بۆ ئەوانی دی روون بکەنەوە، مانای گوزارشتە ناباوە پشتبەستوو بە کلتورەکانی زمانێکی دی چییە. ئەم خاڵە لە بەشی داهاتوودا وەردەگرین و تەعمیم دەکەین. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی پێویستە لێرەدا جەختی لێبکرێت ئەوەیە کە توانای روونکردنەوەی جیاوازییەکی گراماتیکی یان لێکسیمی پشتبەستوو بە کلتور، کەم تا زۆر بەشێوەیەکی رەزامەندانە، لە رێگەی بەکارهێنانی زمانێکی دییەوە کە ئەو جیاوازییەی نەبێت، بە زمانی ئەوە ناگەیەنێت کە ئەکرێت جیاوازییەکە لە وەرگێڕاندا وێنابکرێت (یان لە وەرگێڕانهاتوو بێت -و-). نابێت روونکردنەوەی میتا-زمانی لەگەڵ وەرگێڕاندا تێکەڵبکرێت. (میتازمان واتە زمانی نوسین لەسەر زمان، زمانی دیراسەکردنی زمان -و-).

## ئۆڤەرلاپی کلتوری(٢٢)، تەشەنەکردنی کلتوری و لەوەرگێڕانهاتن

بە درێژایی ئەم نەسکەو لە راستیشدا بە درێژایی ئەم کتێبە ئەو تێڕوانینەمان پەرەپێداوە و نمونەمان بۆ هێناوەتەوە کە زمان دیاردەیەکی هەم بایۆلۆژی و هەم کلتوریشە. وا دەردەکەوێت زمانە دیاریکراوەکان لقە بونیادێکی گەردونییان هەیە، بە جەختەوە لە گرامەر و موفرەداتدا و پێدەچێت لە فۆنۆلۆژیاشدا، وە بونیادێکی فەوقی ناگەردونیش کە نە تەنها لەسەر بناغەی ئەم لقە بونیادە بنیاتنراوە بەڵکو تەواو ئاوێزانیشیەتی.

+ لقەبونیادی گەردونی" بەشێکی لەلایەن ئەو بەهرە ئیدراکییانەی عەقڵی مرۆڤەوە دیاریکراوە کە لە رێگەی جینەکانەوە گوازراونەتەوە، وە هەروەها لەلایەن ئەو پاڵنەر و ئارەزووە غەریزییە مرۆییانەی کە جینەکان دیاریان دەکەن، کە ئەمەش گرنگی لەو کەمتر نییە" وە بەشێکی لە رێگەی کارلێککردنی ئەو فاکتەرە ئیدراکی و نائیدراکیانەی لە رووی بایۆلۆژییەوە دیاریکراون، لەگەڵ جیهانی فیزیکی بەو شێوەیەی کە خۆی دەخاتە روو بۆ مرۆڤەکان. مەسەلەی ئەوەی ئایا بەهرەیەکی وەرگرتنی زمان لە خۆیدا هەیە، هەتا ئێستا دڵنیا نین لێی. لەگەڵ ئەوەشدا، پرۆسەی وەرگرتنی زمان بە جۆرێکە کە گواستنەوەی بایۆلۆژیانەی هەرچیەك کە گەردونییە لە زماندا، لە سەرکەوتنیدا، پشتبەستووە بە پرۆسەی گواستنەوەی کلتوری.

+ سەبارەت بە بونیادی فەوقی ناگەردونی لە زمانەکاندا، ئەمەیان زۆر ئاشکرایانەتر مەسەلەی گواستنەوەی کلتورییە-وە بە دوو مانا. ئەمە تەنها توانستی زمانی نییە کە لە نەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر بگوازرێتەوە لە رێگەی دەزگاکانی کۆمەڵگایەکی دیاریکراوەوە، بەڵکو ئەوەی دەگوازرێتەوە لە خۆیدا پێکهێنەرێکی گرنگە لە کلتوری ئەو کۆمەڵگەیەدا. ئەگەر توانست لە زمانێکی دیاریکراودا بە (ضمني) توانای بەرهەمهێنان و تێگەیشتنی رستەگەلی ئەو زمانە بگەیەنێت، ئەوا بەشێوەیەك کە جێگەی گومان نییە بەشێکە لە کلتور: واتە مەعریفەی کۆمەڵایەتی. لەبەرئەوەی زۆری مانای گوزارشتەکان، بە مانا

وەسفی و هەروەها کۆمەڵایەتی و تەعبیرییەکەشیانەوە، ناگەردونین و پشتبەستون بە کلتور. ئەم خاڵە بە پەیوەند لەگەڵ دوو نمونەی زۆر جیاوازدا باسکرا لە دوو بەشی پێشوودا. وەلێ، ئەو خاڵەش باسکرا کە گرنگی لەو کەمتر نییە، ئەویش ئەوەیە: هەرچەندە پێدەچێت وەرگێڕانی هەموو رستەکانی زمانێك بۆ رستەکانی زمانێکی تر مەحاڵ بێت بەبێ شێواندن یان بەکارهێنانی بەدیلی کاتی وەکو رێگەچارەی مامناوەند، ئەوا عادەتەن مومکینە کەسێك، کە زمان و کلتورە ئەسڵییەکە نازانێت، وا لێبکەین کەم تا زۆر رەزامەندانە تێبگات تەنانەت لەو گوزارشتانەی کە پشت بەستوون بە کلتور و رێگریی (ممانعە) بەرامبەر وەرگێران نیشان دەدەن بۆ هەر زمانێك کە ئەو ئاشنایە پێی.

+ ئەمە مومکینە، چونکە لە نێوان هەردوو کۆمەڵگایەکدا، کەم تا زۆر رادەیەك لە ئۆڤەرلاپی کلتوری هەیە. لە حاڵەتە سنوردارەکەیدا، رەنگە ئەم ئۆڤەرلاپە کلتورییە لەوە زیاتر نەبێت کە پێشبینی پێکراوە لەو شتانەوە کە وەکو کلتور گەردونین بە فەزڵی پێکهاتەی بایۆلۆژی مرۆڤەوە و ڕووە بەرینەکانی لێکچون (اوجە الشبە الواسعة)ی ژینگە لە هەموو پارچەکانی ئەو جیهانەی کەڵکی تیانیشتەجێبونی پێوەیە (واتە خاڵە سەرەتایی و گشتییەکانی لێکچونی نێوان کۆمەڵگەکان، لەوانە شتە بایۆلۆژییەکان و ڕووەکانی لێکچونی ژینگەی مرۆڤەکان –و–). بەڵام لەبەر هۆگەلێکی جۆراوجۆر، لەوانەش ئەوەی ئەنسرۆپۆلۆژیستان بە تەشەنەی کلتوری ئاماژەی پێئەدەن، ڕادەی ئۆڤەرلاپ بە هیچ جۆرێك کەم نییە. بەشێوەیەکی گشتی بدوێین، لەوەرگێڕانهاتن وەزیفەی رادەی ئۆڤەرلاپی کلتورییە. بەڵام وەکو لە حاڵەتی راناوەکانی موخاتەبەکردنی زمانی رووسی و فەرەنسیدا لای تۆڵستۆی بینیمان، هەرچەند ناکرێت رەزامەندانە وەربگێردرێنە سەر ئینگلیزی، ئەتوانرێت بەکارهێنانیان بۆ قسەکەرانی ئینگلیزی تاکزمان روونبکرێتەوە لە رووی تێگەلێکی تاڕادەیەکی باش گشتییەوە کە بەسەر وەسفکردنی کلتورەکەی خۆشماندا پراکتیزە دەبن، ئەگەرچی بە هەبونی جیاوازیگەلێکیشەوە لە تەفاسیلیدا.

+ ئەکرا هەمان خاڵ، ئەوەندەی پەیوەندی بە راناوەکانی موخاتەبەکردنەوە هەبێت، سەبارەت بەو زمانانەی کە سیتێکی دەوڵەمەند لە گوزارەگەلی تەشریفی (رێزلێنان –و–) یان هەیە، باس بکرێت (بۆ نمونە زمانی جاوی و کۆری و تایلاندی و زۆر لە زمانەکانی باشوری رۆژهەڵاتی ئاسیا)، یان ئەو زمانانەی کە وەکو زمانی یابانی کە راناوگەلی تەشریفییان هەیە بەڵام زاراوەکانی خزمایەتی و پێشناوەکانی پلەوپایە زۆر زیاتر لە راناوەکان بەکاردەبەن. لە یەکەم سەیرکردنەوە، ئەمە زۆر جیاواز دەردەکەوێت لە هەر شتێك کە لە کۆمەڵگە ئینگلیزی زمانەکاندا هەیە. بەڵام ئەو سنوربەند (*parameters*)ە کلتورییانەی کە بەکارهێنانی نائاڵوویر دیاریدەکەن – سەردەستی (*superiority*) کۆمەڵایەتی، تەمەن و خزمایەتی و رەگەزی نێر و مێ و هتد، – هەروەها ئەوانیش لە کلتوری خۆماندا کاریان پێدەکرێت، ئەگەرچی تاڕادەیەکی سنوردارترە، وە بەبێ هەبونی هەمان کاریگەری لەسەر بونیادی گراماتیکی و هەروەها موفرەداتی زمانی ئینگلیزی. بۆ نمونە، نە تەنها بەکارهێنانی ئاڵوێر و بەکارهێنانی نائاڵوێری ناوەکان و پێشناوەکان بە هەمان ئەو فاکتەرانە دیاریکراون لە زۆر لە کۆمەڵگە ئینگلیزی زمانەکاندا، بەڵکو بارو زروفگەلێك هەیە کە تیایدا (کە ئەمەش ئەو حاڵەتەیە کە بەشێوەیەکی گشتی لە یابانیدا هەیە) کەسی بەرزتر، نەوەك خوارتر، لەوانەیە بە هەمان ئەو

زاراوەی خزمایەتی و پێشناوەوە ئیشارەت بە خۆی بكات كە موخاتەبەی لەگەڵ ئەو پێدەكرێت (بۆ نمونە بەكارهێنانی "بابە" یان "دایە" یان "مامۆستا": ئەی بابە/ دایە/ مامۆستا پێی نەووتیت كتێبەكانت هەڵبگرە؟). ئۆڤەرلاپی كلتوری لەم چەشنە و تا ئەم رادەیە، بە شێوەیەكی گشتی یارمەتیمان ئەدات تێبگەین لە وەسفی بونیادی دەلالی زمانگەلی تر كە لە ئەدەبی سۆسیۆزمانیی و ئەنسرۆپۆلۆژیدا بەدەردەكەون. لەگەڵ ئەوەشدا، ئەوە هەڵەیە پێمان وا بێت كە تێگەیشتنی گشتی بونیادی دەلالی زمانگەلی تر كە ئەتوانرێت بەم شێوەیە وەربگیرێن (ئیكتیساب بكرێن —و—) لە شتێكی ڕووكەش بەولاوە زیاترە (واتە ئەو تێگەیشتنە تێگەیشتنێكی ڕووكەشە —و—). تەواو تێگەیشتنی ئەو چەند جۆرە مانایەی كە لە گرامەر و موفرەداتی زمانێكدا كۆدكراون تەنها لەگەڵ تەواو تێگەیشتنی ئەو كلتور یان كلتورگەلەدا بەدەستدەهێنرێت كە ئەو زمانە تیایدا ئیشدەكات.

+ ئەوەی هەر ئێستا وترا شتێكی مەئلوفە نە تەنها بۆ سۆسیۆ — زمانناسی و ئیتنو — زمانناسی، بەڵكو بۆ رەخنەی ئەدەبیش. وە دیراسەكردنی زمانگەلێكی بیانی هەڵبژێردراو لە قوتابخانە و زانكۆكانماندا — كە هەموویان وا هەڵسەنگێنراون پلەو پایەی زمانی كلتوریان هەبێت (*Language of culture*) بە مانای بەرتەسكتری "كلتور" — وەكو تەقلید و شایستانە پاسادراوە، بەشێوەیەكی بنەڕەتی لەسەر هەمان ئەو بنەمایانە. زمانگەلی دیاریكراو (معین) لە رووی مێژووییەوە پەیوەستن بە كلتورگەلی دیاریكراوەوە: زمانەكان كلیلی ئەو كلتورگەلە پەیوەستانە دەستەبەردەكەن، وە بەتایبەتیش كلیل بۆ ئەدەبەكەیان: زمانەكان خۆیان ناتوانن تەواو مەفهوم بن مەگەر لە سیاقی ئەو كلتورانەدا كە تیایدا بە چەشنێك ریشەداكوتاون كە قابیلی لێكجیاكردنەوە نین: لەبەرئەوە زمان و كلتور پێكەوە دیراسە دەكرێن. ناتوانرێت ئەم ئارگیومێنتە لەسەر ئاستی پرەنسیپی گشتیدا خەوشی لێبدۆزرێتەوە. بێگومان مەسەلەكە ئاوالآیە بۆ دیبەیتكردن ئایا مەبەست و شێوازە تەقلیدیترەكانی وتنەوەی زمان (فێركردنی زمان) لەسەر بنەمای وێناكردنێكی وەكو پێویستیشە فراوان بۆ كلتور دامەزراوە یان نا. بەڵام ئەمە مەسەلەیەكی ترە. ئەتوانرێت وە پێویستە فێربونی زمان لەگەڵ مەبەستگەلی دیاریكراودا سازبدرێت و بگونجێنرێت. یەكێك لەو مەبەستانە وەرگرتن و بەشداریكردنە، ئەوەندەی ئەكرێت بە تەواوەتی، لە كلتورێكی جیاواز لەو كلتورەی كە تێیدا گەورەبوین.

+ چەند لایەنێكی پشتپێكبەستنی زمان و كلتور هەیە كە تا ئەو رادە فراوانەی پێویستە هەڵنەسەنگێنراون. یەكێك لەوانە، كە زۆر پەیوەندیدارە بە مەسەلەی لەوەرگێڕانهاتنەوە، ئەو رادەیەیە كە تەشەنەی كلتوری جیاوازییە دەلالییەكانی نێوان زمانەكان كەم دەكاتەوە، وە هەندێك جاریش دیاریان ناهێڵێت. سەرەنجامگەلی زمانەوانیی دیارتری تەشەنەی كلتوری ئەمێستا باسكرا: خواستن و وەرگێڕانی — خواستن. ئەوەی كە ئێمە مەبەستمانە جۆرێكە لە وەرگێڕانی—خواستن كە بەخێراییەكی كەمتر قابیلی دەستنیشانكردنە: دیاردەیەكە بەشێوەیەكی گشتی لە خۆیدا وا سەیر ناكرێت، ئەوەی زیاتر وایلێدەكات ئەوەیە كە زەحمەتە لە زۆر حاڵەتدا جیایبكەینەوە لە وەرگێڕانی ئاسایی لەلایەكەوە، وە لە ئیبداع لە بەكارهێنانی زماندا لەلایەكی ترەوە، ئەگەرچی ئەو ئیبداعە پێدەچێت بە رێسا ركێف نەكرابێت، چاك دەكەوێتە مەودای توانستی زمانیی كەسی ئاساییەوە.

+ با بۆ نمونە وا دانێین کە ئێمە خەریکی وەرگێڕانین لە زمانی گریکی کلاسیکییەوە بۆ ئینگلیزی، وە کە روبەڕوی وشەی "*sophia*" بوینەتەوە. ئەم وشەیە وەکو عورف بە "*wisdom*" تەرجەمە دەکرێت، وە لە زۆر سیاقیشدا ئەم تەرجەمەیە، وە زۆر جاریش وا دەردەکەوێت، هاوتایەکی تەواو گونجاوی رەزامەندانەبێت. بۆ نمونە با وا دانێین رستەیەك کە ئاوەڵناوی "*sophos*"ی تێدایە کە وەکو رێزمان و وەکو دەلالەت پەیوەندیدارە بە "*sophia*" وە، هەروەکو پەیوەندیداربونی "*wise*" بە "*wisdom*"وە، لە دەقێکی گریکیدا هاتووە و هی بنوسێکی وەکو ئیفلاتونە، وە وەکو رستەی "*Homer was wiser than Hesiod*" کرایە ئینگلیزی. لە دەرەوەی سیاقدا، یەکێك کە بەباشی زمانی گریکی نەزانێت یان زانیارییەکی تەواوی نەبێت سەبارەت پاشخانی کۆمەڵایەتی و کلتوری، لەوانەیە یەکسەر ئەم تەسریحە بە جۆرێك تەرجەمە بکات کە وشەی "*wise*" بە هەمان ئەو مانایەی کە بۆ نمونە لە رستەی "*Shakespeare was wiser than Marlowe*"دا هەیە، بەکارهێنراوە، بەڵام ئایا وایە؟ لە دەرەوەی سیاقدا، دڵنیا نین لە وەڵامەکەی، بە حوکمی ئەوەی کە وشەی "*sophia*" بێگومانکردن ئەو شتە دەگرێتەوە کە لە ئینگلیزی ئەمڕۆماندا وەکو "*wisdom*" دەستنیشانی دەکەین، وە ئەو وشەیەش دەبێت کە بەکاردەهێنرێت بۆ ئیشارەتکردن پێی (واتە ئیشارەتکردن بە "*wisdom*"). بەڵام "*sophia*" و "*wisdom*" هەمان مەودا و پانتایی مانایان نییە. لە زۆر سیاقدا، باشترین تەرجەمەی ئینگلیزی بۆ رستە گریکییەکە "*Homer is a better poet than Hesiod*" دەبێت. لە راستیدا، جێگەی مشتومڕە ئایا ئەمە نزیکترین مەبەستە لە مەبەستی گریکەکان لە کاتێکدا وشەی "*sophos*" بەکاردەهێنرێت بە واتا پرۆتۆتایپییەکەی. ئەگەر پێڵاودروویەك یان دارتاشێك لە ئیشەکەیدا باش بێت بە هەمان شێوە بێ سێ و دوو پێی دەووترێت "*sophos*" وەکو دکتۆرێك یان شاعیرێکی باش یان پیاوێکی دەوڵەتی باش. ئەکرێت یەکێك بێت و ئارگیومێنت بکات و بڵێت کەس ناتوانێت پیاوێکی دەوڵەتی باش بێت، یان لەوانەیە بڵێت کەس ناتوانێت پزیشکێکی باش بێت ئەگەر "*wise*" نەبێت، بەڵام ئەوەی عادەتەن بە "*wisdom*" ناوی دەبەین لە ئینگلیزیدا، بە دڵنیاییەوە خەسڵەتێکی بنەڕەتی پێڵاودروویەك، دارتاشێك یان شاعیرێك نییە.

+ بەڵام وەرگێڕان لە زمانێکەوە بۆ زمانێکی تر ناتوانێت هەموو کات رێزی بەکارهێنانی عادەتی بگرێت. ئەگەر کەسێك خەریکی وەرگێڕانی یەکێك لە بڕگە زۆرەکانی دایەلۆگەکانی ئیفلاتون بێت کە تیایدا پرسیاری لەمەڕ باس "ئایا فەزیلەت قابیلی فێرکردنە؟" بێت، کە وەکو تەقلید لە ئینگلیزیدا بەم شێوەیە دادەڕێژرێت "*Is virtue teachable?*" (کە پەیوەندە بە پارادۆکسە بەناوبانگەکەی سۆکراتەوە "هیچ کەسێك بە ئاگاییەوە خراپە ناکات" وە بە تێزەگەلێکی زۆری بە هەمان ئاست بەناوبانگەوە، نە تەنها هی فەلسەفەی گریکی بەڵکو هی سەرجەم ترادیسیۆنی فەلسەفی خۆرئاوایی کە لێیەوە داتاشراوە)، خۆی لە بارێکدا دەبینێتەوە کە ناچارە یان "*wisdom*" بۆ "*sophia*" بەکاربهێنێت (وە "*virtue*" یان "*goodness*" بۆ وشەی "*arete*"ی گریکی)، یان وشەیەکی تر بەکاربهێنێت کە، هەرچیەك بێت، نەشیاو دەبێت بە مانا عادەتییەکەی لە زۆر لەو کۆلۆکەیشنانەی[٢٣] کە ئەو وشەیەی تێدا دەردەکەوێت. ئەگەر ئەو بەجۆرێك لە جۆرەکان بەشێوەیەکی رێکوپێك تەرجەمەی نەکات لەو

پەرەگرافانەدا، بونیادی ئارگیومێنتەکە دەشاردرێتەوە و ئەو نمونانەشی بەکارهێنراون بۆ پشتگیریکردن لێی پەیوەندیداریێتیان وندەکەن. مانای ئەمەش، لە پراکسیسدا، ئەوەیە کە وەرگێڕان پەیوەندیدارە بەو مەبەستەی کە وەرگێڕانێکی دیاریکراو مەبەستیەتی، وە پەیوەندیدارە بەو مەعریفە پاشخانە گریمانەکراوەی ئەو کەسانەی بەکاریدەهێنن. لەبەر ئەم هۆیەیە کە ئەوەی پێی دەوترێت وەرگێڕانی حەرفی جاروبار شیاوترە لە وەرگێڕانی سەربەست.

+ بەڵام وەرگێڕانی حەرفی چییە؟ لە هەندێك حاڵەتدا ئەو تەرزە وەرگێڕانەیە کە ناتوانێت گونجاندن بهێنێتە ئاراوە بۆ جیاوازییەکانی هێماگەرایی (الرمزیة) و میتافۆری دوو زمانەکە. وەلێ لە زۆر حاڵەتدا، هەروەکو لەو حاڵەتەدا کە "*sophia*" بەشێوەیەکی ڕێکوپێك لە ڕێگەی "*wisdom*"ەوە وەردەگێڕدرێت (وە "*arete*"یش لە ڕێگەی "*virtue*"ەوە) لە پەرەگرافەکانی دایەلۆگەکانی ئیفلاتوندا کە لەسەرەوە ئاماژەی پێدرا، مەسەلەکە بەکارهێنانی کەم تا زۆر ئەنقەستی وەرگێڕانی خواستنە: جیاوازی نێوان مانای حەرفی و مانای میتافۆری یاخود هێماگەرایی پەیوەندیدار نییە لە حاڵەتی ئەم نمونەیەی ئێستادا. ئەوەی هەیە جیاوازییەکە لە نێوان ناوەرۆکی وەسفی وشەکان و ئەو (مانا) پرۆتۆتایپە پشتبەستوو بە کلتورانەی کە لەگەڵیاندا پەیوەستن. لەباتی بەکارهێنانی وشەی "*wisdom*"ی ئینگلیزی، ئەتوانین بەشێوەیەکی تەواو یەکسان وشە گریکییەکە کە "*sophia*"یە بەکاربهێنین لە دەقە ئینگلیزییەکەدا. ئەمەش هەر هەمان شت دەکات: وە بێگومان ئەمە ئەو شتەیە کە دەبێت بیکەین لە وەرگێڕانێکدا کە بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ بەکارهێنانی قوتابیانی فەلسەفەی ئینگلیزی زمان ئەنجامدراوە، کە زانیارییەکی بەپێی پێویستیان هەیە لە کلتوری گریکیدا بەڵام زانیارییەکی بەپێی پێویستیان نییە لە زمانی گریکیدا کە بتوانن دەقە ئەسڵییەکەی پێ بخوێننەوە. لەگەڵ ئەوەشدا، مەسەلەکە تەنها پێویستی بە ساتێك تێفکرین هەیە، وە ئەگەر بکرێت شتێك لە مومارەسە لە وەرگێڕاندا پاڵپشتی ئەو ساتە تێفکرینە بکات، بۆئەوەی بزانین کە تەنها وشەی نەشاز نییە، وەکو وشەی "*sophia*" (یان وشەی "*arete*") کە کێشە ئەنێتەوە و جیاوازی نێوان وەرگێڕانی — خوازراو و وەرگێڕانی ئاسایی پەردەپۆش ئەکات. مانای وشەگەلێکی وەکو "*sophia*" و "*arete*" بە چڕوپڕی باسی لێوەکراوە بە فەزڵی گرنگی فەلسەفی — وە بە واتای بەرتەسکتری "کلتور"، بە فەزڵی گرنگی کلتوری — ئەو دەقانەی کە تیایدا دەردەکەون. لەبەرئەوە حەساسیەتێکی زۆر زیاتر نیشان ئەدەین بەرامبەر بەوەی کە پێویستە بە ورياييەوە وەریانبگێڕین.

+ ئەکرێت نمونەی بە هەمان ئاست دیار لە هەر زمانێکی کلاسیکی تری جیهاندا بدۆزرێتەوە. بۆ نمونە، ئەکرێت وشەی سانسکریتی "*dharma*" بە شێوەی جیاواز لە سیاقی جیاوازدا وەربگێڕدرێت: لە ڕێگەی "*duty*" و "*custom*" و "*law*" و "*justice*" و هتد (کە بە مانای ئەرك و نەریت و یاسا و عەدالەت دێت یەك لە دوای یەك — و–). بەڵام مانا پرۆتۆتایپییەکەی، لە سەرهەڵدانی دواتریدا و وەکو وشەیەکی وەرگیراو لە زمانەکانی تردا، هێند بە قورسی پشتبەستووە بە کلتور، بە تایبەت لە کۆمەڵگە هیندوسی و بودییەکاندا، کە بەم مانایەوە هێنراوەتە ئینگلیزی و زمانە ئەوروپییەکانی ترەوە. بە هەمان شێوە وشەی "*Kismet*"، لە ڕێگەی زمانی تورکی و فارسیەوە لە عەرەبییەوە وەرگیراوە بەو مانایەوە کە ئەکرێت

کـــورت و موختەســـەر بـــە مانـــا پرۆتۆتاپییـــە ئیســـلامییەکەی ئیشـــارەتی پێبـــدرێت. وا گریمانـــە کراوە، ئەو وشانە وەکو وشـەی خوازراو وەرگیراون چـونکە هەسـت بـەوە کـراوە وەرگێڕانـی "*dharma*" وەکو "*duty*" و وەرگێڕانی "*kismet*" (قیسمەت کە بە هــەمان مانــاوە هاتوەتــە کوردیشــەوە –و–) وەکــو "*fate*" (قــــەدەر) یــــان "*destiny*" (چــــارەنوس) شکســـتهێنانە لـــە وێنـــاکردن و گەیانـــدنی مانـــا (ضـــمني)ە هـــەرە گرنگـــە پشتبەســـتوو – بـــە کلتوورەکانیـان. ڕەنگـە وشـەی "*sophia*"ی گریکـی و هتـد، ئـەوانیش ئاوەهـا هێنرابانـە ئینگلیزییـەوە گـەر کۆنتاکـت لـە سـەردەمە مۆدێرنەکانـدا کرابایـە لەگـەڵ کۆمەڵگەیەکـدا کـــە ئـــەو وشـــە گریکییـــەی تێـــدا بەکارهاتووە، هەروەها با بڵێین ئەگـەر مانـای وشـەی "*sophia*" لای کەســـــێك چـــــینە کۆمەڵایەتییـــــە تایبەتەکـــەی دیـــاری کردبـــا، هـــەروەکو ووشـــەی "*dharma*" لـە کۆمەڵگەیـەکی هیندۆسـیدا. بـەڵام بـە دڵنیاییـــەوە زمـــانی گریکـــی، چ راســـتەوخۆ و چ ناراستەوخۆ لە ڕێگەی لاتینییەوە هـەمان ئـەو نفوزە بەردەوامـــەی پیـــادە کـــردووە بەســـەر زمانـــەکانی ئەوروپادا کـە سانسـکریتی و عـەرەبی بەسـەر زۆر لـە زمانـەکانی ئاسـیا و ئـەفریقیادا پیادەیـان کـردووە بـە درێژایی چەند سەدەیەك.

+ ئەنسرۆپۆلۆژیســـتان هـــەردەم روبـــەڕووی هەمان کێشە دەبنەوە بەنیسبەت زمانگەلێکەوە کە بە پێچـــەوانەی گریکـــی یـــان سانســـکریتی یـــان عەرەبییـەوە، لەسـەر ئاسـتی سـەرجەم جیهـان و بـۆ چەند سەدەیەك، زمانگـەلێك نـەبون گرنگـی کلتوریـان دانی پێدانرابێت واتە، وەکو زمانی کلتـور بـە واتـای "*Langue de culture*". دەبێــت بڕیــار بــدەن ئایــا پێویســـتە وشـــەیەك لـــە زمـــانی ئـــەو کۆمەڵگەیـــەوە وەربگـرن کـە ئـەوان وەسـفی دەکـەن (هـەروەکو چۆن وشـــەی "*taboo*" (تـــابوو) لـــە یـــەکێك لـــە زمانـــە پۆلینیزییەکانـــەوە وەرگـــیراوە کـــە ئـــەویش زمـــانی تۆنگـەن (*tongan*)ە (لـە سـەدەی هەژدەیەمـدا و دواتـر تەعمیمکرا) یان وشەیەك بەکاربهێنن کە خۆی هەیە و کـەم تـا زۆر بـە ئەنقەسـت لـە ڕێگـەی وەرگێڕانـی خواسـتنەوە بیگـونجێنن بـۆ مەبەسـتی وەسـفکردنی ئەو کۆمەڵگەیەی کە ئەوان مامەڵـەی لەگەڵـدا ئەکـەن. لـە دوا سـەرنجامدا، جیـاوازی نییـە لـە نێـوان ئـەوەی ئەنسرۆپۆلۆژیست یان هـەر کەسێکی تـر دەیکات لـە کاتێکدا مانای وشەکانی زمانی دایکی درێژدەکاتەوە لە ڕێگەی وەرگێڕانی خواستنەوە، وە ئەوەی وەرگێـر هەردەم دەیکات لە کاتێکدا خەریکی کاری وەرگێڕانە لـە نێـوان دوو زمانـدا کـە ئەکەونـە دەرەوەی پانتـایی ئۆڤەرلاپی کلتورییەوە.

+ لـەوەش زیـاتر، دواجـار جیـاوازی نییـە لـە نێـوان وەرگێڕانـی خواسـتنی لـەمجۆرە کـەم تـا زۆر ئەنقەسـتە و ئـەو سـودەی دایکزمـان لـە زمانەکـەی خـۆی وەردەگرێـت لـە کاتێکـدا کـە مانـای وشـەکان درێژدەکاتـەوە بـۆ ئـەودیوی واتـا پرۆتۆتاپییەکـەیان لـە بـارودۆخی تـازەدا. بـۆ نمونـە ئـەتوانێت چـەند جۆری جیاواز لە پۆشاکی سەر بهێنێتە ناو دەلالـەتی "*cap*" "*hat*" یان "*bonnet*"ەوە (کە یەك لەدوای یـەك بـە مانـای کـڵاو و شـەپقە و کلێتـە دێـت –و–) کـە ئـەکرێت تایبـەت بـن بـە کلتورگـەلی تـرەوە، نـەوەك کلتـوری خۆیـەوە: ئـەتوانێت نـە تـەنها "قـەیاغ"[٢٤] بەڵکو "کەڵەك"[٢٥]یش بهێنێتە ناو مـەودای دەلالـەتی "بەلـەم"ەوە، کـە یەکـەمجار دەیانبینێت (چ وشـەگەلە لۆکاڵییەکان بخوازێت یان نا): ئەو ئەتوانێت وشـەی "*wedding*"[٢٦] یان "*funeral*"[٢٧] بەسـەر مەودایـەکی فـراوان لـە ئیجرائاتـدا پیـادە بکـات کـە وەکـو مانـای پرۆتۆتاپیـان لێکچـونێکی کـەمیان هـەبێت لەگـەڵ

هەرشتێکدا کە وەکو شایی یان پرسە سەیر بکرێن بۆ زۆربەی قسەکەران بە زمانی ئینگلیزی.

+ ئێستا وا رێکەوتووە کە ئینگلیزی و زمانە سەرەکییەکانی تری ئەوروپا، هەروەکو لەو نەسکەدا کە تایبەتە بە زمان و کۆمەڵگە جەختی لێکراوەتەوە، لە زۆر رووەوە تاڕادەیەکی زۆر بێتوانان لە وێناکردن (نواندن)ی زمانەکانی جیهاندا. زمانی ئینگلیزی، بەشێوەیەکی تایبەت، لە ئیدارەکردنی ئیمپراتۆریەتێکدا بەکارهێنراوە کە هەمەجۆرییەکی کلتوری گەورە و گرانی هەبووە. ئینگلیزی وەکو زمانی دایك لەلایەن ئەندامانی زۆر گروپی ئێتنی جیاواز و شوێنکەوتووانی زۆر لە ئایینەکانەوە قسەی پێدەکرێت کە لە شوێنە جۆراوجۆرەکانی جیهاندا ئەژین. بەشێوەیەکی بەرفراوان لەلایەن هەمەجۆر ئەنسرۆپۆلۆژیست و موژدەدەر (موبەشیر) و نوسەرانەوە بەکاربراوە، نە تەنها لە وەسفکردنی هەر کۆمەڵگەیەکی ناسراودا، بەڵکو لە ڕۆمان و شانۆنامە و هتد یشدا، کە سێتینگی خۆیان هەیە لەو وڵات و کۆمەڵگایانەدا کە ئینگلیزی عادەتەن قسەی پێناکرێت. ئەمەش ئەوە ئەگەیەنێت کە زمانی ئینگلیزی، تەنانەت تاڕادەیەکی زیاتریش لە زمانە ئەوروپییەکانی تر، فراوان و تەعدیلکراوە لە رێگەی وەرگێڕانی – خواستنەوە تەقریبەن لە هەموو بوارەکانی موفرەداتیدا. لەبەرئەوە هاوپەیوەندییەکانی نێوان بونیادی دەلالی زمانی ئینگلیزی و کلتوری دایکزمانانی ئەو زمانە، زۆر ئاڵۆزتر و هەمەجۆرترە لە هاوپەیوەندییەکانی نێوان زمان و کلتور لە زۆرینەی هەرە زۆری کۆمەڵگە مرۆییەکاندا. هەروەها زۆر ئاسانترە بەلای قسەکەری دایکزمانی ئینگلیزی یان قسەکەرێکی دایکزمانی یەکێك لە زمانە سەرەکییەکانی ئەوروپا کە پێی وابێت هەموو زمانە مرۆییەکان لە وەرگێڕانهاتون لە ناویەکدا، ئەم پێوابونە زۆر ئاسانترە لای ئەوان لەوەی بەلای قسەکەرانی زۆربەی زمانەکانی ترەوە. گرنگە ئەم خاڵەمان لەبیر بێت، لە کاتی خوێندنەوەماندا بۆ موناقەشە تیۆرەییەکانی سەبارەت سروشتی زمان بە نمونەگەلێکەوە کە تەنها لە زمانێك لە زمانە ئەوروپییە سەرەکییەکانەوە وەرگیرابێت.

+ ئێستا دێینە سەر دوا مەبەست. زۆرجار زمانناسان ئەو پرەنسیپە رادەگەیەنن، لانی کەم وەکو گریمانەیەکی یاریدەدەر، کە زمانی سەرەتایی (*primitive language*) نییە: کە هەموو زمانەکان بە نزیکی هەمان ئاستی یەکسانی ئاڵۆزییان هەیە و بەیەکسانی و بەشێوەیەکی باش دەگونجێنرێن لەگەڵ ئەو مەبەستە کۆمۆنیکەیشنئامێزانەدا کە بەدیدەهێنن لەو کۆمەڵگایانەدا کە ئەو زمانانە ئیشی تێدا دەکەن. ئەم پرەنسیپە لە خۆیدا، زمانناسان پابەند ناکات بەو تێڕوانینەوە کە هەموو زمانەکان بە یەکسانی گونجاون بۆ هەموو مەبەستە کۆمۆنیکەیشنئامێزەکان. لە راستیدا، هەروەکو ئەمێستا بینیمان، هەندێك زمان بە فەزڵی ئەو رۆڵەی دەیگێڕن وەکو زمانی جیهانی مرونەتێك و خەسڵەتێکی فرەبەکارهێنان (*versatility*) یان تێدایە کە زۆربەی زمانەکان نیانە. زمانگەلی تر هەن، ئەوانیش چ زمانی جیهانی بن یان نا، پەیوەستن بە کلتورەوە بە مانای بەرتەسکتر یان کلاسیکی زاراوەکە. ئەوەش دەبێتە موفارەقە، گەر نەڵێین بێمانایی، گەر پرەنسیپی یەکسانی زمانەکان وا راڤەبکەین ئەوە بگەیەنێت ئەو زمانەی کە کەسێك قسەی پێدەکات کاریگەری نییە لەسەر چلۆنایەتی (*quality*) ژیانی فیکری و هونەری ئەو کەسە، ئەوە با پیشەیی و ئاسۆ ئابورییەکەی لەلاوە بوەستێ. بەشێوەیەکی بەرچاو هۆگەلێکی داکۆکی لێکراو هەنە

کە بۆچی هەندێك لە زمانەکان، زیاد لەوانیدی، بەشێوەیەکی بەفراوان لە قوتابخانە و زانکۆکانماندا ئەوترێنەوە. ئەو زماننانسانەی پێ لەسەر یەکسانی زمانەکان دائەگرن، بە زەرورەت بەر ئەو تێڕوانینە ناکەون کە پێیان وابێت هەموو کلتورەکان بەیەکسانی شایانی ئەو تەرزە تەشەنە ئەنقەستەن کە ئێمە بە پەروەردە (*education*) ناوی دەبەین. ئەمەش پرسیارێکە پێدەچێت زماننانسان، وەکو ئەفراد ڕای شەخسی خۆیانیان لەسەری هەبێت. تێڕوانینێکی پیشەیی یەکگرتوو لە گۆڕێدا نییە.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

١- *Linguistic Relativity*.

٢- *Linguistic Determinism* = حەتمیەت (الحتمیە)، *Relativity* = حەتمیەتی زمانی (الحتمیە اللغویە) لێرەدا مەبەستی لەوەیە کە زمان فیکر دیاریدەکات.

٣- *bilingualism* = قسەکردن بە دوو زمان کە یەکێکیان بەزەرورەت زمانی دایك بێت و ئەویتریان زمانی دووەم.

٤- ئەو نمونەیە قابیلی وەرگێڕان نییە، لەبەرئەوەی "*uncle*" وشەیەکە مام و خاڵ کۆدەکاتەوە، "*parent*" وشەیەکە دایك و باوك کۆدەکاتەوە، وە "*sibling*" وشەیەکە خوشك و برا کۆدەکاتەوە، واتای مانای هەرکامێکیانە.

٥- واتە وێکنەچون لە بونیاد و لە فۆرمدا.

٦- بەفری بوڵکە = واتە بەفری ووشك و ورد وەکو تۆز.

٧- لێکسیم واتا یەکەیەکی زمانی واتادار کە یەکێکە لە موفرەداتی زمانێك.

٨- واتا انماط الفکر.

٩- بازنەیەتی (*circularity*) واتە بیرکردنەوەیەك کە دەرەنجامێك یان سەرنجامێکی وەکو ئارگیومێنت و بەڵگە بەکاردەهێنرێت کە هێشتا نەسەلمێنراوە. واتا ئارگیومێنت و سەرەنجامەکەی لە بازنەیەکدا دەخولێنەوە مەبەستی لەوەیە کە دواجار ناگەینە یەقین فیکر زمان دیاری دەکات یان بە پێچەوانەوە.

١٠- گەلێکی ئەمریکی بە رەگەز هیندین لە باکوری خۆرهەڵاتی ئەریزۆنا.

١١- *Loan- Translation*.

١٢- واتە لە رووی مێژووییەوە.

١٣- *Intern- translatability*.

١٤- *Tense and Mood*.

١٥- رەنگی قەیسی یان لیمۆیی کە لە ئینگلیزیدا ناوی میوەکە خۆیشی بۆ ناوی رەنگەکەشی بەکاردەهێنرێن.

١٦- *Incommensurability* واتە نەبونی بنەمایەك بۆ بەراوردکردنی شتێك کە خۆی قابیلی بەراوردکردنە.

١٧- لقە بونیاد (*substructure*) و بونیادی فەوقی (*superstructure*) لێرەدا مەبەستی لە لقە بونیاد رەنگە بنەرەتییەکانە کە خۆی دەڵێت هەموو زمانەکان هاوبەشن تێیدا و مەبەستیشی لە بونیادی فەوقی ئەو بونیادەیە کە رەنگە نابنەرەتییەکانی تریش دەگرێتەوە کە تاڕادەیەك پشت بەستون بە کلتور.

١٨- لە ساتەوەختێکی مێژووی دیاریکراودا کە ئەمەش پێچەوانەی دایکرۆنی.

١٩- *subjunctive* *imperative/* = الصیغة الأمریة/ الشرطیة.

٢٠- بەکارهێنانی، ئەگەر بکرێت بڵێین، دوو دیالێکتیکی جیاواز لە هەمان کۆمەڵگەدا، یەکێکیان بۆ کاری رەسمی و ئەوی تریان بۆ قسەکردن و کاری نارەسمی، نمونەی کتومتی ئەم حاڵەتەش زمانی عەرەبی فەسیح و عامییە.

٢١- *Highbrow and Lowbrow*.

٢٢- ئۆڤەرلاپی کلتوری واتە پێکداچونی کلتوری واتە رووبەرە هاوبەشەکانی نێوان کلتوورەکان.

٢٣- ڕێکەوتنی وشە بەپێی ئەو شوێنە و ئەو وشەیەی کە لەگەڵیدا دێت وەکو قژی درێژ، کچی کەڵەگەت کە ناتوانین بڵێین، بۆ نمونە، قژی کەڵەگەت.

٢٤–*conoes*.

٢٥–*catamarans*.

٢٦–ئاهەنگی شووکردن یان ژنهێنان.

٢٧–مەراسیمی پرسە و بەخاکسپاردن.

## پەراوێزەکانی نووسەر

١–زاراوەی "میتازمـــانی" عادەتـــەن لەمڕۆمانـــدا وا بەکاردەبرێت کە ئەمە بگەیەنێت "پەیوەندی هەبێت بە وەسـفکردن یـان شـیکردنەوەی زمـان یـان زمـانێکی دیاریکراو". هەروەها لەلایەن بونیادگەرانی دوای پۆست –بلومفیلدیشـەوە بـەکاربراوە، بـە پەیوەنـد لەگـەڵ دیراسـەکردنی زمانـەکان لـە سـیاقە کلتورییەکانیانـدا. کەواتە لێرەدا بە هەردوو ماناکە بەکاربراوە.

## سەرچاوە

*Language and Linnguistics by John Lyons, Cambridge University Press 1981. Reprinted in 1982, 1983, 1984, 1985, 1986 and 1987.*

# ئەندرێ جید: ڕابەری پەخشانی فەڕەنسی

لە فەرەنسییەوە: جلال حمید

بواری ئەدەبی ئەندرێ جید لە ساڵی ١٨٩١ لە چوارچێوەی فۆرمێکی ئیعتباتی و ستاتیکیەتی هێماگەرییانە دەستی پێکرد و لە ساڵی ١٩٥١ گەیشتە ڕادەی کامڵبوون، کاتێك ئەدەبی مولتەزیم هەژموونی بەسەر هەموو ئەفراندنێکی ئەدەبیدا گرت. لە رێگەی شوێنپێکەوتنی ئاسەواری نووسین و بەرهەمەکانی مۆنتێن و غوسۆ و ستاندال تاکو ڕادەی وەسفکاری بێ ووچان کەوتە گەڕان بە نێو قووڵاییەکانی – خود، *soi* –دا و گەشەی بە دانپیانانی بوونی بەئاگادا و بەڕادەیەکی بەرفراوان کەوتە دەوڵەمەندکردنی وتاری بەردەوام لەمەڕ مرۆڤ کە ناوەڕۆك و گەوهەری ئەدەبی فەرەنسی پێکدەهێنێ. لە چوار چێوەی نەرگسیەتی راڕاوە پەل بۆ ئیرادەیەك دەهاوێ کە – ئەو شەڕەنگێزییەی قابیلی گۆڕانە دەبێ بە هیچ شێوەیەك قبووڵ نەکرێ – کۆمەڵێك پرسیاری گرنگ و سەرەکی لە بارەی چارەنووسی مرۆڤایەتی خستەڕوو و بەڕێگەیەکی تایبەت دانی بە خودا و ماوەیەکی دوور بە مەسیح نا بەڵام دابڕاو لە هەموو کەڵێسەیەك. مرۆڤ دۆستێکی گەلێ پتەو و جەختی لەسەر ڕەوشی هیومانیزمی کرد. لەلایەکی تر، خوێندنەوە و پەیڕەوکردنی بەردەوامی شاکارە مەزنەکان رێگە خۆشکەربوون بۆی بۆ راگەیاندنی چەندین کاری رەخنەیی کە لەو سەردەمە بەئاستەنگ پەیڕەو دەکران. لە ڕێگەی بایەخدان بە ئەدەبی بێگانەی وەك ئەدەبی ئینگلیزی و رووسی و ئەڵەمانی بەشداری لە بەربڵاوکردنی خوێندنەوەی بێگومان نووسەرە ناودارەکانی پێشخۆی کرد کە لێکدانەوەی ڕەسەن و هەندێ جار وەرگێڕاوە نایابەکانیان پەرۆشیان دەبزواند. بەهۆی ئەزموونی – دراو ساختەکەرەکان، *Monnayeurs* – *Les Faux* – بیرۆکەی رۆمانی لە توێی ئەدەبەکەماندا نوێکردەوە و ئاکام لە بەرهەمی (رۆحی *N.R.F*) کارامەییەکی چالاك دەنوێنێ. ئەندرێ بزوێنەری تەواوی ئەدەبی فەرەنسی تێکڕای نەوەیەك بوو.

## ئەندرێ والتەر

لە ٢٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٨٦٩ لە پاریس لەدایك بوو. باوکی مامۆستای ماف و یاسا

بوو و بنەماڵەی دایکی بۆ بۆرژوای باڵای هارڤەر دەگەڕێتەوە. جید خوێنی لانگدۆسیان و نورماندی تیادا تێکەڵە بەڵام لە دوو سەرەوە میراتی دابونەریتێکی پرۆتستانتی توند و تۆڵی بۆ دەمێنێ کە لە قۆناغی منداڵی ڕەنگدەداتەوە و لە هەرزەکاری پێوەی دەناڵێ و دووچاری دەمارگیری دەکات. گەلێ زوو ڕاڕایی تەنگی پێهەڵدەچنێ هەستی –نەبوون بەوانی دی– دایدەگرێ. قۆناغەکانی خوێندنی لە قوتابخانەی ئەلزاس و مۆنپیلیە پچڕپچڕ دەبێت تا ئەو کاتەی کە لە نێوەندێکی خێزانیدا بایەخ بە بابەتە ئاوەزییەکان دەدات بە خۆشحاڵیەوە خۆویستانە تیا بەردەوام ئەبێ. کاتێ کە پشووی لە یوزێ لای داپیرەی بەسەر نەبردایە ئەوا یان بۆ لاغۆك یاخود بۆ کۆڤێغڤیلیان دەبرد کە خانووبەرەی نۆغماند و موڵکی خێزانی دایکی لێبوو.

کاتێ باوکی لە ساڵی ١٨٨٥ کۆچی دوایی دەکات تەنیا لە ئامێزی چاودێرییەکی مێیانە دەگیرسێتەوە و لەوێ پەی بە سۆز و هاودەمی کیژە مامەکانی دەبات. لە تەمەنی پانزەساڵیدا بەرامبەر یەکێکیان، مادلین غۆندۆ دان بە ئەوینێك لە ئالودەیی بێگەرد و بەهرەیەکی ڕۆحی و خەون و شکۆمەندییەکی ئازایانە دەنێ کە وەڵامە خودی کۆرنێلیانیزمێکی بێهوودە دەداتەوە. بەهۆی زۆری سامانەوە ناچار نەبوو کار بکات و هەروەها گەلێ زوو بەهۆی دەرکەوتنی بەهرەمەندی پێشوەخت توانی بێ سڵەمینەوە بابەتی سەرکەوتوو بنووسێ. هاوڕێی پییەغ لویس و پۆل ڤالێری بوو و مالارمێ یارمەتی دەدا و بە سانایی دەچێتە نێو جیهانی هێماگەریەوە. سەبارەت بڵاوکردنەوە بەراییەکانی بە گوێرەی ئایدیالی هێماگەری ئەندرێ والتەر کەسایەتی خۆی ئاوێتەی پاڵەوانی کارە تەماوییەکانی دەکات وەك لە: پەڕاوەکان و هۆنراوەکانی ئەندرێ والتەر ١٨٩١–١٨٩٢ و *Le Traite Narcisse*، ١٨٩١ و گەشتی ئۆغیان، ١٨٩٣ دا دەردەکەوێ.

## بوونێکی نوێ

بەمجۆرە ژیانی گۆڕانکارییەکی پرتاو لە میان دوو قۆناغی نامۆی لێکدی بەستراو بەخۆی دەبینێ. لە تەشرینی یەکەمی ساڵی ١٨٩٣ لە تەمەنی بیستوچوار ساڵیدا لەگەڵ نیگارکێشی هاوڕێی پ. ئـ لۆرەنس گەشت بۆ وڵاتی توونس دەکات. لەوێ نەخۆش دەکەوێ و هەست بە مەترسیەکانی ژیان دەکات و دەروونە بێگەردەکەی بە ترس لە گوناهەکاری دەتەنرێ. بە وەفا دەبێ بۆ ئەو خۆشەویستییەی کە ماوەیەکی دوور بە مادلین دەیبەستێ کە هاوکات سۆزی خوشك و دەزگیرانی دەداتێ. لە ساڵی ١٨٩٥ بە سەلامەتی و هەستێکی پڕ لە شەوق بۆ ژیان لە ئەفریقیای باکوور دەگەڕێتەوە و لە بەربەستە جەستەیی و ئاکارییەکان ڕزگار دەبێت و سروش لە مێرگە جادوییەکان وەردەگرێ. خۆی وا دەبینێ کەوتۆتە بەر گۆڕانکاری ئەو یەقینەی کە بوونیادنەری تێکڕای خواستەکان لە پێش هەمووان ئەوانەی لە ڕوانگەی سەراپای جیهان بە ڕادەیەکی زۆر دانیان پێنەنراوە. بۆیە بە هیچ شێوەیەك ناتوانێ دەسبەسەر ئەم بەشەی بوون بگرێ و ڕەتی بکاتەوە. هاوکات بە هیچ جۆرێك ناتوانێ نەهی لە تامەزرۆیی بۆ یەکەی هەست و گیان و ئالودەی فەنابوون و ئەگەری پێویستی داڵدەدانی خود بکات. دوای مردنی دایکی بەماوەیەکی کەم لە ساڵی ١٨٩٥ مادلین غوندۆ دەخوازێ کە هاوبەشی بیروڕا وەهمیەکانی دەکات و بە گرەوی هاوسەرییە شکڵیەکەی قایل دەبێ لەگەڵ ئەوەش لە ماوەی گەشتکردن شانبەشان هاودەمی

ژیان گەشت بۆ هەمان شوێنە سروشبەخشەکانی ئەفریقیا دەکات و هاودژێتی نێوان هەردوو خواستەکەی ناخی دەتەقێتەوە. ئەو هاوبەشیە سەیرە وەك چارەسەر دەبینێ کە پەیوەندی پاکیزەیی نێوان – دەروون، *me* *a* – بۆ هاوسەریبوون دەستەبەر ئەکات و لە روانگەیەوە مەنزڵگایەکی شەرعی بە خۆشنوودی دەبەخشێ. دەرك بە هاوسەرێتی دەکات کە هەر نەبێ دەکەوێتە ژێر فشاری کۆمەڵگەو لە هەستێکی پاکژبوودا کۆنترۆڵی دەکات و لە کاتی ئامادەبوونی کەسەرییەکان بێدەنگی بە نەنگی دادەنێ: بوونی – نائاکارییانە – لەوێوە سەرهەڵدەدات کە لەلایەن سەرجەم گرفتەکانی ژیانی ئاکاری ئازار دەخوات.

پاش ئەم قەیرانە ئەو جیهانە ئەدەبیەی کە دەیناسێ گەلێ بێ تامو فریودەر لە بەرچاوی خۆی دەنوێنێت (بڕوانە بالیود، ١٨٩٥). کۆمەڵە بیرۆکەیەك دەخاتە ژێر رکێفی هەڵسەنگاندنی وردەوە. لە ساڵی ١٨٩٧ رۆمانی خۆراکی زەوی بڵاودەکاتەوەو دراما بەراییەکان دەنووسێ و لە ساڵی ١٩٠٢ رۆمانی بێئاکاری دەخاتە روو. سەرجەم کارەکانی لەژێر پەردە و فۆرمی جۆراوجۆر خۆیان حەشار دەدەن و بە ئەزمونێك تەنراون کە بوونەوەری تازەیان لێ دروست دەکات. بێ مانەوە چەند گەشتێك بۆ نورماندی دەکات. پێش بڵاوکردنەوەی یەکەمین رۆمانی، کۆمەڵێك کاری ئەدەبی ناوازە و دوور لە دەمەکانی –راڕایی– دەنووسێ کە لە راستیدا بایەخێکی گەورە بە رەخنە دەدەن لەوانە: دەرگای تەنگ، ١٩٠٩. ماوەیەك پاش ئەوە رۆڵێکی چالاك لە دامەزراندنی *N.R.F* دەگێڕێ. بەهۆی گرتنەبەری شێوازێکی گاڵتەجاڕ و بوێرانە لە رۆمانی ئەشکەوتەکانی فاتیکان لە ساڵی ١٩١٤ کتوپڕ ناوبانگ دەردەکات لە کاتێکدا بە درێژایی جەنگی جیهانی یەکەم بێدەنگی رادەگرێ و بیروباوەڕ و دانپیانانەکانی کە لە ساڵی ١٨٨٩دەستپێدەکات لە تویێ ژیاننامەکەیدا دەپارێزێ.

## دووایین رزگاربوونەکان

کاتێ لە ماوەی ساڵەکانی جەنگ خۆی بۆ نووسینی چەند کارێکی چاکەخوازی تەرخان دەکات ئەوی راستی بێت لە ناخیدا دەرك بە هوشیاربوونەوەی درامای ئایینی دەکات. گەڕانەوەی دەستەیەك لە هاوڕێ کۆنەکانی وەك گیۆن و کۆپۆ و غێیەغ بۆ کاسۆلیکیەت کاری تێدەکات. ماوەیەك بڕوا بەو هەوڵی ملکەچبوونە دەکات کە جێمس و کلۆدێل ماوەیەکی دوور وەك پێشنیارێکی نموونەیی بۆی دەخەنەڕوو بەڵام دووبارە ئینجیل بە چاوێکی نوێ دەخوێنێتەوە و بێهودە لە ئاقاری خۆشەویستیدا ڕەدووی رابەرێتی و هەڕەشە و داکۆکیکردن دەگەڕێ. بەشێوەیەکی بڕاوە تەنها پەی بە چەند هۆکارێك دەبات بۆ رەتکردنەوەی هەموو یاسایەك و بە هوشیارییەوە رەوایەتی بە ونبوونەکانی ئاوەز دەبەخشێ. لە تویێ لاپەڕەکانی (تۆ نۆمکیدی؟) ئاسەواری ئەم رزگاربوونە ئایینییەی دوایی تیا دەردەکەوێ کە رزگاربوونێکی بەتینتری لەگەڵ سەرهەڵئەدات. خێزانەکەی نامەکانی تافی لاوییان دەدڕێ کە تیادا جوانترین وشەکانی تۆمار کرابوو. ئەم کارە دووچاری مەترسی دەکات و لە نهێنیەکی درێژخایەن و ئازیز بێبەشی دەکات. جید لەو کاتەوە کاروبارەکانی ژیان بوێرانە هەڵدەبژێرێ و دانپیانانەکانی بە پەردەپۆشراوی تۆمار دەکات.

## شەڕەنگێزێك؟

بەرهەمی ئەدەبی – سیمفۆنیای رەعەوی، ١٩١٩ – لە دوایین قەرزەکانی رابردوو ئازادی دەکات

پاشان لە ڕۆمانی - *Si le grain ne meurt*، ١٩٢٠ — بۆ یەکەمجار بە ڕاشکاوی و توندییەوە لەبارەی خۆی دەدوێ. لە — کوا کۆغدیۆن، ١٩٢٤ — داکۆکی لە مەڕ ئەو — ناوازە سێکسییە، شذوذ جنسي—ی کە لە ساڵی ١٩١١ دەسپێدەکات بڵاودەکاتەوە و لەپڕ و بەشێوەیەکی بوێرانە پێشکەش خوێنەرانی دەکات. بەمجۆرە کارە بەراییەکانی دەبنە مایەی وروژاندنی حەزی خوێنەر. جید تەواوی کارەکانی لە ڕووداوە تازەکان دادەڕێژێ کە بەیەکجار مایەی بایەخی خۆی بوون و بەهۆی سەرنجی کارەساتباویانەوە هەڵیدەبژاردن. بەمجۆرە هەڵمەت دەکاتە سەر خۆی لە چەشنی ئەو هەڵمەتەی کە دوژمنە کۆنەکانی وەك ئانغی ماسیس و پەیامنێرە ریاکارەکانی وەك ئانغی بێغۆ و ووتارە ڕەخنەییە بێ ناوەکان دەیانکردە سەرو بە —شەڕەنگێز— ناوزەدیان دەکرد.

## مرۆیەکی ڕاڕا

"خۆشترین کارێك جێگەی متمانە بێت ڕاڕاییە" جید لە بەرواری ٢٨ مارتی ساڵی ١٩٣٥ ئەمە لە ژیاننامەکەیدا دەدرکێنێ کە ئەوی ڕاستی بێت ماوەیەکی دوور سەراپای داگیر دەکات. گوومانی تیادانیە جید هەردەم بە وروژاندنی سەرجەم ئەو پرسیارانەی کە لە ژێر پەردەی دابونەریت خۆیان حەشاردابوو خۆشحاڵبوو. لە ڕوویەکی ترەوە لە ساڵی ١٩٢٥ بە هۆی بڵاوکردنەوەی — دراو ساختەکەرەکان، مزیفوا النقود — گۆڕانکاری بەسەر چەمکی تەقلیدی ڕۆمان بەرپا دەکات و هوشیاری ئەدەبی دەبێتە مایەی خەمو ڕاڕابوونی. لە ساڵی ١٩٢٥–١٩٢٦ دووبارە لە بۆتەی موسافیرێکی بێ جانتا گەشت بۆ کۆنگۆ دەکات و لەو ئاقارە هەقیقەت گەلێك ئاشکرا دەکات و پڕ بەدڵ خۆی وەك موژدەهێنەرێکی کۆمەڵایەتی دەناسێنێ و گەشتی کۆنگۆ لە ساڵی ١٩٢٧ دووبارە چەندین پرسیار لە مەڕ سەردەمەکەی دەوروژێنێ. پاشان دەکەوێتە پەیڕەوکردنی کۆمەڵێك بیرۆکەی کەمتر پەیوەندیدار بەلایەنە مرۆییەکانەوە لە (ئۆدیب، ١٩٣١) متمانەی خۆی بە مرۆڤ ڕادەگەیەنێ و خەبات بۆ ئەوە دەکات — کە خۆشی خۆی لە پێناو خۆشی ئەوانی تر تەرخان بکات — وەك ئەناتۆل فرانس سەرقاڵی کاری کۆمەڵایەتی و نەوە دەبێت و ڕێچکە بەناوبانگەکەی نەرگسیەتی پوخت بەرەو (ئالتغۆیزم، خۆشەویستی ئەوانی دی) پەلی دەکێشێت کە مەترسی بۆ دروست دەکات و بیرۆکەکانی لە شەقڵ و فۆرمێکی نوێدا دادەڕێژێ. گومانی تیانیە ئامادەگی جید لە کۆنگرەی جیهانی لە پێناو ئاشتی لە ساڵی ١٩٣٢ بۆ پەیوەندیکردن بە کۆمۆنیزمی خەباتگێڕ چەردەیەك ڕووداوی خستە پێش دوونیای فەرهەنگی سەردەم. هەروەها لە ساڵی ١٩٣٦ گەشتی بۆ ڕوسیا کرد و پەی بە — جیهانێکی ئیلهام بەخش — برد و کەوتە بەر کاریگەری کۆمەڵێك خاوەن پرانسیپ بەڵام لە میان گەشتەکە نوشووستی هێنا چونکە "لە ڕووی ئاکارییەوە گەرمی و ساردی زۆری کێشا". یاسای ڕاستخوازییەکەی ناچاری کرد مەترسی و کینەی بەرامبەر بە شکڵانیەتی ستالین دەربڕێ (بڕوانە گەڕانەوەی یەکێتی سۆڤیەت ١٩٣٦). کاتێ کە ژنەکەی لە ساڵی ١٩٣٨ کۆچی دوایی کرد جارێکی تر هەستی تەنیایی دایگرت. لە سەرەتای هەڵگیرسانی جەنگی جیهانی دووەم بەرهەمی فیکری ماوەی پەنجا ساڵی لە (ژیاننامە ١٨٨٩–١٩٣٩) پێشکەش جەماوەر کرد.

## پیریی تێزێ

حوکمی دوورخستنەوە و تاراوگەی بەسەر سەپێنرا. ماوەی چەند ساڵێك توونس و گشت ڕووە

جادووییەکانی پشکنی. مێشکی لە تەمەنی شەستو دوو ساڵیدا بەردەوام نۆژەن بوو گەرچی تەمەن روو لە کزی بوو. پاڵەوانی پیر تێزیَ کە وەك خۆی ژیان پـڕزی لێبڕیبوو بۆ بەرجەستەکردنی وەسیەتە تایبەتی و کارە ئەدەبیەکەی هەڵبژارد. تێزیَ ماوەیەکی درێژخایەن لە توونس تاوتوێکرا و لە ساڵی ١٩٤٦ بڵاوکرایەوەو لە ساڵی ١٩٤٧ خەڵاتی نۆبڵی وەرگرت و قەرەبووی ماوەی دەرنەکەوتنی کردەوەو دواجار جیهانی ئەدەب ستایشی کرد لە کاتێکدا شانۆی فەرەنسی لە ساڵی ١٩٥٠ رۆمانی ئەشکەوتەکانی فاتیکانی ئیقتیباس دەکرد. جید بەر لە مردنی لە ساڵی ١٩٥١ گەواهێکی گران و بوێرانەی دڵسۆز لە ژێر ناونیشانی *Et nane manet inte* بەجێدەهێڵێ و لە ژیاننامە هەرە پەنهانەکەی دان بەو ناخۆشیانە دەهێنێ کە خێزانەکەی دڵگیر دەکات و دووبارە لە خۆشبەختیەکان دەکۆڵێتەوە و پەردە لەسەر پەشیمانی ئەو ساتانە هەڵدەماڵێ کە هەردووکیان بە دوای ئازادیدا وێڵبوون.

## جیدیسم

جید لە یەکێك لە بەرهەمەکانیدا سەرجەم رەگەزە ئەدەبیەکان بەکاردەهێنێ کە شەستودوو ناونیشان دەگرێتە خۆ. بەڵام یەکگرتنی ئەم هەمەلایەنیە خۆی لە ئامادەگی بەردەوامی نووسەر دەبینێتەوە کە لە هەموو کاتێك زیاتر پەیڕەوی دەکات. ئەندریَ غۆسۆ دەڵێ: دانپیانان بە یەکێك لە هونەرە جوانەکان دەدرێتە قەڵەم. شایانی باسە جید نەك تەنیا لە فۆرمی دانپیانانی لیریکی و ژیاننامە و سەرگوزشتەی ئۆتۆبیوگرافی بەڵکو لە هەموو شوێنێکدا لە رێگەی ئەو کەسایەتیانەی کە دەیانئەفرێنێ باس لە خۆی دەکات تەنانەت لە هەموو ئیعترافاتانەی کە ناڕەوا پەردەپۆشکراون و ئەو پێشنیارە ئاکارییانەی لە پاڵیەوە بوون. لە ژیانی نووسەر زۆر بە کورتی دۆکترینی ژیانێك هەڵدەیەنجین لەسەر دووپاتکردنەوەی خود و نزیکبوونەوە لە – تحدی، بەرەنگاربوونەوە – بنیاتدەنرێ. کە باس لە "جیدیسم" دەکەین وەك ئەوەیە باس لەو زانیارییە راستەقینەیە بکەین کە مامۆستایەکی خراپ دوور لە هەموو ئەدەب و یاسا و لیاقەتێك لافی لێدات. زانیاری ئەوتۆ پتر جێگای مەترسی و کارەساتباریە کاتێ کە بەنیازی دوژمنایەتی و گاڵتەجاڕییەوە مەسەلەی گرفتە سێکشواڵەکەیمان لە مێشك دەنگ پێبداتەوە. بە پێچەوانەوە بەردەوام رەچاوکردنی هاودژی نێوان پاڵەوانەکانی کە بە تەواوی لەگەڵ ئەفرێنەرەکەیان ئاوێتە دەبێت و گۆڕانیان بەسەردێت هەندێ جار دەمانگەیەنێتە ئەوەی کە لە "جیدیسم – تەنها گەمەیەکی دانسقە و بێهوودە بدۆزینەوە. بەڵام پێش هەموو شتێك پێویستە رەچاوی ئەوە بکەین کە جید لایەنگرەکانی رەتدەکات و جارێکی تر دەیانگرێتەخۆ چونکە وەك مۆتێن بەر لە هەمووشتێك بانگەشە بۆ رەسەنایەتی و ئازادی تاکەکەس دەکات. دوای ئەوەی لایەنگرەکانی بەشێوەیەکی خراپ لێیگەیشتبوون گەیشتنە بڕوایەك کە دەتوانن وەك مۆدێل بەکاری بێنن. پێویستە لەو رستەو وشە پیاهەڵدەر و سەیرانە دوورکەوین کە بەرەو ئازادییەکی رەها راماندەپێچن. لە روانگەی جید بەدواداچوونی کەوتنەکان هەتا لە حاڵەتی بەرزبوونیشدا بن پرنسیپێکی بێهوودە نیە لە پێناو بەدەستهێنانی ژیانێکی راستەقینە. هەروەها دەکەوێتە ژێر رکێفی بیرۆکەی سەپێنراو زۆردارەکی بێئەوەی هیچ ماندووبوونێك بزانێ مادامەکی هەوڵی بەردەوامی لە پێناو نوێکردنەوە بوو. تاکو رادەی پەرستن لایەنگری خودی تەواو

(باغێزی، *Baraisien*) بوو کە لە ڕێگەیەوە نە ڕوو لە لۆڕان دەکات و نە چاویشی بە پێشینەی نوستالژیای کاسۆلیکی دەکەوێت و لەو لایەنەوە لە ستاندال کەم تواناتر دەبێت. (لە گەڕان بە دوای خۆشنوودی) ڕووبەڕووی گەلێ لێکۆڵینەوەی رەخنەیی دەبێتەوەو دووچاری وەسواسیەکی زۆر دەبێت گەرچی لە کاتی خۆبەدەستەوەداندا دەبوو بەسەریا زاڵ بێت و هەروەها بەربەرەکانی ئەو هەوڵانە بکات کە پاڵی پێوەدەنێن — رەمەکیانە ژیان بەرێتە سەر—. کە لەپڕ هەستی دوورکەوتنەوە لە ئاکار دایدەگرێ وا دەزانێ دووچاری لادان دەبێت: بەم شێوەیە دەبینین هێڵەکانی گەشەی ئەفراندنی بەردەوامی خوود ترۆقە دەکات و ئاڵۆزی گەوهەری و ژیاری نێو هاودژەکان بەشێوەیەکی هەستپێکراو پەرەدەسێنێ.

## هەقیقەتی هونەرمەند

جید ئەم ئاڵۆزی و هەوڵە دڵسۆزانەیە لەبەرچاو دەگرێ و ئەو لاپەڕانەی پێ دەوڵەمەند دەکات کە تیایدا راستەوخۆ باس لە خۆی دەکەن بۆ نموونە لە رۆمانی *Si le grain nemeurt*— و —ژیاننامە— ئەوی راستی بێت پەی بە تۆمارێکی بێ وێنەی دواوەی شت و پێچە پەنهان و وردە جیاکاری و راچەنینەکانی — هەستێکی *conscience* — سەرنجڕاکێشی رەها دەبەین. زۆرجار زیرەکانە ئاماژە بۆ ئەو هاودژانە دەکەین کە تایبەتن بەو کارانەی گرێبەستی ئەندێشە و خەیاڵن. جید لە سایەی چەند جۆرێك دەمامك بەشێوەیەکی دوابەدواییەك ڕووناکی دەخاتە سەر هەموو ڕووەکانی ژیانی ئاکاری خۆی. بەڵام سەرەتا وەڵامی دۆشداهاتنێکی خراپ بنیاتنراو دەداتەوە. ئەوەی راستی بێت لەمەڕ خێرا هەستکردن بە ئاڵۆزی تایبەتی و کتوپڕی سەرهەڵدانی هەڵوێستەکانی بەمجۆرە لە ساڵی ١٩٠٩ لەبارەیانەوە دەدوێ: "بە سانایی ناتوانرێ پەی بە ڕێچکە پێچاوپێچەکانی ژیانی ئاکاریم ببرێت". لە ساڵی ١٩٢٤ ئەوە دووپاتدەکات کە هەریەك لە کتێبەکانی دەگەڕێتەوە بۆ بەرپەرچدانەوەی بەهرەمەندانی پێشو و ئاشکرای دەکات "کتێبەکانم فێریان دەکات تەنها بۆ بابەتە باشەکانم نەبێت چەپڵەم بۆ لێنەدەن و هیچ کام لە کتێبەکانم نەخوێننەوە تەنها ئەوانە نەبێ کە باس لە هونەر دەکەن". ئەوی راستی بێت نووسەر کە لە کارێکی ئەدەبی دەبێتەوە زۆرجار بابەتێکی گەلێ جیاوازتر سەرنجی بۆ دەربڕین ڕادەکێشێ بە واتایەکی دی جید کە بەردەوام پەرتەوازە بوو دەیتوانی هەوڵی ئەوەبدات — بە خێرایی دەستبەسەر لایەکی تری خودی بگرێت — و ڕوویەکی دی کەسایەتیە دوورەپەرێزەکەی لە پاڵەوانێکی چاوەڕواننەکراو بەرجەستەکات. ئەم رەنگدانەوە دابڕاوە لای خۆی دەبێتە لێکۆڵینەوەیەکی بێ هاوتا هەروەك دەڵێ رۆمان لە روانگەیەوە چەنێ پەیوەندی بە (ژیاننامەی خود، *autobiographie*)وە بێت باشترین ڕێگاشە بۆ لێکۆڵینەوە وەك حاڵەتێك دەیگرێتە بەرچاو کارامەیی تیا دەنوێنێ چونکە بە ناخەکانیا رۆدەچێ و دەینرخێنێ و خۆی لێدادەبڕێ لەبەرئەوەی بەشێك لە بوونی خۆی کەسایەتی لێ بەرجەستە دەبێت. کەوابوو مافی خۆیەتی بە دیدێکی رەخنەگرانە لەمەڕ کەسایەتیەك بدوێ کە ئێمە هەوڵ بۆ ناسین و جیاکردنەوەی دەدەین. بێجگە لە رۆمانی خۆراکی زەوی سەرجەم بەرهەمەکانی دی ئەندرێ جید ئیرۆنیکی — گاڵتەجاڕی—ن. بەمجۆرە هەریەکێك لەو بوونەوەرانەی کە لە خودی جیدەوە گیانیان

پێدەدات رەهەندێکی بالآتر لە ئەفراندنە هونەرییەکە وەردەگرێ.

## وانەی کلاسیکی

جید بەشێوەیەکی سروشتی رۆدەچێتە نێو تەقلیدی کلاسیکیەوە و لە رێگەی خوودیەوە پتر بایەخ بە لێکۆڵینەوەی ناخی مرۆڤ دەدات و هەروەها پێناسەیەکی تایبەت بۆ کلاسیسیزم فۆرمەلە دەکات و بەهەمیشە سەرکەوتووی دادەنێ بەسەر — رۆمانتیکیەتی ناوەوە — و ئاکام لە روانگەیەوە هەر ئەویش واتا کلاسیسیزم سەنگینی و هێورکاری و پێداویستیەکانی دەربڕینی ئەدەبی دەگەڕێنێتەوە. جید گەلێ زوو حوکمی نووسینی زۆرەملێ بەسەر کارە بەرایییەکانی دەسەپێنێ کە لە چوارچێوەی لێکۆڵینەوە هێماگەرییەکاندا وەدەردەکەوتن بۆ ئەوەی بکەونە ژێر رکێفی رێساکانی خوێندنەوەی ووردکارانەو زمانی گشتی (*Banalite*). بەمجۆرە لە رێگەی بەکارهێنانی دووایەنترین هاودژەکان ستایلەکەی بە رەسەنترین دەدرێتە قەڵەم. لە راستیدا دووپاتکردنەوەی لە رادەبەدەری پاکژکاری دەبێتە مایەی سەرسامبوون. زمانی گشتی جید لە رۆچوون و قووڵبوونەوەیدا پەردە لەسەر بەکارهێنانی وشە و دەستەواژەی خوێنراو هەڵدەماڵێ و ژمارەیەکی کەم وشەی (فەرامۆشکراو، *archaisme*) و ناوچەیی دەگرێتەخۆ و کۆمەڵێك دەربڕینی تازەو هەندێ جار وشە بوێرانە بەکاردەهێنێ و هاوکات لەبری ئەوەی (سینتاکس، بەشێکە لە زانستی زمان) بەشێوەیەکی کارامە رێکبخات لادان و هەڵوەستەی جۆراو جۆری تیا بەرپا دەکات و تەنانەت بوێریش لە هاوگونجانی (زمان پاراوی و شێواز *purism*) نیشان دەدات و دەستەواژە روشێنەرەکانیش دووپات دەکاتەوە.

بەلآم ئەمە لێکۆڵینەوەیەکی رەمەکی و جوانکارییەکی زیادەڕۆ نیە بەڵکو هەر کردەوەیەکی ئەنجامدراو بێ خزمەت بە بیرۆکەی جیاواز و راچەنینی چەپێنراوی هەست دەکات. بەمجۆرە جید یەکەی تەواوی ناخ و فۆرم بەدەستئەهێنێ کە بە پێودانگێکی جەختلێکراوی کلاسیسیزم دەژمێردرێ. جید شایستەی ئەوەیە بە گەورەترین رابەری پەخشانی فەرەنسی دابنرێ کە لەو میانەوە پەی بە چەندین موومکینی تازە و بەهێز و قەشەنگ دەبات.

## سیما بەرایییەکان

پێش ئەوەی دەس بە تاوتوێکردنی کارە ئەدەبییەکانی ئەندرێ جید بکەین جێگای بایەخە کە بە ووردی بڕوانینە هەندێ لە هێڵ و سیمای قووڵی ئەزموونەکانی کە مۆرکی کارە بەرایییەکانی پێکدەهێنن. زۆر بە چاکی دەرك بە ڕەنگدانەوەی بەرفراوانی سیمای کەسایەتی خۆی لە بۆتەی نووسینەکانیدا دەکرێت. ئەو لاپەڕانەی دەیخەنە بەر دیدە لە رۆمانی *Si le grain ne meurt* — وەرگیراوە کە رۆمانێکی ئۆتۆبیۆگرافە تیادا ژیانی نووسەر لە سەردەمی منالْیەوە تاکوو هاوسەرییبوون دەخاتە روو. لەم کتێبە بەشێوەیەکی تایبەت هەست بە ژیانەوەی ئەو رەگەزانە دەکەین کە جید لەوەوبەر لە دوو رۆمانی گرنگی وەك: بێئاکاری، *Limmoralist*، ١٩٠٢ و دەرگای تەنگ، *La porte Etroite*، ١٩٠٩ — بەکاریهێناون.

## مندالە بچووکەکانی تانکغێد

جید بەهۆی ناهەمواریییەوە ژیانێکی نامۆ بەسەر دەبات و تاڕادەیەك ئاشنایەتی لەگەڵ بەسەربردنی ژیانێکی سادەی هۆغۆنۆتی —

پرۆتستانتی فەرەنسایی – پەیدا دەکات لە ماوەی پشووەکانی لە (یوزێ، *uzes*) و هەروەك دواتر لە مۆنپلیێ کە بەهۆی رەچەڵەکی دوولایەنی نۆرماندی و لاگۆدسیان هەستی پەرتەوازەیی توونددایدەگرێ و هەروەها لە ساڵی ١٨٩٧ لە میان موناجاتێکی بەناوبانگ بە باغێ دەڵێ: "من لە پاریس لە باوکێکی یوزێتیان و دایکێکی نۆرماندی چاوم بۆ ژیان هەڵهێناوە، مسیۆ باغێ دەخوازێ رەچەڵەکی من کوێندەری بێت". لە ساڵی ١٩٠٢ لەبارەی (*diptyque*، تابلۆی هونەری دووانی)ی گەورە لە گۆڤاری ئۆکسیدانت دەس بە نووسین دەکات و هاوکات هەمان بابەت لە نووسینە بەناوبانگەکەی – بیانووەکان *pretextes* – کۆدەبێتەوە. پاشان ئەو لاپەڕەیەی کە دەیخوێنین بە شانازییەوە لەگەڵ تافی هەرزەکاری جید ئاشنامان دەکات لە رێگەی کوڕی بچووکی قەشە تانکغێد کە ژیانی ئینجیلی خێزانێکی گوندنشین کاری تێدەکات و هەروەها دەگەینە ئەو دەوروبەرەی کە ماوەی منالی تیا دەباتە سەر و دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتیەوە و شەقڵی گاڵتەجارییانە لە دوعا و نزای بێوەژنە زۆربلێییەکانی نێو پەرستگا دەردەکەوێ.

ئایا منالانی رابردووی دێرین هەستیان بەمجۆرە گاڵتەجاڕییانە دەکرد؟ ئایا –جید–ی هەرزەکار و سەربەست بە شێوازی تایبەتی خۆی رەچاوی ئەم دیمەنانەی دەکرد؟ گشت ئەمانە پرسیاری بەردەوامی نێو بیرەوەرییەکانی منالێن کە لە قۆناغی خۆناسین و جێگۆڕکێی بێئاگایانەی تەمەن دووبارە دەژێنەوە.

گەشتیارێکی لاوی زەوییە کشتوکاڵیەکان بۆ سەردانی قەشە گیۆم گغانێی مامی دەچێ و ناتوانێ بگاتە ئوزێ. شەوی بەسەردێ و خۆی لە کێڵگەیەکی دووردەستی تەریکدا دەبینێتەوە.

لەناکاو لەسەر رەفەی دیوارێکدا رەچاوی ئینجیلێکی گەورەم کرد، زانیم لە ماڵێکی پرۆتستانتیدام. ناوی ئەو کەسەم پێووتن کە نیازی بینینیم بوو. پیرەمێردەکە کە مامی دەناسیم دەمودەست هەستایە سەرپێ. تەنانەت باپیرمی زۆر چاك لەیادبوو. بەشێوازێك قسەی بۆ دەکردم پاڵینام ئەوە تێبگەم کە چی خۆنەویستی و چاکخوازیەك دەتوانێ لە جەستەیەکی پۆڵاییندابێ وەك لە شێوەی باپیرم و خودی ئەم گوندنشینە دەبینرێ کە تەسەورم وابوو باپیرم لە تەواوی شێوەو بەهێزی و دەنگی گڕ و کاریگەری و روانینی قورس و راستەوخۆی دەبوو لەم بکات. لەو کاتەی منالەکان، کیژێکی عازەب و سێ کوڕی گەلێ رووخۆش و ووردتر لە باپیریان بەڵام لەگەڵ ئەوەش کەمێك ترسناك و مۆن لە کار دەگەڕانەوە دایکیان شۆربای گەرمی لەسەر مێزەکە دانا. کە قسەم کرد بە ئاماژەیەکی ژیرانەوە قسەکەی پێبڕیم و پیرەمێردەکەش نوێژی سەرخوانی دەخوێندەوە. لە ماوەی نانخواردن بە زمانێکی کورت و رەوان باسی باپیرەی بۆ کردم بەڵام جێگای داخە تێبینی قسەکانیم نەدەکرد. لەبەرخۆمەوە دەمگووت چی ئەمە کەی خێزانی گوندنشینە! ئای کە پۆشتەو پەرداخی و چوستی و چالاکی و جوامێری لای ئەم جووتیارە گەورانەی نۆرماند بەدیدەکرێ! خواردنی شێو کۆتایی هات، وا خۆم دەرخست دەمەوێ بڕۆم، بەڵام خاوەن ماڵ لێم تێنەگەیشت. دایکە هەستایە سەرپێ و کوڕی گەورە لەگەڵ برایەکیا چوو بۆ نووستن. من چوومە نێو جێگەکەی ژووری ئەو کە چەرچەفی پاکوتەمیز و ئەستووری پیادرابوو و بۆنێکی خۆش لە عەتری لاوەندی لێوە دەهات. خێزانەکە رانەهاتبوو تا درەنگ بمێنێتەوەو زوو دەنووستن. بەهەرحاڵ، گەر ئارەزووم بوایە دەستم بە

خوێندنەوە ئەکرد. پیرەمێردەکە ووتی: ڕێگەمان بە ئەو نەریتانەی مایەی سەرسامی ئێوەن پێشێلی نەکەین هاوکات تۆ نەوەیەکی بچووکی مسیۆ تانکغێدی. پاشان بۆ ئەو ئینجیلە گەورەیە گەڕا کە لێمەوە دیاربوو، خستیە سەر مێزەکە. کچەکەی و هەرسێ مناڵەکە بەرامبەر بە مێزەکە لە تەنیشتیەوە لە حاڵەتی ووردبوونەوە کە بەلایانەوە سروشتی بوو دانیشتن. باپیرە کتێبە پیرۆزەکەی کردەوە بە تەفخیمەوە لاپەڕەیەك ئینجیل و پاشان زەبوری خوێندەوە. پاشان هەریەکەو بەرامبەر کورسیەکەی کەوتە سەر ئەژنۆ تەنها ئەو نەبێ بینیم لەسەر پێ وەستاوە و چاوەکانی داخستووە و دەستەکانی بەکراوەیی لەسەر کتێبە داخراوەکەی بەردەمی داناوە. بە سادەیی و سەنگینی و بێ داواکردنی هیچ شتێك لە کورتە نوێژێکدا سوپاسگوزاری بۆ یەزدان دەربڕی و هەروەها لە بیرمە سوپاسی خوای کرد کەوا دەرگای ماڵەکەی پیشاندام و ئەمەی بە ئاوازێك دەگووت کە بە تەواوی لەگەڵ وشەکانیا یەکانگیر بوو. لە تەواوبووندا دووبارە خوێندیەوە "باوکمان.." پاشان بێدەنگی بۆ ساتێك باڵی کێشا ئینجا منداڵەکان یەك بەیەك هەستانە سەرپێ. ئەوە زۆر بە جوانی و هێمنی بەڕێوەچوو پاشان وێنەی ماچی شکۆداری لەسەر تەوێڵی هەریەکێکیان دەکێشا. کە لەمن نزیك بووەوە تەوێڵم بۆ درێژ کرد. ئەوانەی سەر بەنەوەی باپیرەمن بیرەوەری ئەو ئەشکەنجەیەی باوانیان چەشتبوویان یان هەرنەبێ کەمێك بەرگریان کردبێ بە زیندوویی پاراستووە: لە ناخیاندا پتەویەکی مەزن هەبوو بۆ بەرەنگاریکردنی ئەوانەی دەیانویست ئەو پتەویە بڕوخێنن. هەریەك لەوانە بە روونی گوێیان لە مەسیح بوو کە بە کۆمەڵێ ئەشکەنجەدراو و ئەوانی دی دەگووت "ئێوە خوێی زەوین، لە حاڵەتێکدا خوێ تامی خۆی لەدەستبدات بەچی ئەتوانن ئەو تامەی بۆ بگێڕنەوە؟" پێویستە دان بەوە بنێم کە سروتی خواپەرستی پروتستانتی لە پەرستگا بچووکەکەی یوزێ لە سەردەمی منالیمدا بەشێوەیەکی تایبەتی دیمەنێکی بەچێژی دەخستەروو. بەڵێ، توانیم دووایین جێگرانی ئەم نەوەیە بە خۆیان و کڵاوە لبادییەکانی سەریان ببینم کە ئامادەی سروتەکە بوون بێ زۆر لەخۆکردن ناوی خوایان[1] دەهێناو بە درێژایی ئەو سرووتە ئاینییە کڵاوەکان بەسەریانەوە دەماو لە کاتی پاڕانەوە و نزاکردنی قەشە بە ناوی خواوە بەرزیان دەکرد و لە حاڵەتی وتنەوەی "باوکمان..." نەبێت دایان نەدەگرت. کابرایەکی نامۆ لە چوارچێوەی سروتەکە وەك دەربڕینی بێڕێزی دووچاری توڕەبوون بوو و نەیزانی ئەم پرۆتستانتە فەرەنسیانە یادکردنەوەی ئەم سروتی خواپەرستییە لە دەرەوە و لە ژێر ئاسمانێکی گەرم و لە تووێی پێچە پەنهانەکانی زەوییە کشتوکاڵیەکان دەپارێزن لە زەمانێکدا کە خزمەتی خوا بەپێی بیروباوەڕیان گەر جێگەی سەرسامیان نەبووبێ، ئاکامێکی گەوهەری[2] دەنواند. پاشان ئەم ئاژەڵە[3] زەبەلاحە لەناوچووانە دیارنەمان. دوای ئەوان بەماوەیەك بێوەژنەکان دووبارە رزگاریان بوو. ئەوان تەنها لە رۆژی یەکشەمموان بۆ کلێسە دەردەچوون بەو واتایەی دووبارە خۆیان لەوێ دەدۆزییەوە. داپیرەی من و مەدام ئابۆزیتی هاوڕێی و مەدام ڤانسێنت و دوو پیرەژنی تر کە ناویان نازانم لەوێ بوون. پێش کاتی خواپەرستی کارەکەرەکان کە وەك سەرۆکەکانیان پیربوون، زۆڕپا بچووکەکانی خاتوونەکانیان دەهێناو لەبەردەم کورسیەکانیان دایاندەنا. پاشان لە ماوەیەکی

دیاریکراو بێوەژنەکان کاتێ کە سرووتی خواپەرستی دەستی پێدەکرد دەهاتنە ژوورەوە و وەك نیمچە نابینایەك لە پێش دەرگاکە یەکدیان نەدەناسی بەلاّم بەیەکجار لەسەر کورسیەکان خۆشحالّی خۆیان بەو دیدارە دەردەبڕی و بە کۆمەلّ دەکەوتنە هەلّڕشتنی ناخ و تێکەلّکردنی پیرۆزبایی و پرسیار و وەلاّم. هەریەکێکیان وەك مەنجەلّ کڕوکپ بێدەنگ گوێیان لە هیچ گوتارێکی ئافرەتە بەرپرسەکانیان نەدەبوو. ئاوێتەی دەنگیان لە ماوەی چەند ساتێکدا بە تەواوی دەنگی قەشەی بەستەزمانی دەشاردەوە.

(چاپخانەی گالیمار، بلاّوکەرەوە) *Si le grain ne meurt*

## پەراوێزەکان

١-بۆ رێزگرتن لە خودی دەقی ئینجیل.

٢-دیمەنەکە بە دوور لە شوێنی سوپاسگوزارییەکان روونادات.

٣-بەکارهێنانی ئەم دەستەواژەیە لەگەلّ مەبەستی گالّتەجاڕییانەی پارەگراف خۆی دەگونجێنێ.

## سەرچاوە

*collection Litteraire Lagarde et Michard*

*Andre Gide*

*Page. 259-264.*

# بەجیهانیبوونی ناچاری

## -گفتوگۆ لەگەڵ ڕیچارد رۆرتیدا-

ڕامین جەهانبەگلو
لە فارسییەوە: ئازاد بەرزنجی


ڕیچارد رۆرتیدا

(ریچارد رۆرتی فەیلەسووفێکی هاوچەرخی ئەمریکاییە و بە فەیلەسووفی پۆستمۆدێرن ناسراوە، گەرچی خۆی نکوولّی لەوە دەکات. گرنگترین کتێبیشی "فەلسەفە و ئاوێنەی سروشت"ە، لەم گفتوگۆیەدا جگە لەوەی دەربارەی ژیانی خۆی دەدوێت، دەربارەی کۆمەڵێك مەسەلەی زیندووی ئەمرۆش دەدوێت؛ لەوانە: پێکەوە ژیان، پلورالیزم، گفتوگۆ، بەجیهانیبوون -و-)

➢ جەنابی پرۆفیسۆر، ئێوە لە ٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٣١دا لە نیویۆرك و لە ناو خێزانێکدا هاتوونەتە دونیاوە کە دژایەتیی ستالینیزمیان کردووە. ئایا ئەو ژینگە چەپرەوەی خێزانەکەتان کاریگەریی لەسەر بڕیاری ئێوە بۆ خوێندنی فەلسەفە هەبووە؟

–لە راستیدا نەخێر. مەیلی من بۆ فەلسەفە دەگەڕێتەوە بۆ کاریگەریی مامۆستاکانم لە زانکۆ. من ساڵی ١٩٤٦ چووم بۆ زانکۆی شیکاگۆ. ئەو کات فەلسەفە بەشێکی گرنگ بوو و هەموو بوارەکانیشی دەگوترایەوە. ئەوسا فەلسەفە بەڕادەیەك گرنگیی هەبوو کە دەیانوت کەسێك ئەگەر فەلسەفە نەخوێنێت" نوقسانە. من بە پلەی ماجستێر زانکۆی شیکاگۆم تەواو کرد و بۆ بەدەستهێنانی پلەی دکتۆراش چووم بۆ زانکۆی ییڵ.

➢ پێم وابێت لە شوێنێکدا خوێندومەتەوە کە مامۆستای ئێوە لە زانکۆی شیکاگۆ "ڕۆدۆلف کارناپ" بووە. ئایا کارناپ رووی سەرەکی نەبوو لە ڕێنوێنیی ئێوە بۆ بواری فەلسەفەی زانست و ئەپیستمۆلۆژیا؟

–لە راستیدا کارناپ رۆڵی سەرەکی و کاریگەری هەبوو لە ئاشنابوونی مندا بە فەلسەفەی شیکاری. ئەوکات (لە کۆتایی چلەکان و سەرەتای شەستەکاندا) لە ئەمریکادا بزاوت و تەوژمێکی نوێ

(لە فەلسەفەی شیکاریدا) فۆرمەلە بووبوو و کارناپیش تاقە کەسێك بوو کە لە شیکاگۆ ئەو بەشەی دەوتەوە. قوتابیەکانیشی هەموو لە ناوە دیارەکانی ئەم بزاوتە بوون کە سالآنی دواتر لە فەلسەفەی ئەمریکاییدا گەشەی سەند.

➢ ئایا بە بۆچوونی ئێوە کارناپ لە ئەمریکاش هەر هەمان ڕوانگەی قوتابخانەی ڤیەننای هەبوو؟

–بەڵێ. ئەو ئەندامی گروپێك بیرمەند بوو لە بەرلین کە مایەی ڕەزامەندیی ئەندامانی قوتابخانەی ڤیەننا بوون. لەو گروپەشدا روخسارێکی دیاربوو. نەوەیەك لە کۆچەرانی ئەڵمانی هەبوون وەکو کارناپ، کە وردە وردە لە مەیدانی فەلسەفەی ئەمریکاییدا بوون بە روخساری دیار و بەناوبانگ.

➢ ئایا ئێوە لە ژێر کاریگەریی کارناپدا دەستتان بە خوێندنەوەی ڤیتگنشتاین کرد؟

–من لەسەر راسپاردەی کارناپ دەستم بە خوێندنەوەی کتێبی "تراکتاتۆس" کرد، بەلآم ئەو کاتە لێی تێنەدەگەیشتم و چەند ساڵێك دواتر کتێبی "رامانی فەلسەفی"یم خوێندەوە، کە بەبڕوای من کتێبێکی زۆر گرنگە و من لە کارە فەلسەفیەکانی خۆمدا زۆر سوودم لێبینیوە.

➢ فەلسەفەکەی ئێوە کاریگەریی "جۆن دیوی"یشی لەسەرە. کەی لەگەڵ کارەکانی ئەودا ئاشنایەتان پەیدا کرد؟

–وەختێ قوتابیی زانکۆ بووم "دیوی"م دەخوێندەوە، ئەوکات هاوڕێیەکم هەبوو ناوی سیدنی هۆك بوو دژ بە ستالینیزم بوو و قوتابیی "دیوی" بوو. من لە ڕێی "سیدنی هۆك"ەوە ئاشنایەتیم لەگەڵ هەندێ لە بیروباوەڕەکانی دیوی دا پەیداکرد. بەلآم زۆر حەزم پێی نەکرد. ئەم حاڵەتە وەکو خۆی مایەوە تا لە تەمەنی سی ساڵیدا سەرنجم دا کە بیروباوەڕەکانی جۆن دیوی چەند گرنگن.

➢ ئایا بەڕای ئێوە دیوی هیچ پێگەیەکی لە بیروباوەڕەکانی ئەمریکای ئێستادا هەیە؟

–بە بڕوای من دیوی هەروەکو مارکس تیۆرەی مێژووگەرایی هیگلی وەرگرت. بەلآم ئەم بە پێچەوانەی مارکسەوە کە بیری لە گۆڕانکاری و شۆڕش دەکردەوە لە ناو کۆمەڵگادا، دیوی ریفۆرمخوازێك و سۆسیال دیموکرات بوو. ئەمڕۆکە، وای بۆ دەچم کە دیوی رۆڵێکی بەرچاوی لە ئەورووپای خۆرهەلآتدا هەبێت، لەبەرئەوەی لەوێ فەیلەسووفەکان کەم تا زۆر بیروبۆچوونیان دەشوبهێتە سەر ئەو و درێژەی بیروبۆچوونەکانی مارکسن، بەلآم بە جەختکردنێکی زیاتر لەسەر ئاقاری سۆسیال دیموکراسی.

➢ ئێوە سەرەتا لە سالآنی ١٩٥٢ تا ١٩٥٦دا لە یێل، پایاننامەکەی خۆتان سەبارەت بە "چەمکی توانا" نووسی، کەچی ئێستا لە بەشی ئەدەبی بەراوردکاری لە زانکۆی ستنفۆرد وانە دەڵێنەوە. ئایا ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە بەلای ئێوەوە ئەدەب لە فەلسەفە سەنجڕاکێشتر بووە؟

–نەخێر، راستییەکەی ئەوەیە کە زۆربەی بەشە فەلسەفیەکان لە ولآتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا، بە فەلسەفەی شیکارییەوە خەریکن و کەمتر بایەخ بە کارەکانی هیگل یا هایدیگەر دەدەن، بەم پێیە گەر تۆ بتەوێ سەبارەت بەمانە وانە بڵێیتەوە، وا ئاسانترە لە دەرەوەی بەشەکانی فەلسەفەدا ئەم کارە ئەنجام بدەیت.

➢ من دیسانەوە لە شوێنێکی تریشدا ئەوەم خوێندووەتەوە کە ئێوە وتوتانە ئەسەفبارن لەوەی مێژووناس نین!

–نەك ئەسەفبار، بەلآم وای بۆ ئەچم کە فەلسەفەی مێژووگەرای پاش هیگل، زۆر لە مێژووی فیکر نزیك بووەتەوە، بەجۆرێك کە جیاکردنەوەی

جیاوازییەکانیان ڕۆژ بە ڕۆژ دژوارتر دەبێت، من وا هەست ئەکەم لێرەدا کەسێکی وەکو بلومبێرگ دەیەوێت کە ڕاستەوخۆ خۆی وەکو مێژووناسێك رابگەیەنێت" نەك وەکو فەیلەسووفێك.

➤ ئایا حەزتان دەکرد وەکو ئایزایا بێرلین مێژووی فیکرتان بخوێندایە؟

–بەڵێ، هەست دەکەم ئایزایا بێرلین شتێکی راستی هەڵبژاردووە. ئەو خۆی لە کۆتی فەلسەفەی شیکاری رزگارکرد" کە لە سیەکان و چلەکاندا لە ئۆکسفۆرد باو بوو، بۆ ئەنجامدانی کاری سەرنجڕاکێشتریش روویکردە بواری مێژووی فیکر.

➤ چی وای لێکردیت بایەخ بە "پراگماتیزم" بدەیت؟

–بەڕای من پراگماتیزم یەکێکە لە دەرکەوتەکانی دژایەتیکردنی فەلسەفەی ئەفلاتونی و دیکارتی. ویلیەم جیمز و نیچە، هەردووکیان لە کۆتاییەکانی سەدەی نۆزدەهەمدا بەڕووی پێشگریمانەکانی فەلسەفەی ئەکادیمیی دیکارت و کانت دا وەستانەوە. پراگماتیزم لە ئەمریکادا زۆر قەرزاری نیچە و هەروەها ڤیتگنشتاین لە قۆناغی دووەمیدا و هایدگەرە لە قۆناغی یەکەمیدا. خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا ئەوەیە کە ئەوانیش ئەو فەیلەسووفە ناوبراوانەیان لاپەسەند نەبوو. ئەفلاتون و دیکارتیان پێقبوول نەبوو.

➤ ئایا لەو بڕوایەدا نین کە پراگماتیزم دیاردەیەکی ئەنگلۆ– ئەمریکاییە؟ هەروەکو دەزانن، پراگماتیزم لە نێو فەیلەسووفە ئەڵمانی و فەرەنساییەکاندا بلاونەبۆوە.

–پراگماتیزم هەرگیز لە ئەوروپادا مایەی پەسەندکردن نەبووە. بەڕای من ئەوە جێی داخە، بەلام لە ولاتە ئینگلیزەکانیشدا برەوێکی وای نەبوو. ئەم قوتابخانەیە هەم لە بەریتانیادا تەواو فەرامۆش کراوەو هەم لە ئەڵمانیا و فەرەنساشدا لە ئەمریکاش، پاش دووەم جەنگی جیهانی بە تەواوی ئەفەرۆز کراو فەلسەفەی شیکاری جێی گرتەوە. بەم پێیە، ناتوانین پراگماتیزم بە بزووتنەوەیەك لە قەڵەم بدەین، بەڵکو بە تەنها ناوێکە بۆ هەندێ ڕوانینی فەلسەفیی دیاریکراو کە دەتوانین لە کارەکانی جۆن دیوی و ولیەم جیمزدا بیدۆزینەوە، بەلام ئەم ڕوانینانە لەلای هایدگەر و گەلێ کەسی تریش دەبینرێتەوە.

➤ ئایا تا ئێستا لە زانکۆکانی ئەمریکادا جۆن دیوی و ولیەم جیمز دەخوێندرێن؟

–زۆر نا.. هەندێ جار.

➤ ئایا ئێوە خۆتان بە فەیلەسووفێکی پۆستمۆدێرن دەزانن؟

–نەخێر، من هەرگیز نەمزانیوە وشەی پۆستمۆدێرن یەعنی چی. هەموو من بە پۆستمۆدێرن لە قەڵەم دەدەن، بەلام لە راستیدا من نازانم واتای ئەم زاراوەیە چییە.

➤ شتێکی زۆر سەیرە، ئێوە خۆتان بە پۆستمۆدێرن نازانن، بەلام لە کار و نووسینەکانتاندا پشتیوانی لەو بۆچوونەی فرانسوا لیوتار دەکەن کە دەڵێت حیکایەتە فەلسەفیە گەورەکان کۆتاییان هاتووە و حیکایەتە بچووکەکان جێیان گرتوونەتەوە.

–راست دەکەیت. من پشتیوانیم لەو بۆچوونەی لیوتار کردووە، بەلام هەستدەکەم بە هەڵەداچووم. وای بۆ دەچم کە ئەو بۆچوونە راست نییە. لە ڕوانگەی منەوە، هەموو ئەو کارانەی کە لیوتار ئەنجامیداون" قووڵبوونەوەو تێفکرینە لە "حیکایەتی گەورە"ی ئەویدی و کتێبە بەناوبانگەکەشی کە ناونیشانی "دۆخی پۆستمۆدێرن"ە، خۆی جۆرێکە لە حیکایەتی

گەورە، بەم پێیە، من لەو بڕوایەدام کە هەمیشە حیکایەتی گەورەمان دەبێت. ئێمە ناتوانین لەو حیکایەتانە جیابینەوە.

➢ کەواتە ئێوە، وەکو هەندێکی دی، جیاوازی لە نێوان مۆدێرنیتە و پۆستمۆدێرندا ناکەن؟

–من تێناگەم چۆن کەسانێك جیاوازییەکی لەمجۆرە دەکەن. کەسانێك هەن بە جۆرێك دەدوێن وەك ئەوەی بتوانرێ ئەم جیاوازیانە لە ناو چیرۆك و هونەر و فەلسەفە و سیاسەتیشدا بکرێ. بەڵام من لە چیرۆکی جیاوازی نێو ئەم هەموو بوارانە تێناگەم“ کە لە لێکۆڵینەوەکانی پۆستمۆدێرنەکاندا ئەنجامدەدرێن.

➢ ئایا بەلای ئێوەوە پۆستمۆدێرن لە هونەر و ساختومانسازیدا مانای هەیە؟

–لە ساختومانسازیدا بەڵێ. ئێوە دەتوانن فێری ئەوەبن چۆن ساختومانە پۆستمۆدێرنەکان جیابکەنەوە. دەکرێ ئەم زاراوەیە لە ساختومانسازیدا بەکاربهێنرێ. بەڵام راستیەکەی ئەوەیە کە من لەوە تێناگەم کە چۆن چیرۆکێکی پۆستمۆدێرن دەنووسرێ، یان چۆن دەبمە خاوەنی ڕوانینی فەلسەفییانەی وەها کە ئەوانی دی من بە فەیلەسووفێکی پۆستمۆدێرن بزانن. ڕوانینە فەلسەفیەکانی من لە ساڵی ١٩٠٠یشدا لە ئارادا بوون. ئیتر ئەگەر کۆن بن“ کەواتە پۆستمۆدێرنەکان وشەیەکی ناڕاستیان بۆ هەڵبژاردووە.

➢ کەواتە ئەگەر ئێوە بتانەوێ بە وشەیەك ناو لە خۆتان بنێن، چی دەڵێن؟

–خۆم بە پراگماتیست لە قەڵەم دەدەم.

➢ وا بزانم ئێوە لەو بیرمەندانەن کە ئەگەر بزانن فەلسەفە کۆتایی هاتووە، کێشەیەکی واتان نابێت. مەبەستم لەوەیە کە ئێوە لەو بیرمەندانەن کە ترستان لەو بڕوایەی نیچە نییە کە حەقیقەت نەماوە.

–هەموو ئەوەی کە وای لە نیچە دەکرد رافزی بێت ئەو بیرۆکەیەیە کە راستی (واقعیەت) گەوهەر و ماهیەتێکی ناوەکی و خودیی هەیە و حەقیقەت دەرکەوتەی ئەو ماهیەتەیە. بەلای منەوە ئەم روانینە نیچەییە مایەی قبووڵکردنە و ئا ئێستاش هێشتا ئێمە فەلسەفەمان هەیە. لەبەرئەوەی فەلسەفە لە پێناوی کۆکردنەوەی بەشە جیاوازەکانی کەلتووردا هەوڵ ئەدات و تا ئەو دەمەی پێویستمان بە گۆڕانی کەلتووری بێت“ خەڵك پێویستیان بەوە دەبێت کە کۆن و نوێ لەگەڵ یەکدا بگونجێنن. مەبەستم لەوەیە کە دەبێ لە پاڵ شێوە نوێیەکانی گوتاردا“ شێوە کۆنەکانیشیان هەبێت. بەم پێیە“ هەمیشە فەلسەفە دەبێت، تەنانەت ئەگەر هەمووش لەگەڵ دروشمەکەی نیچەدا بن کە حەقیقەت نەماوە.

➢ بەڵام من بڕوام وایە کە چیدی "ئەقڵی نەمر – یان ئەزەلی–" مانایەکی بەجێ و جیهانی نییە.

–بەڵێ، من لەو بڕوایەدام کە هیگل (وەکو هزری یۆنانی کۆن) راستی دەگوت کە ئێمە سەبارەت بە یەك شت نادوێین و یەك کێشە چارەسەر ناکەین. بەڵام دەبێ ئەوە بڵێین کە ئێمە لە دونیایەکی جیاوازتر لە دونیای ئەواندا دەژین و نەوەکانی دوای ئێمەش لە دونیای جیاوازتردا دەژین. من وایدەبینم کە هیگل ڕاست بووە لەوەدا کە وتویەتی "فەلسەفە کاتێك خۆیەتی کە لە فیکردا بەرجەستە بێت". کەواتە دەبێ لە هەر قۆناغێکی کەلتووریدا تازە بێتەوەو بەم پێیەش نەمر نابێت.

➢ بە بڕوای ئێوە بە چ شێوازێك لە نێوان خۆرهەڵات و خۆرئاوادا گفتوگۆی فەلسەفی بەرقەرار دەبێت؟ ئایا ئێوە هیچتان سەبارەت بە فەلسەفەی خۆرهەڵات خوێندۆتەوە؟ فەلسەفەی خۆرهەڵات چۆن دەبینن؟

–لە راستیدا من زۆر کەم دەربارەی فەلسەفەی خۆرهەڵات دەزانم. من وا هەستدەکەم کە فەلسەفەی خۆرئاوا دیاردەیەکی تەواو لۆکاڵ و سنووردار بووە کە لە ململانێی نێوان زانستە تازەکانی فیزیا و نەریتە ئایینیەکانەوە سەریهەڵداوە. ئێوە ئەگەر لە وڵاتێکدا بن کە ئەم ململانێیەی بەخۆیەوە نەدیبێت، یان تازە تاقی بکاتەوە، لەم حاڵەتەدا ئەوەی بەناوی فەلسەفەوە لە وڵاتەکەی ئێوەدا دێتە ئاراوە" تەواو جیاوازە لەوەی خۆرئاوا.

➢ ئەوەی کە لەسەد ساڵی رابردوودا ڕوویداوە ئەوەیە کە فەیلەسووفانی خۆرهەڵات لە بیروباوەڕە نوێیەکانی خۆرئاوایان کۆڵیوەتەوەو دەیانەوێ خۆیانی لێ نزیک بکەنەوە و لێی تێبگەن. بەڵام فەیلەسووفانی خۆرئاوا کەمتر بایەخیان بە گوتارە فەلسەفیەکانی خۆرهەڵات داوە.

–وابزانم فەیلەسووفانی خۆرهەڵات بەشێکی زۆری کارەکەیان بۆ سازدانی گفتوگۆی خۆرهەڵات و خۆرئاوا ئەنجامداوە. لەبەرئەوەی ئەوانە کەسانێکن کە مێژووی فیکریی ئەورووپایان خوێندۆتەوەو لێی فێربوون. لە کاتێکا، بەلای فەیلەسووفانی خۆرئاواوە زۆر زەحمەتە سەبارەت بە مێژووی فیکر لە چین و هیندستان یان ئێراندا بخوێننەوەو شت فێربن.

➢ بۆچی؟ ئایا لەبەرئەوەی ئەوانە خۆیان بە سەنتەر دەزانن و شەیدای ئەورووپان؟

–بەڵێ. خۆیان بە سەنتەر دەزانن. خۆرئاواییەکان هەمیشە بە پیاچوونەوەی قۆناغێکی فیکری قەڵس دەبن. بەمپێیە، ئەوان بە ناچاری وایدەبینن کە هەموو ئەو شتانەی خۆرهەڵات، کاتی خۆی ئەورووپا لە سەدەکانی حەڤدە و هەژدەدا پیایاندا تێپەڕیوە. بێگومان ئەمە تێڕوانینێکی تەسکبینانەیە و ڕزگار بوون لە داوی هەروا ئاسان نییە.

➢ ئەمڕۆ لە خۆرهەڵاتدا و بەتایبەتیش لە وڵاتانێکی وەکو هیندستان و ئێراندا زۆر گفتوگۆ لەسەر "مۆدێرنیتە" دەکرێ. لەم رووەشەوە رۆشنبیرەکانمان سەرگەرمی خوێندنەوە و توێژینەوەی ئەو کارانەن کە لە خۆرئاوادا بڵاودەکرێنەوە، کاری کەسانی وەکو ئێوەو هابرماس و دێریدا و فۆکۆ و ئایزایا بێرلین و ئەوانی دی. من حەزدەکەم بزانم تێڕوانینی ئێوە بۆ چەمکی مۆدێرنیتە چییە. پێگەتان لەم بوارەدا چییە؟

لەبەرئەوەی هەروەکو خۆشتان دەزانن، هابرماس و فەیلەسووفە کانتییە نوێیەکان، مۆدێرنیتە بە پرۆژەیەکی تەواونەکراو دەزانن و لەم بوارەشدا دەگەڕێنەوە بۆ تێزی رۆشنگەری و هەوڵئەدەن بنەمای تیۆرەیی گونجاو بۆ ڕوانینە فەلسەفی و سیاسیەکانی خۆیان بدۆزنەوە.

–من لە بنەڕەتدا لەگەڵ هابرماسدام، واتە لە شێوازی خستنەڕووی مەسەلە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکاندا، بەڵام بیرۆکەی دۆزینەوەی "بنەمای فەلسەفی" بۆ بونیادە کۆمەڵایەتی و سیاسیەکان، لای من جیاوازە لە بۆچوونی هابرماس. بەڵام لە بنەڕەتدا من لەگەڵ ئەوەدام کە پرۆژەی خۆرئاوا بۆ ڕۆشنگەری دەگەڕێتەوەو ئەم تێزەش تەواو نەکراوە.

➢ ئەم تێڕوانینەی ئێوە سەرنجی من بۆ کتێبەکەتان "فەلسەفە و ئاوێنەی گەوهەر" رادەکێشێت کە ریچارد بیرنشتاین بە "یەکێك لە گرنگترین و مشتومڕ وروژێنترین ئەو کتێبانەی کە لەم چەند دەیەی دواییدا لەلایەن فەیلەسووفێکی ئەمریکاییەوە بەچاپ گەیەنراوە" ناوی دەبات. ئێوە لەم کتێبەدا هەوڵتان داوە ئەوە بخەنە ڕوو کە ئەو بەهەڵەدا چوونە تەوەرەییانەی کە لە فەلسەفەی شیکاریی سیستماتیزەکراودا دەیبینینەوە، لە هەمان نەریتی باوی دیکارتی و کانتییەوە سەرچاوە

دەگرێت، واتە بڕواهێنان بەوەی ئەپیستمۆلۆژیا بالآترە، بەوەی تەقەللایەکە بۆ رەوایەتیدان بە خودی رامانی فەلسەفی. ئایا ئێوە لێرەدا دەتانەوێ بڵێن کە لافی فەیلەسووفەکان بەوەی بونیادەکانی ئێمە دەخولقێنن، لافێکی بێ بنەمایە؟

–بەڵێ. من لەو بڕوایەدام کە پێویستە فەیلەسووفەکان واز لەو پرسیارە بێنن کە بونیادەکانی ئەمە یان ئەوە چین و لەبری ئەوە بیر لەوە بکەنەوە کە چۆن دەتوانین ئەم یان ئەو بزاوتە، یان ئەم یا ئەو بەشە لە کەلتوور پێکەوە بگونجێنین. بە بڕوای من دەبێ فەیلەسووفەکان زیاتر وەکو گونجێنەرێك لە خۆیان بڕوانن، نەك بەدوای بونیاد و بوارەکاندا بگەڕێن.

➢ کەواتە ئەگەر پەیبردن و تێگەیشتن لەسەر بنچینەی جۆری بونیادی بابەتیی زەین نەبێت، لەبەرئەوەی کە ئێمە جیهان لە دەلاقەی نموونە (پارادایم)ی جۆراوجۆرەوە لێك دەدەینەوە“ لەم حاڵەتەدا ئێمە چۆن زەمینە بۆ کردارە ئاکاری و سیاسیەکانی خۆمان بدۆزینەوە؟

–زۆر باشە، هەر کەلتوورێك بۆ وەڵامدانەوەی کردار و بیروباوەڕەکان، نموونەی پاساودەرەوەی خۆی هەیە. کەلتوورەکان لە رووی دۆزینەوەی پاساوهێنانەوەی بەجێ، لە یەکدی جیاوازن. بەرەنجامی کەلتووری لە راستیدا بریتییە لە دۆزینەوەی چەند ڕێگایەك کە بە هۆیانەوە بتوانرێ کۆمەڵێك لەم پاساوانە ئاوێتە و چوونیەك بکرێن و بێگومان ئەم کارەش هیچ پەیوەندییەکی بە دۆزینەوەی زەمینەی نوێ و یان دۆزینەوەی زەمینەی راستەقینە نییە بۆ مەعریفە و کردارەکان. بەڵکو تەواو پەیوەندیی بە گونجاندن و پاساودانی نموونەیەکی رەفتاری مرۆییەوە هەیە بە نموونەیەکی تری رەفتاری مرۆیی. نەریتی فەلسەفی لە سەدەی هەڤدە بەملاوە وتویەتی کە هەندێ لە بەشەکانی کەلتوور بەرز و بالآن. بۆ نموونە زانستە سروشتیەکان بەرز و بالآن، یان هەروەکو کانت دەڵێت "هوشیاریی گشتیی ئاکاری" بەرز و بالآیە و ئێمەی فەیلەسووفانیش دەبێ روونی بکەینەوە کە بەرز و بالآیە، لەبەرئەوەی ڕەگوڕیشەی لە بونیادی زەین یان بونیادی راستی (واقعیەت)دا هەیە. بەڵام لە روانگەی پراگماتیستییەوە“ ئەمانە بەرز و بالآ نین. هیچ کام لەم گوتارانە یان بوارە کەلتووریانە ئیمتیاز و ئاوارتەییەکیان نییە، بەڵکو جووتکردنیان لەگەڵ بەشەکانی تری کەلتووردا دژوارە.

➢ لەم حاڵەتەدا، چۆن دەتوانین قسە لەسەر چەمکی "جیهانی" بکەین؟ ئایا چەمکی جیهانی، چەمکێکی بێمانای میتافیزیکییە؟

–چەمکی جیهانی، دەبێ بە مانای شتێك بێت کە قابیلی بەدەستهێنان بێت. بۆ نموونە، کاتێ تۆ دەڵێیت ئێمە پێویستمان بە "کۆمەڵگایەکی جیهانی" یان "ژیارێکی جیهانی" یان "یاسا و ڕێسایەکی جیهانییە بۆ مافی مرۆڤ"، باسی هەندێ شت دەکەیت کە قابیلی وەدەستهێنانن. بەڵام چەمکی "جیهانی" لە قاڵبە ئایدیالی و کۆمەڵایەتییە داواکراوەکەیدا، کە وەکو سیفەتێك بۆ ئاسۆکان یان ڕوانگە تایبەتیەکان پێناسە دەکرێ“ بەلای منەوە بیرکردنەوەیەکی چەوتە.

➢ من لەسەر ئەم مەسەلەیە پێدادەگرم. لەبەرئەوەی ئێوە دەزانن کە خەڵکانی خۆرهەڵات بە گوێرەی هەندێ نەریتی ئایینی (ناسکولار) دەژین. بەم پێیە پرسیاری لە جۆری "ئایا مەعریفەی ئایینی" هەیە“ هێشتا بەلای زۆر لەو خەڵکانەوە پرسیارێکی بەجێیە.

–بە بۆچوونی من ئەم پرسیارە نادروستە، مەبەستم ئەو پرسیارەیە کە "ئایا ئەمە مەعریفەیە؟"

پرسیارێکی سوودبەخش نییە و هیچ یارمەتیەکمان نادات. بیروباوەڕی وا هەیە کە کەلتورێك بە پاساودراوی دەزانێ و خۆی دەبێتە بەڵگە و بیانووی خۆی. لە کاتێکا دەشێ لە فەرهەنگی تردا پاساو دراو نەبن و خۆیان بەڵگە و بیانووی خۆیان نەبن. پرسیاری سوودبەخش ئەوەیە کە "ئەم کەلتوورانە چۆن دەتوانن لەگەل یەکدا بگونجێن؟" مەسەلەکە ئەوەیە کە "کامیان ناتەبایە؟".

➢ کەواتە دیسانەوە دەگەڕێینەوە سەر مەسەلەی گفتوگۆ، ئەگەر هەریەك لەم کەلتوورانە بیروباوەڕی جیاوازی خۆی هەبێت و لای خۆی بەجۆرێك پاساودراو بێت کە کەلتوورەکانی دی نەزانن، ئەی چۆن گفتوگۆ لە نێوان ئەم کەلتوورانەدا دادەمەزرێ؟

—لەو کۆمەڵگایانەدا کە نەریتی پلورالیزمی ئایینیان تیادایە و کاسۆلیکەکان و جوولەکە و پرۆتستانت و موسڵمان هەموو پێکەوە لە هەلومەرجێکی ئاشتیانەو عادیلانەدا دەژین" پرسیاری وا بەلایانەوە لە گۆڕێ نییە کە "کامیان مەعریفەیان هەیە"، بەڵکو زیاتر ئەو مەسەلە کۆمەڵایەتییە لە ئارادایە کە "چۆن دەتوانین پێکەوە بژین" و بەڕای من ئەم پرسیارە ڕێگایەکی راستە بۆ فۆرمەلە کردنی مەسەلەی پلورالیزم لەم کۆمەڵگایانەدا. بەم پێیە، ئەگەر کەسێك بڵێت "مەعریفە لای ئێمەیە و لای ئێوە نییە" و فەیلەسووفانیش بپرسن "ئایا بە راستی ئەوە مەعریفەیە؟"، ئەم شێوە گفتوگۆیە بە بۆچوونی من بە ڕێگایەکدا دەڕوات کە لە روانگەی فەلسەفییەوە سوودی بۆمان نابێت.

➢ فەلسەفەی وا هەیە کە هەر باوەڕیشیان بە بوونی مەعریفە نییە.

—بەڕای من ئەمە زۆر لە باسەکەی ئێمەوە دوورە. هاوکاریی کۆمەڵایەتی لە نێوان خەڵکدا پەیوەندیی بە بوونی بیروباوەڕی هاوبەش و قبووڵکردنی پاساو و ڕێگەچارەی هاوبەشی ئەم بیروباوەڕانەوە هەیە. ئێمە پێویستە لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ بکەین. ئەبێ پاساو بۆ یەکتر بهێنینەوە و یەکتر قەناعەت پێبکەین. بەڵام ئەم پاساو هێنانەوەیە بۆ کردارو بیروباوەڕەکان لە لایەن مرۆڤەکانەوە" جیاوازە لە نەریتی فەلسەفیانەی "گەڕان بە دوای حەقیقەت" و یان "بەدوای مەعریفەدا وێڵبوون". ئەویان بابەتێکە لە بواری گەیشتن بە تەباییەکی گشتیدا، لە پێناوی بەختەوەریدا لە کۆمەڵگادا.

➢ ئێوە خۆتان بە بۆرژوا – لیبراڵێکی رۆمانتیك دەزانن و باوەڕتان بە عەدالەتی کۆمەڵایەتی و ئازادی هاووڵاتیان هەیە و چەمکی سەرەکیش لە فەلسەفە کۆمەڵایەتیەکەی ئێوەدا چەمکی "پێکەوەبوون"ە. کاتێك دەڵێن "پێکەوەبوون" لە خۆیەوە دروست نابێت و لە ڕێی تەجەللاوە کەشف نابێت" بەڵکو دروست دەکرێ، ئایا مەبەستتان لەوەیە کە لەو شتەدا لەگەڵ سارتەردا یەکدەگرنەوە کە دەڵێت "مرۆڤ چ نییە ئەو شتە نەبێت کە خۆی دروستی دەکات"؟.

—سارتەر جەلاییکارییەکی زۆری ئەم بیرۆکەیەی کردووە. بەڵام کرۆکی ئەو شتەی کە ویستوویەتی بیڵێت" راستە. ئەفلاتوون و ڕێبازە ئایینیەکان دەڵێن کە ڕێگای پێکەوە بەستنەوەی ئادەمیزادەکان ئەوەیە کە بزانین خاڵی هاوبەش لە نێوانیاندا چییە. ئەو ڕێگایەش، یان ئەقڵانیەتە و یان ئەو راستییەی کە هەموو ئەو ئادەمیزادانە مەخلوقی یەك ئافەریدگارن. ڕێگای سارتەریش لەم میانەدا، واتە پێکەوە بەستنەوەی ئادەمیزادەکان، دۆزینەوەی ئەو لایەنانەیە کە قابیلی قبووڵکردنن لە نێوانیاندا و ئەفەرۆزکردنی ئەو کێشانەش کە لە سەرەتادا لەگەڵ یەکدا هەیانبووە.

➢ ئایا ئێوە باوەڕتان بە چەمکی "کەلەپووری هاوبەش" هەیە؟ ئایا ئەم چەمکە دەتوانێت سوود بەو شتە بگەیەنێت کە تۆ ناوت ناوە "پێکەوەبوون"؟

–تەواو وایە. بۆ ئەوروپاییەکان وا ئاسانترە کە لەگەڵ ئەوروپاییەکانی تردا گفتوگۆ بکەن، لەبەرئەوەی خاڵی هاوبەشی پێشینەی وایان هەیە کە دەکرێ پشتی پێ ببەستن و سوودی لێوەربگرن. لێکدانەوە پرۆتستانتی و کاسۆلیکیەکانیش بۆ دەقە پیرۆزەکان بۆ ئەم شتانە دەگەڕێنەوە. بەم پێیە، ئەمانە بۆ گفتوگۆکردن لەگەڵ یەکتردا پەنا دەبەنەوە بەر کۆمەڵێك خاڵی هاوبەشی پێشوویان. بەڵام بەلای ئەوروپاییەکانەوە گفتوگۆ لەگەڵ چینییەکان یان هندییەکاندا دژوارترە لە گفتوگۆ لەگەڵ ئەوروپاییەکانی تر و یان ئەمریکاییەکاندا.

➢ ئایا دەکرێ هونەر، ئەدەب و فەلسەفە" وەکو نیشانە و توخمی کەلەپووری هاوبەشی مرۆڤایەتی لەقەڵەم بدەین؟ من لەو بڕوایەدام کە موزارت ئەڵمانییەکی پەتی نییە، هەروەها ڤان گوگ، بە تەنها هۆڵەندی نییە، هەرچۆن جەلالەدینی رۆمیش بە تەنها موڵکی ئێرانیەکان نییە. ئەمانە وەکو بەشێك لە کەلتووری مرۆڤ" سەر بە هەموو مرۆڤەکانن.

–من بەو جۆرە بیرناکەمەوە. بە بۆچوونی من ئەمانە لە ڕووی کەلتورییەوە بە یەکترەوە بەستراونەتەوە. لەو بڕوایەدام پێداگرتن لەسەر ئەوەی شتێکی هاوبەش لە نێوان هەموو مرۆڤەکاندا بدۆزینەوە، ئەنجامەکەی نائومێدی دەبێت. لە کەلتووری چینیەکاندا کۆمەڵێك رەگەزی بێشومار هەیە کە من هەر نازانم چین و ناشزانم چۆن فێریان بم و کاریان پێبکەم. با نموونەیەکت بۆ بهێنمەوە. من کونفۆشیۆسم خوێندۆتەوە، بەڵام نازانم چۆن کەسێك دەتوانێ بیخوێنێتەوە و پەیڕەوی لێ بکات. هەڵبەت دەکرێ شتی وای تیا بدۆزینەوە کە بە بەشێك لە کەلەپووری هاوبەشی ئادەمیزادی لە قەڵەم بدەین. بەڵام ئەم ئاراستەیە بە هیچ کلۆجێك ئاسان نییە.

➢ فەیلەسووفی ئەڵمانی هانز یۆناس بەردەوام بەرپرسیارێتی بە هەڵوێستێکی ئاکاری زانیوە لە ئاست مەسەلە تێکشکاو و لاوازەکاندا. بۆ نموونە زەوی، کە ئێستا لە بەردەم ئەم هەموو لەوتان و تاقیکردنەوە ئەتۆمیانەدا بێدەسەلات و تێکشکاوە.

لە ئێستاشدا ئێمە لەبەردەم کەلەپوورێکی مرۆیی لاوازکراوداین کە پێویستی بە پشتیوانی و پاراستنە. بۆ نموونە شارگەلێکی وەکو فلۆرەنسا و ئیسفەهان و ڤینیسیا، یان کارە هونەرییەکانی مایکل ئەنجیلۆ" وەکو "پیتا" و "داڤید".

–بەڕای من تێکشکانی کاری هونەری شتێکەو تێکشکانی کەلتووریش شتێکی تر. لە راستیدا کەس نازانێ کە کەلتووری ژیارێکی ئاشتیخواز و جیهانی لە حوکمڕانیەکی فیدراڵدا چۆن دەبێت. بەڵام بە دڵنیاییەوە ئەم کەلتوورە گەلێ لە توخمەکانی خۆی لەدەست دەدات.

تۆش ناچار نیت لە ئایندەدا بەرپرسیارێتیی پاراستنی قەوارەیەکی زۆری توخمە کەلتووریەکان لە ئەستۆ بگریت، کەواتە گەلێ لە کارە هونەرییەکان و گەلێ کتێبیشت لەدەست دەچێت. ئەمانە وازیان لێدەهێنرێ و ئەمەش نرخێکە کە دەبێ لە پێناوی ئاشتی جیهانیدا بیدەین.

➢ پێدەچێت ئێوە سەبارەت بە ئایندەی مرۆڤ زۆر بەدبین بن؟

–زۆر چاکە. هەڵبەتە من ناڵێم کە لەوانەیە هەموومان لە کارەساتێکی ئەتۆمیدا بمرین. بەڵام لە لایەکی ترەوە وا بیردەکەمەوە کە حکومەتێکی جیهانی تاقە ئومێدێکە کە لەبەردەم مرۆڤایەتیدایە.

**➢ بۆ ئەم تاقە ئومێدەش، دەبێ گەلێ کەلتوور و زمان و نەریت لەناوبچن، پێدەچێت تا ئێستاش هەروا بووبێت.**

-بەڵێ، گەلێ ژیاری کۆن هەبوون کە ئێستا نیشانەیەکیشیان لێ نەماوەتەوە. گەلێ لە کەلتوورەکانی ئەفریقا بەبێ هیچ ئاسەوارێک فەوتان و تیاچوون. تا هەزار ساڵی دی، گەلێ لەو کەلتوورانەی کە ئێستا دەیانناسین، لەنێودەچن و ئاسەواریان نامێنێت.

**➢ بەڵام چۆن دەکرێ هەم باوەڕمان بە پلورالیزمی کەلتووری هەبێت و هەم لەو راستییەش بەئاگابین کە گەلێ لەم کەلتوورانە مەحکومن بە فەوتان؟**

-پلورالیزم تەنها بە مانای "پێکەوە بوون لەگەڵ خەڵکانێکدا کە دەبێ لەگەڵیاندا بیت" نەک بەو مانایەی کە "لەگەڵ هەر کەسێکدا و لە هەر شوێنێکدابیت". تۆ ناتوانیت لەگەڵ هیتلەر و ستالیندا بیت. ئاشڤایتس و گولاگ شوێنی پێکەوەبوون نین، بەڵکو دەبێ بۆ لەناوبردنی ئەوانە خەبات بکەیت.

**➢ من وایدەبینم کە جیهانی ڕوو لە بەجیهانیبوونی ئێمە لە رووی ئابووری و سیاسییەوە لە ژێر کۆنترۆڵی خۆرئاوادایە و ئەم پرۆسەی بەجیهانیبوونەش بەجۆرێک لە جۆران راپێچکردنی جیهانە بەرەو یەکتەرزییەکی لەبابەت ماکدۆناڵدو مایکرۆسۆفت و کۆکاکۆلا و گەلێ نیشانەی تری خۆرئاوا.**

-منیش دەڵێم کە تۆ تەواو راست دەکەیت، بەڵام بەڕای من یەکتەرزیی کەلتوری نرخێکە دەبێ بیدەین" ئەگەر بمانەوێ خۆمان لە کارەساتێکی ئەتۆمیدا نەفەوتێنین. ئەمە شتێکە مایەی شەرمە" بەڵام لە راستیدا من نازانم دەبێ چی بکەین. لەوانەیە سەد ساڵی تر هەموومان لە جیاتی کۆکا کۆلا" چا بخۆینەوە، لەبەرئەوەی ئەوکات چین دەبێتە دەسەڵاتی ئابووریی باڵادەست لە جیهاندا. کەلتووری ئەمریکایش لەناودەچێت. هەڵبەت من ئەم مەسەلەیەم بەلاوە گرنگ نییە. بەلای منەوە ئاشتی گرنگترە لەوەی بزانین کام کەلتوور باڵادەستە.

**➢ لەم حاڵەتەدا، لەم جیهانە شێتەی ئێمەدا چ شتێك ئارامی و ئومێدتان پێدەبەخشێت؟ سیاسەت یان شتێکی تر؟**

-لە دونیای سیاسەتدا شتێك نییە ئارام و بەختەوەرت بکات. ئەگەر ئەتەوێ خەیاڵت ئاسوودەبێت" بەڕای من دەبێ کونجێك بدۆزیتەوەو تەنها لەگەڵ ئەو کتێبانەدا بژیت کە لات خۆشەویستن.

**➢ ئەو کتێبانەی مایەی خۆشەویستی و ئومێدن لای ئێوە کامانەن؟ تۆڵستۆی؟ دۆستۆیڤسکی؟ یان پرۆست؟**

-پرۆست و نابۆکۆڤ.

**➢ بۆ ئایندە بەرنامەتان چییە؟**

-بەتەمام کتێبێکی دیکە بنووسم. بابەتەکەی دەربارەی جیاوازی نێوان فەلسەفەی شیکاری و ناشیکارییە. جگە لەمە، ئەمەوێ سەفەر بکەم و گەلێ لە وڵاتانی دونیا ببینم.

**➢ کەواتە بەڵکو بەختی ئەوەمان هەبێت لە ئێرانیش بتانبینین.**

-زۆرم پێخۆشە ئێران ببینم. تا ئێستا نەمدیوە. بەنیازم لە هاوینی ٢٠٠٣دا بێم بۆ ئێران.

## سەرچاوە

رۆژنامەی (همشهری) ژمارە ٢٨٢٠ و ٢٨٢١ی رۆژانی ٢٥ و ٢٦ی ئۆگەستی ٢٠٠٢.

# نامەوێ هاوسەرەکەم دیارییەکم پێشکەشبکاتو دواییش خیانەتم لێبکات

## -گفتوگۆیەك لەگەڵ نەوال ئەلسەعداوی-

سازدانی: ئەحمەد عەدنان

لە عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا


نەوال ئەلسەعداوی

ئاسوودەیی دەروونیی ئەم خانمە سەرسامیکردم. بێگومان، بێ گوێدانە ئەو هەراوهوریایەی بیروڕاکانی دەیخەنەوە، یەکێکە لە نیشانە دیارەکانی دیمەنی فیکریی عەرەبو ناکرێ هەروا بەخێرایی بەلایدا تێپەڕین، بەتایبەت ئەگەر لەبارەی مەسەلەکانی ژنانەوە بێینە قسە. گومانهەڵنەگریشە بەرهەمەکانی لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستیدا، بەتایبەتی لە حەفتاکاندا، لە ڕووی چەندایەتیو چۆنایەتییەوە هەنگاوی چاکیان ڕوەو ڕۆشنگەری هەڵهێناوە. بۆیە ئەگەرچی ئیمڕۆ ئێمە جیاوازیش بین لەگەڵیدا، بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ڕەتکردنەوە ئەو بەخشینە دەوڵەمەندەی گرێدراوی ناوی (نەوال سەعداوی)یە، لەبەر ئەم هۆکارەش گفتوگۆکردن لەتەکیدا تا دواسنوور هەراوهوریا هەلگرو وروژینەرە.

❖ با لە ڕووداوی ساتەوە دەستپێبکەین.. لەم ڕۆژانەدا کۆمەڵێك سیاسەتمەدارو ڕۆشنبیر، بە ڕابەرایەتی کوڕەزای خوالێخۆشبوو رائد (ئەحمەد لوتفی ئەلسەید)، خوازیاری دامەزراندنی حیزبێکی میسریی نوێن. گرنگترین خاڵەکانی داخوازییەکەیان وەلاوەنانی ئەو بەندانەی دەستوورە کە تایبەت بە ئایین، لەگەڵ دابڕینی میسر لە ڕەهەندە عەرەبییەکەی.. چۆن دەڕوانیتە ئەم ئاقارە؟

◻ من لایەنگری وەلاوەنانی ئەو بەندەی دەستورم کە تایبەتە بە ئایینو دەڵێت: "ئیسلام ئایینی ڕەسمی یان سەرەکی میسرە"، چونکە لەناوماندا قیبتیەکان هەن، هەروەها لەبەرئەوەی ئایین مەسەلەی نێوان بەندەو خواوەندی خۆیەتیو هیچ کەسێك بۆی نییە ئایینی خۆی، خودای خۆیو

شێوازی خواپەرستیی خۆی بەسەر خەڵکدا بسەپێنێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە من یەکێکم لە نەیارە سەرسەختەکانی دەوڵەتی ئایینی و پێموانییە خودا خۆی لە سیاسەت هەڵقورتێنێ.

❖ بەڵام قیبتیەکان زۆر بە بەختەوەری و مرۆڤانە لە باوەشی ئیسلامدا ژیانیان بردۆتەسەر، نەیاریت بۆچی دەگەڕێتەوە؟

▱ ئێمە ئەوەی نیشتمانێکین و هەموومان تیایدا شەریکین، بۆیە پێویست ناکات کەس لە باوەشی کەسدا بژی.

❖ کەواتە چۆن دەڕوانیتە ئەو گروپانەی ئیسلامی سیاسی کە خوازیاری ئەوەن میسر بەرەو ئیسلام بگەڕێتەوە، چونکە پێیانوایە میسر ئیسلامی یاخود ئایینی نییە؟

▱ وێڕای ئەوەی ئەو گروپانە توندڕەو و کۆنەپەرستن، ئەگەر دەوڵەتێکی ئایینی نییە، ئەوا باشتر و گونجاوترە، بێ درۆکردن لەگەڵ خۆ و ناکۆکبوون لەگەڵ خۆدا، لە بنچینەوە ئەو بەندەی دەستوور توڕدەین کە تایبەتە بە ئایین.

❖ لەلایەکی دیکەوە، تێبینیت چییە لەسەر بانگەوازی دابڕینی میسر لە ڕەهەندە عەرەبییەکەی، بەتایبەتی لەم کاتەدا؟

▱ پێویستە میسر پابەندی شوێنەوارو ڕۆڵی خۆی بێت لە هەردوو جیهانی عەرەبی و ئەفەریقیدا، بۆ ئەوەی بتوانین پارێزگاریی خۆمان بکەین. ئەوروپا یەکیگرت تا خۆی لە باڵادەستیی ئەمریکا بپارێزێ، ئێمەش پێویستە پاڵپشتێکی عەرەبی، ئەفریقی و ئاسیاییمان هەبێت بۆ پارێزگاریکردنی خۆمان. بۆ زانیاریی خۆت، یاسای حیزبەکان لە میسر دامەزراندن و پێکهێنانی حیزب یاساخدەکات، بۆیە بانگەوازی دامەزراندنی حیزب لەم کاتەدا مانای ئەوەیە لەلایەن ئەمریکاو ئیسرائیلەوە پشتگیریی لێدەکرێت، چونکە تەنیا ئەوان سوودمەندن لە پارچەپارچەبوونی عەرەب.

❖ لە دووتوێی قسەکانتا بۆنی "یەکگرتنی عەرەب" ناکەم، ڕۆژگارو ئەزموونەکانیش سەلماندویانە کە یەکگرتن بیرۆکەیەکی ئایدیالیستانەیە و سەرکەوتنی مەحاڵە.

▱ یەکگرتنی عەرەب تێکنەشکاوە، چونکە لە بنەڕەتدا یەکگرتنێك، تەنانەت لە ڕۆژگاری عەبدولناسریشدا، لەئارادانەبوە. هەروەها دەڵێن سۆسیالیزم شکستەیخواردوە، بەڵام من پێموایە شکستەی نەخواردوە، چونکە لە بنچینەدا نەهێنراوەتەدی.

❖ پێتوایە یەکگرتنی ئیسلامی شیاوبێت؟

▱ نەخێر.. من دژی ئەوەم ئایین لە دەوڵەت یان هاوپەیمانیەکان بئاڵێت.

❖ بەڵام خۆ ژیوارێکی ئیسلامی لەئارادابوو!

▱ ئەوە بەشێك بوو لە ژیوارێکی گشتی کە لەسەر بنچینەی ژیواری مەسیحیەکان، جولەکەکان و فیرعەونیەکان دامەزرابوو، چونکە ژیوارێکی بێگەرد لەئارادانییەو گشت ژیوارەکان تێکهەڵکێشن. بۆیە من دژی دابەشکردنی ژیوارەکانم بۆ خۆرهەڵاتی و خۆرئاوایی. ئێمە لە ژیوارێکدا ژیان دەبەینەسەر، ئەویش ژیواری سەرمایەداریی باوکسالاری چینایەتی ئایینیە، کە بەداخەوە ئایین وەك ئامرازێك بەکاردێنێ بۆ دەسەڵاتداریێتی.

## نوال سەعداوی!!

❖ هەموو ئەو خاڵانە دورودرێژتر بەسەردەکەینەوە کە لە دووتوێی گفتوگۆکەدا قسەت لەسەر کردون.. پشتئەستور بە ئاخاوتنەکەمان سەبارەت بە ئەحمەد لوتفی ئەلسەید، بۆچی میسر لە

بەرهەمهێنانی ئەو بیریارە مەزنانەی وەك خولێخۆشبوان: قاسم ئەمین، تاها حسەین و عەقاد کەوت کە دنیا و خەڵکیان سەرقاڵدەکرد. بەواتایەکی تر نەوال سەعداوی دەکەوێتە کوێوە؟

▱ من لە تاها حسەین گرنگترم. خولێخۆشبوو وەزیر بوو ڕۆڵێکی سیاسی و ڕۆشنبیریی ئاشتیخوازانەی بینی، منیش بێ ئەوەی وەزیربم ڕۆڵێکی ڕۆشنبیری، سیاسی و پزیشکیم گێڕاوە و بەرەنگاری حەرامکراوە ئایینیەکانیش بومەوەتەوە. تاها حسەین ئەمەی نەکرد. ڕاستە لێرەدا پێشڕەوێتی و دەستپێشکەری بۆ تاها حسەین نووسراوە، بەڵام مانای ئەوە نییە میسر لە خستنەوەی پێشڕەوەکان کەوتوە، کە من یەکێکیانم. جیاوازییەکە لێرەدا ئەوەیە، من لە دەسەڵاتدا نیم و مەرایی دەسەڵاتیش ناکەم. بۆیە دەبینی ئەم توێژە داهێنەرە بەدەست پەردەپۆشکردن و قەدەغەکردنەوە دەناڵێنن، ئەمەش بەداخەوە نەریتێکە شۆڕشی تەمموز دایهێنا، بۆیە دەشێ ڕەچاوی ئەوە بکەیت، ئەستێرەکانی سەردەمە جیاوازەکانی دوای شۆڕش بەپێی لێڕازیبوونی دەسەڵات نەك بەرهەمی فیکری و ڕۆشنبیری جیاوازبوون.

❖ ئەم پەردەپۆشکردن و قەدەغەکردنە لە بەرژەوەندیی کێدا بوە؟

▱ لە بەرژەوەندیی ئەو ڕژێمەی فەرمانڕەوابوە، جا ئەو ڕژێمە هەرچۆنێك بووبێت.. بۆیە بیریارەکان دەچەوسێنرێنەوە، ئەشکەنجەدەدرێن و بە دوورخستنەوەو کوشتن هەڕەشەیان لێدەکرێت. زۆرێك لە بیریارە پیاو و ژنەکان دووچاری ئەوە بوون، بەڵام توانیان خۆڕاگربن و بمێننەوە.. بەڵام تو بێیت و بڵێیت میسر پاش تاها حسەین و قاسم ئەمین کەسی تری نەخستۆتەوە، ئەوا من هاوڕات نیم، چونکە کتێبەکانی من ملیۆن جار لەوانەی قاسم ئەمین گرنگترن.

❖ قسەکانت سەبارەت بە پەیوەندیی نێوان دەسەڵات و ڕۆشنبیر ئەم پرسیارە تەقلیدی/ گرفتە دەخاتەڕوو: بۆچی پەیوەندیی نێوان ڕۆشنبیرو دەسەڵات پەیوەندیی سازان یاخود دژایەتیکردنە؟ ئایا دەروازەیەك یان ڕێگەیەك نییە بۆ دەربازبوون لەم هەتەریبوونە (حەدییەتە)؟

▱ گرانە.. لەسایەی فەرمانڕەواییەکی دیکتاتۆریدا کە دەچێت بەگژی میللەتدا، پێویستە ناڕەزابیت و بدەیتەپاڵ میللەت و خەڵك، بچیتە ڕیزی ئەوانەوە و دژی زۆرداری ڕاوەستیت. ئەمەش لە هەموو شوێنێکی دنیا ڕاستە. من لە زانکۆکانی ئەمریکا و ئینگلستان وانە و موحازەرە دەڵێمەوە، ئەنجامی ئەزموونی خۆم، پێموایە دیموکراسی نە لە ئەمریکا و نە لە ئینگلستان نییە. ئەوان لە ڕووی پەرلەمانەوە لە ئێمە پێشکەوتووترن، بەڵام هەڵەیە لەو بڕوایەدابین دیموکراسی هەڵبژاردن و پەرلەمان بێت. دیموکراسیی ڕاستەقینە ئەوەیە دەرفەت بۆ هەموو توێژەکانی خەڵك بڕەخسێت، بە هەموو توێژاڵ و ئاقارەکانەوە، توانای ڕێکخستنی سیاسی و بەشداریکردنیان هەبێت لە فەرمانڕەواییکردندا.

## پێکهاتن:

❖ بێگومان ئەو بیروڕا جیاوازانەی لێرەدا یاخود لە کتێبەکانتدا وەڕووتخستوون دەربڕی ئەزموونێکی جیاوازە، دەشێ بە کورتی باسێکی ئەو ئەزموونەمان بۆ بکەیت؟

▱ من خەڵکی گوندی میسرم و لە بنی کۆمەڵگەوە هاتووم و ڕێگەی خۆم بەرەو جیهان نەك تەنیا میسر بڕیوە، چونکە کتێبەکانم وەرگێڕراونەتە

سەر زیاتر لە (٣٠) زمانی دنیا. یەکەمین هۆکارێك کە کاریگـــەریی بەســـەر پێکهاتنمـــەوە هـــەبووە، خوالێخۆشـبوو بـاوکم بـوو. نـەنکی مـەزنم (دایکـی باوکم) کۆششیکردو لە ئەزهـەر و ماڵی زانستەکانو دادوەریی شـەرعی کوڕەکەی خستە بەر خوێنـدن تا بوە ئەزهەرییەکی خوێندەوار کە بڕوای بە یەکسانی نێـوان کـوڕ و کـچ هـەبوو، لـە هەنـدێك شـتی زۆر بچووکدا نـەبێت، هـەروەها بایەخیـدەدا بە فێرکردنـی هـەردوو توخمەکـە. ئـەو خـاوەنی ٩ کـوڕو کـچ بـوو و خوێنــدنی زانکـۆی بـە هــەموویان تــەواوکرد. مــن زیرەکترینیـان بـووم، بۆیـە زیـاتر هانیـدامو شـانازیی پێوە کردم. دایکم یـەکێك بوو لـە شۆڕشگێڕەکان کـە بەشداریی کاری نیشتمانی کـرد دژی ئینگلیزەکانو بــەهۆی ئــەوەوە زینــدانیکرا. بۆیــە بــاوکی، کــە سەربازکار بوو، لە قوتابخانە دەریهێناو دایە باوکم. ئەمــە بــەکورتی ئــەو ژینگەیــە بــوو کــە تیایــدا گــەورەبوومو بایــەخی بــە فێربــوون دەدا. ئــەوەبوو خوێندنی پزیشکیم تەواوکردو بوومە پزیشك. دوای ئـەوە لـە کۆمەڵگـە تێگەیشـتمو لێـی یـاخیبووم، لـە فێربوونی پزیشکی یاخیبوومو داوای گۆڕینیم کرد.. لێـرەدا ڕەچـاوی ئـەوە دەکرێـت کـە یـاخیبوونم لـە شـتەکان بەرهـەمی تێگەیشـتنو ئـەزموونی خۆمـە، چونکە بێ هۆشیاربوون بەرامبەر بە شتێكو ناسینی کەموکوڕییـەکانی، نـاکرێ لایەنـە خراپـەکانی شتەکە بدۆزیتەوە. بەکورتی، لە ژینگـەو خێـزانو فێربوونـدا بەختـداربووم، ئەگـەر نـاڕەزایی خـۆمو پشـتگیریی دایکم نەبوایە لە تەمەنی دە ساڵیدا دەیاندامە شوو.

❖ گرنگترین ئەو بیریارانە کێن کە کاریگـەریان لەسەرت هەبووە؟

◻ ئەوانە زۆرن، چونکە من بە زمانی عەرەبیو فەڕەنسیو ئینگلیـزی دمخوێنـدەوە. دێتـەوە یـادم لـە سـەردەمی هەرزەکاریـدا کاریگـەریی بیرەوەرییـەکانی تاهـا حسـەین (ڕۆژەکـان)م لەسـەر بـوو، بـەڵام ئیمـڕۆ ئێمـە بەچـەندین قۆنـاغ ئـەو نەوەیـەمان جێهێشـتوە، تەنانــەت قاســم ئــەمینو هــودا ئەلشــەعراویش، کتێبــەکانم کــەلێنێکی فراوانیــان خســتۆتە نێــوان خۆیانو ئەوانەوە.

❖ بێگومـان نابـێ ئـەو هەلومەرجـە کاتـدارە پشتگوێبخەین کە تیایدا دەژیان.

◻ بێگومان ئەوان پێشڕەوبوون، بـەڵام ئیمـڕۆ ئێمە پێشڕەوین.

❖ لەلایەکـەوە بەشـێوەیەکی پۆزەتیڤانــە لــە گفتوگــۆو کتێبەکانتــدا باســی باوکــت دەکــەیت، لەلایـەکی دیکـەوە هەمیشـە زللـەی یـەك لـەدوای یـەك لـەو دامـەزراوە دەدەیـت کـە ئینتیمـای بـۆی هـەبوو (ئەزهەر)، ئایا لەمەدا جۆرێك ناکۆکی بەدیناکرێت؟

◻ لـە بنچینەدا باوکم یاخیبوو لـە ئەزهـەر و وەزارەتــی مــەعاریفو پێکــدادانی زۆری هــەبوو لەگەڵیاندا، بۆیە بۆ ماوەی دە ساڵ دوریانخستەوە بۆ (منوف)، لەبەرئەوە جێی سەرسوڕمان نییە ئەوەی لە ئەزهەر و دامەزراوی باوکسالاری یاخیبووبێ کەسێك بخاتەوە دژی هەردووکیان ڕابێت.

## پسپۆڕی:

❖ لـــە دواکتێبەکەتـــدا "تێکشـــکاندنی سنوورەکان" دەربارەی ئایین، ڕۆشنبیری، داهێنانو سیاسـەت نووسـیوتە، ئایـا ئـەم (پەلهاویشـتنە) لـە ڕۆژگـاری پسـپۆڕبووندا نابێتـە هـۆی لـە دەسـتدانی ڕاســـتبێژیو جووڵــەکردن لــەنێوان تــەفرەدانو هەمووشت زانیندا؟

◻ نـەخێر! ئەمـە ڕاسـت نییـە. چـونکە ئێمـە لەسـەر کلکـی ئـەو جیهانـەین کـە ڕووەو داهێنـانو جوانکـاری قەڵـەمبازدەدات، بــەڵام بــە ڕەتکردنـــی پسپۆڕی. ئیمڕۆ کۆلیـژە پزیشـکیە پێشـکەوتووەکان ئـەدەبو مێـژوو و مۆسـیقا دەخـوێنن. بـۆ نموونـە،

ڕۆمانەکانی من لە کۆلیژەکانی پزیشکی لە ئەمریکا دەخوێنرێن. مەبەست ئەوەیە خوێندکاری کۆلیژی پزیشکی ڕۆشنبیرێکی مۆسیقی، ئەدەبی، مێژوویی و سیاسی بێت و زانستی (گەردوونی) پسپۆڕی زانستەکان تێکدەشکێنێ و پێویستە مرۆڤ لە سەرەتادا پسپۆڕی بوارێك بێت، بەڵام پاشتر لە زانستەکانی تردا قوڵبێتەوە، هەتا بتوانێ جیهانبینی گشتی و هەمەلایەنی پشکنێرو چارەسەرکاری مەسەلەکان بەدەستبێنێ.

❖ لە ڕوانگەی زۆرێکەوە ئاخاوتن سەبارەت بە ئایین، بەهۆی هەستیارییەوە، هەندێ تایبەتمەندی خۆی هەیە، وانییە؟

▱ نەخێر! دەشێ بخوێنم و بتوانم لە خوالێخۆشبوو شێخ شەعراوی زاناتربم و لەو زیاتر شارەزای قورئان بم. من دیراسەی ئایینەکانم کردوەو بەراوردی قورئان و تەورات و ئینجیلم کردوە، کەچی ئەو نەیکردوە، ئەو لە قورئانێکدا شارەزابوو کە بێ بەراوردکردنی بە کتێبەکانی دیکە مەحاڵە لێی تێبگەیت، چونکە زانست بە بەراوردکردن و ئەزموون و تاقیکردنەوە دەستپێدەکات.

❖ بەم جۆرە ئێمە زانستەکان دەتوێنینەوە، بۆیە زاناکان هیچ بایەخێکیان نابێت؟

▱ من وام نەوتوە، من پسپۆڕیم ڕەتنەکردۆتەوە. با نموونەیەك بهێنمەوە بۆ ڕوونکردنەوەی بیرۆکەکەم. کەسێك هەیە پیسپۆڕە لە نەشتەرگەری و چارەسەرکردنی نەخۆشیەکانی دڵدا، پێویستە ئەم کەسە مۆسیقا بخوێنێ، لەوەش تێبگات دڵ چۆن نەخۆشدەکەوێ. دڵ لەناو جەستەیەکدایە کە لە کۆمەڵگەدا جێگیرە، کۆمەڵگەش کار لەو جەستەیە دەکات کە دڵی تێدا جێگیرە. بۆیە ئەگەر کەسەکە، پێش تێگەیشتن لە جەستە، لە کۆمەڵگە تێنەگەیشتبێ، ئەوا ناتوانێ چارەسەری نەخۆشیی دڵ بکات. من پزیشکێکی دەروونیم، پاش تاوتوێکردنی کۆمەڵگە جەستەو دەروونم تاوتوێکردوە، چونکە نەخۆشییە دەروونیەکان لە ژێر کاریگەریی نەخۆشییە سیاسی، کولتووری، ئابووری و کۆمەڵایەتیەکاندایە، بۆیە بێ قوڵبوونەوەو فرەلایەنکردنی خوێندنەوەکان ناتوانم هیچ چارەسەربکەم. پزیشك سوودی چییە ئەگەر لە ئەلف وبێی کۆمەڵگەکەی خۆی تێنەگات؟ هیچ سوودێکی نییە! پزیشك چ سوودێکی هەیە ئەگەر لە سیاسەت و ئابووری تێنەگات؟ بەهەمان شێوە هیچ سوودێکی نییە! ئەو "هەمووشت زانین"ەش کە باسیدەکەیت هیچ شتێکی نەخوێندوە، هیچ کارێك ئەنجام نادات و قبوڵکراویش نییە، بەڵام پسپۆڕبوون لە زانستێکداو ئاگاداربوون و ڕۆشنبیربوون و قاڵبوون لە زانستەکانی دیکە، ئەمە ئەوەیە کە بانگەشەی بۆ دەکەم و کاری پێدەکەم. بۆچی لە زانکۆکانی ئەمریکا کاردەکەم و پارەی زیاتر لەسەر موحازەرەکانم وەردەگرم؟ چونکە وانە "داهێنان و یاخیبوون" دەڵێمەوە. ئەمەش ئەو بابەتەیە کە لە زانکۆ عەرەبییەکاندا بوونی نییە. زۆرجار پێیاندەڵێم: خۆزگە گەنجەکانی میسرو جیهانی عەرەب وەك ئێوە گوێیان لێم دەبوو. من لە هەموو زانکۆیەکی عەرەبی وانە ناڵێمەوە، چونکە بە پسپۆڕبوون تاوانبارمدەکەن، کەچی لەوێ کاتێك گوێ لەوە دەگرن کە دەیڵێم و دەیڵێمەوە، پارەی زیاترم دەدەنێ. ئەمەش نیشانەیەکی دیاری ئەوەیە کە بەزینی فیکریمان بەزینی سیاسی و ئابووریمانی بەرهەمهێناوە.

❖ ئایا حەقیقەتەکە ئەمەیە.. ئێمە لەڕوی فیکرییەوە بەزیوین؟

▱ بەڵێ، چونکە ئێمە داهێنەرمان نییە. هەمیشە پەیوەندییەك لەنێوان داهێنان و یاخیبوون،

داهێنانو ناڕەزاییبووندا هەیە، کەچی ئێمە لەنێو ترسدا لەدایکدەبینو دەژینو دەمرین. بۆیە نە یاخیبوونو نە ناڕەزاییبوون لای ئێمە بوونی نییە.. ئێمە هەمیشە ڕازیو ڕازین!

❖ کەواتە تەنگوچەڵەمەکەمان سیاسییە نەك کولتووری؟

▱ نەخێر.. تەنگوچەڵەمەکەمان سیاسیو کولتووریشە. من سیاسەت، ئابووری، کولتوور، ژنو ڕەگەز لێك جیاناکەمەوەو هەموو گرێدراوی یەکن، کاتێك کۆڵەکەیەك هەرەسدێنێ، بیناکە بەگشتی دادەڕمێ.

## ئەلسادات:

❖ بۆچی خولێخۆشبوو ئەنوەر ئەلسادات: "پاڵەوانی جەنگو ئاشتی"، لای تۆ لوتکەی هەرەسهێنانی کۆڵەکەی سیاسییە؟

▱ دەخوازم سەرەتا هێما بۆ ئەوە بکەم کە من نە لایەنگری عەبدولناسرمو نە غەدر لە ئەلسادات دەکەم، بەڵام شادمانبووم بەو گۆڕانکاریانەی عەبدولناسر لە ماوەی فەرمانڕەوایی خۆیدا هێنانیەئاراوە، دیارترینیان: نەهێشتنی جیاوازیی نێوان چینەکان، یەکسانی، هاندانی کاری کرێگرتەی ژنانو بەرەنگاربوونەوەی ئیمپریالیزمی خۆرئاوایی کە ئەوکاتە لە لەخۆباییبوونی بەریتانیو ئەمریکیدا خۆی دەبینییەوە. ئەمەش هانی خۆرئاوای دا پیلان لە دژی سازکەنو هەرەسی پێ بهێنن. لێرەشدا سیاسەتی ناوخۆی عەبدولناسر، کە لەسەر بنچینەی سەرکوتکردن نەك گفتوگۆ دامەزرابوو، یاریدەدەری ئەوە بوو. ئەمانەش، وێڕای گەندەڵیی عەبدولحەکیم عامر و دارودەستەکەی، گەورەترین خەوشیو هەڵەکانی ئەو بوون.

❖ پێتوانییە ئەگەر عەبدولناسر تاکو ئیمڕۆ بمایە ئەوا زۆر جیاوازیی نەدەبوو لەگەڵ سەدام حسەینی سەرۆکی هەڵکەنراوی عیراقدا؟

▱ ناکرێ سەدامو عەبدولناسر پێك یەکسانکرێن، چونکە سەدام ئەگەرچی کاری مەزنی زۆری بۆ عیراق ئەنجامداوە، بەڵام پیاوکوژبوو، لەکاتێکدا عەبدولناسر وانەبوو.

❖ ئەی زیندانو بەندیخانەکان کە بۆ ئیخوانو نەیارەکانی کرانەوە؟

▱ شەریف حەتاتەی هاوسەرم لە سەردەمی عەبدولناسردا دە ساڵ زیندانیکرا، کەچی بێ ڕووشان هاتەدەرێ. عەبدولناسر وەك سەدام خوێناوی نەبوو. لێرەشدا ئەگەرچی من دژی جەنگی کەنداو بووم، بەڵام پێموایە جۆرج بووشی باوكو کوڕ لە سەدام حسەین خوێناویترن.

❖ بۆچی بەلای تۆوە ئەلسادات لوتکەی هەرەسهێنانەو سمبولی ڕێنسانس نییە، ئەی ئەو نەبوو سینای ڕزگارکرد؟

▱ نەخێر ڕزگارینەکرد، ئەگەر کردبێتیشی بە چ نرخێك ئەنجامیداوە؟ بە فرۆشتنی مەسەلەی عەرەبو لەناوبردنی جامیعەی عەرەبی!! بۆیە لە بری ئەوەی پێمان بڵێن "نیشتیمانی عەرەب"، پێماندەڵێن "خۆرهەڵاتی ناوەڕاست".

❖ لایەنەکانی مەسەلەکە خۆزگەدەخوازن لایەنگری ئەنوەر ئەلسادات بوونایە، بۆچی ئەوەندە دڵڕەقی بەرامبەری؟

▱ ئەمە نەفامییەکی سیاسیی مەترسیدارەو ڕیاکارانەیە بۆ ئەلسادات، چونکە سەردەمی ئیمڕۆ درێژکراوەی سەردەمی ئەلساداتە.

❖ (ئەلسادات) محەمەد حەسەنین هەیکەلی گرت، کاتێك کە بەربوو "پاییزی توڕەیی" نووسی، پێموایە هێرشبردنی سەرسەختانەت بۆ سەر

ئەلسادات بۆ هەمان کێشە بگەڕێتەوە، چونکە لە سەردەمی ئەودا زیندانیکرایت.. ئایا لایەنێکی ڕاستی لەمەدا نییە؟

▱ کێشەیەکی شەخسی لە نێوان منو ئەلسادات یان ئەلموبارەك یاخود عەبدولناسردا نەبوە کە لەسەردەمی ئەویشدا چەوسێنراومەتەوە. من لە هەموو سەردەمەکاندا چەوساوەبووم، چونکە هەمیشە لایەنگری میللەت بووم نەك فەرمانڕەواکان.

❖ ئەلسادات یەکەمین کەس بوو تۆوی دیموکراسی لە میسر و تەنانەت جیهانی عەرەبیشدا چاند، ئایا ئەمەی بۆ حسێبناکرێت؟

▱ ئەمە شاخدارترین درۆیە لە ژیانمدا بیستبێتم. گرنگ نییە بڕیارێکی کۆماری سەبارەت بە فرەحیزبی دەرکرد، ئەنجامەکەی چی بوو؟ ئەو حیزبانەی لای خۆمان حیزبی ڕاستەقینە نین، بەڵکو حیزبی کارتۆنین، چونکە حیزبی ڕاستەقینە بەرهەمی دیموکراسییەو لە ناخی کۆمەڵگەوە سەردەردێنێ نەك لە کۆشکەکانی سەرکردایەتیەوە. ئایا داخستنی کۆمەڵکەمان ساڵی ١٩٩٠ لەبەر دژایەتیکردنمان بۆ جەنگی کەنداو دیموکراسییە؟ دوو ڕووداو زەبریان لە جیهانی عەرەب وەشاند: کامپ دێڤیدی ئەلساداتو جەنگی کەنداو، ئەنجامی ئەو دوانە ئێمە ئیمڕۆ لە زەلکاودا دەژین. ئەگەر ئاگاداری دیمەنی کێشەی فەڵەستینی بیت، بۆت دەردەکەوێ ڕژێمەکانی عەرەب لە ئەمریکا دەپارێنەوە خۆ لە مەسەلەکە هەڵقورتێنێ.. ئەمە چ ئابڕوچوونێکە بۆ میللەتەکانمان؟

❖ پێدەچێ دژی ئەو گوتەیە بیت کە دەڵێت عەرەبەکان دژی خۆیان کاردەکەن، ئەگەرچی ڕۆژگار هەمیشە ئەو گوتەیەی دووپاتکردۆتەوە؟

▱ پێویستە میللەتەکانو ڕژێمەکانی جیهانی عەرەب لێك جیابکەینەوە. زۆرداری عەرەب هەمیشە بەکرێگیراوی کۆڵۆنیالیزمی بەریتانیو ئینجا ئەمریکیو ئیسرائیل بوە، تەنیا کەسێك کە تۆزێك لەم دەستورە ڕیزپەڕبووبێ جەمال عەبدولناسر بوو.

❖ ئەویش وەك ئەوانی دیکە یارمەتی لە ئەمریکا وەردەگرت، بۆچی لەوانی دیکەی جیابکەینەوە؟

▱ ڕاست نییە.. ئەمە تەنیا لە سەردەمی ئەلساداتدا ڕوویدا. ئەمریکا چوو بەگژی عەبدولناسردا، چونکە سازشەکەی ئەوی بۆ پشتگیریکردنی دارایی سەدی عالی ڕەتکردەوە، سەروەری بەفیڕۆنەدا، کەناڵی سوێسی ڕزگارکردو چوو بۆ ڕوسیا، ئەنجامی ئەمەش بە کۆمۆنیست بوون تاوانبارکرا. ئەو یارمەتیە/ئابڕوچوونەی باسیدەکەیت بە هەزاران قات بۆ ئەمریکا دەگەڕێتەوە. ئەم وێناکردنە چەوتانە بەرهەمی سروشتیی سەرلێشێواندنی سیاسیو ڕۆژنامەگەرەکانی میللەتە عەرەبیەکانە.

❖ کەواتە لە دۆخی سیاسیدا سێ گرفت بەدیدەکرێت: چەوسێنەر- ئیسرائیل - پاشکۆیەتی ئەمریکا، ئایا پەیوەندییەك لەنێوان "چەوسێنەر" و ئیسرائیلدا بەدیدەکەیت؟

▱ بەڵێ.. ئێمە لە جیهانێکداو لەسەر شێوازی شەیپوور (هرم) ژیان دەبەینەسەر کە دەستەیەك خاوەن پارەو کالا لە ئەمریکا جڵەویدەکەن، ئیسرائیل دەستەڕاستی وڵاتە یەکگرتووەکانو کۆمپانیا فرەڕەگەزەکانە لە ناوچەکەدا، سیاسەتی نێونەتەوەییش کاریگەریی لەسەر سیاسەتی ناوچەیی هەیەو ئەمەش کاریگەریی لەسەر سیاسەتی ناوخۆ هەیە کە کاردەکاتە سەر خێزان.. زۆرداری عەرەبیش دەستکردی سیاسەتی نێونەتەوەییەوەو لەلایەن ئەویشەوە پارێزگاریدەکرێت، بۆ نموونە (ئەلسادات) لەلایەن

ئەمریکاوە دەپاریزرا، بەڵام کاتێک هەموو ئامانجەکانی ئەمریکا هێناتنەدی، دەستی لە پاراستنی هەڵگرت‌و کوژرا، ئەوەی ئەلسادات دەشێ بۆ کەسانی دیکەش ڕاست بێت.

## گاڵتەجاڕی:

❖ پڕۆژەکەی دەستپێشکەرەکەی پاوڵ‌و ئەوانی دیکە سەبارەت بە هاوردن‌و چەسپاندنی دیموکراسی لە ناوچەی عەرەبدا چۆن لێکدەدەیتەوە؟

▱ دەشێ بڵێیت گاڵتەجاڕییە.

❖ چۆن؟

▱ ئایا دەبێ هەمیشە خەریکی سواڵکردنی هەمووشتێك بین لە خۆرئاوا؟ ئەمریکا هەموو کێشەکانی ئێمە چارەسەرناکات‌و کۆلن پاوڵ‌و کۆندالیزا رایس دیموکراسی بۆ ئێمە ناهێنن.

❖ بەڵام لەکاتی ڕووخانی ڕژێمی جەوروستەم لە بەغدا گۆڕانکاریی چاك لە جیهانی عەرەبدا ڕوویانداوە کە ناکرێ پشتگوێخرێن، ئەمە چۆن لێکدەدەیتەوە؟

▱ تورەهاتە، ئەوانە هەموو دەرزی بێهۆشکەرن. پێتوایە داگیرکردنی ئەمریکی بۆ عێراق دیموکراسی دەستەبەربکات؟

❖ من تەنیا ڕۆژنامەنووسێکی بێلایەنم کە پرسیار دەخەمەڕوو.. ئایا بووژاندنەوەی ئابووری‌و سیاسی لە یابان‌و ئەڵمانیا بە ڕووخاندنی ڕژێمە دیکتاتۆرییەکان لەسەر دەستی ئەمریکا دەستیپێنەکرد؟

▱ نەخێر! تۆ مێژوو ئاوەژوودەکەیتەوەو لایەنگری داگیرکردنیت، هیچ میللەتێك یان دەوڵەتێك لەسایەی داگیرکردندا دیموکراسی جێگیرناکات. لۆژیکێك لەئارادایە کە نابێ ڕەتیبکەینەوە: چۆن دیموکراسی لەسەر دەستی ئەمریکییەکان دێتەدی، کاتێك هاتنە ناو عێراقەوە یەکسەر دەستیانگرت بەسەر داهاتەکانی نەوتدا، ئینجا بەسەر خودی نەوتەکەدا؟

❖ بەڵام لە هەموو بارێکداو دوائەنجام نەوت دەگاتە ئەمریکا؟

▱ ڕاست نییە.. پێشبڕکێی فەڕەنساو ئەڵمانیاو ڕوسیا لەیادمەکە" ئەوانەی لە ئەنجومەنی ئاسایشدا پاڵەوانبازیان نواند، نەك لەبەر چاوی کاڵی عێراق، بەڵکو لەبەر کانە نەوتەکان کە بوونەتە لانەی ئەو کۆمپانیا ئەمریکیانەی دەرگایان بەڕووی هەموو کۆمپانیا ئەورووپییەکاندا داخستوە. واتە دەردەکەوێت لە سەرەتاوە تاکو کۆتایی ململانێکە لەپێناو نەوتدا بوەو دەبێت.

❖ کێشەی دوایی عێراق ڕۆشنبیرانی عەرەبی ڕووبەڕووی گرفتێك کردۆتەوە، ئەویش ئەمەیە: ئەگەر دژی داگیرکردن نەبێت ئەوا لایەنگری زۆرداریيەو بەپێچەوانەشەوە. ڕۆشنبیری عەرەب چۆن دەتوانێ لەم کێشەیە قوتاریبێت؟

▱ لێرەدا ناکۆکییەك بەدیناکرێت‌و کێشەکەش ساختەکارانەیە، چونکە سەدام بەکرێگیراوی ئەمریکا بوو و لەسەر مەسەلەی بچووك لە داگیرکردنی کوەیتدا لەگەڵ ئەمریکا ناکۆك بوو، ئەمەش بەپلانی خودی ئەمریکا پەیوەندیی نێوانیانی لەناوبرد. کۆبوونەوەکەی سەدام لەگەڵ خانمی باڵوێزی ئەمریکا بەر لە جەنگ دێتەوە یادمان. ئەمەش نیشانەیەکی گرنگی ئەوەیە کە دیکتاتۆرەکان هەمیشە گەمژەن. ئەوە ئەمریکایە زۆردارەکان بەرهەمدێنێ‌و دەیانپارێزێ‌و کاتێك دەستبەرداریان دەبێت کۆتاییان پێ دێت. بۆیە ئەو کێشەیەش کە باسیدەکەیت دەستکردە، بۆ ئەوەیە ڕۆشنبیرەکان بێدەنگبن لەترسی ئەوەی بە لایەنگری سەدام دانەنرێن. من نە لەگەڵ سەدامم و نە لەگەڵ

ئەمریكا، من لەگەڵ میللەتی عێراقم كە ڕۆژانە دەمرێت، جا لەسەر دەستی زۆرداری بێت یاخود داگیركردن.

❖ نەوال ئەلسەعداوی لەلایەكەوە هێرشدەباتە سەر زۆرداریو كۆنەپەرستی لە جیهانی عەرەبدا، لەلایەكی تریشەوە هێرشدەكاتە سەر مۆدێلی خۆرئاوایی، ئەمەش سەرەگێژەی بۆ وەرگر دروستكردوە سەبارەت بەوەی نەوال ئەلسەعداوی چی گەرەكە؟

□ ئایا هەڵبژاردنەكە تەنیا لەنێوان زۆرداریی ناوخۆ و كۆڵۆنیالیزمی سەرمایەداریانەی خۆرئاوادایە؟ من ئازادیی خەڵكو میللەتم گەرەكە. بڕوانە نموونەكەی كاسترۆ لە كوبا كە دەوڵەتێكی بچووكی نزیكەدەستی ئەمریكایە، ئەو نە لەگەڵ زۆرداریدایە نە لەگەڵ كۆڵۆنیالیزمدا، وێڕای ئەو پڕوپاگەندەیەی لە دژی دەكرێتو ئەو هەوڵانەی بۆ تیرۆركردنی دەدرێن، میللەت بەردەوام دەوریانداوە. ئەمە بەڵگەی ئەوەیە دەكرێ كۆڵۆنیالیزمی دەرەكیو زۆرداری ناوەكیش ڕەتبكەیتەوە. ئەمریكاش هەركاتێك دووبارەبوونەوەی ئەم مۆدێلەی لە ئاسیا و ئەفریقا بەدیكردبێت، كۆششیكردوە بۆ ڕووخاندنی. بۆیە دەشێ بڵێین عەبدولناسر كوژرا.

❖ پێدەچێت دكتۆر ڕەتكردنەوەی تاوانی "ناسڕیبوون" سەبارەت بە تۆ كارێكی ئاسان نەبێت؟

□ ئەمە ئەو بیركردنەوە ئایینیەیە كە ڕەتیدەكەمەوەو تەنیا ڕەشو سپی دەبینێ پێیوایە عبدولناسڕ یان پادشایە یاخود ئەهریمەنە. من دژی دابەشكردنی خەڵكم بۆ فریشەو ئەهریمەنەكان. عەبدولناسڕ نیشتمانپەروەرێك بوو هەوڵیدا گەشە بە كۆمەڵگەكەی خۆی بدات، ئەو مرۆڤێكی دەستپاك بوو مانگانە وەك ئەلسادات موچەی لە ئەمریكا وەرنەدەگرت. خەوشیی عەبدولناسڕ ئەوەبوو دیكتاتۆر بوو. بێگومان چۆن چەپڵە بەیەك دەست لێنادرێ، ئاواش تاكەكەسێك ناتوانێ شتێك ئەنجامبدات. لەسەردەمی عەبدولناسڕدا داوای گۆڕانكاریمان كرد، بەڵام لەلایەن داروودەستەكەیەوە چەوسێنراینەوەو ئەویش لە خەڵك دابڕێنرا. هەرگیز عەبدولناسڕ وەك ئەلسادات نەبوو، چونكە ئەلسادات دەرگای بۆ ئاقار ئیسلامیە خستە سەر گازی پشت، بەڵام عەبدولناسڕ سووربوو لەسەر بەربەرەكانیكردنو لەناوبردنیان.

❖ ئایا ئەو ئاقار ئیسلامیانە مافی ئەوەیان نییە فەرمانڕەوایی بگرنەدەست.. ئەی ئەمە دیموكراسی نییە؟

□ نەخێر مافی ئەوەیان نییە، چونكە ئەوانە پیاوكوژو خوێنڕێژنو ناوی منو زۆرێك لە ڕۆشنبیرانو بیریارانی بەشەرەفو دڵسۆزیان خستۆتە ناو لیستی كوشتنەوە. ئەگەر چاوێكیش بە تاوانەكانیاندا بخشێنینەوە، ئەوا لە ژماردن نایەن. گەر تێڕوانینی من لەگەڵ هی تۆدا جیاوازبێت، ئەوە بەهانەی كوشتنم ناداتەدەستەوە، دەتوانی بە فەرامۆشكردنو وەڵامدانەوە مامەڵەم لەگەڵ بكەیت، نەك بە خوێنڕشتنو بەكافركردنم، وەك ئەو گروپانە دەیكەن. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە من دژی دەوڵەتی ئایینیم. پێویستە (خودا)ی خۆمان لە سیاسەت بەدووربگرین، چونكە ناتوانم بكەومە ئاخاوتن لەتەكیداو ناشتوانم دژی بوەستمەوە. من ئامادەم ڕێزی ئەو خودایە بگرم كە دەیخوازیتو بەرژەوەندیو داواكارییەكانت دێنێتەدی، بەڵام مەیسەپێنە بەسەر من یاخود دەوڵەتدا، چونكە هاوڵاتیەكان وێڕای جیاوازیی باری داراییو توێژی كۆمەڵایەتیو ئینتیمای ئایینیان لە دەوڵەتدا یەكسانن. بۆ دەبێ من وەك ژنێك مافی هاوڵاتیبوونم كەمتربێت لە پیاو، تەنیا لەبەر ئەوەی ئایینی ڕەسمی

ئیسلامە؟ بۆچی پیاو مافی ئەوەی هەیە چوار ژن بهێنێو من هەمان مافم نییە؟ ئەمە سوکایەتی پێکردنمە.

## هاوسەرێتی:

❖ ئەمە مافی پیاوە!

▱ کێ ئەم مافەی پێ بەخشیوە؟

❖ قورئان!

▱ من دیراسەی قورئانم کردوەو دادپەروەریی کردۆتە مەرجێكو وتویەتی "دادپەروەرنابن". پێموایە هیچ شتێك هێندە ڕوون نییە. پیاوان بەپێی بەرژەوەندیی خۆیان بانگەشەدەکەنو بەزمانی قورئانەوە درۆدەکەنو دەڵێن داخوازی فرەژنی بووە. چۆن پیاو دەتوانی چەند ژنێك بهێنێت؟ ئەمە گەندەڵیی ئەخلاقیو ناوزڕاندنی قورئانو ئیسلامە! چۆن پیاو دەتوانێ لە پێخەفی ژنێکەوە بچێتە ناو پێخەفی ژنێکی دیکەوە! "برام"! سوێندەخۆم ئەگەر مێردەکەم چووە لای ژنێکی دیکە ئەوا دەریدەکەم. ئایا پیاو ڕازییە بەوەی ژنەکەی پێخەفی پیاوی جۆربەجۆر بگۆڕێت؟ نەخێرو بێگومان ئەویش ژنەکەی خۆی دەردەکات. منیش کەرامەتم هەمان کردارو پەرچەکردا دەسەپێنی بەسەرمدا. تونسو هەندێ دەوڵەتی ئیسلامی فرەژنیان ڕەتکردەوەتەوە، ئایا ئەم دەوڵەتانە بەکافردەکرێن؟ فرەژنی نیشانەی ئابڕوچوونە بە ناوچەوانی عەرەبەوەو هەر دەوڵەتێك ڕێگە بەم جۆرە کارە بداتو بۆ ئەمەش پەنا بە یاسا بەرێت، ئەوا یاساکە بۆگەنو نائەخلاقیانەیە.

❖ ڕێگەم پێبدە عەبای ئیسلامی بدەم بەسەر شانمداو پێت بڵێم پێغەمبەر (د.خ) نۆ ژنی هێنابوو، هەندێك لە سەحابەکانی پاش ئەویش تا دوا سنووری ڕێگەپێدراو ژنیان هەبوو!

▱ بۆچی تۆ وەك پێغەمبەر دەکەیت، لەکاتێکدا ئەو داوای لێنەکردویت وەك ئەو بکەیت؟ وەك لە حەدیسێکدا هاتوە، جارێك یەکێك لە ژنەکانی لەناو پێخەفەکەی خۆیدا ژنێکی تری لەگەڵدا بینیوە، بۆیە نارەزایی دەربڕیوەو وتویەتی: "لە شەوە نۆرەی منو لەناو پێخەفی مندا ئەی پێغەمبەری خودا؟!" ئەویش دوای پەشیمانیو پەندوەرگرتن "بێدەنگبەو باسی مەکە، هەرگیز دووبارەیناکەمەوە"، چونکە ئەو پێغەمبەری خودایەو دەبێ نموونەی دادپەروەری بێتو ئەو کارە ئەویش کردویەتی ناکۆکە لەگەڵ دادپەروەریدا (ئەو حەدیسە لە "الطبقات الکبری"دا هاتوە). ئەگەر مەحمەدی پێغەمبەر هەڵەیکردبێ، چونکە مرۆڤ بووەو مرۆڤیش هەڵەدەکاتو ڕاستیش دەپێکێ، بۆ داوام لێدەکەیت لە هەڵەکردندا شوێن پێی ئەو هەڵبگرم. جارێکی تر دەیڵێمەوە پیاو بەهۆی گەندەڵی ئەخلاقی خۆیەوە ئیسلام لێکدەداتەوەو ئەوە هەڵدەبژێرێ کە مەبەستیەتی.

❖ بیرورات چییە دەربارەی بەڵگەی دادگا سەبارەت بە دیاردەی قەیرەکچ؟

▱ ئەمە بەهانەیە بۆ گەندەڵیی ئەخلاقیی پیاوان. بێگومان فرەژنی ئامرازێك نییە بۆ نەهێشتنی دیاردەی قەیرەکچ، ئەو ژنەی شووش بە پیاوێك دەکات کە سێ ژنی هەیە، سۆزانییەو شایانی ئەوەنییە ژن بێت.

❖ بەپێی شارەزاییت لە دەروونزانیدا، بەهانەیەکمان خوێندۆتەوە کە دەڵێت پیاو بەپێی سروشتی خۆیو خۆڕسکانە ڕوو لە چوار ژن دەکات، لەکاتێکدا ژن تەنیا مەیلی تاقە پیاوێکی هەیە؟

▱ پێچەوانەکەی ڕاستە. لە ڕووی بایۆلۆژییەوە پیاو دەرەقەتی زیاتر لە یەکێك نایەت، ئەگەرچی وەك دەرمبڕی من بایۆلۆژیاو سیاسەتو

ئابووری لێك جیاناكەمەوەو لایەنگری ئەخلاقو سەرڕاستیو دژی دووفاقیم، چۆن دەبێت پیاو ئەخلاقی هەبێت، ئاواش دەبێ ژن خاوەن ئەخلاق بێت، چونكە ئەخلاق دەوڵەمەندو هەژار دەگرێتەوەو ناكرێ لایەكی لێ ببوێردرێ.

❖ لە یەكێك لە كتێبەكانتدا داخوازی ئەوەیت پێوانە ئەخلاقییەكان بۆ پیاو و ژن وەك یەك بنو دەڵێیت: "شەرەفی ژن وەك دەنكە شقارتە وایە"و "دایك قوتابخانەیە، ئەگەر چاك ئامادەتكرد ئەوا نەتەوەیەكی خاوەن بنەچەی چاك پێكدێنی". ئەنجامی ئەمە هێرشكرایە سەرت، چونكە وا تێگەیشتن كە خوازیاری بەرەڵایی ژنیت، وەڵامی تۆ بۆ ئەمە چییە؟

◻ ئایا پیاو شەرەفی نییەو باوكیش قوتابخانە نییە؟ ئەی بەرپرسیاریی باوك لەكوێدایە؟ هەموو ئەركەكان لە ئەستۆی دایكدان، كەچی سووكایەتی پێدەكەنو قسەی سووكی پێدەڵێنو مندالْ ناوی ئەو هەڵناگرێ، بەڵكو ناوی باوك هەڵدەگرێ. من خوازیاری ئەوەم مندالْ ناوی دایكی هەڵگرێ، چونكە شەرەفمەندانەیە. بۆچی مندالْەكانم ناوی نەوال ئەلسەعداوی ناگرنەخۆ، ئایا ناوی دایك عەیبو عارهێنەرە؟

❖ ئەی تێڕوانینت چییە بەرامبەر بەو تیۆرەی دەڵێت پیاو بۆ كاركردن خولْقاوەو ژنیش بۆ پەروەردەكردن؟

◻ هەڵەیە، من ژنم، پزیشكم، ئەدیبو بیریارمو شوومكردوەو مندالْم بووەو پەروەردەشمكردون. دایكایەتی وەك باوكایەتیە، ژن وەك پیاو وایە. من بۆ ئەوە لەدایكنەبووم كە تەنیا پەروەردەكردنم لەئەستۆدابێت، بەڵكو بۆ ئەوەی بیربكەمەوە، چونكە ئەقڵم هەیە، ئەقڵی ژنیش تەواو وەك هی پیاوەو دەشێ بەپێی ژینگەو هەلومەرجیش لە هی ئەو باشتربێت. كوا ئەو پیاوە میسرییەی توانیویەتی ئەوە بەدەستبێنێ كە بەدەستمهێناوە؟ تەنانەت كتێبەكانی نەجیب مەحفوز هێندەی كتێبەكانی من وەرنەگێڕراوەنەتە سەر زیاتر لە سی زمان. من ژنمو ئەقڵم هەیە. مرۆڤ ئەقڵە نەك كۆئەندامی زاوزێ كە بۆ وەچەخستنەوە خولْقاوە. پێویستە باوكایەتی وەك دایكایەتی بەرپرسیاربێت، ناوی دایكیش وەك هی باوك شەرەفمەندانەبێت. پێویستە كۆمەڵگەكانمان گۆڕانیان بەسەردابێت، چونكە كۆمەڵگەی بێئەخلاقن.

❖ كەواتە تیۆری بەرپرسیارێتی دایك لە ئەخلاق ڕەتدەكەیتەوە؟!

◻ غەریبە، ئەی باوكیش بۆ بەرپرسیارنەبێت!!

❖ باوك سەرقاڵی كار و پارەپەیداكردنە؟

◻ دایكیش بە هەمان شێوە، تەنانەت ئەو دایكە كە فێری چێشت لێنانو گسكدانو جلشتنیش نەبوە، پیاو بەری ڕەنجی شانی دەخوات. كەواتە كوانێ ئەخلاقی پیاو؟ پیاوان هەمیشە دەخوازن خۆ لە بەرپرسیارێتی بەدووربگرن.

## ئازادكردنی ژنان:

❖ ئەگەر بەناخی پڕۆژەكەتدا "ئازادكردنی ژنان" ڕۆچینە خوارەوە، كە كاتی ناوهێنانت یەكسەر دێتەوەیاد، هەروەها بڕوانینە كۆتایی سەدەی نۆزدەهەمو سەرەتای سەدەی بیستەم، بەتایبەتی قاسم ئەمینو هودا ئەلشەعراوی، ئینجا تۆ لە كۆتایی سەدەی بیستەمدا، ئەوا جیاوازییەك لەنێوان دوو قوتابخانەدا بەدیدەكەین: قاسم ئەمین مەبەستی نەبوو بیناكە هەڵوەشێنێ، بەڵكو تەنیا دەیویست لاوازیو خەوشییەكانی هاوڵاتی چاكبكات، نەوال ئەلسەعداوی بەپێچەوانەوە

مەبەستێتی بیناکە هەڵوەشێنێ و یەکێکی دیکە لە شوێنی بینابکات. قاسم ئەمین پشتی بە دەق بەست، لەکاتێکدا نەوال ئەلسەعداوی پشت بە ئەقڵ و لۆژیک دەبەستێ. تۆ چۆن دەڕوانیتە ئەم جیاوازییە؟

□ من هەرگیز درێژکراوە قاسم ئەمین و هودا ئەلشەعراوی نیم. من بڕوام بە ئازادیی ژنان هەیە، چونکە لە ژینگەیەکی هەژاردا لەدایکبووم و هەستم بە زۆرداریی کۆمەڵگە کردوە بەرامبەر بەخۆم. پڕۆژەکەی قاسم ئەمین پڕۆژەیەکی زۆر ڕواڵەتکارانە بوو، چونکە کێشەکە لەوەدا نییە ژن دەبێ ماکیاج بکات، بچێتە زانکۆ، شوبکات و دواتریش لەچك بپۆشێ و ڕازیبێت مێردەکەی لێیبدات. ئەمە ئازادی نییە.

❖ بەبڕوای تۆ "ئازادیی ژنان" چییە؟

□ ئەوەیە ژن مرۆڤێکی کامڵ بێت، هەست بە بەرپرسیارێتی تەواو بکات بەرامبەر بەخۆی و ئینجا کۆمەڵگەکەی. ئەمە پوختەی پڕۆژەکەمەو پڕۆژەکەشم بۆ جیهانە نەك تەنیا جیهانی عەرەب.

❖ بۆچی بۆ ئەم پڕۆژەیە پشت بە سەرچاوەی دەق/ قورئان نابەستی؟

□ داوای لێبوردن دەکەم، ئایین دەق نییە، خوداش کتێب نییە. یەکەمین وانەی ئایین لە نەنکە نەخوێندەوارەکەمەوە فێربووم: "خودای ئێمە دادپەروەرییەو بەئەقڵ بیناسن". کەواتە خودا دادپەروەرییە نەك دەقێك کە لە چاپخانەوە دێتەدەرێ. بەلای منەوە ئەمە ئایینە، ئەمە ئیسلامە، ئەمە ئەخلاقە.

❖ بەڵام دادپەروەری لێکدانەوەی جۆراوجۆر هەڵدەگرێ؟

□ لێرەدا سیاسەت خۆی هەڵدەقورتێنێ و خودای ئێمە هیچ پەیوەندییەکی بەوەوە نییە. خودای ئێمە دادپەروەرییە، ڕووناکییە، جوانییەو ڕاستگۆییە. ئەمە ئەو شتەیە کە لە باوکی ئەزهەریمەوە فێربووم کە دژی فیکری دەقخواز ڕاببوو. بۆیە لێکدەرەوە پێشکەوتووەکان دەڵێن ئەگەر دەق و بەرژەوەندی پێك ناکۆکبوون، ئەوا بەرژەوەندی پێش دەق دەکەوێت، چونکە دەق نەگۆڕەو بەرژەوەندی بگۆڕە. ئەمە فەلسەفەی ئیسلامەو فەلسەفەیەکی پێشکەوتووە. خودی ئیسلامیش پێشکەوتووە، چونکە بگۆڕەو ئیسلامی ئیمڕۆ ئەوەی پێش سەدەیەك نییە. تەنانەت ئیمڕۆ، ئیسلامی سعودی جیاوازە لەگەڵ ئیسلامی لیبیدا، ئیسلامی تاڵەبان جیاوازە لەگەڵ ئیسلامی میسریدا. واتە هەر کۆمەڵگەیەك هەلومەرجی تایبەتی خۆی هەیە.

❖ یەکێك لە بیریارەکان دەڵێت: "ژیواری ئیسلام هەمیشە پشتی بە دەق بەستوە، بۆیە هەر خواستێکی گۆڕانکاری لە کۆمەڵگەیەکی ئیسلامیدا پێویستە بەژێر عەبای دەقدا تێپەڕێت." تێبینیت چییە لەسەر ئەم دەربڕینە؟

□ هەڵەیە.. دەستەپاچەیی و پاشکەوتوویی هۆکاری گەڕانەوەن بۆ دەق. ئەوە مرۆڤە کە دەق دروستدەکات نەك بەپێچەوانەوە. پێدەچێ بە دەستی خۆمان بتێکمان (دەق) دروستکردبێ و کەوتبینە پەرستنی. مرۆڤ یاسای خوڵقاندو لە خزمەتی بەرژەوەندیی گشتدا دەستکاریکردو هەرگیز یاسای نەکردۆتە شمشێرێکی ڕووەو مل ئاڕاستەکراو، ئەمەش داهێنانە.

❖ ئەی دابینکاری چییە؟

□ پێویستە سیستەمێك هەبێت. ئێستا سستەمێك هەیە، بەڵام مەحاڵە پێڕەویبکەین، چونکە سیستەمێکی کۆنە. داهێنان هەمیشە سیستەمی کۆن وەلاوەدەنێ و سیستەمێکی نوێ دەخوڵقێنێ. بۆ نموونە، من چەمکی پەیوەندیی شەرەف بە پەردەی

کچێنییەوەم گۆڕیو بەستمەوە بە دادپەروەرییو ئەقڵو ڕاستگۆییەوە. پێویستە سیستەمی کۆن هەڵوەشێتەوە، بەمەرجێك سیستەمێکی نوێ بخرێتەڕوو. هەڵەیەك لە بیرکردنەوەماندا هەیە، ئەویش ئەوەیە لە وشەی هەڵوەشاندنەوە دەترسین. بڕوانە پڕۆسەی بنیاتنانی مرۆڤ، هەندێ شانە هەڵدەوەشێتەوەو شانەی نوێ بنیاتدەنرێ. نە بنیاتنانی بەتەنیا هەیەو نە هەڵوەشاندنەوەش بە تەنیا دەبێت. هەمان بنیاتنانو هەڵوەشاندنەوە کە لە جەستەدا هەیە، لە فیکریشدا بەدیدەکرێت.

## ئینکارکردن:

❖ ڕێگەم پێبدە لەگەڵتدا بچینە سەر مەسەلەی (هاوسەرێتی). تۆ خۆت مەسەلەی شەرەفت وروژاندوەو پێشتر ئەوەت ڕاگەیاندوە کە ناڕازیت بەرامبەر بە بیرۆکەی هاوسەرێتیو دژی ئەوە نیت پەیوەندیی تەواو لەنێوان دوو توخمەکەدا هەبێت، بێ ئەوەی هیچ پەیمانێك لەنێواندابێت، ئایا ئەمە ڕاستە؟

◻ من دژی ئەوەبووم هاوسەرێتی بە پەیماننامە بێت، چونکە وەك چۆن کاتێك کەسێك ١٠٠٠ جنیهت بە قەرزدەداتێ کومپیالەت پێ ئیمزادەکات، ئاواش کاتێك پیاو ژن دێنێ پەیمانی لەگەڵ مۆردەکات کە بە پارەیەکی پێشەکی "کرێیەتی"و کاتی تەڵاقیش بڕێك پارەی دەداتێ. پێموایە پەیماننامەی هاوسەرێتی گەورەترین سوکایەتیکردنە بە هاوسەرێتی.

❖ ئەی سەبارەت بە پاراستنی مافەکان چی دەڵێیت؟

◻ ئەگەر پیاو مافەکانی ژن نەپارێزێ، ئەوا شایستەی ئەوە نییە ژن لەگەڵیدا بژی. بەبڕوای خۆم، بەئەقڵدا نایەت پیاو لەبەر "وەرەقەیەك" دڵسۆزبێت بۆ ژنەکەی، چونکە پاراستنی مافەکانی ژن یاخود مێرد بەر لەهەر شتێك گرێدراوی ویژدانو ئەخلاقە.

❖ کەواتە ناڕەزاییەکەت بەرامبەر بە خودی هاوسەرێتی نییە؟

◻ نەخێر.. من خۆم شوومکردوەو مندالم هەیە.

❖ ئەی بۆچی ئینکاری فرمانی حەج دەکەیت؟

◻ من ئینکاری حەجم نەکردوە، دەقاودەق وتومە "حەج"و "ماچکردنی بەردی ڕەش" نەریتێکی بتپەرستییە.

❖ بەڵام ئەوە پێنجەمین کۆڵەکەیە.

◻ هەرگیز.. ئەوە "ویستەکی"یەو "بۆ کەسێکە کە توانای هەبێت". باوکم کوچی دوایی کردو نەچوە حەج، ئەوە مانای ئەوەنییە ئیسلامەکەی کەموکوڕە. زۆرکەس هەن نوێژدەکەنو نوێژەکەیان بێسودە، ئەمەش بۆ ئەو کەسە ڕاستە کە لەپێناو کارێکدا یان بۆ ماچکردنی بەردی ڕەش دەچنە ئەوێ!! من دەپرسم: ئایا ماچکردنی بەردی ڕەش کارێکی ئیسلامییە؟ نەخێر کارێکی بتپەرستانەیە. ئیسلام بۆ ئەوە هاتۆتەئاراوە تا بتپەرستی لەناوبەرێتو منیش دەچم بەگژ ئەوانەدا کە بت دەپەرستن.

❖ ئایا حەج دەربڕی ئەوەیە؟

◻ بەڵێ، بەو شێوازەی پێیهەڵدەستن. هەروەها من دژی ئەو شێوازەی نوێژکردنی ئەوانم. "چەند سەحابەیەك چوونە لای پێغەمبەری خوداو وتیان: فلان کەس شەو و ڕۆژ نوێژدەکات، پێیوتن: ئەی کێ خێزانەکەی دەژێنێ، وتیان: هەموومان پێغەمبەری خودا، وتی: کەواتە ئێوە لەو باشترن". براکەم ئاگاداریکردنی ماڵو مندال نوێژو خواپەرستییە، ڕاستگۆیی نوێژو خواپەرستییە،

مامەڵەکردنی مرۆڤانە نوێژو خواپەرستییە، نەك چوونە حەج بۆ دزی یان بازرگانی یاخود نوێژکردن لەکاتێکدا ئەو خراپەکارترین خوڵقاوی خودایە. من لایەنگری واتەی ڕاستی ئیسلامم، لێرەشدا نوێژکردن تەنیا جووڵەیەکی وەرزشکارانە نییە وەك ئێستا بەدیدەکرێت، بەڵکو ژیاندنەوەی ویژدانە. هەروەها حەج سەردانی گۆڕ و ماچکردنی بەرد نییە، چونکە ئیسلام دژی بتپەرستی بوە، بەڵکو تێرامانە. بڕوانە ئاخاوتنی جوانی رابیعەی عەدەوی کە هاوشانی سوفییەکان دژی (دەستورخوازیی ئایینی) دەجەنگی: "من خوا لەبەر ترسی ئاگرو حەزی بەهەشت ناپەرستم، بەڵکو لەبەر ئەوەی خۆشمدەوێت". بڕوانە ئەم جوانییە.

❖ ئەمەش توڕەبوونی تۆ لێکدەداتەوە کاتێك کەسێك پێتدەڵێت حاجی؟

□ بەڵێ.. پێمخۆش نییە کەسێك بەو نازناوە بانگم بکات، چونکە نە چوومەتە حەجو نە دەشچمە حەج. من دەتوانم لە هەیوانی ماڵەکەی خۆمەوە حەج بکەم، کارو کتێبەکانم نوێژکردنی منن، نزیکبوونەوەم لە دادپەروەریو ئازادی نزیکبوونەوەمە لە خودا، نەك بە دەقو لێکدانەوەکان، چونکە ئەمە سیاسەتە.

❖ بەڵام خۆ خۆیشت سیاسەتدەکەیت، بۆچی ئەوە بێزارتدەکات؟

□ مەبەستم سیاسەتە بەواتەی پیلانگێڕان بۆ بەدەستهێنانی دەسەڵات یاخود بۆ ڕیاکاری. واتە ئەو سیاسەتەی لە جیهانی عەرەبدا ناسراوەو بە میرات بۆمان ماوەتەوە.

❖ بەکورتی، وشەی پیاو و ئایین لای تۆ واتای چی دەگەیەنن؟

□ پیاو ئایین بەکاردەبات بۆ ژنهێنانو تێرکردنی هەوەسە سێکسییەکانی خۆی.

❖ ئەم هێرشبردنە دڕندانەیە بۆ سەر پیاو بەری هەڵوێستێکی کەسێتی تایبەتیە؟

□ من هەڵوێستی کەسێتی تایبەتیم بەرامبەر بە پیاو نییە. من شوومکردوە بە د. شەریف حەتاتەو کوڕێکم هەیە (عاتیف حەتاتە)و هاوڕێ پیاوەکانم ژمارەیان لە دەستەخوشکەکانم زیاترە. من دژی پیاو نیم، بەڵکو دژی ئەو سیستەمەم کە پیاو گەندەڵدەکات.

❖ ئایا "ئایین" ئەو سیستەمەیە؟

□ بەڵێ ئایین بەو شێوازەی وڵاتو ڕژێمە عەرەبییەکان کارییپێدەکەن، بەڵێ ئەو ئایینەی لە خوێندنگەکان دەیخوێنن، نەك ئەو ئایینەی لە باوکمو نەنکمەوە فێریبووم: "خودا دادپەروەرییە بە ئەقڵ بیناسن".

❖ بەڵام تۆ لە کتێبەکانتدا ڕاشکاوانە وتوتە ئیسلامو مەسیحیەت، وێڕای ئەو گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتیەی خستویانەتەوە، دەستوپێبەستەکانی ژنیان زیاترکردوە!

□ من وتومە ئایینە ئاسمانیەکانو نائاسمانیەکان قۆناغی پێشکەوتوتری مێژووی مرۆڤایەتین، ئەگەر لە خزمەتی چەوساوەکانو ژنو هەژارەکاندا بن، بەڵام ئەگەر لە بەرژەوەندیی حکومەتو دەسەڵاتدارەکاندا بن، ئەوا دژ بە مرۆڤ دەبن. ئایا دەزانی ئیسرائیل بەبەهانەی ئایەتێکی تەورات فەڵەستینی داگیرکردوەو ژنانی کوشتوە؟! لەلایەکی دیکەوە، بەگشتی پێویستە کتێبی ئایینی هاوشانی پێشکەوتنی مرۆڤایەتی گەشەبکات، من دژی وەستانو لایەنگری گۆڕانم "ئەگەر دەق لەگەڵ بەرژەوەندیدا ناتەبابوو، ئەوا بەرژەوەندی لە خزمەتی میللەتدا زاڵدەبێت". کەواتە بۆچی بە "کتێبی ئایینی وتی" زیندانمدەکەیت؟ ئایا پێغەمبەر نەیوتوە: "ئێوە شارەزاترن لە کاروباری دنیای

خۆتاندا"؟ ئێمە بەڕێوەبردنی کاروباری دنیای خۆمان خستۆتە ئەستۆی خۆمان، ئیتر بۆ دەبێت ملکەچی فەرمانڕەوایەك بین کە دەستوپێبەستمان دەکات؟

## ڕوپۆش:

❖ دەخوازم ئەم دەربڕینە ڕوونبکەیتەوە کە لە یەکێك لە کتێبەکانتدا هاتوە: "ڕوپۆشکردنی ژن بەناوی ئیسلامەوە وەك ڕووتکردنەوەیەتی بەناوی بازرگانیەوە".

□ من دژی ڕووپۆشکردن و ڕووتکردنەوەی ژنم. من مرۆڤم نەك تەنیا جەستەیەك کە دادەپۆشرێ یان ڕووتدەکرێت. کێشەی "پرچ" چییە؟ ژنان ڕوودەپۆشن، کەچی چاو لە پیاوان دادەگرن! هیچ پەیوەندییەك لەنێوان ڕووپۆشی و ئەخلاقدا نییە. هەروەها وتومە ماکیاجیش ڕووپۆشییەو هێرشمکردۆتە سەری، وتومە دژی ڕووتیم و هێرشمکردۆتە سەری. ژن ڕووپۆشدەکرێ، چونکە کاڵایەکی جەستەییە، هەروەها لەبەر هەمان هۆ ڕووتدەکرێت. لەبەرامبەر ئەمە پیاو نە ڕوودەپۆشێ و نە خۆی ڕووتدەکاتەوە.

❖ ڕووپۆشی چییە؟

□ ڕووپۆشی بەسەر کۆیلەو کەنیزەکاندا دەسەپێنرێ. خراپترین شێوەی ڕووپۆشی ڕووپۆشیی ئەقڵە، چونکە کەمایەتیەك بێ ڕووپۆشکردنی ئەقڵ ناتوانێ زۆرایەتیەك جڵەوبکات. هەمان شت بۆ ڕووپۆشیی دەموچاو ڕاستە.

❖ ئەم وەڵامدانەوە ڕاشکاوانەیە ناکۆکە لەگەڵ گوتاری ئایینی باڵادەستدا، چۆن ئەمە لێکدەدەیتەوە؟

□ ئەمە ئەو بێدەنگییە لێکدەداتەوە کە بەسەرمدا سەپێنراوە.

❖ بەڵام چ لە بەرامبەر گوتارەکەی تۆ ڕاوەستاوە؟

□ گوتاری حکومەتەکان، ئەو گوتارەی کە گوتارەکەم ئەڵتەرناتیڤیانە.

❖ بەڵام خۆ تۆ سەرچاوەیەکی (مەرجەعێکی) ئایینی نیت؟

□ ئەوە گرنگ نییە، چونکە ئایین لە هەموو ماڵێکدا هەیەو هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ سیاسەت یان ئابووریدا نییە، لەبەرئەوەی پەیوەندییەکی تاکەکەسییە لەنێوان بەندەو خودای خۆیدا، بەندەش خۆی خودای خۆی هەڵدەبژێرێ و بەو شێوازەش دەیپەرستێ کە حەزیپێدەکات.

❖ پاش ئەو دوورکەوتنەوەیە، جارێکی دی دێینەوە سەر ئازادیی ژنان: پێتوانییە "بزووتنەوە"ی ئازادیی ژنان، ئەگەر دەستەواژەکە ڕاست بێت، بەراورد بە شەست و حەفتاکان پاشەکشەیکردوە، تەنانەت کەسایەتیە دیارەکانی پاشەکشەیانکردوە بۆ ڕۆژنامەگەری، ڕەخنەی ئەدەبی، تەنانەت دایکایەتی و هەندێ جاریش ژنی ناو ماڵ. ئایا ئەمە شکستەخواردنی نەوال ئەلسەعداوی نییە؟

□ نەخێر، ئەمە تێکشانی ئەو سیستەمەیە کە دژایەتیمکردوە.

❖ چۆن؟

□ ئەوانە خوێنەر یان خوێندکاری من نین، بەڵکو پاشکۆی گوتاری ڕەسمی باڵادەستن.

❖ بەڵام ئەوانە ڕۆژگارێك لەگەڵ تۆ بوون؟

□ هەرگیز. مەعریفە بەلای منەوە تووشی سەردانەواندن نابێت. ئەوەی کتێبەکانی منی خوێندبێتەوەو تێیانگەیشتبێ مرۆڤبوونی خۆی بەدەستدێنێتەوە. چێژوەرگرتن لە مرۆڤبوون وەك ئازادبوونی کۆیلەکان جوانەو شیاوی سەردانەواندن

نییە. ئەوەی هەوای ئازادی هەڵمژیبێ، پاشگەزنابێتەوە. ئەوانەی پاشگەزدەبنەوە پاشکۆی گوتاری ڕەسمین. من لایەنگرم زۆرە لە میسرو جیهانی عەرەبدا. لەخۆت بپرسە: بۆچی چاوپێکەوتنم لەتەکدا دەکەیت؟! تەنانەت ڕۆژنامەی (عکاظ) بەر لەتۆ هاتە لامو بەزمانی منەوە درۆی هەڵبەست.

## پاشەکشەکردن:

❖ لە تەوەرەی داهێناندا، بەنووسین نارەزاییت بەرامبەر بە "ولیمە اعشاب البحر"ی حەیدەر حەیدەر دەربڕیوە، نەك لەبەر ئەوەی دەستکاریی پیرۆزەکان دەکات، بەڵکو لەبەرئەوەی خاوەن ئەندێشەی پرشوبڵاو و لێکدابڕاوە. هەروەها بەناکۆکییەکی ئاشکرا هێرشتبردە سەر شێوەکاری میسری خوالێخۆشبوو (مەحمود سەعید)، چونکە نیگاری ژنێکی ڕووتی کێشابوو. ئایا ئەمە توخمپەرستیی داهێنانە؟

▱ تۆ باش ئەوەت نەخوێندۆتەوە کە سەبارەت بە مەحمود سەعید نووسیومە. من وتومە بۆچی ژن خۆی ڕووتدەکاتەوەو وەك مۆدێل لەبەردەمی شێوەکارێکدا دەوەستێ تا نیگاری بکێشێ؟ ئایا شێوەکار ناتوانێ ژنێك بە جلوبەرگەوە بنەخشێنێ. من دژی گەندەڵیی ئەخلاقیم. مەحمود سەعید شێوەکارێکی چینە باڵا گەندەڵەکانە کە ژن ڕووتدەکاتەوە یان ڕووپۆشیدەکات. خودی خۆی نیگاری ژنی بە ڕووتی یاخود ڕووپۆشراوی کێشاوە. سەبارەت بە "وەلیمە" ڕۆمانێکی خراپە، نەك لەبەر ئەوەی هێمای بۆ ئایین کردوە، بەڵکو لەبەر تێڕوانینی بەکەمزانینی ژنان. ئەمەش جێی سەرسووڕمانی من نییە، چونکە نووسەری ڕۆمانەکە "چەپخوازە" یان پاڵەوانەکەی بەرجەستەی چەپ دەکاتو بەڕاستیش ئاقاری چەپ لە جیهانی عەرەبدا کۆتاییهاتووەو کۆچی دواییکردوە، یان بەلای کەمەوە دەتوانم بڵێم بەهای خۆی لەدەستداوە، لەبەر یەك هۆ: لەڕووی مرۆییەوە گەشەی نەکردوەو بەم یان بەو شێوەیە گرێدراوی گەندەڵیی ئەخلاقی بووە.

❖ ئەگەر ڕۆمانەکە لە ڕووی ئەدەبییەوە پایەبەرزبوایەو دەستکاری پێرۆزیشی بکردایە، ئایا قبوڵتدەکرد؟

▱ بەبڕوای من شتێك نییە ناوی ڕۆمانێك بێت پایەبەرزبێتو دەستکاری پیرۆز یاخود ناپیرۆز بکات. من شتەکان دابەش ناکەم بۆ پیرۆز و ناپیرۆز، خواکانو ئەهریمەنەکان. من دژی ئەم دوانەییو دووفاقیانەم کە لە کۆیلەیەتیەوە بەمیرات بۆمان ماونەتەوە، چونکە مرۆڤ چاکەو خراپە لەخۆدەگرێت، بەبێ ئەوەی فریشتە یان ئەهریمەن بێت. مرۆڤ دەشی بکوژێو بکوژرێت. بۆیە من دژی ئەوەم پیاوکوژ بکوژرێ یاخود دەستی بقرتێنرێ. من دەروونزانم، بۆیە دەبێ بپرسم: مرۆڤ بۆ ئەو تاوانەی کرد؟ ئینجا بەدوای چارەسەردا بگەڕێم. من دژی سزادانو خەڵاتکردنم.

❖ کەواتە چۆن منداڵەکانی خۆت، بێ پەنابردن بۆ پرنسیپی سزادانو خەڵاتکردن، پەروەردەکردوە؟

▱ لەسەر پرنسیپێك پەروەردەمکردون: "خەڵات ئەوەیە کە بەرهەمیدێنیت". خەڵاتی نۆبڵم بەلاوە گرنگ نییە، کاتێکیش بۆ خەڵاتی پاداشتکاری دەوڵەت هەڵبژێرام، ڕەتمکردەوە. خەڵاتی من بەری کارەکەمەو ئەوەیە کەسانی وەك تۆ بێنە لام. بۆ پرنسیپەکەشم پشتم بە کتێبو خوێندنەوە بەستوە، چونکە ئەو نووسینەی لەدڵەوە سەرچاوەدەگرێت دەچێتە دڵەوە. کاتێك دەمخوێنیتەوە هەست بەوە دەکەیت ژنەجوتیارێك دەخوێنیتەوە کە دەبارەی

واقیعی خۆی دەنووسێ، نەك ژنە ئەكادیمیەك كە گەمە بە وشەكان دەكاتو لە بورجێكی عاجیدا دەژی. كتێبەكانی من كچو كوڕی لاو دەیانخوێننەوە كە تەمەنیان سیانزەساڵی ڕەت نەكردوە. بۆ زانیاریی خۆیشت، پیاوە ڕووناكبیرەكانی جیهانی عەرەب، هاوشێوەی تۆ، نووسینەكانی منیان خۆشدەوێت. بۆیە ئەو گوتەیە ڕاست نییە كە دەڵێت پیاو دژایەتیمدەكات یاخود من دژایەتی پیاو دەكەم. پیاوێكی خەڵكی صەعید هاتە لامو ویستی دەستم ماچبكاتو وتی: "ئەگەر كتێبەكەی تۆ: "ژنو سێكس" نەبوایە، ئەوا كچەكەم لە شەوی بوكێنیدا دەكوشت، چونكە خوێنی لێ نەهاتبوو".

❖ سوپاس بۆ ئەو پیاداهەڵدانەی شایستەی نیم. پرسیاركردن سەبارەت بە خێزانەكەت هانمدەدات بۆ پرسیاركردن دەربارەی هۆكاری ڕەتكردنەوەی هەر دیارییەك هاوسەرەكەت پێشكەشتیبكات، كە لە گفتوگۆی یەكێك لە كەناڵە ئاسمانیەكاندا دەرتبڕیوە؟

◻ دیاریی من مرۆڤدۆستییە. گەورەترین دیاری بەلای منەوە مامەڵەكردنی پڕسۆز و دڵسۆزییە. من نە بازنگم لەدەستدایەو نە ئەڵقە، نە پرچی خۆم ڕەنگدەكەم نە ماكیاج دەكەم. چونكە من زۆر بڕوام بەخۆم هەیەو پێمخۆشە خاوەن سروشتی خۆم بم. ئەوەی منی وەك خۆم قبوڵە پێشوازیدەكەم. لێرەدا دەپرسم: بۆچی دیاریم بۆ دێنێ؟ چی لە دیارییەكە بكەم؟ زەردەخەنەتێگرتنێكی هاوسەرەكەم دیارییە بۆ من، پاڵپشتیكردنی بۆم لەكاتی تەنگانەدا دیارییە، داكۆكیكردنی لەمن لەكاتی نائامادەبوونمدا دیارییە. ئەمە خۆشەویستییە، نەك دیارییەكم بۆ بێنێو دوایش خیانەتم لێبكات. من مارەییم قبوڵنەكرد، مێردەكەم بەخێوم ناكاتو بارنیم بەسەر شانییەوە، ئێمە بە یەكسانی مەسرەفی ماڵ دەكەین.

دادپەروەرانە نییە پیاو كاربكاتو ماندوبێتو من لە ماڵەوە بێ كار دابنیشم. چۆن كات بەسەربەرم؟ وەك وتم نەبارمو نەبالادەستیش.

❖ هەستت چییە كاتێك گوێت لەم ڕستانە دەبێت: "گوێڕایەڵی بۆ مێرد گوێڕایەڵییە بۆ خودا"، "پیاوان بالادەستن بەسەر ژناندا".

◻ مانای ئەوەیە ژن كۆیلەو كەنیزەیە، نە لە قورئان تێدەگات نە لە ئیسلام.

❖ كەواتە لێكدانەوەت بۆ گوتەی خودا "پیاوان بالادەستن بەسەر ژناندا" چییە؟

◻ پیاو مافی بالادەستی هەیە ئەگەر مەسرەفی ژن بكات، هەروەك چۆن نانەدەیتە ژنەكارەكەرەكەتو جلی بۆ دەكڕیت. ئەمە بۆ ژنو پیاویش ڕاستە، بەڵام ئەگەر ژن سەربەخۆبوو ئەوا ئەم گوتەیە ئەو ناگرێتەوە.

❖ وەك دەریدەبڕیت، تۆ نوێنەرایەتی گوتارێكی نوێ دەكەیت. ئایا ئەو شێخە نوێیانەش، وەك عەمرو خالیدو خالید ئەلجوندی نوێنەرایەتی هەمان گوتار دەكەن؟

◻ نەخێر، هەرگیز. ئەمانە كەسانێكن كچو كوڕانی لاو هەڵدەخەڵەتێننو درۆ لەگەڵ خەڵك دەكەن. ئەوانە بەو ژنانە دەچن كە ماكیاج دەكەنو بانگەشەی ئەوە دەكەن كە جوانن و لەواقیعدا وانین.

❖ ئایا لە ڕوانگەی تۆوە، كاركردن بۆ دەروەستبوونی خەڵكو نزیككردنەوەیان لە خودا درۆ و هەڵخەڵەتاندنە؟

◻ ئێمە لە درۆدا ژیان بەسەردەبەین، دنیای ئیمڕۆ لەسەر درۆ دامەزراوە. سەرۆكی گەورەترین دەوڵەتی دنیا (جۆرج بوش)ی كوڕ هەموو ڕۆژێك درۆدەكات، تۆنی بلێر ڕۆژانە درۆدەكات. ماركس وتویەتی، ئەگەرچی ماركسیست نیم: "ئایین تلیاكی میللەتانە". ئەمەش گوتەیەكی ڕاستە. سیاسەت لە

جیهانی عەرەبدا مانای هەنەری درۆکردنە، پیاوەئاییینیەکانی لای خۆشمان هەمان ڕۆڵ دەبینن یاخود ئارایشی ئەو ڕۆڵەی سیاسەتمەدار دەکەن، چونکە میللەت لە مەسەلەی سەرەکی خۆی: "زۆرداریی سیاسی" دووردەخەنەوە، ئەمەش لەڕێگەی سڕکردنەوە بە مەسەلەی ڕواڵەتکارو زۆر لاوەکی.

❖ تەوەری داهێنان بەم پرسیارە کۆتاییدێنم: "چۆن خۆ بپارێزین؟" و "کێ یاسخکردن مسۆگەردەکات"؟

▱ ئەوانە چەوتن و سەبارەت بەو مەسەلەیەش شتم نووسیوە. ئەوان دەڵێن دەبێ ڕۆشنبیری و ئامڕازەکانی ڕاگەیاندن سانسۆربکرێن، وەك ئەوەی میللەت پەککەوتەو ئیفلیج بێت. ئەمەش تیۆرێکی پەروەردەیی هەڵەیە، چونکە زامن لێرەدا ئەوەیە میللەت خۆی خۆڕسکانەو بێ زۆرەملی یان ئامۆژگاریکردن بۆ خۆی هەڵیدەبژێرێ. لێرەدا ناکۆکییەکی ڕون و ئاشکرا لەگەڵ ئەو دیموکراسیەدا بەدیدەکرێت کە عەرەب بانگەشەی بۆ دەکەن. دیموکراسی لە بنچینەدا ئازادیی میللەت و هەڵبژاردنی خۆویستانەی نوێنەرەکانیەتی، جا ئەگەر میللەت توانای هەڵبژاردنی نوێنەرەکانی خۆی هەبێت، چۆن دەستەوەستاودەبێت لەئاست هەڵبژاردنی ئەو ڕۆمانەدا کە دەیەوێ بیخوێنێتەوە؟!

**کۆتایی:**

❖ لە کۆتاییدا دەپرسم: چیت کردوە؟ هەمووشتێك وەك خۆیەتی، هیچ سوودێکمان لە تۆ وەرنەگرتوە، جگە لەوەی لەکاتی بەشداربوونت لە کۆنگرەکانی خۆرئاوادا دەڵێن: "بڕوانن چ زۆرداریو پاشکەوتنێك هەیە لای ئەوان، تەنانەت نەوال ئەلسەعداوی دێت و لای ئێمە دەکەوێتە ئاخاوتن؟

▱ پێموایە شتی زۆر هاتۆتەدیو کەس ناتوانێ چاوی لێ بپۆشێ، تەنانەت تۆش کە ئیمڕۆ هاتویتەتە لام. ئەو گوللەیەی تیختدەکات دەتڕوشێنێ. هەزاران کەس هەن لە دنیاو میسریش کە نامەم بۆ دەنێرن بۆ ئەوەی بڵێن: فلانە کتێبت ڕێڕەوی ژیانی گۆڕیم.. لەلایەن ڕۆشنبیرە ڕاستەقینەکانەوە ڕۆشنگەری لەناو نەوە نوێکاندا هاتۆتەئاراوە، لەبەرامبەر ئەوەش ساختەکاریی ڕوویداوە کە بۆتە هۆی ئەوەی گەلێك کەس بکەونە باوەش و داوی ئاقارە ئوسوڵییەکانەوە، بەڵام من بڕوادارو گەشبینم بەرامبەر بەوەی ئاقاری پێشکەوتن سەردەکەوێت. بۆیە وێڕای ئەوەی ژیانم هەمووی ماندوبوونە، بەڵام لە بەختەوەریو ئارامییەکی دەروونیدا ژیان دەبەمە سەر، چونکە لە کۆتاییدا ئەقڵ و لۆژیك زاڵدەبێت نەك نەفامیو ساختەکاری. بەهەرحاڵ، وەك دەرمبڕی، "بنیاتنان" و "هەڵوەشان" هەن و سەرەنجام، هەمیشە یان زۆرجار، ڕەوتەکە لە خزمەتی بنیاتنان و پێشکەوتندایە.

## تێبینی

ئەم بابەتە لە ماڵپەڕی (ئیلاف)ی ڕۆژی ۲۰۰۳/۹/۲۰دا بۆ یەکەم جار بڵاوکراوەتەوە.

# بێدەنگی لێوان لێوە لە نەوتراوەکان

مارگۆت بیکڵ

لە فارسییەوە: فرزند شێرکۆ

دڵتەنگییەکانی مرۆڤ
(با) دەیکات بە گۆرانی،
خەونەکانیشی
ئاسمانی پڕ لە ئەستێرە گوێی ناداتێ،
هەر کلوە بەفرێکیش
لە فرمێسکێکی نەڕێژراو دەچێ.

بێدەنگی
لێوان لێوە لە وتەی نەبێژراو
لە جوڵەی نەکراو
دانپیانان بە عەشقی شاراوەداو
سەرسووڕمانێك کە نەکەوتۆتە سەر زمان

لەم بێدەنگییەدا
حەقیقەتی ئێمە شاراوەیە
حەقیقەتی تۆ و
منیش

بۆ تۆ و خۆم

چاوانێك دەخوازم
کە چراکان و نیشانەکان
لە تاریکییەکانماندا
ببینن

گوێیەك
کە دەنگەکان و شناسەکان
لە بێهۆشیماندا ببیستن
بۆ تۆ و خۆم، ڕۆحێك
کە ئەم هەمووە
لەخۆ بگرێ و قایل بێ
زمانێکیش
کە بە ڕاستگۆیی خۆی
ئێمە لە بێدەنگی خۆماندا
دەرکێشێت و
لێگەڕێت
لەو شتانە بدوێین کە کۆتیان کردووین

لە بەختەوەریمانە

ڕەنگە
ئەوەی کە دەمانەوێت
یا دەستمان ناکەوێت
یا لە دەستمان هەڵدێت.

دەمەوێت ببمە ئاو
لە پانتایی ئاسۆدا
لەوێدا کە دەریا دەگاتە کۆتایی و
ئاسمان دەست پێدەکات

دەمەوێت لەگەڵ هەرچیدا کە منی لەخۆ گرتووە ببمە
یەکێ.
هەست دەکەم و دەزانم
دەست دەگێڕم و دەترسم
باوەڕ دەکەم و هیوادارم
کە هیچ شتێك لەگەڵیدا ئینکاری نەکات
دەمەوێت ببمە ئاو
لە پانتایی ئاسۆدا
لەوێدا کە دەریا دەگاتە کۆتایی و
ئاسمان دەست پێدەکات.

چەند جار هیوات خواست و داوت نایەوە
تاکو دەستێکی یارمەتیدەر
وتەیەکی پڕ لە میهر
نەوازشێك
یا گوێیەکی خۆڕادێرت
دەستبکەوێ؟

چەند جار
داوەکەتت خاڵی دیتەوە؟

لەپێ مەکەوە
ئامادەبە کە جارێکی تر و جارێکی تر
داوەکەت بنێیتەوە!
لە پاش سەفەرگەلێکی زۆر و
تێپەڕین لە بەرز و نزمی شەپۆلی ئەم دەریا بەزریانە
لەوەدام کە
لە کەناری تۆدا لەنگەر بگرم
چارۆکە کۆکەمەوە
سەوڵ دانێم
سوکان بەردەم
بێمە خەڵوەتی لەنگەرگاتەوە و
لە پاڵتا دابنیشم
ئامێزی والآت ببینمەوە:
خۆڕاگریی پتەوی زەوی
لەژێر پێی خۆمدا

پەنجەمان لێك هەڵپێکاوە
بە دەستەکانمان
لەباتی ڕزگار بوون.
سەنگین سەنگین لە کۆڵ دەگرین
باری خەڵکانی دی
لەبری بەهاوڕێ بوونیان.

عەشقی ئێمە
خوازیاری ڕزگارییە
نەك زەوتکردن

لە ڕێگەی خۆتدا
بەخشندەیی هەیە نەك لەکۆڵ کردنەوە
بریندار
بەرگەنەگر
سەرسوڕهێنەر و پڕ ڕاز و ڕەمزە
خولْقاندن و

تەواوی ئەو شتانەی
کە بوون
دەگونجێنێ.

هەموو مەرگێك
ئاماژەیەکە
بۆ ژیانێکی دی

ئەم هەموو پێچە
ئەم هەموو تێپەڕینە
ئەم هەموو چرایە
ئەم هەموو هێمایە!

هەروەها خۆڕاگری لە وەفاداریدا
بە ڕێگەکەم
بە خۆم
بە ئامانجم و
بە تۆیش

وەفایەك کە من
و تۆ
بەرەو یەك ئامانج
ڕێنوێنی دەکات.

بە شوێن ڕێی خۆتدا بگەڕێ
وەك من
لە هەوڵی بە ئینسانی بووندا

لە نێوەندی ڕێدا
دیدار دەکەین لەگەڵ
حەقیقەتدا
ئازادیدا
خوددا

لە نێوەندی ڕێدا
شانازی دەکات و دێتە بەر
دۆستیەك کە توانامان پێدەبەخشێ
تا بۆ خەڵکی
پەنایەك بین و
هاوڕێیەك.

ئەمەیە ڕێگەی ئێمە
ڕێگەی تۆ و
منیش

لە بوونی هەرکەسێکدا
ڕازێکی گەورە شاراوەیە
داستانێك
ڕێیەك
کوێرە ڕێیەك
دەربڕینی ئەم ڕازە
–ڕازی من و ڕازی تۆ
ڕازی ژیان –
پاداشتی گەورەی هەوڵدانێکی پڕ دەستکەوتە.

گەلێك جاران
لەگەڵ یەکدا باس لە خەم و شادی خۆمان دەکەین.
بەڵام لە هەموو شتێکدا ڕازێك نییە
هەندێك جار قسەکردن لەسەر برینەکان پێویست
نییە
بێدەنگییە ناکامەکان
لە ڕازی ئێمە
دەتوانێ بدوێت.

سەیرت دەکەم و
دەزانم
تۆ تەنها پێویستیت بە نیگایەکە
تا دڵ بە تۆ بسپێرێت
خەیاڵت ئاسودە کات
بتکاتەوە
تا بێیتە دەرێ.

من دەکشێمەوە
و دەرگای نیوەکراوە
بە ڕووی تۆدا
دادەخرێت

بەرلەوەی پەنا بەرمە بەر تەنیایی خۆم
لە خەڵکانی دیی گلەیی دەست پێدەکەم
هاوار دەکەم کە:
"جێیان هێشتووم!"

بۆچی لەخۆم ناپرسم
کەسێکم هەیە
هەستم
بیر و خەونەکانم
ژیانم
لەگەڵ ئەودا دابەش بکەم؟

سەرەتای جیابوونەوە
ڕەنگە
لە خەڵکانی دیەوە
نەبووبێت

ئەڵقە بەردەوامەکان
بە دوای یەکدا
لە دوورەوە
بڕیاری دروستی ڕاستگۆیانە.

لەگەڵ خۆمدا وەفادار دەمێنمەوە ئایا
یاخود ڕێگەیەکی ئاسانتر هەڵدەبژێرم؟

بێ باوەڕی
دەرگایەکە،
بە خۆدا هەڵدان و ترس
کلیل و کلۆمی غرورە،
و نەداری
دیوارە و ئەڵقەرێزە
زیندانێك کە تیایدا
زیندانی بۆچوونی خۆمانین
دڵتەنگی خۆمان لەبەر ئازادی و دڵی خەڵکانی تر
لە درزەکانیانەوە
هەڵدەمژین.

تۆ و من
توانای ئەوەمان دۆزیەوە
کە بکرێینەوە
کە خۆمان بکەینەوە

ئەوەی کە خواستی منە
هێرشی ناکەمەسەر
بە تەواوی خۆمی تێ دەهاوم
ئەگەر لەوەدابم
تا جارێکی تر و جارێکی تر
بتوانم بە پێوە بوەستم
ڕێگەیەك بێجگە لەمە بەدی ناکەم
توانای دان بەخۆداگرتن

بۆ رووبەڕوو بوونەوە لەگەڵ ئەوەیدا کە دەبێت
رووبدات
بۆ بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ ئەوەیدا کە روودەدات
دان بەخۆداگرتن
کراوەیی
دان بەخۆداگرتن
ئازادبوون.

کە دەکەوینە ترسەوە
لە سەرمای دەوروبەری خۆمان
لە تاریکی و
لە کەمی رووناکی گەرمی بەخش،
چونکە هەمیشە
دایدەخەین
دەرگای کوخەکەمان
رۆحمان.

هاوڕێ ئەگەر دەتەوێت بمپارێزیت
لە دەستم دەدەیت

ئەگەر دەتەوێت هاوڕێیەتیم بکەیت دۆستی من
تا مرۆڤێکی ئازاد بم،
لە نێوانماندا پەیوەندیەکی لەو شێوەیە دەڕوێت
کە ژیانی ئێمە هەردووکمان
نوقمی چرۆ دەکات
من فێر بووم
گوێ لە خۆم بگرم و
دەنگێ ببیستم
کە پێم دەڵێت
"ئەم چرکەیە" چ دیارییەکم پێشکەش دەکات

فێرنەبووم
گوێ بۆ دەنگێ هەڵخەم
کە لەگەڵ مندا دەدوێت و
بێ پسانەوە دەپرسێت
من "بەم چرکەیە" چ دیارییەك پێشکەش دەکەم

شەونم و گەڵاکان بەستونی و
ئارەزوەکانی منیش
هەورە بەفرینەکان لە ئاسماندا بەیەکدا دەچن
با هەڵدەکا و
تۆفان دەگاتە جێ
برینەکانی من
قەتماغە دەکات

بەفر دەتوێتەوە
لە رۆحما
لە ئەندێشەکانما

بەهار
هاتنی تۆیە
بونی تۆیە

کەسێك دەڵێ "ئا"
بەر لەدایکبوونم
بە ژیانم
بە بونم
بێ هێزیم
بێ توانایم
مردنم

کەسێك دەڵێ "ئا"
بە من
بە تۆ

لە چاوەڕوانی درێژی
بیستنی وەڵامی مندا
بیستنی وەڵامی تۆ
ماندوو نابێت

فڕینی باوەڕ پێکردن
لەگەڵ یەکدا تاقی کەینەوە
دەنا دەشکێنین
باڵەکانی دۆستایەتیمان

لەژێر پێمدا
زەوی لە سمکۆڵانی ئەسپان دەلەرزێت
چوارناڵە تێدەپەڕن
کێوی، جڵەو پچڕاو، ترساو
بەرەو پێش هەڵدێن
ئەسپان
لە یاڵەکانیاندا لێك دەئاڵێ
ئارەزووەکانم
شانبەشانیان ڕادەکات
ویستەکانم

هەوا پڕە لە بۆنی ئەسپ و
خەم و
کەمێك شادمانی

لە ئاسۆدا
خاڵگەلێکی رەشی بچووك سەما دەکەن
زەوییەکیش کە لە سەری راوەستاوم
جارێکی تر زەوی ئارام بۆتەوە.
دەڵێی خەونێك بووە ئەو هەمووە:
خەونی ئازادی
یا

هەستی کۆت و بەند.

لە بێدەنگیدا
لەگەڵ یەکتر پەیوەندداربوون،
یەکدڵی ڕاستگۆیانە
وەفاداریی ڕەسەن.
باوەڕ بکە!

لە تەنهایی رامەکە
بۆ تەنهایی رامەکە
جارجار
بیدۆزەرەوە و
دانبەخۆدا بگرە و
ماوەیەکیش بدە
بە هێوری خەیاڵ!

یەکدی ئازار دەدەین
بێ ئەوەی بمانەوێت،
رەنگە باشتر ئەوە بێت
کە دەست بدەینە دەستی یەك
بە بێدەنگی

دەستێك کە کراوەتەوە
دەبات
دەهێنێت،
رینمایت دەکات
بە ماڵێك کە
رووناکیە دڵگیرەکەی گەرمی بەخشە

لە کەسێ ناپرسن چ کاتێ دەتوانێت ماڵئاوایی بکات
لە نەریتە مرۆڤانەکانی ناپرسن
لە ژیانی ناپرسن.

زەمانێك
لە پڕدا
دەبێت رووبەڕووی ئەو بێتەوە
بە خۆڕاگری
بە قایل بوون
بە ماڵئاوایی
بە دەردی مەرگ
بە هەڵوەرین،
تا جارێکی تر
بتوانێت هەستێتەوە

## سەرچاوە

همچون کوچەیی بێ انتها: وەرگێڕانی ئەحمەدی شاملو.

# تەپڵی ئاگر

کارلۆس فۆینتێس
لە فارسییەوە: ئەمین گەردیگلانی

## کورتە بیۆگرافیەکی نووسەر

کارلۆس فۆینتس بێشك یەكێ لە گەورەترین نووسەرانی سەدەی بیستەمە. ساڵی ١٩٢٨ لە پاناما لەدایکبووە. دایکی لە سینەمایەك خەریکی دیتنی فیلمی "قەرەچییەکان" بوو کە ژانی منالبوون گرتی و کارلۆس هاتە دنیا. باوکی باڵوێز بوو. ساڵانیکی زۆری لە وڵاتانی جۆراوجۆردا بەسەربرد، باوکی مێکزیکییەکی دەمارگرژبوو. بە زۆر کارلۆسی ناچار دەکرد مێژووی مێکزیك بخوێنێتەوە. هەر ئەو خوێندنەوەیەش بووە هۆی ئەوەی ببێتە نووسەر. مێکزیکی فۆینتێس میکزیکێکی ئاشنایە و لە نێو بەرهەمەکانیدا رەنگی داوەتەوە. نەتەوەیەك کە خاوەنی شۆڕشی شکست خواردووی زاپاتاو بزووتنەوەی خوێندکارانی زانکۆی ١٩٦٨ بووە لە دەرگانەی ئولەمپیکی مێکزیکوستیدا.

یەکەمین کۆمەڵە چیرۆکی بەناوی (رۆژانی دەمامك دار) ساڵی ١٩٥٤ بڵاوکرایەوە. ساڵی ١٩٥٥ بڵاڤۆکی پێداچوونەوەی ئەدەبیاتی مێکزیکی لەگەڵ نووسەرانی مێکزیکی دامەزراند. ساڵی ١٩٥٨ رۆمانی (ئەو ساڵانەی ئاسمان پاکە)ی بڵاوکردەوە و رۆمانی (ئارخەیان)یشی ساڵی ١٩٥٩ بڵاوکرایەوە. هەر لەو ساڵەشدا لەگەڵ کچە ئەکتەری مێکزیکی (ریتاماسدۆ) زەماوەندی کرد. (ئائوورا و مەرگی ئارتمیۆ کرۆس)ی ساڵی ١٩٦٢ بڵاوکردەوە. ساڵی ١٩٧٢ بووە ئەندامی هەمیشەیی کۆلیجی نەتەوەیی مێکزیك.

ساڵی ١٩٧٣ لەگەڵ رۆژنامەنووسی مێکزیکی (سیلویالۆمس) زەماوەندی کرد.

ساڵی ١٩٧٥ رۆمانی (ترانوسترا)ی نووسی و خەڵاتی (خاویەر و یائیرۆتیا)ی پێوەرگرت.

ساڵی ١٩٧٧ خەڵاتی (رۆمۆلۆخایگاس)ی (ونزۆئێلا)ی هەر بەو رۆمانەی ترانوسترا وەرگرت.

ساڵی ١٩٧٩ شانازیی وەرگرتنی خەڵاتی مێکزیکی (ئەلفونسوریس)ی بۆ تێکڕای بەرهەمەکانی بە قسمەت بوو.

فوئینتێس جگە لە کاری ئەدەبی لە کاروباری سیاسیشدا هەڵسووڕانی بووە. بۆ وێنە: نووسەری وەڤدی نوێنەرانی مێکزیك بووە لە کومیسیۆنی مافی نێونەتەوەیی سازمانی نەتەوە یەکگرتووەکان. جێگری

بەشی فەرهەنگیی زانستگای نەتەوەیی مێکزیکۆ. بەڕێوەبەری پێوەندیی روناکبیری نێونەتەوەیی لە وەزارەتی دەرەوەی مێکزیك. هەروەها سەرپەرشتی وەفدی نوێنەرانی مێکزیك لە کۆنفرانسی نێونەتەوەیی هاوکاری ئابووری و..

## تەپڵی ئاگر

لە شەوێکی مانگەشەوی مانگی مارسی ١٩١٣دا کە هەوا بۆنی گڵی لێدەهات، "ئینریکۆ ئیسپیدا" فەرماندای ئەیالەتی رووی کردە بەندیخانەی "بیلەن". سی چەکداری لەگەڵ بوو کە خۆیان لە لۆری فڕێدا خوارێ. چەن کەسیان بەسەر قۆڵیان لووتیان سڕی و چڵمەکەیان هەڵلوشییەوە. یەك دوو کەسیشیان جگەرەی بۆگەن و هەرزان باییان داگیرساند و چڕەدووکەڵیان سازکرد. چەن کەسی دیکەش بە دەلینگیان پۆستاڵەکانیان سڕی. "ئیسی یاس" بەسەر پاسەوانەکەیدا گوڕاند: "خەبەردار! جەنابی فەرمانداری ئەیالەتی."

ئیسپیدا گوتی: "بەڵێ! فەرمانداری ئەیالەتی دێتە ژوورێ."

"گابریل ئیرناندێس" لە نێو بەندەکەیدا خەوی لێکەوتبوو. پێلەقەی پۆستاڵێکی رەش لە خەوی هەستاند: "هەستە زووکە زوو!"

ئیرناندێس بە لەشگرانییەوە هەستاو لە بنەوە چاوێکی لە پاسەوانەکان کرد کە لە بەردەرکی بەندەکەدا ماتڵی بوون. سەرۆکی نیگابانەکان فەرمانی دا بیبەنە حەوشە.

هەوای دەرەوە لێڵ و مات بوو. دیواری خۆڵەمێشینی بەندیخانە لەزۆر جێگاوە کون کون ببوو.

ئیسپیداو ئیسی یاس و کاسائیگۆئیا سەر و سیغارێکیان داگیرساند. قاقای پیلان گێڕان بەرز ببۆوە. ژینراڵ ئیرناندێس کە لە نێوان نیگابانەکانەوە بەرەو بن دیوارەکە هەنگاوی دەنا، گوتی: "ناپیاوینە! ئەگەر ئێستا تفەنگێکم پێ دەبوو پێم دەگوتن پووتێك چەن سیەیە."

ئیسپیدا بەو دەستە قورسانەی شەپلاخەیەکی خێواندە پەناگوێی ئیرناندێس. ئیرناندێسیان بردە بن دیوارەکە و لەگەڵ قاقای فەرماندار‌دا پێنج چەکدار دەستڕێژیان کرد. کە دوایین گوللە تەقێندرا فەرماندار دەنگی قاقاکەی خاوکردەوە و گوتی: "هەر لێرە لەبن ئەو دیوارە ئاوری تێبەردن." کاتێ چەکدارەکان جەستەی دابێژ دابێژکراوی ئیرناندێسیان ئاورتێبەردا، دووکەڵە ڕەشەکەی بە سەروچاوی ئیسپیدا داچوو. هەر لەو کاتەدا "پوولا" لەگەڵ سێ بەندیی دیکە خۆیان لە نێو ماشێنی زباڵەدا شاردەوە و دەرباز بوون. پوولا لە ماوەی رێگەدا بیری لەوە دەکردەوە کە پیاو لە کاتی مردندا چ هەستێکی هەیە. رەنگە لەو کاتەدا بیهەوێ هاوار بکات و بگوڕێنێ بەسەر ئەوانەدا کە خەریکن دەینێژن و پێیان بڵێ، خۆ من نەمردووم بۆ گڵم بەسەردا دەکەن؟ هەر چواریان سەریان بە کەلێنی بنی ماشێنەکەوە نابوو بۆ ئەوەی بتوانن هەناسە هەڵکێشن. پوولا دەیویست ئەو نەختە هەوا تەپوتۆزاوییەش هەڵلووشێ. کاتێ ماشێنەکە راوەستا لەوانەبوو لە بۆگەنی زباڵەدا بخنکێن. زباڵەرێژەکان دووکەس بوون و دەرەقەتیان نەهاتن. خێرا هەردووکیان بە تەگەری ماشێنەکەوە شەتەکدان و بۆی دەرچوون. تا داوێنی کێوەکە تەپۆڵکە زوباڵە رۆکرابوو. پوولا کاتێ دەموچاوی پیس و جلوبەرگی تەڕو بۆگەنی هاوڕێکانی خۆی دی دڵی تێکەڵ هات.

یەکیان گوتی: "بەر لەوەی رۆژ بێتەوە دەبێ خۆمان بە هێزی "زاپاتا" بگەیەنین."

پوولا چاوێکی لە لاق و قولی رووت و پێخاوس و جلوبەرگی تەڕوشڕی هاوڕێکانی کرد. یەکیان حالی زۆر شپرزە بوو. سندم و زنجیر قولاپەی لاقی بریندار کردبوو و خوێن و جەراعاتی پێدا دەهاتە خوارێ.

پوولا و هاوڕێکانی بەرەو چیا تێهەڵگەڕان — کاتێ بە دەشتەکەدا دەڕۆیشتن زۆنگ بوو و لاقیان لە زەلکە و لیتەدا هەر جلقەی دەهات. کاتێ هەورازی کێوەکەشیان گرتەبەر دڕك و داڵ لاق و قولی بریندار دەکردن. کزەبا لە دار و دەوەن وەردەهات و هاژەو هووژەی بوو. پوولا بە سرتە گوتی: "هەتا "ترۆس ماریاس" دەچین و لەوێ لێکهەڵدەبڕێین. من و پێدرۆ بەلایەکدا دەڕۆین. "فرۆیان" تۆش لەگەڵ "باین دلفۆ" بەلای چەپدا بڕۆن، چونکە تۆ شارەزای رێگای "مۆرلیس"ی. دەبێ زۆریش وریا بین وەگیر ژاندارمەکان نەکەوین. خودا بکات دەستەیەکمان سەربازی زاباتا تووش بێ دەنا بەجارێ لێمان دەقەومێ.

فرۆیان گوتی: "سین دلفۆ بەو لاقە شەلەوە ناتوانێ بڕوا، تۆ ئەو لەگەڵ خۆتا بەرە من و پێدرۆ پێکەوە دەڕۆین."

سین دلفۆ گوتی: نا، هەموومان پێکەوە بین باشترە، جا چ دەبێ بابێ چش."

پوولا گوتی: "هەر ئەوەی کە گوتم ئەگەر یەکمان دەرباز بێ چاکترە لەوەی هەموومان بگرن و گوللەبارانمان بکەن و هیچمان نەمێنین."

کزەبا لەشی ماندووی دەرزی ئاژن دەکردن و بە کوێرە ڕێگادا هەورازیان دەبڕی. پوولا ئەو دەستەچکۆڵەی خۆیانی وەك سوپایەکی قارەمان دەهاتە بەرچاو کە بە لاقی پێخاوس و شەکەت و بریندارەوە دەڕۆنە پێشێ و ترپەی هەنگاویان وەکو خرمەی سمی ئەو ئەسپانە وایە کە بە دەشتی داغار دەدەن. دەڕۆیشتن تاکو کێوێکی مەزن فەتح کەن. لە ئاسۆوە گزنگی خۆر وەدەرکەوت. پوولا گوتی: "فرۆیان! لەبیرتە شەوی هەوەڵ چ هەڵلایەك بوو. دەنگی زرم و کوتی تەپڵی ئاور و قرمە قرمی گوللەم هەر لەبیرە. نۆرەی من هەر نەهات تاکو بنەڕێنم و بڵێم من لە ئێوە ناترسم. نایەڵم چاویشم ببەستن. پێم خۆش بوو نیشانیان دەم کە لەگەڵ کێ تێکەوتوون. بەڵام بەداخەوە نۆرەم هەر نەهات. دیتووتانە هێندێ جار ئەوانەی بۆ گوللەباران کردنیان دەبەن، دەگرین و دەکوڕووزێنەوە و دەپاڕێنەوە کە لە تاوانیان خۆشبن و نەیانکووژن. بەڵام من وا نەدەبووم.

ئەگەر بیانویستایە بمبەخشن بە زللە نەبوایە نەمدەدا لە روومەتیان. هەر کەسیان دەبردە بن دیوارەکە من خەم دایدەگرتم چونکە نۆبەکەی من وەدوا دەکەوت. پێم خۆش بوو من لە جێی ئەو گوللەباران کراوانە بوایەم. سەرم بەرز رادەگرت و وەك قارەمان سنگم دەردەپەڕاند. بەڵام حەیفێ."

پێدرۆ گوتی: "ئەگەر لەگەڵ من بی و بەجێم نەهێڵی گرنگ نیە و هەرچییەك بێتە پێشێ تاملی دەکەم. بەڵام ئەگەر بشمانگرن هەرچوارمان پێکەوە بین باشترە. پێکەوە گیراوین، پێکەوە هەڵاتووین، پێکەوەش دەمرین. پێم خۆش نیە بە تەنیا وەگیریان کەوم و بە گوللە دابێژ دابێژم کەن."

سین دلفۆ متەقی لێوە نەدەهات و ژانی لاق و قولی عەجمانی لێ هەڵگرتبوو. هێندێ جار برینی لاقی وەخوروو دەهات و دەکزاوە. فرۆیان گوتی: "بریا چۆڕێ ئاومان وەگیر کەوتایە خوێن و زنچکاوی ئەو داماوەم پێ خاوێن کردایەتەوە."

سین دلفۆ گوتی: "گوێی مەدەیە برالە ئاوم ناوێ."

پوولاش گوتی: "کوڕە دەبێ دەست لە نان و خۆراکیش دابشۆن."

پێدرۆ گوتی: "ئەگەر تەنیا بکەوین کاتی مردن کەس نابێ لانی کەم فاتیحایەکمان بۆ بنێرێ."

پوولا گوتی: "خەم مەخۆ، داڵ و سیارك هەن. خاك و خۆڵیش هەر هەیە. کرم و ماریش کاتێ لە گۆشتە رزیوەکەمان تێریان خوارد داوای خوالێخۆشبوونمان بۆ دەکەن."

لەژێر دارێك راوەستا و کەوتە گۆمی بیرو خەیاڵەوە. هەستی دەکرد دەبێ لە جێگایەکی دوورە دەست شوێنێك ببێ کە بتوانێ لەوێ ئۆقرە بگرێ. جێگایەك لەوپەڕی ئەم خەم و پەژارەی وڵاتە کاول و سووکایەتی پێکراوە. جێگایەك لەوپەڕی ئەم کوشت و کوشتار و تاڵان و برۆیە.

ئەو لە نێو پیسایی و زباڵە و گەنداودا نوقم بووە و خەڵکی مێکزیك هەر وە نازانن هەشە. بەڵام ئەم بە وڵاتەکەی وەفادارە و لەسەر بەڵێنی خۆی سوورە. ئەگەر بڕیارە ئەمان رزگارکەم لە پێشدا دەبێ لە بیری خۆمدا بم، ئەو ناکەسانە دەیانەوێ پێکەوە بمرین. دەزانم دەیانەوێ من لە پێشدا بمرم. بۆ ئەوەی مردنی خۆیان ئاسان بێ بەڵام دەبێ بیر لە حاڵی خۆم بکەمەوە بۆ ئەوەی زیندوو بمێنم و ئەوان رزگار بکەم.

فرۆیان گوتی: دیتان چ بەڵایەکیان بەسەر ژینراڵ ئیرناندێس هێنا. تەنانەت تەرمەکەشیان ئاور تێبەردا. بە تاقی تەنیا بوو. ئەگەر دیسان ئێمەش بگرنەوە ئەو بەڵایەمان بەسەر دێنن. چاك بوو هەر چوارمان دەرباز بووین."

سین دلفۆ گوتی: "نا نا! من نە لێرە پێم خۆشە تەنیا بکەوم و بمرم، نە لە بەندیخانە."

پوولا بە لقەدارێکی وشکەڵ کێشای بەشانیدا و گوتی: "هێندەت پرتاند دیقت پێکردین. تا ئێرە بەو لاقە شەل و شەوێقەتەوە باوکمانت هێناوەتە بەر چاومان. وەك چەققە پێمانەوە نووساوی. دە تۆزێ دەست لێکنێ با بزانین قوڕی کوێ بکەین بەسەر خۆماندا."

-"بەچاوان فەرماندە، بە چاوان."

کە گەیشتنە ترۆس ماریاس لێکجیابوونەوە. فرۆیان چوو بووە بن پیلی سین دلفۆ بۆ ئەوەی نەکەوێ و لەسەر پێ خۆ راگرێ. پوولا و پێدرۆش پێکەوە رۆیشتن. پێدرۆ سەرمای بوو. تەم و مژێکی خەست باڵای کوێستانی داگرتبوو و هەواکەی ساردتر کردبوو. دەبوایە کارێك بکەن نەکەونە بەرچاوی چەکدارە شەکەت و خەواڵووەکانی ژاندارمری و خۆیان بە هێزی زاباتا بگەیەنن.

بەلای پێگەی ژاندارمەکاندا تێپەڕین. بۆنی پاقلەی کوڵاو بەسەریاندا هات. تا کاتی خۆرنشین رێگایان کوتا. زەوی لەژێر پێیاندا ساردو مردبوو. پێدرۆ دڵی تێکەڵ دەهات. هەڵترووشکا و هێڵنجی دا. ئازای جەستەی کەوتە لەرزین و پەرۆشی کرد. پوولا دەستی دا بن پیلی و بەرزی کردەوە.

پێدرۆ گوتی: "هەر قسەی فرۆیانە. وەکو ژینڕاڵ ئیرناندێس گوللە بارانمان دەکەن و پاشان تەرمەکەمان ئاور تێبەردەدەن. چارەنووسی هەمووومان هەر ئەوەیە."

-"باشە هەستە دەی هێندەی لێ مەڵێ."

-"فەرماندە تۆی! لە ئێمەش بەهێزتری. بەڵام تۆش نازانی بە کام لادا بڕۆین باشترە. ئەوە گریمان گەیشتینە لای هێزی زاباتا. پاشان چیبکەین.

-"پێدرۆ! پیاو لە شەڕدا بیرناکاتەوە، شەڕ دەکا."

-"بۆچی شەڕ دەکا؟ کاتێك نازانی بۆچی شەڕ دەکەی. ئێمە ئەوە لێرە داماوین. تۆ برسیتە و منیش خەریکە تاویاو دەمکووژێ. تا ئێرەش هەولی

خۆمان داوەو بەشی خۆمان خەبات کردووە. وەرە با هەڵبێین و چش بکەین لە زاباتاش".

-"دەی باشە هەڵبێین بۆ کوێ؟ ها!"

-"جێگایەك هەر دەبێ. دەچینە "کوائۆتیا." رەنگە بتوانین لەوێ هێندێ پارە و دوو دەست جلوبەرگ پەیداکەین. پاشان دەچینەوە سەر ماڵ و ژیانی خۆمان".

-"پیدرۆ! دەمانگرن لادین! ئێستا وەختی وازهێنان نییە. بۆ هەرکوێ بچی دەتگرن."

-"پاشان چی؟"

-"پاشان دەچینەوە سەر ماڵ و ژیانی خۆمان".

-"یانی تا ئەو کاتە هیچ خەبەرێك نابێ و هیچمان بەسەرنایە؟"

-تۆش هێندە پرسیار دەکەی. پیاو لە شۆڕشدا ئەوەندە پرسیار ناکا. ئەو کارەی کە پێت سپێردراوە بەڕێوەی ببەو تەواو."

-تۆ دەزانی ئاکامی ئەم کارەمان بە کوێ دەگا! نا تۆ پێم بڵێ لەو شەڕەدا سەرکەوتوو کێیە؟"

-"من نازانم سەرکەوتوو کێیە. هەموو سەردەکەون پیدرۆ! هەر کەس لە شەڕا بە زیندوویی دەرچێ سەرکەوتووە. ئێمەش ئێستا زیندووین. هەستە دەی هەستە."

-تاویاو بڕستی لێ بڕیوم. دەڵێی لە ناوەوە گۆشتی لەشم دەپچڕن."

-"با بڕۆین هیدی شەو بەسەردا هات".

-"با هەر لێرە بخەوین، من لەوە زیاتر توانای رۆیشتنم نییە."

دەنگی سیرك لە هەموو لایەکەوە دەهات. پیدرۆ هەڵترووشکابوو و لە سەرمانا دەستی لێك دەخشاند. هەوا تاریکتر بوو. پێدرۆ دەستی کرد بە وڕێنە: "مەڕۆ، مەڕۆ هەر تۆ شارەزای رێگاکەی.. ئەگەر تۆ بڕۆی من بە تەنیا چبکەم. وەرە پاڵ بەیەکەوە دەین با تۆزێ گەرممان بێتەوە.." بە دەمەوە کەوت و لە نێو خاك و خۆڵدا گەوزی. دەستی بە بەرچاوی خۆیەوە گرت بۆ ئەوەی بزانێ زیندووە یان نا. شەوێکی تاریك و سامناك بوو. ترس سواری شانی بوو بوو.

هاواری کرد: "منیش لەگەڵ خۆت بەرە! هەر چاکتر وایە بگەڕێینەوە بۆ بەندیخانە. من لەم کێو و شاخە دەترسم. ئازادیم ناوێ. هەر کۆت و زنجیرەکەم چاکترە."

پێدرۆ دەستی لە ئەژنۆی وەرهێناو پێی وابوو هێشتا لە بەندیخانەیە. لە دڵی خۆیدا گوتی: "من پێم خۆشە لە بەندیخانەیەکی دروست و حیسابیدا بم، نەك بەندیخانەی سەرما و تاریکی. خودایە گیان من کۆت و زنجیرەکەمم دەوێ. من خۆ ئازاد لەدایك نەبووم، ئازادیم بۆچییە."

هاواری کرد: "بۆ کوێ دەچی؟ مەگین تۆ فەرماندە نیت! منیش لەگەڵ خۆت بەرە."

دەنگی لە ناخی کێوەکاندا بوو بە زایەڵە. پوولا سەرەو خوار هەڵدەهات تاکو خۆی بگەیەنێتە لای ئەو ئاورەی لە نێو دۆڵی "مۆرالس"دا کرابۆوە.

ژینڕاڵ "ئینیس یانووس" دەستی بە زگی خۆیدا هێناو هات لە قەراغ ئاورەکە دانیشت. کڵاوی گەورەی سەربازەکان و چاوی زیتیان لە تیشکی ئاورەکەدا کەوتبوونە سەما.

"دەی! کەوابوو لە بەندیخانە هەڵاتووی؟"

-"بەڵێ قوربان بە تەنیا هەڵاتووم. تاکو لەو کێو و شاخە تێپەڕم و خۆم بگەیەنمە هێزی زاباتا و هەمیسان دەست بکەمەوە بە خەبات."

ژینڕاڵ پێکەنی و گوتی: "بەراستی گەوجی! بۆرە پیاوی نەخوێندەوار. تۆ گەلاڵەی "ئەیالا"ت نەبیستووە. زاباتا بەو بەرنامەیەی گووی لە شۆرش

کردووە. جیکەیان لە "مادرۆ"بڕی. هەروەها ژینڕاڵ "ویکتۆریا نۆئۆئرتا"ش.

–"زاباتا چی بەسەرهات؟"

–"بە گۆڕی بابی زاباتاوە. من ئینیس یانووسم، نوێنەری یاسای دەوڵەت. بەیانی زوو دەتبەمەوە بۆ بەندیخانە. ڕێگایەکی دوورمان لەبەرە. شتێ بخۆ با نەمری لە برسانا."

پوولا بۆ جاری دووهەم کەوتەوە بەندیخانەی پڕ لە خەم و پەژارە.

نێو حەوشەکە ئێستاش پەڵە پەڵەی چەورو ڕەشی پێوە دیاربوو. ئەو شوێنەی کە ژێنڕاڵیان لێ سووتاند. کاتێ بەسەر خۆڵەمێشەکەدا هەنگاوی هەڵێنایەوە ئەژنۆی کەوتە لەرزین. خودا خودای بوو لە نێو بەندەکەی بکەن و دەستی لە کۆڵ کەنەوە تاکوو سەرخەوێك بشکێنێ. دوو ئەفسەر خۆیان کرد بە ژووریدا. یەکیان بۆرەڵووکە بوو. خێرا هەڵیدایە و گوتی: "پێویست بە شێر و ڕێوی هێنانەوە ناکا، بتەوێ و نەتەوێ لەو بن دیوارە ڕاتدەگرین و گوللەبارانت دەکەین. بەڵام دەبێ شوێنی قایم بوونی هاوڕێکانیشت ئاشکراکەی. پێم بڵێ بزانم پێدرۆریۆس و فرۆیان ریبی یرۆ و سین دلفو ماسووتێل لە کوێن؟"

–" ئێوە خۆ هەر دەیانگرنەوە هیدی بۆ لە من دەپرسن."

–"زمان درێژی مەکە، بۆ چاوترسێن کردن دەبێ هەر چوارتان پێکەوە بەو دیوارەوە بنێین و گوللەبارانتان بکەین. پێمان بڵێ لە کوێن، دەنا هەر سبەینێ لە پێشدا تۆ ئیعدام دەکەین."

درگای بەندەکەی شەققەی لێوە هات و پێوەدرا.تەپەی پێی دوو ئەفسەرەکە وردە وردە دوورکەوتەوە. بایەکی سارد لە نێوان میلەکانەوە بە هاژەهاژ هاتە ژووری و وەلەرزینی خست. پوولا خۆی بەسەر عەرزەکەدا ڕەهێل کرد بۆ ئەوەی بایەکە لێی نەدا.

"سبەینێ بە تاقی تەنیا لەو بن دیوارە. کاتێ بەسەر خۆڵەمێشی ژینراڵدا ڕۆیشتم ئەژنۆم کەوتە لەرزین. ئێمەش دەبینە خۆڵەمێش. پێدرۆ لە خۆڵەمێشی من و سین دلفۆ لە خۆڵەمێشی پێدرۆ و فرۆیان لە خۆڵەمێشی سین دلفۆ.. تەنانەت فریای خوداحافیزیش ناکەوین. دەمویست ببمە قارەمان. بەڵام کاتێ لەو بن دیوارە ڕاتدەگرن دەبێ چ هەستێکت ببێ. کاتێ گوللە لە زگت دەدرێ و کونی دەکا یەك و دوان و سیان.. تەنانەت فریاناکەوی خوێنەکەشت ببینی. ناتوانی ئەو ئەفسەرەش بە جوانی ببینی کە گوللەی خەلاست لێ دەدا. گوللەیەك ڕاست لە تەختی نێوچاوانت دەدا. تەتەق. خودایە چەندە سامناکە. دەترسم.. زۆر دەترسم.. ئێوە خۆ گوللەباران ناکرێن تاکوو بزانن دەردەکەی چۆنە. ئاگاتان لە دڵی من نییە. بەڵام هاوڕێکانم دەزانن. دەتوانین پێکەوە قسە بکەین. باسی گوللە بکەین و هەمووومان پێکەوە بمرین."

پوولا هەستا سەرپێ و شەقەشەق کێشای بە میلەکاندا و بە نیگابانەکەی گوت: "کارم بە سەرۆك نیگابانی زیندانە."

ڕۆژی یەکشەممە کەڕەی بەیانی هێشتا گازەنگی کلێسە نەزڕابوو کە پوولا ڕووت و قووت و خەواڵوو و لەش داتەپیو بە ڕێڕەوی بەندیخانەکەدا تێپەڕی. دەیویست هەموو شتێ وەبیر خۆی بێنێتەوە. هەوڵی دا ژن و منداڵ و دایك و باوکی بێنەوە بیری، بەڵام تەنیا مەلێکی خووساوی دەهاتە بەرچاو کە لە دەشتێکا کەوتبووە نێو چۆمێکەوە. نیگابانەکان لەبەردەرکی بەندێکی دیکە ڕاوەستان. فرۆیان و پێدرۆ و سین دلفۆیان هێنایە دەرێ. دەموچاویانی نەدەدی بەڵام لێی ڕوون بوو کە

ئەوانن. ئێستا بڕیار بوو هەموو پێکەوە بمرن. هەر چواریان. ئەو هەستە قارەمانانەیە لە ناخیدا ژیایەوە. قارەمانگەلێکی گەورە بەڕیز لەبن دیوارەکە راوەستان و روویان کردە تیپی ئیعدام.

پوولا گوتی: "هەمووومان پێکەوە دەچین بۆ ئەو دنیایەی دیکە."

سین دلفو گوتی: "داڕزێن بۆ رێگایەك کە هەڵتانبژارد بۆ مردن."

پوولا گوتی: "دەست دەدەینە دەست یەك و پێکەوە دەمرین." چاوێکی لە هاوڕێکانی کرد. پێی وابوو مەرگ لە پێشدا بەرۆکی هاوڕێکانی دەگرێ. چاوی قووچاند تاکوو بەر لە هاتنی مەرگ چاوی بە مەرگ نەکەوێ. قرمەی گوللە دەستی پێکرد. باڵندە خووساوەکە بە لەت و کوتی کەوتە نێو چۆمەکەوە.

ئەفسەری بەندیخانەکە دەمانچەی دەرهێنا تاکوو گوللەی خەلاسیان پێوەنێ کە هەرچواریان لەسەر عەرزەکە کەوتبوونە گێنگڵ دان.

پاشان رووی کردە چەکدارەکانی تیپی ئیعدام و نەڕاندی:

"جارێکی تر ئەگەر بە یەکەم گوللە ئەو زۆڵانە سارد نەکەنەوە خۆم دەزانم چیتان لێ دەکەم."

چاوێکی لە دەستی خۆی کرد. وەرچەرخاوەو دوورکەوتەوە.

## سەرچاوە

گۆڤاری کارنامە. ژمارە ٣١ خەزەڵوەری ١٣٨١.

وەرگێڕ بۆ فارسی: ئەسەدوڵڵا ئەمرایی.

## وتەی سەرەتا

# عەلمانیەت

عەلمانیەت لێك جیاكردنەوەی ئایینو دەوڵەتە، واتە سەبەخۆبوونی دەوڵەت ـ سیاسەتە (لە بواری یاسادانانو فەرمانڕەواییكردندا) لە دەسەڵاتی دامەزراوەییو مەعنەوی ئایین، چونكە دەوڵەتی عەلمانی پرنسیپەكانی خۆی لەو بەهایانەوە هەڵدەهێنجێ كە گرێدراوی چالاكیی كۆمەڵایەتی مادیی ڕاستەخۆی مرۆڤەكانن، نەك لە بەهای ڕووتەوە، هەروەها ئامڕازی هێنانەدیی "مافی مرۆیی"ـە نەك هێنانەدیی "مافی خواوەندانە". ئەمە بێ گوێدانە شێوازی ئەو مافە مرۆییە یان چۆنایەتیەی پێی دەهێنرێتەدی كە زۆربەی كات پەیوەندییەكی ڕاستەوخۆی بەو دەستەبژێرە سیاسییەوە هەیە كە جڵەوی دەسەڵات دەكاتو وێناكردنو لێكدانەوەی تایبەتی خۆی سەبارەت بەو مافە دەسەپێنێ.

لێك جیاكردنەوەی ئایینو دەوڵەت، مانای ڕەتكردنەوەی ئایین یاخود دوورخستنەوەی ئایین لە كۆمەڵگە نییە بە هێزی یاسا، چونكە عەلمانیەت ئایین یان كارپێكردنی ئایینی ڕەت ناكاتەوە، بەڵكو سیاسەتو ڕێكخستنی كۆمەڵایەتی لە پانتایی كارپێكردنی ئایینی دەكاتە دەرەوە، هەروەها كارپێكردنی ئایینی لە پانتایی سیاسیو كۆمەڵایەتی بەدووردەگرێت، بۆ ئەوەی بیگێڕێتەوە بۆ نێو تاكە چوارچێوەی خۆی كە پانتایی كەسێتییە. ئەمەش مانای ئەوەیە، عەلمانیەت هاوجووتی بێبڕوایی نییە، چونكە ئەگەر عەلمانییەت مانای بێبڕوایی بوایە، ئەوا دەوڵەت دەبوە یەكێك لە گروپەكانی كۆمەڵگەی شارستانیو لەوە دەكەوت دەوڵەت بێت. واتە فرمانی سەرەكیی خۆی كە بریتییە لە ڕەتكردنی دابەشكردنە ڕۆشنبیرییو بڕواخوازییەكانی كۆمەڵگە، لەدەستدەداتو درزێك دەخاتە دیواری هاوسەنگییەكانیەوەو برەو بە پەرچەكرداری توندوتیژی ئەو گروپانە دەدات كە چیتر وەك هێزگەلی دەوڵەت نامێننەوە. بەوەش دەوڵەت چوارچێوەیەكی بەكردەوە نابێت بۆ كۆدەنگیی (اجماع) سیاسی، بەڵكو لایەنێكی ناكۆكی شارستانی جێگیر. سەرەنجام دەوڵەت دەرفەت بۆ پڕۆسەی داڕمانی خۆی خۆشدەكات، چونكە مۆڵەتدەدات بە ململانێ لە دەرەوەی بواری سروشتی خۆی (بواری سیاسی)و دەبێتە هۆی دامەزراندنی سیاسەت لەسەر بناغەی توندوتیژی. ئەمەش دەبێتە هۆی دەرگاكردنەوە بەڕووی ململانێی ناوخۆی چەكدارانەدا كە دەبێتە هۆی هەڵوەشاندنەوەی دەوڵەت پێش كۆمەڵگە.

كەواتە عەلمانیەت پەیمانێكی زەمینیە لە نێوان گروپە كۆمەڵایەتیە جۆربەجۆرەكاندا، كە بەهۆیەوە

هەر گروپێك بەها تایبەتیەكانی خۆیو سیستەمی پێوانەكاریی خۆی دەپارێزێو لەنێو پەیوەندیی دوولایەنیی نێوان خۆیو گروپەكانی تردا بەدوای بەها (بەهاگەلێك)ی كۆمەڵایەتیدا دەگەڕێت كە گشتگیری دروستدەكاتو جیاكارەییەكانی كۆمەڵگەی شارستانی دەتوێنێتەوە. دەشێ ئەو بەهایە ئازادیی (و دامەزراوە سیاسییە جۆراوجۆرەكانی) بێت یان سۆسیالیزم، سیستەمی لیبرالی یاخود سیستەمی ئاراستەكار بێت. لە چوارچێوەی ئەم كۆدەنگییەدا هەر گروپێك، جا گروپێكی نەتەوەیی بێت یان ئایینی یاخود زمانەوانی، دەتوانێت ناسنامەی خۆی بپارێزێت، بەمەرجێك ئەو پاراستنە نەبێتە هۆی لە دەستدانی بەرپرسیارێتیەكانی بەرامبەر بە لایەنەكانی كۆدەنگییەكە گشتیەكە.

بێگومان ئەگەر ئەو پەیمانە بەرهەمی ڕێكەوتنێكی بەكردەوەی ڕەزامەندخوازانە نەبێت لە نێوان ئەو گروپانەی كۆمەڵگە پێكدێنن، ئەوا ناتوانێت كۆدەنگیی سیاسیی ڕاستەقینە دەستەبەربكات. واتە كاتێك ڕوودەدات كە گەشەكردنی ڕۆشنبیریو سیاسیی هێزەكانی ناو گۆمەڵگە بووبێتە هۆی هێنانەئارای هۆشیارییەك سەبارەت بە گرنگیی بەرهەمهێنانی سازشێكی هاوسەنگو ئارام هەتا ئەو ڕادەیەی گروپەكان تیایدا دڵنیابن بەرامبەر بە بەرژەوەندییە تایبەتیو گشتییەكانی خۆیان. دەشێ لێرەدا چینێكی كۆمەڵایەتی یان هاوپەیمانیەكی نێوان چینەكان ڕۆڵی هەبێت لە بەرهەمهێنانو ڕابەرایەتیكردنی ئەو سازشكردنەدا، وەك ئەوەی چینی بوارژوا لە فەڕەنسا یان هاوپەیمانێتی چینی بۆرژواو خاوەن زەوییەكان لە ئەڵمانیا، بەڵام بەبێ ئەوەی ئەو بەرهەمهێنانە یاخود ڕابەرایەتیكردنە هیچ پەیوەندییەكی بە ڕەتكردنەوەی كۆمەڵگەی شارستانیەوە هەبێت. واتە بەبێ ئەوەی ئەو پەیمانە لە سەرەوەڕا لەلایەن چینێك، هاوپەیمانێتیەكی چینایەتی، تایەفەیەك یان نەتەوەیەكەوە زۆرەملێیانە سەپێنرابێت. چونكە لەم بارەدا سازشەكە لەسەر بناغەیەكی ساختەكارانە دادەمەزرێو تەنیا بەهێزی كوێرانە دەپارێزرێتو سازشێكی فشۆڵو نائارام دەبێتو ڕووبەڕووی ئەگەری داڕمانی خۆیو كۆمەڵگەش دەبێتەوە. لەبەرئەوەی دەوڵەت بێ جۆرێك لە ڕەزامەندیو قبوڵكردن دانامەزرێت.

كاتێك چەمكی عەلمانیەت بە لێك جیاكردنەوەی ئایینو دەوڵەتو دەستەبەركردنی یەكبوونی گشتی لەسەر بنچینەی پەیمانێكی كۆمەڵایەتی دەستنیشاندەكەین، پێویستە بە كورتیش باسی واتەی ئەو یەكبوونە بكەین كە گرێدراوی هەموو سیستەمێكی عەلمانی ڕاستەقینەیە، ئەمەش بۆ ڕەواندنەوەی هەر تێكەڵكردن یان ئاڵۆزییەك كە ئەنجامی بەكارهێنانی ئەم چەمكە سەرهەڵدەدات. چونكە ئەو یەكبوونە سیاسی . شارستانیەی مەبەستە ئەو جیاوازییە چینایەتییە ئاسۆییانە ڕەت ناكاتەوە كە هەر بنەمایەكی كۆمەڵایەتی لەسەری ڕادەوەستێت، بەڵكو دابەشكارییە توێژگەرییە شاقوڵییە بەمیرات بۆماوەكان ڕەتدەكاتەوە یاخود كاریگەییان لە ژیانی سیاسیی گشتیدا سنووردار دەكات. لە ئەوروپا (جێگەو نموونەی عەلمانیەت) بانگەوازی عەلمانیەت دابەشكردنە كۆمەڵایەتی - چینایەتیەكانی ڕەت نەكرایەوە، بەڵكو بە پێچەوانەوە زیاتر لە قۆناغی پێش شۆڕشە بۆرژواییەكان ڕێڕەوی پێكهاتنو خەملێنیان بۆ والاكرا، كەچی لە باری وڵاتەكانی "دنیای سێ"دا هەتاكو ئێستا ئەو كۆمەڵگەیانە گیرۆدەی هاوكێشەی ئاڵۆزن كە لە پێكهاتەیاندا دابەشكردنە شاقوڵیو

ئاسۆییەکان ئاوێتەی یەکترن. ئەمەش بۆتە ڕێگر لەبەردەم لێک جیاکردنەوەی کۆمەڵایەتی خاوەن سروشتی ڕوونو ئارامبەخشدا. ئەو دابەشکردنانەش بەگشتی پەیوەندییەکی توندوتۆڵیان بە یەکگرتوویی کۆمەڵگەوە هەیە (کە پەیوەندیی بە بابەتی یەکبوونەوە هەیە)، لەبەرئەوەی دابەشکردنە شاقوڵیەکان بەپێچەوانەی دابەشکردنە ئاسۆییەکان، یەکگرتوویی کۆمەڵگە ڕەتدەکەنەوە، چونکە بوونی تایەفەیەکی دیاریکراو بێ تایەفەیەکی دیکە شیاوەو دەشێت تایەفەیەك جیابێتەوەو بەتەنیا نیشتمانێك پێکبێنێ، بەڵام بوونی چینێکی دیاریکراو بێ چینێکی دیکە لە ڕووی پراکتیکیو لۆژیکییەوە مەحاڵە. ئەو یەکبوونەی یەکگرتوویی کۆمەڵگەیەك یان میللەتێك یاخود نەتەوەیەك دەپارێزێ، بەرهەمی ئەو هەڵوەشاندنەوەیەیە کە لەناو کۆمەڵگەی تیرەگەری تەقلیدیی دامەزراودا ڕوودەداتو لەسەر بنچینەی دابەشکردنی شاقوڵی دامەزراوە، بۆ ئەوەی بڕژێتە ناو بزووتنەوەی تواندنەوەی هاوتەریبی دامەزراو لەسەر بنچینەی بەهای مرۆڤکردەی هاوبەش. لەم بزووتنەوەی تواندنەوەیەدا کۆمەڵگە بەپێویست ڕووخسارەکانی دابەشبوونی کۆمەڵایەتی بنەڕەتی لەدەست نادات کە لەسەر توخمی دیکە دامەزراون. کەواتە ئەگەر ئیشکالیەتی ئەم دابەشبوونەی دوایی گرێدراوی پەیوەندیی بەرهەمهێنەر و ئامرازەکانی بەرهەمهێنان بێت، ئەوا ئیشکالیەتی دابەشبوونەکەی گرێدراوی پەیوەندیی هاوڵاتیو دەوڵەتە یاخود پەیوەندیی "کۆمەڵگەی شارستانی"و "کۆمەڵگەی سیاسی"یە.

بێگومان ئەو دەربڕینەی سەرەوە کە سەبارەت بە عەلمانیەت خراوەتەڕوو سەرچاوەیەکی فیکریی تیۆری هەیە، ئەویش سیستەمی فیکریی لیبرالیزمی خۆرئاواییە کە پشتئەستوورە بە سەرچاوەیەکی مێژوویی: شۆڕشە بۆرژواییەکانی ئەوروپاو دامەزراندنی دەوڵەتی عەلمانی نوێ. ئەمەش مانای ئەوەیە دەربڕینەکە واتایەکی ڕێژەیی هەیەو گرێدراوی دۆخێکی مێژووییو کۆمەڵایەتیە کە یەکێك لە جۆرەکانی لێك جیابوونەوەی دەسەڵاتی ئایینیو دەسەڵاتی سیاسی بەخۆوەی دیوە. بۆیە هیچ بەهانەیەك بەدەستەوە نییە بۆ دانانی ئەم دەربڕینە لە سەروو مێژووەوەو هەر هەوڵدانێکیش بەو ئاڕاستەیەدا پەیوەندیی بە مەیلی ئەوروپاسەنتەریزمەوە هەیە، کە ڕاستیی هەنگاوێك بە تەبایی لەگەڵ مۆدێلە ئەوروپییەکەیدا دەپێوێ. جا لێرەدا ئەگەر ڕەوتی ئەوروپاسەنتەریزم لە خۆرئاوا جۆرێك لەباڵادەستی هەبێت، ئەوا ڕەوتی داڕشتنەوەی ئیشکالیەتی عەلمانیەت لای هەندێ ئاقاری ئێمە لە گۆڕێیە بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ئەو مامەڵکردنە لەگەڵ عەلمانیەت بەو شێوەیەی لە خۆرئاوا هەبووە، بێ ڕەچاوکردنی ئەوەی عەلمانیەت لە چوارچێوەیەکی مەعریفیو مێژوویی دیاریکراودا مامەڵەی لەگەڵ دەکرێت کە جیاوازە لەگەڵ ڕەوتی گەشەکردنی سیاسیو کۆمەڵایەتی خۆرئاوادا.

بەڕێوەبەری نوسین

# عەلمانییەت چییە؟

**عادل ضاهر**

لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

لە بەشی یەکەمی ئەم کتێبەدا بە کورتی پرسیارە بنچینەییەکانمان خستەڕوو و ئێستاش بە درێژی بە دوای وەڵامی ئەو پرسیارانەوە دەبین. باشتر وایە بۆ خستنەڕووی بایەخ و گرنگیی عەلمانییەت و چۆنیەتی دامەزراندنی هەڵوێستی عەلمانیانە لە ڕووی فەلسەفییەوە، بۆچوون و تێگەیشتنی خۆمان لە بارەی "عەلمانییەت"[1]ەوە ڕوون بکەینەوە. هەروەها بەرلەوەی لە چەمك و تێگەیشتنی باوی عەلمانییەت بدوێیین لە ناوەندی ڕووناکبیرانی ئێمەدا و بەرلەوەی خاڵە لاوازەکانی ئەو تێگەیشتنە دەستنیشان بکەین، دەبێت لە سەرەتادا شتێك لە بارەی وشەی "عەلمانییەت" ڕوون بکەمەوە.

لەناو ڕۆشنبیرانی ئێمەدا بۆ ماوەیەکی درێژ و تا ئەمڕۆش وا بڵاوبۆوە کە دەبێ ئەم وشەیە بە "عیلمانییەت" بخوێنرێتەوە بەو پێیەی ئەم وشەیە لە "عیلم"ەوە وەرگیراوە. بەڵام لە ڕاستیدا ئەمە هەڵەیە و دەبێ ڕاستی بکەینەوە. وشەی "عەلمانییەت" لە "عالەم"ەوە وەرگیراوە نەك لە "عیلم"، بۆیە ڕاستتر وایە بڵێین "عەلمانییەت" نەك "عیلمانییەت"[2]. کەواتە لێرەدا جیاوازییەك هەیە لە نێوان هەردوو وشەی "عەلمانی" و "عیلمانی". عیلمانی کەسێکە مەعریفەی زانستی لە زانستە سروشتییەکانەوە وەردەگرێ و لەو بوارەدا کاردەکات. واتە کەسی عیلمانی پشت بە تێڕوانینی پۆزەتیڤیزم دەبەستێ و دان بە شیمانەی مەعریفەی مۆراڵی و ئایینی و میتافیزیکیدا نانێت چونکە ئەمانە لە ڕووی پرەنسیپەوە مومکین نییە بچنە ژێر فۆرم و پێوەرەکانی زانستەوە. ئەوەی ئێمە لەم کتێبەدا مەبەستمانە بە هیچ جۆرێك پەیوەست نییە بە عیلمانییەتی پۆزەتیڤیستەوە یان هەر هەڵوێستێکی تری نزیك لە پۆزەتیڤیزم. ئەوەی لێرەدا مەبەستمانە عەلمانییەتە و ئەمەش بە گشتی هەڵوێست لە سروشتی مەعریفە لە خۆ ناگرێ بە تایبەتی لە مەعریفەی زانستی. عەلمانییەت بە پلەی یەکەم بایەخ بە مرۆڤ دەدات لە جیهان و لەناو دنیادا و جەخت لە سەربەخۆیی عەقڵی مرۆڤایەتی دەکات و

هەروەها لە بەکارهێنانی عەقڵ لەلایەن مرۆڤەوە لە هەموو بوارەکاندا. لەمانەش گرنگتر عەلمانییەت رۆڵێکی گەورەتر بە مرۆڤ دەبەخشێت تا بە سەربەخۆیی لە ئایین و لە دەرەوەی ئاییندا کەشفی جیهان بکات. کەواتە عەلمانییەت، بەم مانایە، بریتییە لە هەڵوێستێکی ئیپستیمۆلۆژی تا ئەو سنوورەی دەبێتە هەڵوێستێك لە سروشتی مەعریفەی زانستیش لە پەیوەندیدا بە مەعریفەی ئاینییەوە. کەسی عەلمانی مەرج نییە کەسێکی عیلمانیش بێت[٣].

ئێستا بابگەڕێینەوە بۆ ئەو پرسیارە سەرەکییەی لەم بەشەدا مەبەستمانە بیخەینە ڕوو: ئەو تێگەیشتنە باوەی عەلمانییەت چییە کە لەناو روناکبیرانی ئێمەدا بڵاوە؟ سیما و جەوهەری ئەو عەلمانییەتە کامەیە و خاڵە لاواز و ناتەواوییەکانی ئەم تێگەیشتنە چین و چ ڕێگە و شێوازێك بۆ سڕینەوەی ئەو تێگەیشتنە باوە لە ئارادا هەیە؟

چەمکی باوی عەلمانییەت لەلای ئێمە ئەو چەمکەیە کە عەلمانییەت لە نیاز و مەبەستە زانراوەکانیدا دەناسێت نەك لەو بنچینە ئیپستیمۆلۆژییەی عەلمانییەتی لەسەر رادەوەستێت. بەشێوەیەکی روونتر، چەمکێك لەو نیاز و ئامانجانەوە عەلمانییەت دەناسێنێت کە بزاوتە عەلمانییەکانی خۆرئاوا لە پێناویدا تێکۆشاون. یەکێ لە ئامانجە گرنگەکانی ئەو بزاوتانە بریتییە لە نەهێشتنی دەسەڵات و هەژموونی کڵێسە بەسەر کاروباری سیاسەتەوەو رزگارکردنی دەسەڵاتی سیاسی لە هەر کاریگەرییەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆی دەسەڵاتی ئایینی کە خۆی لە ئەکلیرۆسدا دەبینێتەوە[٤]. (واتە جیاکردنەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە دەسەڵاتی ئایینی). هەندێجار بەشێ لە روناکبیرانی ئێمە لەوە تێدەگەن کە عەلمانییەت نیاز و ئامانجی لەوە دوورتری هەیە، واتە ئامانج و نیازی دیکە غەیری ئەوانەی باسمان کردن، ئامانجێك ئەو قۆناغە مێژووییە دەیسەپێنێ کە مرۆڤ خۆی تیادا دەبینێتەوە. بۆ نموونە لە سەرەتاکانی شکڵگرتنی بیری نەتەوایەتیماندا بەشێکی گەورەی رۆشنبیرە ناسیونالیستەکانمان مەیلێکی بەهێزیان هەبوو بۆ تێگەیشتن لە عەلمانییەت بەو سیفەتەی فاکتەرێکی پێویستە بۆ دابینکردنی یەکێتی کۆمەڵایەتی و پەرەپێدانی ئابووری و دەرچوون لە هەموو شێوەکانی پاشکەوتوویی. عەلمانییەت، بەم مانایە، پەیوەست بوو بە ڕەوتی نوێکردنەوەی کۆمەڵگاوە.

هەندێ کەس لەم تێگەیشتنەی عەلمانییەت دوورتر دەڕۆن. بۆ نموونە ناصیف نصار وایدەبینێ دەوڵەتی ئایینی مۆرکێکی توتالیتاریانەی هەیە و لەوێدا دامەزراوی ئایینی دەبێ بە مەرجەعی کۆتایی و رەها بۆ هەموو مەسەلەکانی دین و دونیا[٥]. لە ژێر رۆشنایی ئەم تێگەیشتنەی دەوڵەتی ئاینیدا عەلمانییەت دەبێ بە هەڵوێستێکی دژ یان دژایەتی توتالیتاریزمی ئایینی. زۆر بە دەگمەن کەسێ دەبینین لە مانا قووڵەکانی عەلمانییەت بکۆڵێتەوەو هەوڵبدات تێڕوانینە فەلسەفییەکانی عەلمانیەت ئاشکرا بکات. جگە لە ئەنتوان سەعادە، لە نێوان رۆشنبیرە ناسیونالیستەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، روناکبیرێکی ناسیونالیست نابینین تا ئەو سنوورە سەیری عەلمانییەت بکات کە هەڵوێستێکە لە سروشتی ئایین و بەهاو عەقڵ و مرۆڤ و پەیوەندی بە خوداوە[٦]. لە نێو بیریارانی عەرەبدا بە گشتی جگە لە محەمەد ئارکۆن کەسێ نابینین بەو سیفەتە بایەخ بە عەلمانییەت بدات و لێی بکۆڵێتەوە کە هەڵوێستێکە لە مەسەلەی مەعریفە[٧].

بۆ نموونه ئەوانەی دژایەتیی مۆرکی توتالیتاریزمی ئایین دەکەن تەنها تەرکیز دەکەنە سەر ئەو مەسەلە ئەخلاقیانەی پەیوەستن بە ماف و ئازادییەکان و کەچی مەسەلە ئیپستیمۆلۆژییەکان فەرامۆش دەکەن، بە تایبەتی سەربەخۆیی مەعریفی لە عەقڵی مرۆییدا. ئەمانە وایدەبینن حوکم و دەسەڵاتی ئایین بەسەر هەموو مەسەلە رۆحی و دنیاییەکاندا هەڕەشەیەکی ترسناکە بۆ سەربەخۆیی مرۆڤ لە هەردوو ئاستی مۆراڵی و سیاسیدا، بەڵام زۆر بە دەگمەن ئاماژە بۆ ترسناکیی دەسەڵاتی ئایینی دەکەن بەسەر سەربەخۆیی ئیپستیمۆلۆژیی عەقڵ.

وتمان بیرۆکەی باوی رووناکبیرانی ئێمە بۆ تێگەیشتن لە عەلمانییەت ئەوەیە کە لە نیاز و ئامانجەکانی عەلمانییەت دەکۆڵنەوە، بە تایبەتی ئەو ئامانجانەی بزاوتە عەلمانییەکانی خۆرئاوا هەر لە چەرخی رێنیسانسەوە لە پێناوی بەدیهێنانیدا خەباتیان کردووە. ئەم جۆرە تێگەیشتنە بۆ عەلمانییەت – لەبەر کۆمەڵێ هۆکاری رۆشن و زانراو – باشترین چەمك و تێگەیشتنە لە لای روناکبیرە ئایینخوازەکانی ئێمەدا. چونکە روناکبیرە ئایینخوازەکان باوەڕیان وایە لەم چەشنە چەمك و تێگەیشتنەدا دەتوانن بە ئاسانی بگەنە ئەو دەرەنجامەی کە گوایە عەلمانییەت هیچ شوێنێکی لە ئیسلامدا نییە. ئەم چەمکە سادەگۆییە بۆ عەلمانییەت چەمکێکە لەگەڵ ئایدیۆلۆژیای ئاینیدا گونجاو و ڕێك دێتەوە چونکە پێیان وایە ئەم تێگەیشتنە بە پلەی یەکەم بریتییە لە بانگەشەی جیاکردنەوەی کڵێسە (یان هەر دامەزراوێکی ئایینی) لە دەوڵەت و رەتکردنەوەی ئامۆژگاری و بانگەشەکانی کڵێسە بەسەر کاروباری دونیاییدا. کەواتە ئەو ئایدیۆلۆژیا شەرعانی – ئاینییەی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ کە ئیسلام بریتییە لە دین و دەوڵەت، ئەوا مومکین نییە لە دەرکەوتەی یەکەمیدا بە هیچ جۆرێ گوێ لە بانگەشەکانی عەلمانییەت بگرێ مادامەکی لە ئیسلامدا دامەزراوێکی وەکو دامەزراوی کڵێسە بوونی نییە کە هەوڵ بدات دەست بەسەر کاروبارەکانی دەوڵەتدا بگرێت. ئەم مەسەلەیە لە تێڕوانینی محمد نور فرحات مەسەلەیەکی روون و ئاشکرایە لەو واقیعەوەی کە "هیچ ناوەندێك لە نێوان موسڵمان و خوداکەیدا نییە و هیچ وەسایەیەکیش لە موسڵمانەوە بۆ غەیری موسڵمان بوونی نییە. هەموو موسڵمانێکیش کۆششکارە یان موجتەهیدە مادامەکی کۆمەڵێ مەرجی دیاریکراوی تیادایە"[8]. ئەوەی لەم وتەیەدا شاراوەیە و بەئاشکرا گوزارشتی لێنەکراوە، بریتییە لەوە کە: بانگەشەکردن بۆ پراکتیزەکردنی شەرعیەتی ئیسلامی بەهیچ جۆرێ مانای گەڕانەوە نییە بۆ چەمکی ئەو دەوڵەتە ئاینییەی لە خۆرئاوای مەسیحیدا هەیە کە دامەزراوی ئایینی لە ڕێگەی ئەکلیرۆسەوە دەسەڵاتی بەسەر کاروبارەکانی دەوڵەتدا هەبوو. دەوڵەتی ئایینی لە خۆرئاوادا کەوتبووە ژێر دەسەڵاتی دامەزراوی ئایینی بەو سیفەتەی ئەو دامەزراوە ئاینییە تەنها ناوەندێکە لە نێوان باوەڕدار و خوداکەیدا و هەر ئەو دامەزراوەشە رێنوێنی کاروبارە رۆحی و دنیاییەکانی ئینسان دەکات. جا لەبەرئەوەی لە ئیسلامدا ناوەندێکی لەو چەشنە بوونی نییە، کەواتە چەمکی دەوڵەت لە ئیسلامدا جیاوازە لە چەمکی ئەو دەوڵەتە ئاینییەی لە خۆرئاوای مەسیحیدا هەیە. خۆ ئەگەر عەلمانییەتیش بانگەشەیەك بێت بۆ رزگاربوون لە هەژموونی کڵێسە بەسەر کاروباری دونیاییەوە (وەك محمد فرحات و ئەو کەسانە وا دەڵێن کە وەکو ئەو بیردەکەنەوە) کەواتە عەلمانییەت لە ژیانی ئێمەی موسڵماناندا هیچ شوێنێکی نییە و بێمانایە

دژایەتیی دەوڵەتی ئایینی بکەین و لە بەرامبەریدا بانگەشە بۆ عەلمانییەت و دەوڵەتی عەلمانی بکەین.

محمد عمارە دوورتر دەڕواو باوەڕی وایە لە ئیسلامدا تەنانەت چەمکی دەوڵەتی ئاینیش بوونی نییە[٩]. چەمکی دەوڵەتی ئایینی، بە بۆچوونی ئەو، لە بەرامبەر دەوڵەتی عەلمانیدا، بە پێویست گرێدراوە بە "کۆمەڵگای پیرۆز"ەوە کە ئەم زاراوەیەی لە هوارد بیکەر خواستووە، ئەم زاراوەیەش – لە شیکردنەوە شاراوەکەی محمد عمارەدا – بە پێویست ئاماژە بۆ ئەو دامەزراوە ئاینییە دەکات کە پیاوانی ئەکلیرۆس (پیاوانی ئایینی مەسیحی – کەهنوت) ڕێبەری دەکەن و ئەمانە خۆیان بە ناوەندێك یان وەسیتێك دەزانن لە نێوان مرۆڤ و خودادا. جا لەبەرئەوەی لە ئیسلامدا "کۆمەڵگای پیرۆز" بەو چەمکەی هوارد بیکەر بوونی نییە، کەواتە ئیسلام دەوڵەتی دینی نازانێت[١٠]. مادامەکی ئیسلام دەوڵەتی ئایینی نازانێت، کەواتە بانگەشەکردن بۆ دەسەڵاتی عەلمانییەت لە نێو ئێمەدا جگە لە لاساییکردنەوەی خۆرئاوا و پاشکۆیی ژیاری خۆرئاوا شتێکی تر نییە[١١].

یەکێکی دیکە لەو روناکبیرە ئیسلامەوییانەی بەو تەرزە لە عەلمانیەت تێدەگەن، روناکبیری میسری محمد یحیی کە پێی وایە "بانگەشەکردن بۆ عەلمانییەت بە تەواوی دەکەوێتە ناو سیاقی بزاوتی بەخۆرئاواییکردن و بە ئەوروپیکردن و داگیرکردنی کولتوورییەوە کە سەدەیەك زیاترە دوچاری ئیسلام بووە"[١٢]. هەمان تێڕوانین و هەمان ئاکام لەلای پیاوێکی شیعەی لوبنانی وەکو محمد مهدی شمس الدین – یشدا هەیە و پێی وایە عەلمانییەت بیرێکی ئەوروپییانەیە و بۆ چارەسەرکردنی گرفتەکانی ئەوروپا داهێنراوەو لەژێر سێبەری پێداویستییە مێژووییەکانی ئەوروپادا خۆی سەپاندووە، بۆیە زۆر بە سادەیی دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە "ئەو پاساوە تیۆریانەی عەلمانییەت کە لە فیکری ئەوروپییەوە دەرهاتوون و لە نێو کۆی تیۆرە فەلسەفی و سۆسیۆسیاسییەکانی فەیلەسووفان و بیریارانی ئەوروپا هەر لە سەدەی شانزەهەمەوە گەڵاڵە کراون، ئەو پاساوانە لە ئیسلامدا بوونیان نییە"[١٣]. واتە لەم گۆشە نیگایەوە بانگەشەکردن بۆ عەلمانییەت لەلای ئێمە بەهیچ جۆرێ دروست نییە، لەمەش خراپتر، ئەوان وایدەبینن عەلمانییەت بریتییە لە چوونەناو سیاقەکانی خۆرئاوا و ئەوروپیکردن و شتی لەم بابەتە.

تێگەیشتنی ئەو روناکبیرە ئیسلامەوییانەی ناومان بردن بۆ عەلمانییەت هەمان ئەو تێڕوانین و تێگەیشتنەیە کە چەمکی عەلمانییەت دەبەستێتەوە بە ئەزموونی بزاوتە عەلمانییەکانی ئەوروپا لە کۆنتێکستی (سیاقی) ململانێی نێوان دەسەڵاتی زەمەنی – دونیایی و دەسەڵاتی کەنیسە. سائەگەر چەمکی عەلمانییەت گرێ بدەین بە ڕیشە مێژووییەکەی لە ئەوروپادا، ئەوا – لە تێڕوانینی ئەواندا – پێدراوەکانی عەلمانییەت لە ئیسلام و ئەزموونی ئیسلامیدا بوونی نییە. ئەوان باسی گرفتی دوولایەنیی سەرچاوەی دەسەڵات دەکەن بەو پێیەی ئەم دوولانییەی دەسەڵات، ئەزموونی دەسەڵاتی ئەوروپیی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سەپاندوویەتی بەهۆی پێداگرتنی کەنیسە کە دەیەوێ لەیەك کاتدا سەرچاوەی دەسەڵاتی زەمەنی – دونیایی و دەسەڵاتی ئاینیش بێت. عەلمانییەتیش لەم سیاقەدا ڕێگەیەکە بۆ چارەسەرکردنی گرفتی دوولایەنیی دەسەڵات. ئەگەر عەلمانییەت رەتکردنەوەی دەوڵەتی ئایینی بێت بەو پێیەی لەم دەوڵەتە ئاینییەدا کەنیسە دەبێتە سەرچاوەی هەردوو دەسەڵاتی دینی و دونیایی،

کەواتە عەلمانییەت – لەم تێگەیشتنەدا – لانیکەم بریتییە لە داماڵینی دەسەڵاتی دونیایی لە کەنیسە و لەوەش زیاتر بریتییە لە ملکەچیی کەنیسە بۆ دەسەڵاتی مەدەنی سیاسی[١٤].

لەم تێگەیشتنەدا، بۆ ئەو روناکبیرە بەناو ئیسلامیانە، زۆر ئاسانە بگەنە ئەو سەرەنجامەی کە گوایە عەلمانیەت بیرۆکەیەکی نامۆیە بە ئێمە و بە هیچ جۆرێ لە ژیانی ئێمەدا شوێنی نییە، چونکە ئیسلام – بەبۆچوونی ئەوان – گرفتی دووفاقیی سەرچاوەی دەسەڵاتی نەزانیوە چونکە وەکو محمد مهدی شمس الدین دەڵێ لە ئیسلامدا کڵێسە و دەوڵەت بوونیان نەبووە و شتێك نەبووە بەناوی مەملەکەتی خوداو مەملەکەتی قەیسەر، هەروەها لە ئیسلامدا " رۆحی پاکیزە و جەستەی هەڵەکار لە ئینساندا" بوونی نییە، واتە دوالیزمێك نییە کە ببێتە هۆی ناکۆکی و ململانێ نە لە سروشتدا و نە لە کۆمەڵگاو نە لە مرۆڤیشدا[١٥].

ئەم تێگەیشتنە، چەمکی عەلمانییەت گرێ دەدات بەو سیمایانەی لە ئەزموونی ئەوروپییەوە وەرگیراون لە ڕەوتی ململانێدا لەسەر دەسەڵات لە نێوان کەنیسە و ئەو هێزانەی دژ بە دەسەڵاتی کەنیسەن. ئەم چەشنە تێگەیشتنە لە عەلمانییەت، بەبۆچوونی من، پتر ئیعتباراتی ئایدیۆلۆژی لەبەرچاو دەگرێ وەك لە هەوڵدان بۆ گەیشتن بە جەوهەری چەمکی عەلمانییەت. پاڵنەری سەرەکی لەلای ئەم تەرزە روناکبیرانە هەوڵدانە بۆ پاراستنی ئەو وتەزایەی کە دەڵێ ئیسلام بە سروشتی خۆی بریتییە لە دین و دەوڵەت. بۆیە ئەوانە دوو مەسەلە گریمانە دەکەن: یەکەم – عەلمانییەت لە جەوهەردا ڕەتکردنەوەی دەوڵەتی تیۆکراتییە لە خۆرئاوای مەسیحیدا. دووەم – ئیسلام بەو پێیەی دین و دەوڵەتە، لە هەناوی خۆیدا دەوڵەتی تیۆکراتیی هەڵنەگرتووە و تەنانەت هیچ یەکێ لە پێکهاتەکانی ئەو جۆرە دەوڵەتەی لە خۆدا هەڵنەگرتووە. خۆ ئەگەر وا بێت و دان بەم دوو مەسەلەیەدا بنێین، ئەوسا چار نییە دەبێ ئیسلام بەدوور بگرین لە بانگەشەکانی عەلمانییەت چونکە ئیسلام بریتییە لە دین و دەوڵەت!

بێگومان چەمکی عەلمانییەت کۆمەڵێ سیماو دەلالەتی دیاریکراوی وەهای هەڵگرتووە کە لە ژێر سێبەری کۆمەڵێ مەرجی مێژووییدا بەدەستی هێناون، بەڵام ڕاست نییە ئەو سیماو مانایانە بە تەنها ببەستینەوە بەو چەمکەی بەندە بە مەرجە مێژووییەکانی قۆناغێکی دیاریکراو. بێگومان ئێمە نکوڵی لەوە ناکەین کە لێکۆڵینەوە لە چەمکەکان پەیوەندیی بە مەرجە مێژووییەکانی ئەو چەمکانەوە هەیە و روناکبیرە ئیسلامەوییەکانیش لەو لایەنەوە ڕاستن کە دەچنەوە سەر ئەو مەرجە مێژووییانەی لە سایەیدا چەمکی عەلمانییەت گەڵاڵە بووە، بەڵام ئەوەی نکوڵی لێدەکەین تێڕوانینی ئەوانە بۆ هەندێ لە سیماکانی ئەو چەمکە کە گوایە ناوکی سیمانتیکی دەلالی و جەوهەریی چەمکی عەلمانییەت پێکدەهێنێ چونکە ئەو سیمایانە تەنها لە سایەی کۆمەڵێ مەرجی مێژوویی دیاریکراودا پتر بەرجەستە بوون.

ئێستا با نموونەیەکی تری نزیك لە چەمکی عەلمانییەت بهێنینەوە کە ئەویش پەیوەستە بە چەند مەرجێکی مێژوویی دیاریکراوەوە، ئەو نموونەیەش چەمکی دیموکراسیەتە. چەمکی دیموکراسییەت هەروەکو چەمکی عەلمانییەت لە سیاقێکی مێژوویی دیاریکراودا سەریهەڵداوە و گەشەی کردووە و بەهۆی پەیوەستبوونی بەو مەرجە مێژووییە دیاریکراوانەوە کۆمەڵێ سیماو مانای بەدەست هێناوە، بەڵام ئەو سیمایانەی ئەمڕۆ

چەمکی دیموکراسییەت هەڵگریانە هەمان ئەو سیمایانە نین کە لە سەدەکانی رابردوودا هەڵیگرتبوون. بۆ نموونە ئەو دیموکراسییەتەی ئەسینییەکان پرۆسەیان دەکرد دیموکراسییەتێکی راستەوخۆ بوو، چەمکی دیموکراسییەت لە زەینی ئەواندا لە سیاقی پرۆسیسەکردنی ئەو جۆرە دیموکراسییەتە راستەوخۆیەدا شکڵی گرتبوو، ئەم وێناکردنە بۆ دیموکراسییەت تا نەمانی دیموکراسییەتی ئەسینی و سەرهەڵدانی دیموکراسییەتی نوێ لە چەرخە نوێیەکانی ئەوروپادا هەر بەو شێوەیە مابووەوە، دوای ئەوە بیرۆکەی "نواندن" یان نوێنەرایەتی هاتە ئاراوە، لەگەڵ دەرکەوتنی ئەم بیرۆکەیەدا بیرۆکەی ململانێی ئازاد یان بەربەرەکانیی ئازاد لە نێوان دەنگی ئازادی دەنگدەراندا سەریهەڵدا، ئەم بەربەرەکانییە ئازادە لە بەربەرەکانیی تاکەکەسە بێلایەنەکانەوە گواسترایەوە بۆ بەربەرەکانیی نێوان حیزبەکان و گروهە جیاجیاکان، دەبینین ئەمڕۆکە نوێنەرایەتی حیزبی لە دیموکراتیەتی هاوچەرخدا بەشێکی دانەبڕاوە لە ژیانی دیموکراسییەت.

لێرەوە تێدەگەین گرێدانی چەند سیماو مانایەکی دیاریکراو بە چەمکێکی دیاریکراو لە ژێر سایەی چەند مەرجێکی مێژوویی یان کولتووریی دیاریکراودا، مانای ئەوە نییە ئەو سیماو مانایانە کۆمەڵێ سیما و مانای بنچینەیی و پێویستن بۆ ئەو چەمکە، بەو پێیەی ماناکانی هەر چەمکێك لە قۆناغێکی مێژووییەوە بۆ قۆناغێکی مێژوویی دیکە گۆڕانکاریان بەسەردا دێت بەپێی پێداویستی و پێدراوە تازە و جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگا.

تێگەیشتنی روناکبیرە ئیسلامەوییەکان بۆ عەلمانییەت ئەو خاڵە گرنگانە لەبەرچاو ناگرێت، ئەوان وایدەبینن سیمای بنەڕەتی عەلمانییەت بریتییە لە رەتکردنەوەی دەسەڵاتی کەنیسە بەسەر کاروباری دونیاییەوە لەلایەن بزاوتە عەلمانییەکانی خۆرئاواوە و لە سایەی چەند مەرجێکی مێژوویی دیاریکراوەوە، بەڵام لە راستیدا ئەمە تەنها یەکێکە لە سیماکانی چەمکی عەلمانییەت و لێرەدا ژمارەیەك سیماو مانای دیکە بۆ ئەو چەمکە هاتوونەتە ئاراوە بە گوێرەی پێشکەوتن و گۆڕانکارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتیی مرۆڤ. ئەو دامەزراوەی لە سەدەکانی رابردوودا ژیانی دینی و دنیایی داگیرکردبوو دامەزراوێکی ئایینی بوو، ئەمە مەسەلەیەکی گرنگ و جەوهەرییە لەلای عەلمانییەکان، سا ئەو دامەزراوە ئاینییە سەر بە هەرچ ئاینێك بێت، واتە مەسەلەکە بریتییە لە دەسەڵاتی دامەزراوی ئایینی نەك جۆری دامەزراوەکە. پرەنسیپی سەرەکیی دامەزراوە ئاینییەکان بە فۆرم و رەنگە جیاوازەکانیانەوە بریتییە لەو گوتەزایەی کە دەڵێ دەبێت تەعالیمی ئایینی دوا مەرجەع و دوا فۆرمی هەموو مەسەلە رۆحی و زەمەنییەکان پێکبهێنێت. جا لەبەرئەوەی عەلمانییەت ئەم چەشنە پرەنسیپە رەتدەکاتەوە، کەواتە بەرگری لە هەوڵدانی هەر گروهێك دەکات کە بیەوێت بەپێی ئەو پرەنسیپە دەسەڵاتی بەسەر دەوڵەت و دامەزراوەکانی دەوڵەتدا هەبێت، سا ئەندامانی ئەو گروهە پیاوانی ئایین بن یان یەك پیاوی ئاینیشیان تیادا نەبێت. چونکە دەشێت ئەندامانی ئەو گروهە پیاوانی ئەکلیرۆس و بە گشتی پیاوانی ئایینی نەبن و بگرە لەوانەیشە بە هیچ مانایەك دامەزراوێکی ئایینی پێك نەهێنن. دەشێت ئەو جۆرە گروهانە جگە لە بزووتنەوەیەکی سیاسی شتێکی تر نەبن، بۆ نموونە بزووتنەوەی ئیخوان موسلمین. خاڵی بنەڕەتی رەتکردنەوەی عەلمانییەت بۆ ئامانج و بانگەشەکانی ئەو گروهانە، بەند نییە بە

پێکهاتەی ئەو گروهە و بە جۆری ئەو وەزیفەیەی ئەندامانی ئەو گروهە لە کۆمەڵگادا ئەنجامی دەدەن. بەڵکو عەلمانییەت تەنها ئەو گروهو لایەنانە رەتدەکاتەوە کە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی ئایینی تێدەکۆشن کە تیایدا ئایین دەبێت بە دوامەرجەع بۆ هەموو کاروبارە رۆحی و زەمەنییەکان.

دوا ئامانجی عەلمانییەت بریتییە لە بەرتەسکردنەوە و سنووردار کردنی ئەو بنەمایانەی چەمکی دەوڵەتی ئایینی لەسەر رادەوەستێ. کاتێ بزاوتە عەلمانییەکانی خۆرئاوا هەژموونی کەنیسەیان بەسەر کاروباری سیاسی و مەدەنیدا رەتدەکردەوە، تەنها لەبەر مۆرکی تیۆکراتیانەی دەوڵەتی ئایینی نەبوو. چەمکی دەوڵەتی ئایینی مەرج نییە دەوڵەتێك بێت راستەوخۆ ملکەچی پیاوانی ئایینی بێت. فۆرمی تیۆکراتی یەکێکە لە فۆرمەکانی دەوڵەتی ئایینی و ئەمەش فۆرمێکی تاك و تەنیا نییە، بەڵکو دەوڵەتی ئایینی چەندین فۆرمی هەیە نەك تەنها فۆرمی تیۆکراتی.

کەسی عەلمانی پەیوەندییەکی مێژوویی لە نێوان دەوڵەتی ئایینی و فۆرمی تیۆکراتیدا دەبینێت، ئەو رەگەزە گرنگانەیشی کە لەو چەشنە دەوڵەتەدا هەن بە پێویست پەیوەست نین بە بوونی دامەزراوێکی وەکو دامەزراوی کەنیسە بەڵکو پەیوەستن بە شتێکی زۆر لەوە قووڵتر، واتە پەیوەستن بە مۆرکی سەرجەمگیر و توتالیتاریانەی دەوڵەتی ئایینی، ئەمەش هەندێ لە بیریارە عەلمانییەکانی ئێمە زۆر بە باشی درکیان پێکردووە، بۆ نموونە ئەنتوان سەعادە و محەمەد ئارکۆن و ناصیف نصار. ئەو دەوڵەتەی مۆرکێکی گشتگیر و توتالیتارییانەی هەبێت مەرجەعێکی رەهایشی بۆ هەموو مەسەلە دینی و دونیاییەکان هەیە. سا لێرەدا ئەگەر وەسیتێك یان ناوەندێك هەبێت لە نێوان باوەڕداران و مەرجەعدا وەکو پیاوانی ئەکلیرۆس لە ئایینی کاتۆلیکی مەسیحیدا یان پەیامبەران و پێغەمبەران لە ئاینەکانی تردا، ئەوا مەسەلەکە هەر هەمان شتە: واتە کردنی ئایین بە دوا مەرجەع لە هەموو مەسەلە دینی و دونیاییەکانماندا.

سیمای بنەڕەتی دەوڵەتی ئایینی بریتییە لە سەیرکردنی ئایین وەکو دوا مەرجەع لە مەسەلە رۆحی و زەمەنییەکاندا کە دەبێ حاکم پەنای بۆ ببات بۆ داڕشتنی یاساکان و سیاسەتەکان لە هەموو ئاستەکان و لە هەموو بوارە کۆمەڵایەتی و ئابووری و پەروەردەییەکان. سیمای بنچینەیی دەوڵەتی توتالیتاریی ئایینی هەلومەرجێك دەخوڵقێنێت کە تیایدا پیاوی ئایینی بایەخ و گرنگییەکی گەورەی دەبێت و لەوێشەوە دەسەڵات و نفوزێکی گەورە و بەهێزی لە هەموو ئاستەکانی کۆمەڵگادا دەبێت و هەر ئەوانیش شەرعیەت بە سیاسەتەکانی حاکم و فەرمانڕەواکان دەدەن و پرۆسەی بەسیاسیکردنی ئایین بەڕێوە دەبەن. ئەمانە هەندێ لەو فاکتەرانەن کە وردە وردە دەبنە هۆی گەشەکردن و گەورەبوونی دەسەڵاتی ئایین بەسەر هەموو جومگە گرنگەکانی کۆمەڵگای مەدەنی و لەناوبردنی هەموو ئەو فاکتەرانەی دەشێت لە دواییدا پێکهاتەکانی کۆمەڵگای مەدەنی بخوڵقێنن. بەڵام گەیشتنی ئایین بەئاست و بە بارودۆخێکی لەو جۆرە کە بتوانێت لە هەموو بوارەکانی کۆمەڵگادا رۆڵی دوا دەسەڵات و دوا مەرجەع ببینێت مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە دۆخ و فاکتەرەکانی رەوتی کۆمەڵایەتی – مێژووییەوە هەیە. واتە ئەو بارودۆخ و هۆکارانەیە لە هەناوی کۆمەڵگادا تۆوی دەوڵەتی ئایینی پێکدەهێنێت، لەبەرئەوە ئەو فۆرمەی دواجار دەوڵەتی ئایینی لە خۆی دەگرێت مەسەلەیەکە بەندە بەو بارودۆخ و فاکتەرانەوە، ئەمەش مانای وایە رۆڵی پیاوانی ئایین

لەسەر سروشتی ئەو مەرجانە ڕادەوەستێت. لێرەوە ڕووندەبێتەوە ئەوەی کە تەحەکوم بە پەیوەندیی نێوان دەوڵەتی ئایینی و دەسەڵاتی چینی پیاوانی ئایین بەسەر ئەو دەوڵەتەوە دەکات – سا ڕاستەوخۆ بێت یان ناڕاستەوخۆ – یاساکانی فیکر نین، بەڵکو یاساکانی واقیعن. کەواتە ئەو شتەی کە لە دوا شیکردنەوەدا شوێنی بایەخی کەسی عەلمانییە پەیوەندیی بەو فۆرمەوە نییە کە دەوڵەتی ئایینی لە خۆی دەگرێت بەڵکو پەیوەندیی بەو شتانەوە هەیە کە لە چەمکی دەوڵەتی ئایینییەوە هەڵدەقوڵێن و ئەو سیمایانەی کە تۆوی سیمانتیکی دەوڵەتی ئایینی پێکدەهێنن: واتە شەرعیەتی دەوڵەت و دامەزراوەکانی دەوڵەت لە ئایندا نیشتەجێن و هەر تەنها ئایین دەتوانێت شەرعیەت بە دامەزراوەکانی دەوڵەت ببەخشێت. عەلمانییەت ئەم پرەنسیپە ڕەتدەکاتەوە، چونکە لەم پرەنسیپەدا دەسەڵاتی زەمەنی یان دنیایی شەرعیەتی نابێت ئەگەر ئایین شەرعیەتی پێنەبەخشێت.

پێداگرتنی عەلمانییەت لەسەر ئەوەی کە نابێت ئایین دوا مەرجەع و دوا بنچینەی دەوڵەت و یاساکانی کۆمەڵگا بێت، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو باوەڕەی کە دەبێت عەقڵی ئینسان سەربەخۆ بێت و لە دەرەوەی بازنەکانی ئایندا ئەخلاق و سیاسەت و یاساکان دابڕێژێت.

## پەراوێزەکان

١–لێرەدا پێویستە خوێنەر ئاگادار بکەینەوە کە ئەم وشەیە بە "عەلمانییەت" دەخوێنرێتەوە نەك "عیلمانییەت" وەك دواتر ڕوونی دەکەینەوە.

٢–هەندێ لە نووسەرانی ئێمە ئاگاداری ئەم مەسەلەیەن، بۆ نموونە بڕوانە: (غریغوار حداد "المسیحیة و العلمانیة" – مجلة مواقف، عدد ٣٩، خریف ١٩٨٠ – ص ١٤٣) کە تیایدا دەڵێ: "عەلمانییەت لە وشەی عالەمەوە وەرگیراوە، ئەم وشەیەش یەکەمجار بە عالەمانییە دەخوێنرایەوەو دواتر کورت کرایەوە بۆ عەلمانییەت". هەروەها بڕوانە: (محمد یحیی، في الرد علی العلمانیین، الزهراء للاعلام العربي، القاهرة – ص١١).

٣–ناصیف نصار داکۆکی لەو گۆشەنیگایە دەکات و دەڵێ "گواستنەوە بۆ کۆمەڵگایەکی عەلمانی، سەرکەوتوو نابێت ئەگەر پشت بە سیفەتی زانستی نەبەستێت، سیفەتی زانستی تەواوکەری سیفەتی عەلمانییە و بگرە بناغەی عەلمانییەتە"، بەڵام ئەو مەبەستی لە سیفەتی زانستی ئەو شتە نییە کە پەیوەستە بە عیلمانییەتەوە – لە عیلمەوە – وەك ئەوەی هەڵوێستێکی پۆزەتیڤیستانەیە لە سروشتی مەعریفە، بەڵکو مەبەستی لەو هەڵوێستەیە کە سیفەتی عەقڵی و میتۆدی و بابەتی لەخۆ دەگرێت، بڕوانە: (ناصیف نصار، نحو مجتمع جدید: مقدمات اساسیة في نقد المجتمع الطائفي، بیروت – دار النهار للنشر، ١٩٧٠ ص ١٨٤–١٨٥).

٤–بۆ نموونە شبلی العیسمی بەم شێوەیە پێناسی عەلمانییەت دەکات: "بریتییە لە ڕستێك لەو کارانەی کە بەرهەمی ململانێیەکی دووروودرێژی نێوان دەسەڵاتی ئایینی و دەسەڵاتی دونیاییە لە ئەوروپا کە هەوڵی دا ئەو دوو دەسەڵاتە بەنێویەکدا چووە لە یەکتر بترازێنێ و ئایین لە دەوڵەت جیابکاتەوە بە چەشنێك دەوڵەت لە بەرامبەر ئاییندا – هەر ئاینێك بێت – بێلایەن بێت و ئازادیی ڕادەربڕین دەستەبەر بکات، هەروەها بە پیرۆزکردنی ڕاوبۆچوونی پیاوانی ئایین قەدەغە بکات"، بڕوانە: (شبلي العیسمي، العلمانیة و الدولة الدینیة، بغداد – دار الشؤون الثقافیة العامة – ١٩٨٦– ص١٩).

٥–ناصیف نصار، سەرچاوەی پێشوو – ل٦٢–٦٣.

٦–ئێمە بە درێژی ئەم بابەتەمان لە موحازەرەیەکدا باسکردووە لە سێنتەری لێکۆڵینەوەی هاوچەرخی

عـەرەبی لـە جۆرجتـاون - ١٩٩٠، هـەروەها بڕوانـە: (عـادل ضـاهر، الفلسـفة و السیاسـة فی فكـر انطـوان سـعادة - الفلسـفة العربیـة المعاصـرة، بـیروت - مركـز دراسـات الوحـدة العربیـة، ١٩٨٨ - ص ٢٩٢-٣٠٧).

٧-محەمـەد ئـاركۆن لـە ژمـارە (٥)ی سـالّی ١٩٧٩ ی گۆڤاری (الاحیاء العربي)دا دەلّێت: "عەلمانییەت بە تەنها هەلّوێسـتێك نییـە لەبەرامبـەر ئاییـندا بـەلّكو هەلّوێسـتە لەبەرامبەر گرفتی مەعریفەشدا.. عەلمانییـەتی فەلسـەفی كـوفر نییـە، بـەلّكو بـە دوای مەعریفـەدا دەگـەڕێ و هـانی مەعریفـە دەدات كـە ئـاییینیش دەچـێتە نـاو ئـەو مەعریفەیەوە.. عەلمانیەت لـە بارەی ئاییـنەوە دەدوێت و توێژینـەوەی زانستی لەبارەیـەوە ئەنجام دەدات و بەهیچ جۆرێكیش نیـازی ئـەوەی نییـە لـە ئـایین بـدات. ئامـانجی هـەموو هەلّوێسـتێكی زانسـتی بریتییـە لـە ریسـواكردن و ئاشـكراكردنی ئـەو دەمامكـە تەمویهیانـەی كـە فیكـری ئیسلامی عەرەبی لە خۆی نابوو".

٨-محمـد نـور فرحـات، الحـوار حـول تطبیـق الشـریعة الاسلامیة، منبر الحوار، ربیع ١٩٨٩، ص٤٥.

٩-محمـد عمـارة، العلمانیـة و نهضـتنا الحدیثـة، دار الشروق - القاهرة، ١٩٨٦، ص ١٥.

١٠-هەمان سەرچاوە.

١١-هـەمان سەرچـاوە - ل ٢٨. هـەروەها بڕوانـە: (محمـد عمـارة، المسـتغربون اسـتعاروا مشـكلة اوروبیـة كـي یستعیروا لها حلاً اوروبیاً، جریدة الحیاة ١٩٨٩/٨/٢٥.)

١٢-محمد یحیی، في الرد علی العلمانیین - ص ١١.

١٣-محمـد مهـدي شمـس الـدین، العلمانیـة، المؤسسـة الجامعیة للدراسات و الابحاث - ١٩٨٣،

١٤-لێرەوە لەم وتەیەی محمد یحیی تێدەگەین كە دەلّێ: "لـە دەرەوەی پرۆسـەی مێـژوویی خۆرئـاوایی و بـەبێ بـوونی كەنیسـە و ئـایینی مەسـیحی، هـیچ بانگەشـەیەك نییە بۆ عەلمانییەت". (في الرد علی العلمانیین - ص٣١).

١٥-هەمان سەرچاوە - ل ١٦٣-١٦٤.

## سەرچاوە

بەشێكە لە فەسلّی دووەمی ئەم كتێبە: (عادل ضاهر، الاسس الفلسفیة للعلمانیة، دار الساقي - لندن، الطبعة الاولی - ١٩٩٣).

# عەلمانیەت

مالکوم هیمڵتون

لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

بەبڕوای تیۆریزەنانی مانا و هەموو ئەو تیۆریزەنەکانی دی کە سەرچاوەی دین بە هەلومەرجی مرۆیی دەزانن، پرۆسەی عەلمانیەت لە کۆمەڵگا پیشەسازیەکاندا، کێشەئامێزە. بە بڕوای بێرگەر، ئەگەر دین بەربەستێك لە بەرامبەر لەخۆنامۆبووندا دروستبکات، کەوابوو مەسەلەی عەلمانیەت چۆن مومکینە؟ زۆرێك لە بیریاران و لەوانە دۆرکهایم هەوڵیانداوە نکوڵی لە هەموو جۆرە عەلمانیەتێك بکەن. بەبڕوای ئەوان ئەم وەهمە بەهۆی سستبوونی شێوە تەقلیدیەکانی دینەوە، دروستبووە. ئەم بیریارانە دەڵێن کە لەبری شێوە تەقلیدیەکان، شێوازی تازە بەردەوام دروستدەبن. بەڵام بەرگر نکوڵی لە واقیعیەتی عەلمانیەت ناکات و لەڕاستیدا بە یەکێك لە بەرجەستەترین تیۆریزەنانی ئەم دیاردەیە دەزانرێت. بەهەرحاڵ، بەرلەوەی باسی تێڕوانینەکانی ئەو بکەین، پیویستە باسێکی ئەم مەسەلەیە بکەین. لەم فەسڵەدا تێڕوانینی دیش لەبارەی پرۆسەی عەلمانیەتەوە لەبەرامبەر تیۆرەی بێرگردا دەهێنینەوە.

زۆرێك لە تیوریزەنان، بەتایبەتی نوسەرانی سەدەی نۆزدە، لەناوچوونی دینیان لە کۆمەڵگای مۆدێرندا پێشبینی کردبوو. وەك بینیمان تایلۆر، فرێزەر، مارکس و فرۆید، هەر هەموویان پێشبینی ئەوەیان کردبوو کە بە باڵادەستبوونی زانست بەسەر شێوە بیرکردنەوەی کۆمەڵگای هاوچەرخدا، دین لەناودەچێت.بیریارانی تر کە بەشێوەیەکی وەزیفیتر تەماشای دینیان دەکرد، پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە دین بەشێوە باو و تەقلیدیەکانی لەناو دەچێت و جێگەکەی بڕوایەك دەیگرێتەوە کە لەسەر بناغەی میتافیزیکی و موتەعالی نییە. کۆنت دینێکی تازەی لەسەر بناغەی بونیادە عەقڵانی و زانستیەکان داهێنا و گوتی ئەم دینە تازەیە جێگەی خاڵی دینی تەقلیدی پێشوو دەگرێتەوە. دۆرکهایم لە بەهاکانی شۆڕشی فەڕەنسیدا، سەرەتاکانی

دروستبوونی کردارێکی نویٚ و هاوتای دینی، دەستنیشان کردبوو.

بەڵام زۆریك لە بیریارە تازەترەکان ئەمجۆرە بیرکردنەوانەیان رەت کردەوە و بڕوایان وایە کە دین وەك رابردوو بە بەشێکی گرنگ لە کۆمەڵگای تازە دادەنرێت، ئەگەرچی بەگشتی ئەوەیان قبوڵە کە شێوە تایبەتیەکانی دین رەنگە گۆڕانێکی بەرچاوی بەسەردا بێت. بۆ نمونە، بێلا (١٩٧١) ئیستدلالی کردووە کە چەمکی عەلمانیەت بەشێکە لەتیورەی کۆمەڵگای مۆدێرن کە لە بنەڕەتدا لە کاردانەوەی بزوتنەوەی رۆشنگەری بەرامبەر بە نەریتی ئاینزای مەسیحیەوە، سەرچاوە دەگرێت، هەمان ئەو نەریتەی کە ئاراستە وەرگرتنێکی مەعریفی توندی هەیە و جەخت لەسەر باوەڕی بەڕەسمی ناسراو، دەکاتەوە. بەبڕوای بێلا، تیورەی عەلمانیەت وەك ئەفسانەیەك کە لەرووی سۆزداریەوە تەفسیرێکی رێکخراو لەبارەی واقعەوە بەدەستەوە دەدات، تا ئەندازەیەك کرداری هەیە. لە دیدی بێلاوە، خودی ئەم تیۆرەیە لەبری ئەوەی تیۆریەکی زانستی بێت، خۆی تێزێکی دینیە. بەبڕوای ئەو لەو ڕووەوە کە دین کرداری کۆمەڵایەتی پێویستی لەسەرشانە، دوبارە ناوەندی سەرقاڵیە کلتوریەکانی ئێمە دەگرێتەوە. زۆریك لە بیریارانی دی بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا، بە سەرنجدان لە پەیدابوونی بزوتنەوە جۆراوجۆر و تازە دینیەکان و بەتایبەتی بونیادگەری دینی، بە دەرئەنجامی هاوشێوە گەیشتوون (کریگن ١٩٨٨، داگلس١٩٨٣، گێلسنێر١٩٧٧، گلاك و بێلا ١٩٧٦ گریلی١٩٧٣، هادین١٩٨٧، لاکمان١٩٦٧ و ١٩٩٠، مارتین١٩٦٩ و ١٩٩١. ستارك و بین بریج١٩٨٥، و وتنۆ١٩٧٦). بە بڕوای هەندێك لەم بیریارانە سەرەڕای بوونی عەقڵگەری و بناغە زانستی و تەکنەلۆژیەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن، دین خەسڵەتی باڵندایەتی (تراسندنتاڵی) خۆی لەدەست نادات.

لەلایەکی دیەوە هەروا بەرگری لە تیۆرەی عەلمانیەت دەکرێت و بەڵگەکانی نەیارانی دەکەونە بەر رەخنە، هەرچەند کە هەندێك لە لایەنگرانی ئەم تیۆرەیە قبوڵیانە کە عەلمانیەت رەنگە پرۆسەیەکی ناچاری و لەسەر یەك ریتم نەبێت (بێرگر١٩٧٣، دابلێر ١٩٨١، ١٩٨٧، لیچیز١٩٩١، ویلسۆن١٩٨٢). هەندێکی دی ئەم پرۆسەیە زۆر بە ئاڵۆز دەزانن و بڕوایان وایە ئەم پرۆسەیە هەم بە ئاراستەی عەلمانیەتە و هەم لە بەرامبەر هێزە عەلمانیەکاندا بەرگری دەکات و تەنانەت دژایەتیشیان دەکات (کەمپێل ١٩٧٢، ١٩٧٨، ١٩٨١، مارتین ١٩٧٨، شروت ١٩٨٩).

ئەم مەسەلەیە کە ئایا کۆمەڵگای مۆدێرن عەلمانی بووە یان بە ئاراستەی عەلمانیبوونە، پەیوەندیەکی زۆری بەوەوە هەیە چ مانایەکمان بۆ دین هەیە. زوربەی وتوێژەکان لەبارەی عەلمانیەتەوە لەو راستیەوە سەرچاوە دەگرێت کە بیریارە جیاوازەکان، تێڕوانینی زۆر جیاوازیان بۆ دین هەیە. ویلسۆن (١٩٨٢) دەڵێت ئەوانەی کە سود لە پێناسە وەزیفیەکان وەردەگرن، ئاراستەیان بەرەو رەدکردنەوەی تیورەی عەلمانیەتە، لەکاتێکدا ئەوانەی پێناسە زاتیەکان بەکاردەهێنن، رەنگە زیاتر بەرگری لەم تیورەیە بکەن. هەندێکی دی ئەوەندە پێناسێکی گشتگیر بۆ دین دەکەن کە وەك لە فەسڵی یەکدا بینیمان، هەمیشە شتیك دەمێنێتەوە کە بە دین دابنرێت. بۆ ئەم نوسەرانە عەلمانیەت مومکین نییە. لێرەوە پێناسی مەسەلەی عەلمانیەت بەگشتی موکین نییە. بەڵام بەهەرجۆریك بێت وەك بینیمان ئەم پێناسە گشتگیرانە زۆر کێشەئامێزن.

تەنانەت کاتێك دین بەشێوەیەکی سنوردارتر پێناس بکرێت، نەگونجان لەبارەی مەسەلەی عەلمانیەتەوە هەروا دەمێنێتەوە. زۆرێك لەم نەگونجانانە لەو مەسەلەیەوە سەرچاوە دەگرن کە عەلمانیەت چیە (ئەم مەسەلەیە پەیوەندیەکی نزیکی بە پێناسی دینەوە هەیە). ئەم زاراوەیە بەشێوەی جۆراوجۆر بەکارهاتووە. شاینەر لەمبارەیەوە لێکۆڵینەوەیەکی ئاماری سودمەندی کردووە (١٩٦٦) ئەو شەش مانا یان بەکارهێنانی بۆ ئەم زاراوەیە دۆزیوەتەوە. یەکەم مانا پەیوەندی بە لەناوچوونی دینەوە هەیە. بەو شێوەیەی کە رەمز و تیز و دەزگا دینیەکانی پێشوو بایەخ و پلەی خۆیان لەدەستدەدەن و لە دەرئەنجامدا رێگە بۆ کۆمەڵگایەکی بێ دین دەکرێتەوە. مانای دوهەم پەیوەندی بە هەرچی زیاتر گونجانەوە هەیە لەگەڵ »ئەم دنیایە»دا، بەو مانایەی کە لەم دنیایەدا سەرنجی خەڵکی لەسەر هۆکارە میتافیزیکیەکان لاچووە و بەرەو پێداویستیەکانی ژیانی دنیایی و مەسەلەکانی، راکێشراوە. بەپێی ئەم مانایە پەیوەندیەکان و گروپە دینیەکان لەگەڵ پەیوەندی و گروپە نادینیەکاندا تێکەڵدەبن، بەشێوەیەك کە ناکرێت لەیەك جیابکرێنەوە. عەلمانیەت لە سێهەم مانادا بەمانای جیابونەی دین و کۆمەڵگایە. لەم مانایەدا دین پاشەکشێ دەکات بۆ بواری تایبەتی و تایبەت دەبێ بە ژیانی تایبەتی و خەسڵەتیکی راستەوخۆ دەرونی پەیدا دەکات و باڵادەستی بەسەر هەر لایەنیکی ژیانی کۆمەڵایەتی لە دەرەوەی بواری دیندا لەدەستدەدات. عەلمانیەت لەمانای چوارهەمدا بەمانای جێگرتنەوەی شێوازە دینیەکانە لەجێی باوەڕ و دەزگا دینیەکان. لەم مانایەدا زانین، رەفتار و ئەو دەزگایانەی کە سەردەمانێك لەسەر بناغەی دەسەڵاتی خودایی وێنا دەکران، دەبن بە کۆمەڵێك دیاردەی دروستکراوی مرۆڤ و دەکەونە ژێر بەرپرسیارێتی مرۆڤەوە. لێرەدا لە بەرامبەر دینێکی بە مرۆپیکراودا ین. عەلمانیەت لەمانای پێنجەمدا بەمانای داماڵینی پیرۆزیە لە دنیا. جیهان خەسڵەتی پیرۆزیی لەدەستدەدات و مرۆڤ و سروشت دەبنە بابەتی رونکردنەوەی هۆیی (علّي)ـ عەقلانی و دەستتێوەردان. لەم جیهانەدا هێزە میتافیزیکیەکان هیچ دەورێکیان نییە. دواجار عەلمانیەت بەمانای جوڵەیە لە کۆمەڵگای »پیرۆزەوە« بۆ کۆمەڵگای »دنیایی«، بەو مانایەی کۆمەڵگا هەمووجۆرە پابەندبوونێکی بە بەها و کردارە تەقلیدیەکانەوە واز لێدێنێ و هاوکات لەگەڵ قبوڵی گۆڕانکاریدا، هەموو بڕیار و کردارەکان لەسەر بناغەیەکی عەقلانی و سودخوازانە ئەنجامدەدات. ئاشکرایە ئەم مانایەی عەلمانیەت لە هەموو ماناکانی تر کە تەنها پەیوەندی بە جێگەی گۆڕاوی دینەوە هەیە لە کۆمەڵگادا، بەرفراوانترە.

ئاشکرایە کە ئەم مانا جیاوازانە بەهیچ شێوەیەك رەدکەرەوەی یەك نین. ئەم جیاوازیە لە مانای عەلمانیەتدا، پەیوەندی بە جیاوازی مانای دینەوە هەیە و دەگاتە ئەوەی شاینەر بە پەیڕەوکردنی لە مارتین (١٩٦٥) بڵێت کە گونجاوترین دەرئەنجامێك کە لەم مەسەلەیەوە دەتوانرێ وەربگیرێ، ئەوەیە کە دەبێ راستەوخۆ واز لەم زاراوەیە بهێنرێت. پێدەچێ ئەم ئەنجامگیریە هێندە هەڵسەنگێنراو نەبێت. مانای سەرەکی ئەم زاراوەیە هەمان لەناوچوون و رەنگە ونبوونی ئەو باوەڕ و دەزگا دینیانە بێت کە پەیوەندیان بەمانای یەکەم و دوەهەم و چوارهەم و پێنجەمەوە هەیە. پرۆسەکانی ئەم مەسەلەیە رەنگە لەگەڵ یەکدا جیاواز بن و ناسینی هەر یەکێکیان پێویستی بە لێکوڵینەوەی ئەزمونگەرانە هەیە، بەڵام پێدەچێت کە دوا دەرئەنجامی هەموو ئەم پرۆسانە

دەبێت هەر یەك شت بێت. عەلمانیەت بەم مانایە دەشێ رووبدات یان نەدات و رەنگە پرۆسەیەکی بەردەوام بێت و نەبێت. ئەگەر ئەمجۆرە عەلمانیەتە رووبدات، شتێکی وەك مانای دوهەم دەبێت، کە هەمان تایبەتبوونی دینە و یان رەنگە وەك یەکێك لە لایەنەکانی مانای دوهەم، دەرکەوێت.

بەهەرحاڵ، پێویست ناکات واز لە زاراوە یان چەمکی عەلمانیەت بهێنرێ. ئەوانەی کە ویستویانە چەمکی عەلمانیەت لە ریز بکەنە دەرەوە، هەندێکجار لەبەرئەوەی ئەم زاراوەیە وەك چەکێك بەدەست نەیارانی دینەوە، بۆ لاوازکردنی بەکاردەهێنرێ، بۆتە هۆی ئاڵۆزیەکی زۆر (مارتین ١٩٦٥). ئەم هەڵوێستە لە هەڵوێستی کەسانێك کە دەڵێن تێکەڵکردنی باسەکان لەم مەسەلەیەدا چەکی دەستی ئەو کەسانە بووە کە چەمکی عەلمانیەتی کۆمەڵگای هاوچەرخیان، بە چەمکێکی گونجاو بۆ بیرکردنەوە نازانن، دروستر نییە.

ئەم قسەیە بە مانای ئەوە نییە کە چەمکی عەلمانیەت چەمکێکی سادە و رێك و رەوانە، یان بۆ ناسینی وردتری لایەنە جیاوازەکانی، پێویستمان بەزاراوە و چەمکی دی نییە. لەمڕووەوە دابلێر (١٩٨١) زاراوەی »دین لابردنی "*Laicisation*" بۆ گێڕانەوە بۆ پرۆسەکانی داماڵینی پیرۆزی *Desacralisation*، جیاکردنەوە و جیگۆڕکێی چەمکە دینیەکان لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا، بەکاردەهێنێت و لەنێوان عەلمانیەت لە ئاستی تاکەکەس، کۆمەڵگا و لەناو خودی دیندا، جیاکاری دەکات (١٩٨٥،١٩٨٧).

بەهەرحاڵ جیاوازی تێڕوانین بۆ مەسەلەی عەلمانیەت، تەنها جیاوازی نییە لەسەر زاراوە و چەمکەکان. لەبارەی ئەو مەسەلەیەوە کە ئایا کۆمەڵگای هاوچەرخ لە کۆمەڵگای رابردوو کەمتر یان زۆرتر دینیە (دینیبوون بە هەموو مانایەکی)، وتوێژێکی زۆر کراوە. هەندێکجار ئیستیدلال دەکرێت کە ئێمە تێڕوانینێکی دروستمان بۆ ماهیەتی دینی کۆمەڵگاکانی رابردوو نییە، چونکە لە رابردوشدا هێندەی ئەمڕۆ رەگەزی دژە دینی هەبووە. بەپێی ئەم ئیستدلالە چەمکی »سەردەمی باوەڕ« وەهمێکە کە زۆرتر لە دەرئەنجامی گرنگیدان بە بیروڕا و ئاراستەکانی دەستەبژێرەکانی کۆمەڵگای رابردوو کە زانیاریەکی زیاترمان لەبارەیانەوە هەیە و گرنگینەدان بە خەڵکی ئاسایی، دروستبووە(گۆدریچ١٩٧٥، داگلس١٩٨٣). لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینەدا، نوسەرانی وەك ویلسۆن(١٩٨٢) وایان وەڵام داوەتەوە کە تێڕوانینێکی لەم چەشنە لەسەر ئەو گریمانەیە دامەزراوە کە عەلمانیەت هەمان داماڵینی مەسیحیەتە*Dechristianisation*. ئەم بانگەشەیە دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە رابردوو هێندەی ئەمڕۆ لەلایەك دنیایی و لەلایەك دینی بوو، وە لە راستیدا بەو بانگەشەیە دەگات کە رابردوو زیاتر لەمڕۆ مەسیحی نەبوو، لە دەرئەنجامیشدا ئەمڕۆ کەمتر لە رابردوو دینی نییە. بەڵام پاشماوەی بتپەرستی و »دینی عامیانە« لە کۆمەڵگا بە روکەش مەسیحیەکاندا، بەڵگەی ئەوەیە کە خەسڵەتی دژە دینی ئەوان لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکان، زیاتر بووە. دیارە سڕینەوەی بتپەرستی، دینی عامیانە و باوەڕ و کردارە جادویەکان لە سەردەمی رابردوودا بەو ناوەی کە دینی راستەقینە نین، وەك هەمان ئەو کارەی کە تێرنەر کردی، کارێکی ئەوەندە راست نیە. کارێکی وا بەمانای دەرکردنی سیستەمەکانی باوەڕە لە زۆربەی کۆمەڵگا سەرەتایەکاندا لە وتەزای »دین« و سنورداركردنی بێ هۆی بۆ دینە گەردونیەکانی وەك مەسیحیەت و بودایی و

ئیسلام. تەنانەت لەم حاڵەتەشدا زۆرینەی خەڵك تەفسیرێكی وا بۆ ئەم دینە گەورانە دەكەن كە هێندە لەگەڵ مانای دینی جێی سەرنجی تێرنەر ناگونجێ.

بەهەرحاڵ تیرنەر هەڵوێستێكی راستەوخۆ دژ بە عەلمانیەت ناگرێت. ئەو دەڵێت بیریارانی تەبا و نەیاری عەلمانیەت، هەردوكیان تا ئەندازەیەك راستدەكەن. لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا، مەسیحیەتی كاسۆلیك جێی ئارەزووی چینی باڵا یان ئەرستۆكراتەكان بوو، بەڵام لەناو دیهاتیەكاندا هێندە دەسەڵاتی نەبوو. لە رابردوودا هیچ سەردەمێكی زێڕین نیە كە بكرێ وەك خاڵی بەرامبەر هەلومەرجی هەنوكە رابگیرێ. تەنها شتێك كە هەبوو سەردەمێكی دینی زێڕین بوو بۆ دەستەبژێرەكانی كۆمەڵگا كە زۆرتر وەك هۆكارێكی عەقیدەتی بۆ پاراستنی مافی موڵكایەتی و میرات، كاری دەكرد. دین لەم قۆناغەدا یارمەتی چینی موڵكداری دەدا بۆئەوەی جنسیەت بەتایبەتی لەبارەی ژنانەوە، كونترۆڵ بكات و سیستەمی دابەشكردنی دارایی لەسەر بناغەی سەرەتازایین *Primogenitore*، بەهێز بكات كە بەئاراستەی پاراستنی پاوانی موڵكیەتی زەمین لەدەست ئەرستۆكراتەكاندا كاری دەكرد. دێهاتیە بێ زەمینەكان كەمتر جازیبەیان لە كاسۆلیسیزمدا دەبینی و بەرامبەری بێهودەیی و تەنانەت دوژمنیان پیشاندەدا لەبری ئەوە لایەنگری نەریتە ئیلحادیەكان یان عامیانەكان لەجۆری خورافی یان جادوویان دەكرد (هەروەها تەماشای ئابێركۆمبی و ئەوانی دی بكەن ١٩٨٠).

تەنانەت بە قبوڵكردنی ئەگەری جیاوازی نێوان باوەڕ و كرداری دینی دێهاتیەكان و نەجیبزادەكان، بەو هۆیانەی كە لەسەرەوە هێناماناوە، بە سەختی دەكرێت ئەم جیاوازیانە وەك بەڵگەیەكی دژ بە تیورەی عەلمانیەت لەبەرچاو بگیرێ. ئەم ئیستدلالە كە كاریگەری مەسیحیەتی كاسۆلیكی لە سەردەمی دەرەبەگایەتیدا، زۆرتر لەسەر بناغەی تێبینی گواستنەوەی موڵكایەتی بوو، تا ئەندازەیەكی زۆر جێی گومانە. هەرچەند رەنگە چینی موڵكداری ئەو قۆناغە سودی لە مەسیحیەتی كاسۆلیكی بەو شێوەیە وەرگرتبێ، بەڵام گوتنی ئەوەی كە مەسیحیەت لە سەدەكانی ناوەڕاستدا لە بنەڕەتدا ئەم دەورەی بینیووە، گومڕاكەر و یەكلایەنەیە. لەم ئاراستەیەدا هەرئەوەندە بەسە بیر لە ئاینزای مەریەمی باكیرە و قەدیسان بكەینەوە بۆئەوەی لەوە تێبگەین كە مەسیحیەت وەك باوەڕ و كرداری خەڵكی پەسەند، چەند گرنگی هەبووە و چەند سەرنجی لە پەیوەندی دێهاتیەكان دەدا، وەك چۆن لە زۆرێك لە كۆمەڵگا دێهاتیەكانی ئەمڕۆدا بە تایبەتی لە جیهانی سێهەم و وڵاتە تازە پەرەسەندوەكاندا، كار دەكات. وەك چۆن ئەمڕۆ مەسیحیەت بەگشتی لەپاڵ باوەڕ و كرداره ئیلحادی و عامیانەكاندا لەم ناوچانەدا رەونەقی هەیە، رەنگە لە ئەورووپای سەردەمی فیودالیشدا هەر بەمشێوەیە پێكەوە ژیانی لەگەڵ ئیلحاد دینی عامیانەدا هەبوبێ.

ئیستدلالێكی تری نەیارانی تیورەی عەلمانیەت، جەخت لەسەر رەواجی زۆرێك لە عورفە تایبەتی و تاكانەییەكانی دەرەوەی بواری دینی رێكخراو، دەكات، لە پەرستن و عیبادەتی تایبەتیەوە بگرە تا خورافات، لە گوێگرتن لە بەرنامە دینیەكانی رادیۆوە بگرە تا ئارەزووی دەستخوێندنەوە و خوێندنەوەی ئەستێرەی بەخت لە گۆڤارەكاندا. لێرەدا دوبارە مەسەلەی پێناسی دین دێتەوە پێشێ. ئەوانەی نكوڵی لە عەلمانیەت وەك خەسڵەتێكی تایبەتی كۆمەڵگای هاوچەرخ دەكەن، ئارەزووی

ئەوە دەکەن لایەنگری لە پێناسە گشتگیرەکان بۆ دین بکەن.

وەك وێلسۆن گوتوێتی(١٩٧٦) دوهەم مەسەلەی ئەم ئیستدلالە ئەوەیە کە ئەگەر بڕوای دینی بالادەست بەسەر چالاکیە تایبەتیەکاندا بەهیچ شێوەیەکی دەزگایی و گشتی دەرنەکەوێت، خودی ئەم مەسەلەیە بەڵگەی جێگەی لەرزیوی دینە لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا. وێلسۆن ئەو راستیە قبوڵدەکات کە لە راستیدا زۆرێك لە تاکەکان رەنگە باوەڕ یان کرداری دینی تایبەتی لەناو کۆمەڵگایەکی بەگشتی دنیاییدا، بۆ خۆیان بپارێزن. بەبڕوای ئەو عەلمانیەت **»پرۆسەیەکە کە تیایدا دەزگاکان، کردارەکان و هوشیاری دینی، گرنگی کۆمەڵایەتی خۆیان لەدەستدەدەن«** (١٩٦٦، لا١٤١). لەدەستدانی گرنگی کۆمەڵایەتی، دەتوانێ قۆناغێك بێت بە ئاراستەی تەنانەت سڕینەوەی باوەڕی دینی تایبەتی.

دیارە دامێنی لەدەستچوون و لەدەستدانی گرنگی کۆمەڵایەتی دین، مەسەلەیەکی ئەزمونیە، بەلام دۆزینەوەی ئامێرێکی جێی متمانە بۆ ئەندازەگیری ئەم مەسەلەیە کارێکی ئەستەمە. ئەندازەگیری دامێنی بڕوای دینی شەخسی یان تایبەتی، تەنانەت لەمەش دژوارترە. ئەو ئامارانەی پەیوەندی بە ئامادەبوون لە کەنیسا یان پەیوەستبونەوە پێی، وەك دیاریکەری بڕوای دینی یان گرنگی دین لە ژیانی کەسانێکدا کە لە کەنیسا ئامادە دەبن، بەئاشکرا جێی متمانە پێکردن نیە. بۆ نمونە لە ویلایەتە یەکگرتوەکان ئامادەبوون لە کەنیسادا زۆر لە ئینگلتەرا و زۆربەی وڵاتانی ئەوروپا زیاترە، بەلام رەنگە ئەمە لەبەرئەوە بێت کە ئامادەبوون لە کەنیسا لە وڵاتە یەکگرتووەکاندا زۆرتر لە ئامادەبوون لە بەریتانیا، دەرخەری ئەندامێتی لە کۆمەڵ، لایەنگری بەها کۆمەڵایەتی و نەتەوەیەکان بێت و ئاماژە بێت بۆ ناوی باش (هێربێرگ ١٩٥٦، ویلسۆن ١٩٦٦، ١٩٨٢). پاشان کەنیسا و گروپە دینیە ئەمریکیەکان، تا ئەندازەیەك دنیاییبوون (لاکمان١٩٦٧،لا٣٦٦). لەلایەکی دیەوە هەڵسەنگاندنی باوەڕەکان راستەوخۆ لە رێگەی لێکۆڵینەوە ئاماریەکانەوە، رەنگە دەرئەنجامی گومڕاکەرانەی لێبکەوێتەوە. بۆ نمونە، ئەگەر پرسیار لە خەڵکی دەربارەی رادەی بڕوابوونیان بە خودا بکرێت، وەلامەکانیان زۆرتر رەنگە پیشاندەری ئەو مەسەلەیە بێت کە خەڵکی چ وەلامێك بۆ ئەمجۆرە پرسیارانە بە گونجاو دادەنێن و فێربوون کە چۆن وەلامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە و ئەم وەلامانە رەنگە لەبارەی باوەڕی شەخسی و دەروونی خۆیانەوە، زانیاریەکی هێندە سودمەند نەدات بەدەستەوە.

بەسەرنجدان لەم مەسەلانە، بەڵگە هەبووەکان زۆر تر لە قازانجی ئەو تێڕوانینانەن کە دین بە مانا هەمەکیەکەی، لایەنی کەم تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە مەسیحیەکانەوە هەیە، لە کۆمەڵگاپیشەسازیەکانی رۆژئاوادا، روو لە لەناوچوونە. ئاکواویوا (١٩٧٩) لە لێکۆڵینەوەی دراوەکانی پەیوەست بە ئەمەریکای لاتین و وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەوروپا یان هەموو جیهانی مەسیحیەوە، بەو دەرئەنجامە دەگات کە »دینامیکیەتی کارکردنی دینی لە هەموو شوێنێکدا، سستبوونی دینی کەنیسایی و کەم تا زۆر هەمووجۆرە بڕوایەکی دینی و لەوانە بڕوابوون بە خودا، ئاشکرا دەکات« (لا٣٨). نمونەی ئەم لاوازیەی بڕوای دینی ئەوەیە کە دین لە وڵاتە پرۆتستانتەکانی باکوری ئەمەریکادا، زۆرتر روو لە لەناوچونە تا لە وڵاتە کاسۆلیکیەکانی ناوچەی میدیتەرانە. بەهەرحاڵ هوڵەندا و بەلژیکا لایەنیکەم

تا ئەم دواییانەش لاوازی دینی کەمتریان لەخۆیان پیشانداوە و ویلایەتە یەکگرتووەکان رەنگە لە هەمووان کەمتر شایەتی لەناوچوونی مەسیحیەتە، دیارە لەسەر بناغەی ئامادەبوون لە کەنیسا و دیاریکەرە لێکچووەکانی دی، کە زۆر جێگەی متمانەش نین. لادێکان و ناوچە دێهاتیەکان دینیترن لە ناوچە شاریەکان. ژنان لە پیاوان دینیترن و هەر بەمشێوەیە، ژنانیماڵەوە لە ژنانی ئیشکەر، باوەردارترن. تەندروستان و لاوان لە تەمەن مامناوەندیەکان و چینی ناوەڕاست لە چینی کرێکار دینیترن. کرێکارانی پیشەسازی لە هەموو گروپ و چینە کۆمەڵایەتیەکانی دی، نادینیترن. لەناوچوونی باوەڕ و کارکردنە دینیەکان لەنێوان پرۆتستانت و کەلیمیەکاندا زیاترە لە کاسۆلیکەکان، ئەگەرچی پێدەچێ لەم بوارەدا کاسۆلیکەکانیش خەریکە لە پرۆتستانتەکان نزیکدەبنەوە.

تیورەکان و رونکردنەوەکانی کە پەیوەندی بە رەوتی گشتیەوە هەیە بە ئاراستەی عەلمانیەت، بەر لە هەرکەسێك دەڵێن کە ئەم پرۆسەیە بەئاشکرا پەیوەندی بە پلەی پیشەسازیبوون و شاریبوونەوە، هەیە، ئەگەرچی رەنگە ئەم پەیوەندیە ئەوەندە سادە و ئاشکرا نەبێت. پەیوەندی نێوان پیشەسازیبوون و عەلمانیەت، بەهیچ شێوەیەك کامڵ نییە. بۆ نمونە ویلایەتە یەکگرتوەکان یەکێك لە پیشەسازیترین نەتەوەکانی دنیایە، بەڵام بەناچار عەلمانیترین میللەت نییە. عەلمانیەت دەرئەنجامی گۆڕانی کۆمەڵایەتی ئاڵۆزە کە هەم لە دەرئەنجامی پرۆسەی پیشەسازیبوون و شاریبوونەوە دروستبوون و هەم لە پەیوەندیدا بوون بەم پرۆسەیەوە و لە راستیدا هۆکاریبوون. هەر لەبەرئەمە بۆ ناسینی ئەوەی کە بۆچی عەلمانیەت روویدا، دەبێت روانگەیەکی مێژووی و تەتبیقی گەلێك فراوانتر بگرینەبەر.

رونکردنەوەی ئەم پرۆسەیە پەیوەندی بەو جۆرە تیورەیەوە هەیە کە کەسی رونکەرەوە لەبارەی دەوری دین لە کۆمەڵگادا، قبوڵی دەکات. رونکردنەوە لەسەر بناغەی سستبوون یان لەناوچوونی دین، پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئەو کەسە لەبارەی هۆی دروستبوونی سەرەتایی دینەوە چ تێڕوانینێکی هەیە. ئەگەر دین وەك دەرئەنجام یان کاردانەوە بەرامبەر بە مەحرومیەت و ستەمکاری روونکرێتەوە، رونکردنەوەی عەلمانیەت دەبەسترێتەوە بە پەرەسەندنی فراوانی و دیموکراسیەوە. ئەگەر دین بە دەرئەنجامی کەمی زانین بزانرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی پەرەسەندنی زانست دادەنرێت. ئەگەر دین بە بەرهەمی ترس و نادڵنیایی بزانرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی توانای روو لە زیادی ئێمە بۆ رونکردنەوە و کونترۆڵی جیهانی سروشتی دادەنرێت. ئەگەر دین وەك کاردانەوەیەکی نیۆرۆتیکی لە بەرامبەر هەلومەرجی ژیان لە ئاستی پشتیدا دابنرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی ئەو واقعیەتە دادەنرێت کە ئێمە وەك رەگەزێك گەیشتوینەتە قۆناغی کامڵی لە پرۆسەی پەرەسەندنماندا. ئەگەر دین وەك هۆکارێکی رێکخەری کۆمەڵگا تەماشا بکرێت، عەلمانیەت بە دەرئەنجامی ئەو واقعیەتە دادەنرێت کە پێویستمان بە زنجیرەیەك بەهای گونجاوتر لە هەلومەرجی تازەدا هەیە. ئەگەر دین بە هۆکاری بەخشینی مانا بە بوونی مرۆۋ دابنرێت، ئەوا عەلمانیەت بە بەرهەمی قەیرانی مانا یان پرۆسەی گەڕان بەدوای رێگەیەکی تازەدا بۆ ئامادەکردنی مانایەکی گونجاوتر لەگەڵ هەلومەرجی هەبوودا، دادەنرێت.

دواجـار دەبێــت بڵــێین کـە لـەم مەســەلەیەوە وادەردەکـەوێت کـە ئەگـەر تیورەیـەکی قانعکـەرمان لــەبارەی دینــەوە نــەبێت، تیورەیــەکی بەتــەواوی قانعکەرمان لەبارەی عەلمانیەتیشەوە نابێت. پاشان گەر دەمانتوانی تێبگەین کە چ شتێك لە کۆمەڵگای هاوچــەرخدایە کــە بەئاراســتەی لاوازکردنــی دیــن کاردەکات، ئەوسا لەبارەی ئامادەبوون و دەسەڵاتی دینــەوە لــە رابــردوودا و لــە کۆمــەڵگاکانی دیشــدا، زانینێکـــی زیاترمـــان بەدەســـتدەهێنا. کـــەوابوو مەســــەلەی عەلمانیــــەت گرنگیــــەکی تیــــوری دەستنیشانکەری هەیە.

عەلمانیــــەت ئەگەرچــــی پەیوەنــــدی بــــە پیشەسازیبوون و شاریبوونەوە هەیـە، بەڵام دەبێت ئەم پرۆسەیە بەپێی گۆڕانیکی کۆمەڵایەتی فراوانتر و بنچینەیتر، لەبەرچاو بگرین کە هەم لەم گۆڕانانەوە سەرچاوەی گرتووە و هـەم بـەهێزیان دەکات. رەنگـە وەك فیبـەر گوتـوێتی تێروانینی باڵادەست ئـەوەبێت کـە پەرەســەندنی عەقڵانیــەت لــە رۆژئــاوادا کلیلــی تێگەیشتنی پرۆسەی عەلمانیەتە. ئەم تێروانینە ئەو واقعیەتـە رووندەکاتــەوە کــە وڵاتــە پرۆتســتانەکان زۆرتــــر لــــە وڵاتــــەکانی تــــر، لــــەژێر کاریگــــەری عەلمانیەتـدان. ئـەم پرۆسـەیە دوو رووی هەیـە کـە لـەبارەی هەریـەکێك لەوانــەوە بیریــارانی جیــاواز، جـەختی جیـاواز دەکـەن. لـەرووی یەکەمـەوە دەبـێ بگـوترێ کـە هەنـدێك هۆکـار هـەن کـە تایبـەتن بـە مەســیحیەت و بــە بــڕوای فیبــەر بونەتــە هــۆی پرۆتستانیزم و بەتایبەتی پرۆتستانیزمی کالڤینی. لە لایەنی دوهەمەوە، هەندێك هۆکار هەن کە تایبەت نین بـە مەسـیحیەت، بـەڵکو پەیوەنـدیان بـە گـۆڕان و پەرەسەندنی شێوازەکانی بیرکردنەوە و شێوازەکانی بیــنین بــۆ جیهــان هەیــە و بــە جەمســەرەکەی تــری

مەســیحیەت یــان لــە راســتیدا دیــن بــە مانــا هەمەکیەکەی، دادەنرێن.

بێرگــەر لــە شــیکردنەوەکەیدا (١٩٧٣) جــەخت لەسـەر کۆمـەڵێك هۆکـار دەکـات کـە پەیوەنـدیان بـە نەریتی مەسیحیەوە هەیە. ئەو باسی ئەم مەسەلەیە دەکات کە »نەریتی دینی رۆژئاوایی تا چ ئاستێك دەیتــوانی تــۆوی عەلمانیــەت لــە بــواری خۆیــدا، پەرشوبڵاو بکاتەوە« (ل١١٦). دیارە ئەمە بـەو مانایـە نیە کە بێرگەر تەسەور دەکات مەسیحیەت مـەیلێکی زاتی و خۆبەخۆی تێدایە بە ئاراستەی عەلمانیەت. ئەو ئەم راستیە قبوڵدەکات کە زۆرێك لەم هۆکارانە لـەم مەسـەلانەدا دەسـتیان هەیـە کـە پەیوەنـدیان بـە نــەریتی دینیــەوە نیــە، بــەڵکو بەتــەواوی هۆکــاری کۆمەڵایەتی و ئابورین. بەهـەرحاڵ بە بڕوای بێرگـەر ئــەم هۆکارانــە زیــاتر کاریگــەریان لــە مەســیحیەت کـردووە بـەمانای تایبـەت، تـاکو لـە دیـن بـە مانـای گشــتی. ئــەم هۆکارانــە ئاراســتەگەلێك دەهێننــە پێشــێ و بــەهێز دەکــەن کــە لــەناو خــودی نــەریتی مەسـیحیەتدا، بـوونی هەیـە. لـەناو جۆرێـك فـەزای تایبــەتی کۆمەڵایەتیــدا، مەســیحیەت مــەیلێك بــە ئاراستەی عەلمانیـەت پیشـاندەدا، بـە هـەر حـاڵ لـە دینەکانی تردا، ئەگەر کۆمەڵگا شایەتی پەرەسـەندن، پیشەسـازیبوون و شـاریبوون بێـت ، ئـەم مەیلانـە دروسـت نـەدەبوون و لـە دەرئەنجامـدا ئـەم دینانـە روبــەرووی پرۆســەی عەلمانیــەت نەدەبونــەوە. لـەمرووەوە دەکـرێ بگـوترێ مەسـیحیەت بەدەسـتی خۆی گۆڕی خۆی هەڵدەکەنێ.

بــەبڕوای بێرگــەر ئــەم مەیلانــەی تایبــەت بــە مەسـیحیەت، پەیوەنـدیان بـە رەگ و ریشـەکانی لـە کلیمیەتدا هەیە. ئەم مەیلانە لە دینی کاسۆلیکیدا »کۆنترۆڵکرابوون« بەڵام لە بزوتنەوەی پرۆتستانتی چاکســازی دینیــدا، ئــازادکران. ئــەم بزوتنەوەیــە

هاوکاتبوو لەگەڵ جۆرێك گۆڕانکاری لە بونیادی چینایەتی و جیگۆڕکێی فیودالیزمدا. هەر ئەم بزوتنەوەیە بوو کە هێزە عەلمانیەکانی لە ناو مەسیحیەتدا رزگارکرد.

دیارە ئەم تیورەیە بە توندی بیرهێنەرەوەی ماکس فیبەرە. بێرگەر لە شیکردنەوەکانی خۆیدا زۆر پەیڕەوی لە فیبەر دەکات. تەنها جیگۆڕکێیەك کە بێرگەر لە تێڕوانینی سەرەکی فیبەردا لەبارەی گۆڕانی مەسیحیەت و کۆمەڵگای ئەوروپاییەوە ئەنجامی دەدات، ئەوەیە کە لەبری »عەقڵانیەت«ی فیبەر، سود لە زاراوەی »هێزە هاندەرەکانی عەلمانیەت« وەردەگرێ.

بیرگەر جەخت لەسەر مەیلی پەیوەندیدار بە عەقڵانیەتی روو لەزیادبوون دەکات کە فیبەر ناوی دەنێ » ئەفسانە داماڵین لە دنیا«. کلیمیەت، سیحر و سۆفیگەری و هاوشێوەکانی رەدکردبۆوە و مەسیحیەتیش وەك کلیمیەت، ئەم هەڵوێستەی وەك عەقڵانیەتی ئەخلاقی قبوڵکرد. بە بڕوای فیبەر کەنیسای مەسیحی سەرەتا، هەنگاوێکی روو لەدواوەی هەڵهێنابوو. ئەم کەنیسایە لەڕاستیدا تاکانەیەتی خودایی کلیمیەتی کردبوو بە بتێك و تا ئەندازەیەك سۆفیگەری بەرقەرار کرد و رەگەزە سیحراوی و نهێنی ئامێزەکانی سەرلەنوێ لەناو مەسیحیەتدا هێنابووە پێشێ. بەڵام هێزەکانی هاندەری عەقڵانیەت لە مەسیحیەتدا بەهێزتربوون لەوەی کەیەکسەر لەناوبچن. ئەخلاقی ئەم دنیاییە لە نەریتی مەسیحیدا پارێزراو مایەوە. لەلایەکی دیەوە ماهیەتی بونیادگەرانەی مەسیحیەت، واتە ئاراستەی بۆ تواندنەوەی جیهان، لە سەرتاسەری سەدەکانی ناوەڕاستدا بەهۆی گروپەکانەوە پارێزراوبوو کە لەم مەیلەوە بۆ شۆڕشکردن، ئیلهام وئومێد و رینماییان وەردەگرت. ماهیەتی ئەخلاقی سەرەتای مەسیحیەت و پەیوەندی بە دادپەروەریەوە، هەرگیز فەرامۆش نەکرابوو.

بە بڕوای فیبەر، مەیلەکانی هاندەری عەقڵانیەت لە مەسیحیەتدا، بونە هۆی دروستبوونی پرۆتستانیزم بەتایبەتی کالڤینیزم، واتە هەمان ئەو دینەی کە بە بڕوای فیبەر لایەنی کەم لەڕووی عەقڵانیەتی وێنەییەوە، بەعەقڵانیترین شێوەی دینی لە مێژووی مرۆڤایەتیدا دادەنرێت. بە بڕوای بێرگەر هەر ئەم عەقڵانیەتە پرۆتستانتیە، لەپشت عەلمانیەتەوە رادەوەستێت. لێرەوە پرۆتستانیزم پێشەکی عەلمانیەتە. »پرۆتستانیزم لە بەراورد بە کاسۆلیزمدا، بواری شتی پیرۆزی لەواقعدا، زۆر کورت کردەوە« (بێرگەر،١٩٧٣،لا١١٧). پرۆتستانیزم رەهەندە نەریتی و ئاینیەکانی کاسۆلیسزمی تاڕادەیەکی زۆر سڕیەوە و نهێنی و مۆجیزە و جادوی دورخستەوە. چەمکی خودای پرۆتستانیزم راستەوخۆ تراسندنتاڵیە کە لەگەڵ ئەوەشدا کە جیهانی دروستکرد، بەتەواوی خۆی لێ دورخستەوە. بەبڕوای بێرگەر ئەم جیابوونەوە بنەڕەتیەی بواری پیرۆز و ناپیرۆز لە پرۆتستانیزمدا گەلێك گرنگە. پرۆتستانیزم پەیوەندی و بەرکەوتنی نێوان خودا و مرۆڤی ئەوەندە کەمکردەوە کە پچڕانی ئەم زنجیرەیە پێویستی بە هەوڵێکی زۆر نیە. ئەم مەیلە رەگ و ریشەی لە یەکەمین گۆڕانکاریەکانی نەریتی مەسیحی ـ کلیمیەتدا هەیە: »دەبێ بۆ رەگ و ریشەکانی عەلمانیەت لە یەکەمین سەرچاوەکانی دینی ئیسرائیلی کۆندا بگەڕێین«(لا ١١٩). بەهەرحاڵ هەر ئەم بزوتنەوەیەی ژیاندنەوە و بەهێزکردنی دین بوو کە بە بزوتنەوەی ریفۆرمی دینی دادەنرێت، بەشێوەیەکی ناکۆکیئامێز تۆوی لەناوچونی دینی چاند.

هۆیەکی چارەنوسسازی دی ئەم مەسەلەیە کە لە ناوەندی نەریتی مەسیحیدایە، ئەو جۆرە دەزگا دینییەیە کە مەسیحیەت دروستی کرد، واتە هەمان کەنیسە. ئەگەر بێرگەر لەمبارەیەوە راستی گوتبێت، ئەوا مەسەلەکە زۆر سەرسوڕهێنەر دەبێت، چونکە کاوتسکیش (١٩٢٥)بۆ سەرکەوتنی مەزن و پەرەسەندنی مەسیحیەت لە سەرتاسەری جیهانی رۆمی و مانەوەی لەم جیهانەدا، جەخت لەسەر ئەم مەسەلەیە دەکات. بە بڕوای بێرگەر دەزگای کەنیسە دواجار کەوتە ئاراستەی عەلمانیەتەوە، چونکە ئەم دەزگایە هەڵگری جۆرێك پسپۆرێتی بەزەبر و زاتی بوو. ئەم پسپۆرێتیە خەسڵەتی هاوبەشی دین لە مێژووی دینەکاندا نەبوو. ماناکانی ئەم پسپۆرێتیە ئەوەبوو کە دەکرێ بوارەکانی تری ژیان زیاتر بە بوارێکی جیا و ناپیرۆز بسپێرێت و لە دەرئەنجامدا ئەو بوارانە لە سنوری دەسەڵاتی شتە پیرۆزەکان، بهێنێتە دەرەوە. ئەمە بەو مانایەیە کە دەکرا بوارە نادینیەکانی تر بەئاسانی بخرێنە ناو پرۆسەی عەقڵانیەت و بەکارهێنانی بیر و زانینی تازە و زانستەوە. بەمشێوەیە کەنیسە و دین لە رێنمایکردنی ژیان و تەفسیری جیهاندا، رۆڵێکی کەمتر گرنگی وەرگرت و کاریگەریەکانی زیاد لە جاران کەم دەبۆوە.

نەهێشتنی پاوانکردنی دەزگایەك بۆ بابەتە دینیەکان و پرۆسەی داماڵینی مەرکەزیەتی دینی کە هاوڕێی پرۆتستانیزم بوو، لە بەهێزکردنی عەلمانیەتدا دەورێکی گرنگی هەبوو. ویلسۆنیش (١٩٦٦) لەگەڵ بێرگەردا لەمڕووەوە هاوڕایە، بەڵام بۆ ئەم مەسەلەیە لە پرۆسەی عەلمانیەتدا تەنها دەور بەهۆیەکی گرنگ نادات، بەڵکو بە دەرئەنجامی ئەم پرۆسەیەی دەزانێت. بە بڕوای ویلسۆن دەستەی (فرقە)متودیزم لە پەرەسەندنی عەقڵانیەت لە بەریتانیادا زۆر گرنگی هەبوو، چونکە توانیبووی گروپە کرێکاریەکان بەلای خۆیدا رابکێشێ. لە دەرئەنجامدا ئەم دەستەیە هەموو شتێکی لەنێوان گروپێکی کۆمەڵایەتی تازە لەدایکبوودا، بەهێزکردبوو. ئەم دەستەیە دەستگەیشتن بە دیسپلینێکی دەرونی لەناو رێکخستنێکی کۆمەڵایەتی تازەدا بۆ ئەم گروپە ئاسان کردبوو، وە ئەم دیسپلینە دەرونیەی کردبووە جێنشینی دیسپلینێکی دەرەکی کە ژیانی کۆمەڵایەتی تەقلیدی رێکدەخست، بەڵام لە ئەنجامی شۆڕشی پیشەسازیەوە خەریکبوو لەناودەچوو.

بەهەرحاڵ فرەگەری دینی نەك هەر یارمەتی پەرەسەندنی عەقڵانیبوونی دا، بەڵکو کاریگەریەکی راستەوخۆی کردە زۆرێك لە خەڵکی، بۆئەوەی پشت بکەنە دین. ئەو هەلومەرجەی کە هەر کەس دەیتوانی لەنێوان تەفسیر و دەزگا جیاواز و رەقیبە دینیەکاندا، کە بە وتەی بێرگەر لە »بازاڕی دین«دا پێکەوە ململانێیان دەکرد، یەك تەفسیر و دەزگا بۆ خۆی هەڵبژێرێ، لە دەرئەنجامدا دەبووە هۆی کەمبونەوە یان لەدەستدانی دەسەڵاتی دیدی دینی. ئەم هەلومەرجەی فرەیی دینی کە کەسێك دەیتوانی دینەکەی بۆخۆی هەڵبژێرێ، لە ناواخندا هەمان ئەو هەلومەرجە بوو کە کەسێك دەیتوانی هیچ دینێك بۆخۆی هەڵنەبژێرێ. کاتێك تیزێك یان دەزگایەکی دینی بە دەرکردنی تێز و دەزگاکانی دی، باڵادەستی بەسەر کۆمەڵگادا پەیدا دەکات، پەیدابوونی دیدگایەکی نادینی لەلایەن هیچ گروپێك یان کەسێکەوە لەناو کۆمەڵگادا تەحەمول ناکات.

نابێت ئەوەمان لەبیر بچێت کە فرەگەری دینی لەو ڕووەوە کە جۆرێك راکردنی دینی ناڕێکخراو بۆ نەیاران و چینی کرێکار فەراهەم دەکات، تا ئەندازەیەك رێگەی لە گەشەکردنی پرۆسەی

عەلمانیەت گرتووە. ویلسۆن ئەو واقعیەتە قبوڵدەکات کە میتۆدیزم نەك هەر عەقلانیەتی بەهێزکرد، بەڵکو روداوێکی گرنگی لە ژیانەوەی دینی بەرێخست. لەگەڵ ئەمەشدا **فرەگەری لە دور مەودادا نەك دین، بەڵکو عەلمانیەت بەهێز دەکات. پرۆسەی عەلمانیەت قۆناغێك فرەگەری دینی بەجێهێشت و ئەمجۆرە فرەگەریە، دەبێ بە یەکێك لە لایەنە گرنگەکانی پرۆسەی عەلمانیەت بژمێرێت.**

تیۆرەی عەلمانیەتی بێرگەر قانعپێکەرە و لەگەڵ ئەو راستیەدا دەگونجێ کە تەنها دنیایی مەسیحی و بەتایبەتی پرۆتستانیزمە کە زۆرترین پلەی عەلمانیەتی ئەزموون کردووە. بەڵام رەنگە ئەو زیاد لە سنور جەخت لەسەر هۆکارە دەرونیەکانی مەسیحیەت دەکات. دەکرێ گرنگی دەزگایی کەنیسەیی و فرەگەری دینی قبوڵبکرێت، بەڵام قبوڵکردنی ئەو تێروانینەی کە عەلمانیەت دەرئەنجامی مەیلە زاتیەکانی مەسیحیەتە کە پاش کۆنترۆڵی هەزار و پێنج سەد ساڵەی کاسۆلیسیزم بەهۆی هەندیك گۆرانی کۆمەڵایەتیەوە، هەڵچووە، زۆر ئەستەمە. بەهەمان شێوە ئەو وتەیەی کە گۆرانکاریە کۆمەڵایەتیەکان گرنگیەکی بنچینەییان هەیە، دروستە، بەڵام ئەستەمە بتوانرێ بگوترێ کە ئەم گۆرانکاریانە کاریگەریان لەسەر وڵات و کۆمەڵگا مەسیحیەکان زیاتر لە وڵاتانی دی کردووە. رەنگە بتوانرێ بگوترێ کە مەسیحیەت لەم گۆرانە کۆمەڵایەتیانەدا کەم تا زۆر دەوری هەبووە یان زەمینەسازی بۆکردووە یان نەیتوانیووە رێگەیان لێبگرێت. بەکورتی ئەم پەیوەندیە ئاڵۆزترە لەوەی کە تیۆرەی بێرگەر باسی دەکات.

ویلسۆن جەختێکی زۆرتر لەسەر ئەو هۆکارانە دەکات کە لە دەرەوەی نەریتی مەسیحین و باڵادەستن لە پرۆسەی عەلمانیەتدا. لێرەشدا گەشەکردنی عەقلانیەتە کە دەوری سەرەکی دەبینێ، بەڵام وێلسۆنیش وەك زۆربەی ئەو نوسەرانەی کە جەخت لەسەر هۆکاری دەرەکی دەکەن، گرنگیەکی زۆر بۆ گەشەکردنی سەربەخۆی زانین و میتۆدی زانستی دادەنێ، نەك مەیلە زاتیەکانی مەسیحیەت. ئیستدلالی ویلسۆن ئەوەیە کە پەرەسەندنی زانستی، تەفسیرە دینیەکانی بۆ دنیا، لاوازکردووە. ئەو بەتایبەتی گرنگی بۆ میتۆدی زانستی لەبارەی کۆمەڵگاوە دادەنێ، هەمان ئەو هۆکارەی کە بێرگەریش لە لێکۆڵینەوەکانی دواییدا (١٩٧١) جەختی لەسەر دەکاتەوە. مژدەی هەزارەیی دین و توانای رەوایەتی دروستکردن و ئاراستەکردنی رێکخستنی کۆمەڵایەتیەکەی لاوازبووە.

لێرەشدا جیابونەوەی بوارە کۆمەڵایەتیەکان و پسپۆربوونی دەزگایی دین، گرنگییان هەیە. خەڵکی بۆ دادپەروەری و داواکاری هەلومەرجی باشتر، چیدی روو ناکەنە کەنیسە و ژیانی ئەو دنیا، بەڵکو رودەکەنە دەزگا و پرۆسە سیاسیەکان. چاوەڕێی ئەوە لە دەوڵەت دەکرێت کە وەڵامی ئەم پێداویستیانە بداتەوە. هەنوکە کە ئەنجومەنەکانی یاساڕێژی و سیاسەتمەداران زیاد لە جاران رودەکەنە پێوەرە ئەخلاقیەکان، لە گرنگی دەوری کەنیسە لەپێناسکردن و ناساندنی ئەم پێوەرانە، کەمبۆتەوە. گرنگترین دەورێك کە بۆ کەنیسە ماوەتەوە، ئەنجامدانی **نەریتی تێپەڕینە** (مەبەستی نوسەر نەریتی تەعمیدکردن، هاوسەرێتی و نەریتی ناشتنی مردووە) و تەنانەت ئەم دەورەی کەنیسەش رۆژ بە رۆژ گرنگی کەمتر دەبێتەوە.

خاڵێکی سەرەکی دی کە ویلسۆن جەختی لەسەر دەکات (١٩٧٦، ١٩٨٢)، لەناوچوونی پەیوەندی کۆمەڵایەتیە لەناو فەزای تازەی شاردا و لە دەرئەنجامدا گۆڕان لە جێگە و خەسڵەتی چاودێری

کۆمەڵایەتیدا. لە کۆمەڵگا راستەقینەکاندا، چاودێری کۆمەڵایەتی بنەمایەکی ئەخلاقی و دینی هەیە، لە کاتێکدا لە دنیای عەقڵانی، تەکنیکی و بیرۆکراتی ئەمڕۆدا، چاودێری ناشەخسیە و ئەو بنەما ئەخلاقیەی پێشووی لەدەستداوە. لەناو فەزایەکی وادا دین گرنگی خۆی لەدەستدەدات و ئەو بەها گشتیانەی کە وەك نەریتی دینی بەیان دەکرێن، چیدی وەك رابردوو گرنگ نین.

بەڵام لەگەڵ گرنگی ئەم بەڵگانەدا، هێشتا کەموکوڕیەکی بنەرەتی لەم پرۆسەیەدا بەرچاو دەکەوێت. ئەو پرۆسەیەی لە سەرەوە باسمانکرد، رەنگە دەورێکی لاوەکی هەبێت لە رونکردنەوەی عەلمانیەتدا و ئەو دەورە بنەڕەتیەی نەبێت. پەرەسەندنی تەفسیرە مادی و زانستیەکان لەبارەی جیهانەوە لەبری تەفسیرە دینیەکان، بەشێکە لەو پرۆسەی گۆڕانەی کە لەناوچوونی دینیش بەشێکە لێی. لەناوچوونی دین رویەکی تری ئەم گۆرانەیە. پەرەسەندنی زانست بەهەمان ئەندازە کە هۆی لەناوچوونی دینە، کە لەناوچوونی دین یان لایەنی کەم لەناوچوونی هەندێك لە شێوەکانی دین، هۆی زەمینەسازی پەرەسەندنی زانست بوو. پەرەسەندنی زانست و لەناچوونی دین، لەڕاستیدا بەشێکن لە یەك پرۆسە. هەردووکیان دەرئەنجامی گۆڕانی زۆر بنەڕەتی و بونیادین.

بێگومان لێرەدا ئەوە جێگەی دودڵی نیە کە پەرەسەندنی زانست یارمەتی لاوازبوونی دینی داوە، لەوکاتەوەی زانست بایەخی پەیداکرد و بووە بناغەی زۆرێك لە لایەنەکانی ژیانی مرۆڤ، بە ویست و ناویست هەڕەشەی لە دیدگای دینی کرد. بەڵام ئەم مەسەلەیە ئەوەندە لەبەرئەوە نیە کە لەنێوان دیدی زانستی و دینیدا دژایەتیەك هەیە. وەك چۆن لەم کتێبەدا چەندانجار جەختمان لێکرد، دین لایەنیکەم بە مانایەکی بنەڕەتی بەناچار وەڵامی هەمان جۆر پرسیار یان مەسەلە ناداتەوە کە بابەتی زانستە. دین بەناچار پەیوەندی بە پەیوەندی ئەزمونگەرانەی شتەکانەوە لە جیهانی سروشتیدا نیە. دین تەنها بەو پرسیارەوە سەرقاڵە کە بۆچی شتەکان بەو شێوەیە هەن. زانست دەتوانێت پێمان بڵێت کە جیهان بە چ شێوەیەك دروستکراوە، بەڵام ئەو پرسیارانەی کە پەیوەندی بە مانای جیهان و بوونی مرۆڤەوە هەیە، وەڵام ناداتەوە. هەندێکجار دەگوترێت کە زانست هیچ شتێکمان لەبارەی ئەو شتانەوە پێ ناڵێت کە بەڕاستی دەمانەوێت بیزانین. ئەم مەسەلەیە پەیوەندی بەوەوە هەیە کە بەڕاستی ئێمە دەمانەوێت چ شتگەلێك بزانین و وادەزانین کە قابیلی زانینن و وا دەرناکەون کە زانست دەتوانێت وەڵامێکی ئەم خواستانەی ئێمە بداتەوە. **خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە زانست و دین بە ناچار دژیەك نین** ( بلا١٩٧١،ستارك وبين بريج١٩٨٥).

هەرچەند کە دین و زانست بە ناچار دژی یەك نین، بەڵام لە نەریتی رۆژئاواییدا بەناچار ئەم دژایەتیەیان دۆزیوەتەوە، چونکە تێزە دینیەکان لەم نەریتەدا هەوڵیداوە شتە ئەزمونیەکان نەك لەسەر بناغەی بەڵگە ئەزمونیەکان، بەڵکو لەسەر بناغەی کتێبی پیرۆز رونبکاتەوە. دین لەم هەوڵانەیدا بە ویست یان نەویست دەبێت شکستی خواردبێت. شکستی تەفسیرە دینیەکان لەبارەی هەلومەرجی زەوی لەناو مەنزومەی خۆریدا و پەرەسەندنی، نمونەی دیاری ئەم مەسەلەیەیە. لە ئەنجامی ئەم هەوڵانەدا، دین دەبوو تا ئەندازەیەك بایەخی خۆی لەدەست بدا.

ویلسۆن بە باشی ئاگای لەو خاڵانە هەیە، بەڵام دەرئەنجامی گونجاوی لێوە وەرناگرێت. بەبڕوای ئەو مەسەلەکە تەنها ئەوەیە کە دین بایەخی خۆی لێ

سەندراوەتەوە. هەرچەند رەنگە ئەو مەسەلەیە راستبێت، بەڵام خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە ئەم مەسەلەیە پرۆسەیەکی بنەڕەتی نییە. لەم مەسەلەیەوە وا ئەنجامگیری ناکرێت کە پەرەسەندنی زانست خۆبەخۆ بۆتە هۆی لاوازبوونی دین یان تەنانەت مەسیحیەت. بەڕاستی هەندێك لە تێزە دینیەکان لاوازبوون، **بەڵام دیدی دینی بۆ جیهان ئەگەر تێزەکانی جێبەجێبکات یان بیگۆڕێت و چاکی بکات، بەناچار لاواز نابێت**. بۆ نمونە پەرەسەندنی ئەو نهێنی و شاراوانەی کە تێگەیشتن لە ماناکەی بە بڕوای هەندێك بیریار پێویستی بە تەفسیری دینی هەیە. خاڵی سەرەکی ئەوەیە کە زانست لە چۆڵاییەوە دروست نابێت. ئاراستەوەرگرتنی رەخنەگرانە، کراوە و گومانکارانە کە خەسڵەتی زانستە، دیاردەیەکی تازەیە کە لە هەلومەرجێکی کۆمەڵایەتی و میژوویی تایبەتدا دروستبووە، واتە هەمان ئەو هەلومەرجە کۆمەڵایەتی و مێژووییەی کە رێگەی عەلمانیەتی هەموار کردووە. ئەم دیاردەیە تەنها دەرئەنجامی کۆکردنەوەی بەردەوامی زانین و بەڵگە زانستیەکان، لەبارەی جیهانی سروشتیەوە نیە. سەدان ساڵ بوو کە لەژێر باڵادەستی کاسۆلیسیزمی سەدەکانی ناوەڕاستدا، زانست پێشکەوتنێکی کەمی کرد، چونکە ئەم قۆناغە قبوڵکەری ئەندێشەی نویٚ نەبوو و بە بەراوردیش لەگەڵ یۆنانی کلاسیکدا تازەگەری و رەسەنایەتیەکی فیکری کەمتری لەخۆی پیشاندەدا. تەنها لە سەرەتاکانی سەردەمی تازەدا بوو کە زانست یەکسەر سەری بڵندکردەوە.

مارکس و ئنگڵز وایان ئیستدلال کرد کە بەهۆی لەناوچوونی فیودالیزم و پەیدابوونی سەرمایەداریەوە، بە بوونی بزوتنەوەی ریفۆرمی دینی و ئەگەر بێرگەر دروستی گوتبێت تا ئەندازەیەك بەهۆی ئەم بزوتنەوەیەوە، دیدی دینی لەبارەی جیهان و رەوایەتی رێکخستنی کۆمەڵایەتیەوە، کوتەکێکی گەورەی بەرکەوت. سەرمایەداری لەگەڵ ئەوەدا کە دیدی دینی بۆخۆی پاراست، بناغەی مادی بیرکردنەوەی داڕشت. تەنها شۆڕشی مەزن و کۆتایی سەرمایەداری، واتە شۆڕشی فەرەنسا بوو کە توانی دیدی دینی راستەوخۆ بخاتە لاوە. بەڵام شۆڕشەکانی سەرمایەداری رێگەی بۆ بیرکردنەوەی مادی و دەرکردنی شێوازەکانی بیرکردنەوەی دینی، خۆشکرد. هەرئەم هۆکارە بوو کە ئەگەری پەرەسەندنی زانستی رەخساند. ئەم قۆناغە شایەتی رێڕەوێکی زانستی بوو بۆ جیهان و پێشکەوتن، لە هەموو بوارەکانی زانیندا. ئەمە هەمان ئەو سەردەمە بوو کە ئەگەری خوانەناسینی بۆ هەندێك کەس فەراهەم کرد.

لە بواری سیاسەتدا چیدی ئەوە نەك تێزە دینیەکان و کتێبی پیرۆز، بەڵکو هاوڵاتیان بوون کە رەوایەتیان بە حکومەت و رژێمەکان دەبەخشی. مافی خودایی شاکان دورخرایەوە. زیاد لە جاران وا تەسەور دەکرا کە شتەکانی ئەم دنیایە پەیوەندی بە خودا یان دینەوە نیە. رێکخستنی کۆمەڵایەتی چیدی بە موقەدەری خودا نەدەزانرا، بەڵکو بە دەرئەنجامی پەیمانەکان، رێکەوتنەکان و بڕیاری مرۆڤەکان دەزانرا. بە دەربڕینێکی تر رێبازی بیرکردنەوەی مادی بە هاوتەریبی لەناوچوونی دین، پەرەی سەند، هەر ئەم هۆکاری لەناوچوونی دینە بوو کە هەم ئەم رێبازەی ئاسانکرد و هەم دەرئەنجامی بوو.

بەهەرحاڵ پرۆسەی عەلمانیەت، پرۆسەیەکی بەردەوام و هەموار نەبوو. روداوەکانی ژیاندنەوەی دینی و لەناوچوونی چەندانجار هاتنە پێشیٚ و

کەوانەی بڕوای دینی سەرەولێژی هەبووە. هەندێك لە بیریاران بەدوای لەناوچوونی هەمەکیدا رۆیشتن. هەندێکی دی ئاستی فراوانتریان بینی و بەو ئەنجامە گەیشتن کە رەوتی عەلمانیەت بە لوتکەی خۆی گەیشتووە و هەنوکە دەکرێت ئاماژە بەرجەستەکانی پەیدابوونی دین، بدۆزینەوە. پەیدابوونی بزوتنەوە دینیە تازەکان و فەندەمینتالیزمی مەسیحی وەك بەڵگەیەکی ئەم گۆڕانە دەهێنرێنەوە. نمونەی عەلمانیەت لە کۆمەڵگا جیاوازەکانی مرۆڤایەتیدا، نمونەیەکی سەرڕاست یان چونیەك نەبووە. پرۆسەی عەلمانیەت بەتوندی لەژێر کاریگەری زەمینەی کۆمەڵایەتی یان مێژووی دینی وڵاتێکدا، کاردەکات.

دێیپید مارتین (١٩٧٨) کە زۆرترین سەرنجی لە نمونە جیاوازەکانی عەلمانیەت داوە، گەرچی شیکردنەوەی خۆی لەسەر بنەمای پلەی فرەگەری دینی یان پاوانکردنی دینی لە کۆمەڵگادا، دامەزراندووە، بەڵام لە رونکردنەوەکەی خۆیدا جۆری بەربڵاوی گۆڕاوەکان پێکەوە دەلکێنێ، لەوانە: توانای کەمایەتیە دینیەکان و پەرشوبڵاوی جوگرافیاییەکەی، پەیوەندی نێوان گروپە دینیەکان، دەستەبژێرە فەرمانڕەواکان، خەسڵەتی زاتی نەریتە جیاوازە دینیەکان. ئەو جۆرە هەلومەرجە سەرەکیانەی کە مارتین دەستنیشانی کردووە، بریتین لە: یەکەم، هەلومەرجی پاوانکردنی کاملی دینی لە نەریتی کاسۆلیکیدا، دوهەم، هەلومەرجی دوو دینی کە کەنیسەی پرۆتستانت رێکخراوی سەرەکیانە، بەڵام کەمایەتیەکی گەورەی کاسۆلیکەکانیش لەخۆ دەگرێت. سێهەم، هەلومەرجێکی فرەگەرتر کە ئینگلتەرا نمونەی ئاشکرایەتی، بەو شێوەیەی کە کەنیسەی دەوڵەتی لەپاڵ چەندان جۆری بەرفراوانی گروپە دینیە ناڕازی و جیاوازەکانی دیدا هەیە. چوارهەم، فرەگەرترین هەلومەرج کە تایبەت بە ویلایەتە یەکگرتوەکانی پرۆتستانتە. پێنجەم، هەلومەرجی وڵاتانی وەك ئەسکەندناڤی و وڵاتانی ئەرسۆزۆکس دین کە کاسۆلیکەکان هیچ ئامادەبونێکیان تیدا نیە. مارتین دەلالەتە ئالۆزەکانی دەوری گۆڕاوی دینی لەناو کۆمەڵگادا و لە هەریەکێك لەم هەلومەرجانەدا تاوتوێ دەکات و دوای ئەو دەرئەنجامە جیاوازانە دەکەوێت کە ئەم دەورە گۆڕاوە لە زۆرێك لە لایەنە گشتیەکان و ژیانی تایبەتیدا دەیخاتەوە.

ستارك و بین بریچ (١٩٨٠،١٩٨٥) لەبارەی مەسەلەی گرنگی بەردەوامی عەلمانیەت و ژیاندنەوەی دیندا، ئیستدلال دەکەن کە عەلمانیەت پرۆسەیەکی خۆ سنوردارکەرە. ناکرێ شتێکی تازە لە روانگەی ئەواندا بدۆزرێتەوە. ئەم پرۆسەیە بەشێکە لە چەرخی ئاسایی بزوتنەوەی دینی. پرۆسەی گروپسازی کە لەرێگەیەوە گروپەکان خەسڵەتی جیابونەوەیان لەدەستدەن و بەئاراستەی گۆڕان بۆ کەنیسە دەجوڵێن، بەشێکە لە پرۆسەی عەلمانیەت. سەرئەنجام کەنیساکان لە دەرئەنجامی مەیلیان بۆ گۆڕانی هەرچی زیاتر بەئاڕاستەی زۆرترین ئاستی دنیایی بوون، دەبنە هۆی پەیدابوونی گروپە دینیە ژیاوەکان یان گۆڕانە نوێیە بەدعەتکاریەکان. ستارك و بین بریج لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو واقعیەتەیان قبوڵە کە پەرەسەندنی زانست، عەلمانیەتێکی توند و بێوێنەی بەدوادا دێت، بەڵام دەڵێن کە زانست ناتوانێ پێداویست و ئارەزووە سەرەکیەکانی مرۆڤ، جێبەجێ بکات. زانست ناتوانێ هەموو رەنج و نادادپەروەریەکان لەم جیهانەدا لەناو ببات و ناتوانێ رێگەی دەربازبونێك بۆ لەناوچونی فەردی پیشکەشبکات و دواجار زانست توانای نیە کە مانا بە بوونی مرۆڤ ببەخشێ. لە روانگەی خەڵکیەوە ئەوە تەنها خودایە کە دەتوانێ ئەمجۆرە

کارانە بکات. لێرەوە دین نەك هەر دەمێنێتەوە و دوبارە باڵادەست دەبێتەوە، بەڵکو وێنەی تراسندنتاڵی و میتافیزیکیشی دەپارێزێت. زۆرتر رەنگە دین وێنەی رێبازی نوێ بەخۆیەوە بگرێت، نەك ئەوەی کە دەستەکانی ژیاندنەوەی نەریتە بەجێماوەکان، دوبارە رەونەق پەیدا بکەنەوە، چونکە ئەم دەستانە بەویست یان نەویست دەکەونە بەرامبەر هەمان ئەو هێزانەی کە عەلمانیەتیان لە قۆناغی یەکەمدا بەبارهێناوە. بە گشتی رێبازە نوێکان کەموکوڕیەکانی نەریتەکانی پێشویان نیە، هەمان ئەو کەموکوڕیانەی لە جێبەجێکردنی پێداویستیە مرۆییەکان لە هەلومەرجی کۆمەڵایەتی گۆڕاودا، بێ دەسەڵاتی کردبوون.

ستارك و بین بریج ئاماژەی بەردەوامی گرنگی بنەڕەتی دین و ئەگەری بەهێزبونەوەی دوبارەی دینیان لەو راستیەدا دۆزیەوە کە ئەوانەی لە لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتیەکاندا پەیوەستبوون یان بڕوای دینی خۆیان پیشان نادەن، زۆرتر رەنگە جۆرێك ئارەزووی »پاش سروشتگەری *Supernaturalism*«ناتەقلیدی یان پەراوێزی وەك بەختگرتنەوە، یۆگا و چاودێری تراسندنتاڵی قبوڵبکەن یان پیشان بدەن. ئەو ئەمەریکیانەی کە لە خانووە نادینیەکاندا گەورە بوون، رەنگە پەیوەندیان بە ئەنجومەنێکی دینیەوە هەبێت. گەرچی ئەنجومەنە دینیە عەلمانیترەکان لە ئەمەریکادا روولە لە ناوچوونن، ئەنجومەنە کەمترعەلمانیەکان لەناوچونێکی وا لەخۆیان پیشان نادەن. دواجار دەبێ بگوترێت کە دەیەکانی دوایی شایەتی پەیدابوونی سەدان بزوتنەوەی دینین.

ستارك و بین بریج ئەو ئیدعایەی ویلسۆن (١٩٧٦) و فین (١٩٧٨) رەد دەکەنەوە کە دەستە و رێبازە تازەکان لە بازاڕی دینیدا بە شتێکی پەراوێزی و ناگرنگ دەژمێرێن. بەبڕوای ئەوان ئەم تێڕوانینە ناتوانێ گرنگی بە زەبری دینە تازەکان ببینێ و رەگی لە کورتبینی مەسیحی – کلیمیدا هەیە. ئەم تێڕوانینە هەروەها لە جیانەکردنەوەی جۆرە جیاوازەکانی رێبازەکان، سەرچاوە دەگرێت. ستارك و بین بریج دەڵێن کە بەبڕوای ئەوان ریبازێك کە لەسەر بناغەی جۆرێك بزوتنەوەی دینیە، گرنگی هەیە، نەك ئەو رێبازانەی کە هەردوکیان وەك رێبازی وەرگرەکان (*audience cult*)موشتەریەکان ( *client cult*) ناوی دەهێنن. رێبازی وەرگرەکان ریکخراوێکی رەسمی نیە و جۆرێك چالاکی مەسرەفکردنە. تێز و بیرکردنەوەکانی ئەم رێبازە لە رێگەی گۆڤارەکان، کتێبەکان و دەزگا گشتیەکانەوە بڵاو دەکرێتەوە و مەسرەف دەکرێت. نمونەی ئەم رێبازە، بەرنامە دینیە تایبەت و زۆر تەماشاکەرەیە کە لە کەناڵە تایبەتیەکانی تەلەفیزۆنەوە پەخش دەکرێن. بەڵام رێبازی موشتەریەکان رێکخراوترە، بەو شێوەیەی کە خزمەتە تایبەتیەکانی وەك تێزەکان، دەرمانەکان و لەم بابەتە شتانە، لەسەر بناغەی پەیوەندی تایبەتی نێوان موشتەری و دەرمانکەر پیشکەش دەکرێت، پەیوەندیەك کە پێویستی بە جۆرێك رێکخراوە لەلایەن دەرمانکەرەوە، بەڵام موشتەریەکان هیچ رێکخراوێکیان نیە. هەردوو ئەم رێبازە جیاوازن لەگەڵ بزوتنەوەی رێبازێکی تەواو رێکخراودا، چونکە ئەم بزوتنەوەیە گروپێکی تازەیە کە بەتەواوی لە دەرەوەی چوارچێوەی نەریتە دینیە کۆنتر و بەجێماوەکان، کار دەکات. بە بڕوای ستارك و بین بریج مەیل بۆ تێکەڵکردنی ئەو بزوتنەوانەی لەسەر بناغەی رێبازن، لەگەڵ رێبازی وەرگرەکان و موشتەریەکاندا، بۆتە هۆی ئەوەی کە هەندێك لە شیکەرەوان بە هەڵە هەموو

بزوتنەوەکانی لەسەر بناغەی ڕێبازێك دروستبوون، بە دیاردەیەکی لاوەکی و پەراوێزی دابنێن.

ستارك و بین بریج سەلماندنی ئەزمونی تیورەکەیان بەشێوەی دو گریمانەی هەڵێنجێنراو، پێشکەش دەکەن و پاشان ئەم گریمانانە لەگەڵ دراوە کۆکراوەکانیاندا، تاقی دەکەنەوە. یەکەم گریمانە دەڵێت لەهەر شوێنێکدا کە کەنیسە باوەکان بەتوندی لاواز دەبن، ڕێبازەکان زیاد دەکەن، چونکە لەم ناوچانەدا زۆرینەی خەڵك ڕەنگە بەهۆی جوڵەی جوگرافیایی، پەیوەندیەکانیان بە کەنیسەوە لەدەستدەدەن و لە ئەنجامدا دەتوانن بیرکردنەوەی تازە تاقیبکەنەوە. گریمانەی دوهەم دەڵێت کە لەو ناوچانەدا کە کەنیسە تەقلیدیەکان بەرێژە بەهێزن، گروپەکانی ژیاندنەوەی دینی زیاتر لە ڕێبازە تازەکان پەیدا دەبن. ستارك و بین بریج گریمانەکانیان بە دراوە کۆکراوەکان دەسەلمێنن و بەو ئەنجامە دەگەن کە فۆرمەلەبوونی ڕێباز و دەستەکان، لایەنەکانی کارکردنی عەلمانیەت نین، بەڵکو کاردانەوەی جیاوازن. عەلمانیەت بەتوندی کەنیسە تەقلیدیەکانی لاوازکردووە، بەڵام کۆمەڵێکی نادینی بەرهەم نەهێناوە، عەلمانیەت تەنها توانیوێتی کۆمەڵی کەنیسە دروستبکات. تەنانەت لەو ناوچانەدا کە ئەندامێتی لە کەنیسەدا کەمە، بڕوابوون بە هێزە میتافیزیکیەکان، هەروا توندە.

ڕەخنە لە ستارك و بین بریج ئەوەیە کە ئەو هاوبەستەییەی ئەوان دۆزیویانەتەوە هەرچەند بەهێز بێت، هێشتا ئەو ڕاستیە بە بەهێزی خۆیەوە ماوەتەوە کە ژمارەی ئەو کەسانەی لە ڕێباز و دەستە تازەکاندا ئەندامن، زۆر کەم و ناگرنگن (بیبی و ویور ١٩٨٥، لێچز ١٩٩١، ڤالیس و بروس ١٩٨٤). لە وەڵامدانەوەی ئەم ڕەخنەیەدا میلتۆن (١٩٩٣) دەریدەخات کە دەستەکان، ڕێبازەکان و بزوتنەوە دینیەکان لە ویلایەتە یەکگرتووەکاندا ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەکات و گەرچی هەندێکیان لەناودەچن، بەڵام زوربەیان دەمێننەوە و ڕەونەق پەیدادەکەن. ئیستیدلالی میلتۆن ڕاستەوخۆ لەسەر بناغەی ژمارەی دەستە و ڕێبازە تازەکانە. بەهەرحاڵ وەك چۆن لیچز، ڤالیس و بروس دەڵێن ئامارە دیاریکەرەکان پەیوەندی بە ڕادەی زیادبوونی ئەندامێتی لەناو بزوتنەوە تازەکاندایە لەبەرامبەر کەمبونەوەی ئەندامێتی لە ئەنجومەن و گروپە دینیەکانی کە پەیوەستن بە ڕوداوی دینی کۆنەوە. هەرئەم کەمبونەوەی ئەندامێتیە کە لە ئەوروپا زۆر زیاترە لە زیادبوونی ئەندامێتی لە بزوتنەوە تازەکاندا. شیکردنەوەی ستارگ و بین بریج تەنانەت گەر لەبارەی ویلایەتە یەکگرتوەکانەوە ڕاست بێت، کەمێك سەنتەریزمی نەتەوەیی پێوە دیارە.

ستارك و بین بریج کە ئەم ڕەخنەیەیان پێشبینی کردبوو، زۆر هەوڵدەدەن تا ئەوە بەبیر بهێننەوە کە وا بیرناکەنەوە کە گروپ و ڕێبازە تازەکان، ئەو چۆڵاییە پڕ دەکەنەوە کە نەبوونی ئەندامێتی لە کەنیسەدا دروستی دەکات، بەڵکو دەیانەوێت دەریبخەن کە لە هەرکوێیەك خەڵکی جیابۆوە لە مەسیحیەت هەبێت، هەوڵگەلێك بۆ پڕکردنەوەی ئەم چۆڵاییە هەیە. ئەم تێڕوانینەش ڕوبەڕوی ئەو ڕەخنەیەیان دەکاتەوە کە دیار نیە ئەم هەوڵانە دەستکەوتێکی بەرچاویان هەبێت. ئەوان باسی ئەو مەسەلەیە ناکەن کە بۆچی دینی وەرگرەکان و موشتەریەکان لە دەیەکانی دواییدا وەك قارچك لە هەموو شوێنێکدا ڕوان. ڕەواجی ئەمجۆرە ڕێبازانە کە نمایشکەری شانۆی ڕۆحی جیهانی نوێن و نەك بزوتنەوەکانی لەسەر بناغەی دینن، دودڵمان دەکات سەبارەت بە ڕەدکردنەوەی ئیدیعای ویلسۆن لەلایەن ستارك و بین بریجەوە. ویلسۆن ئیدیعای کردبوو کە هەر ئەم

خەسڵەتی پەراوێزیەی ئەم دیاردەیەیە کە دەبێتە هۆی ئەوەی دین بۆ پاراستنی هەرجۆرە دەسەڵاتیك بەسەر زیهنی خەڵكیدا، دوچاری كێشە بێت. ستارك و بین بریج پەنا بۆ ئەو ئیدعایە دەبەن كە ئێمە نازانین كام یەك لەم بزوتنەوە تازانە یان رەنگە تەنها یەكێكیان لە ئایندەدا دەگەنە لوتكە، دروست وەك چۆن بزوتنەوە نوێكان لە رابردودا، لوتكەیەكی وایان تاقیكردۆتەوە. بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیەش قابیلی تێرامانە و خۆ بەخۆ ناتوانێت تیورەكەی ئەوان بسەلمێنێ. پاشان وەك دابلێر (١٩٨٧) دەڵێت نابێ ئەوە فەرامۆش بكەین كە زۆربەی دینە گەردونیەكان، تەنها بە هاوكاری فەرمانڕەوایان توانیویانە لەناو خەڵكیدا رەگ داكوتن. بەڵام ئەمڕۆ بونیادەكانی كۆمەڵگا ئەوەندە گۆڕانیان بەسەر هاتووە كە زۆر دورە پرۆسە میژووییەكان كە بوبونە هۆی بەهێزبوون و پەرەپێدانی هەندێك لە سیستەمە دینیەكان لەلایەن دەوڵەتەكانەوە، دوبارە ببنەوە. تەنانەت گەر هەوڵێكی زۆریش لەلایەن كەس و گروپەكانەوە بۆ بەهێزبوونی دینە تازەكان بدرێت، دورە كە هیچ یەك لەم هەوڵانە دەستكەوتێكی ئەوتۆ بەدەست بێنێت. بە سودوەرگرتن لە نمونەكەی بێرگەر (١٩٧١) دەبێ بگوترێ كە لە هەلومەرجی هەنوكەدا، هێزە میتافیزیكیەكان ناتوانن پلەیەكی بالاتر لە شایعە بەدەست بێنن. رەنگە مەسەلەكە بەو شێوەیە بێت كە گرفتاری كۆمەڵگای هاوچەرخ ئەوەیە كە خەڵكی خوازیار پێویستیان بەو جۆرە مژدانە هەیە كە دین بەشێوەیەكی تەقلیدی پێشكەشی دەكات، بەڵام لایەنی كۆنی ئەم مژدانە چیدی بە جێی متمانە دانانێن.

كەمپێلیش بەگشتی وەك ستارك و بین بریج جەخت لەسەر گرنگی بەزەبری بزوتنەوە تازە دامەزراوەكان لەسەر بناغەی دین دەكات (١٩٧٢ و ١٩٨٢). ئەو هاوكات لەگەڵ لێكۆڵینەوە لەبارەی دەوری زەمینە كۆمەڵایەتیەكانی دینەكان، دەڵێت لە كاتێكدا دینە خسوسیەكان بەگشتی تێپەڕن، زەمینەی كۆمەڵایەتی دین، خەسڵەتی بەردەوامی كۆمەڵگایە. خەسڵەتی فەزای كۆمەڵایەتی دین، گەڕانە (*Seekershi*) و لە كۆمەڵگای هاوچەرخدا گۆڕانی ئاراستەی سەرەكی بە ئاراستەی روو وەرگێڕان لە پابەندبوون بە تێز و باوەڕە تایبەت و لەپێشەوە دیاریكراوەكانەوە و روكردنە گەڕان و یان بە دەربڕینێكی تر، بەهادانان بۆ پەرەسەندنی عەقڵی و رۆحی فەردی، بوونی هەبووە. ئەم تێڕوانینەی كەمپێل بیرهێنەرەوەی »فەردگەری ئەبستمۆلۆژی« ڤالیسە (ڤالیس١٩٨٤). بە بڕوای كەمپیل، عەقڵگەری، عەلمانیەتی سەقامگیر بەهێز ناكات، بەڵكو لەڕاستیدا خورافات و مەیلە نهێنی ئامێزەكان، رۆحی و عاریفانەكان لە كلتوری نوێدا، توند دەكات. تەنانەت ئەوانەش كە بالاتربوونی زانستیان قبوڵە، لە پلەیەكدا نین كە لەنێوان داعیە كلاسیكیەكان و بەدعەتكارەكاندا داوەری بكەن و رەنگە باوەڕ بە سەحنە فڕیوەكان، ئیدراكە سەرو هەستیەكان و جۆرەكانی تری باوەڕی نیمچە زانستی بهێنن. شروت (١٩٨٩) دەڵێت لەو روەوە كە خەسڵەتی زانست، ناسینی ئەو واقعیە كە ناتوانێ وەڵامی هەموو پرسیارەكان بداتەوە، ئەوا جێگە بۆ بیركردنەوە جادویەكان دەهێڵێتەوە، چونكە ئەم بیركردنەوانە دەتوانن ئیدیعا بكەن كە ئەوەی زانست ناتوانێ روونی بكاتەوە، ئەوان دەتوانن رونی بكەنەوە. لەوێوە كە خەڵكی جیهانبینی زانستی بە دڵ و بە گیان ناسەلمێنن، ئامادەیی بۆ قبوڵكردنی هەموو جۆرە باوەڕێكی جادوی و نهێنی ئامێز، پەیدا دەكەن. ئەم باوەڕانە رەنگە زۆر فەردیانە و

پەرشوبڵاو بن. بە بڕوای بیبی و پیێۆر (١٩٨٥) ئەمە لەبەرئەوەیە کە لە کۆمەڵگا پیشەسازیە هاوچەرخەکاندا، تاکەکان چەندان جۆر دەوری پسپۆری دەگرنە ئەستۆ کە سیستەمە مانایییە گشتگیرەکان ناتوانن هەقانیەت بە هەموویان بدەن.

لاکمان (١٩٦٧)یش دەڵێت کە خەسڵەتی کۆمەڵگا هاوچەرخەکان نەبوونی پێویستیە بە سیستەمە بەهاییە گشتگیرەکان، چونکە ئەم خەسڵەتانە پێویستیان بە ڕەوایەتی دینی نیە. دین دەبێت بە لایەنێك لە لایەنەکانی ژیانی تایبەتی و دەبێت بە هەڵبژاردنێك لەناو چەندان هەڵبژاردنی دیدا، ئەو هەڵبژاردنانەی دەکرێ بکرێن بە سیستەمێکی رازیکردنی شەخسی. هەر ئەم مەسەلەیە لاکمان رادەکێشێ بۆ ئەم ئیستدلالە کە کۆمەڵگا مۆدێرنەکان شایەتی گۆڕانێکی قوڵن لە روکردنە دیندا، بەو شێوەیەی کە رویان لەو »بڵندبونەوە گەورانە« هەڵگرتووە کە سەروکاریان لەگەڵ شتەکانی ئەو دنیا و ژیان و مەرگدایە و رویانکردۆتە »بڵندبونەوە بچوکەکان«ی ژیان کە سەروکاریان لەگەڵ بەدیهاتنی نەفس، راگەیاندنی بوون و ئازادیە شەخسیەکاندا هەیە (١٩٩٠).

بەڵگەکانی وەك بەڵگەی کەمپیل و لاکمان روبەروی هەمان ئەو تۆمەتانە دەبێتەوە کە ویلسۆن دژی ئەو کەسانە بەکاری دەهێنا کە تەماشای بزوتنەوە دەستەیەکان و ڕێبازەکان، وەك سەرچاوەی ژیانەوەی دین دەکەن، لەو روەوە کە ئەم بڵندبونەوە بچوکانە وەك هەندێك ڕێبازی بە ڕێژە ناسەقامگیر دەردەکەون، بە دوور دەزانرێ لەبەر پشتبەستن بە هەندێك رەگەزی جادویی، بتوانن ببن بە شێوەگەلێکی سەرەکی دینی.

فین لە باسە دورودرێژەکەی خۆیدا سەبارەت بە عەلمانیەت (١٩٨١،١٩٧٨،١٩٧٢) جەخت لەسەر ئەم کەمی بەها گشتگیرانە و پێویستی بوونیان بۆ دروستکردنی سیستەمە کۆمەڵایەتیە تازەکان، دەکات. دەبێ بۆ رەگ و ریشەی کارەکانی فین لەناو بەرخوردیدا لەگەڵ تیورەی وەزیفی دیندا بگەڕێین، هەمان ئەو تیورەیەی کە دین بە هۆکاری سەرەکی رەوایەتی و گونجانی کۆمەڵگا دەزانێت. فین ئەو گریمانەیە رەد دەکاتەوە کە کۆمەڵگای مۆدێرنی وەك ویلایەتە یەکگرتووەکان دەبێ لەگەڵ سیستەمە بەهاییە گشتگیرەکاندا بگونجێن، چونکە لەم کۆمەڵگایانەدا پێویستیەك بۆ رەوایەتی دینی و بۆ رێکخستنی کۆمەڵایەتی نیە. فین پرۆسەی عەلمانیەت بەپێی سنوری نێوان پیرۆز و ناپیرۆز لە کۆمەڵگادا، تاوتوێ دەکات. بە بڕوای ئەو ئەم سنورە هەمان ئەو شتەیە کە دەستەکان، کۆمەڵەکان، دەزگاکان و تاکە کەسە جیاوازەکان دایدەنێن، بۆ ئەوەی مەبەستە جیاواز و تایبەتیەکانی خۆیان دەستنیشان بکەن. کەوابوو عەلمانیەت پرۆسەیەکی خەبات، وتوێژ و ململانێیە کە تیایدا، کارەکتەرە کۆمەڵایەتیەکان هەوڵدەدەن تێڕوانینە تایبەتیەکانی خۆیان بۆ واقع دەربڕن. ئەم پرۆسەیە، پرۆسەیەکی خۆ بە خۆ و پەرەسەندنی نیە. پرۆسەی عەلمانیەت پرۆسەیەکی ئاڵۆز و ناکۆکئامێزە کە لەهەر قۆناغێکدا رەنگە ئامادەی قبوڵکردنی ئاراستەی ناکۆك بەیەك بێت. هەر لەبەر ئەمە ئەم پرۆسەیە قابیلی گەڕانەوەیە بۆ دواوە.

فین پێنج قۆناغ لە پرۆسەی عەلمانیەتدا دەستنیشان دەکات. یەکەم قۆناغ جیاوازبوونی دەور و دەزگا دینیەکانە کە لە دێر زەمانەوە دەستی پێکردووە و پەیدابوونی کەهنەتی جیاواز بەشێکە لێی، ئەمجۆرە پسپۆڕیە دینیە لە سەرتاسەری مێژووی دیندا بەردەوامە. لە قۆناغی دوهەمدا سنوری نێوان مەسەلە دنیایی و دینیەکان

دیاریدەکرێت. بەرلەوەی بواری دەسەڵاتی دەزگا مەزهەبی و دنیاییەکان دیاری بکرێت، بونیادە دنیاییەکان بەگشتی لە بونیادە دینییەکان جیابووبوونەوە. لە ڕاستیدا ئەم دوو بونیادە هەرگیز بەشێوەیەکی کامڵ لەیەك جیا نابنەوە، بەڵکو سنوری نێوانیان بە کەمڕەنگی دەمێنێتەوە. پرۆسەی عەلمانیەت ڕەنگە ئەو ئاڵۆزیە توندتر بکات کە لە جیاکردنەوەی شتە پیرۆز و شتە ناپیرۆزەکاندایە. سێهەم قۆناغ هەڵگری فۆرمەلەبوونی ڕەمزە دینیە گشتیکراوەکانە کە زیاتر لە ڕەگەزە جیاوازەکانی دروستکەری کۆمەڵگا دەڕۆن. لێرەدا ڤین ئاماژە بۆ ئەو گۆڕانە دەکات کە ناو دەنرێ »دینی مەدەنی« لە دەوروبەری ویلایەتە یەکگرتوەکاندا (بیلا١٩٦٧). لە قۆناغی چوارهەمدا »پێناسی هەلومەرج« کە تایبەتە بە کەمایەتیەکان و گروپە تاکانەکان، پەیدا دەبێت. لەم قۆناغەدا، دەسەڵاتی سیاسی دنیایی دەبێت، بەڵام بواری پیرۆز پەرشوبڵاو دەبێتەوە و زۆرێك لە گروپەکان بەدوای ڕەوایەتیدا دەبن لەسەر بناغەی دینی .دواجار لە قۆناغی پێنجەمدا، ژیانی فەردی و گشتی لەیەك جیادەبێتەوە.

دەکرێ ماهیەتی ناکۆکئامێزی ئەم پرۆسەیە لە قۆناغە جیاوازەکاندا ببینرێ. پەیدابوونی دینی مەدەنی یەکێك لە قۆناغەکانی ئەم پرۆسەیەیە و لە هەمانکاتدا جۆرێك ڕوو وەرگێڕانە لە عەلمانیەت. دەوڵەت لە هەوڵدانیدا بۆ دیاریکردنی پێناس بۆ هەلومەرجەکان، هەوڵدەدات خودموختاری دینی سەرکوت بکات و بواری دین و بەتایبەتی شێوە دەستەیەکان سنوردار بکات، بەڵام لە هەمانکاتدا هەوڵدەدات دەسەڵاتی ناوەڕۆکەکان و بنەما پیرۆزەکان بۆ ڕەوایەتی بەخشین بەخۆی، بەکاربهێنێت.

بەبڕوای ڤین، وێنەیەك لە کلتوری دینی کە لەگەڵ کۆمەڵگای مۆدێرندا زۆرترین گونجانی هەیە، ئەو شێوەیەیە کە بوارێکی سنوردراو بە شتە پیرۆزەکان دەدات و پلەیەکی کەم لە گونجانی سیستەمە بەهاییە فەردی و گروپییەکان، بەهێز دەکات. دینی نهێنی ئامێز و پسپۆر، باشترین ڕەنگدانەوەی ئەم کلتورە دینییە. دەکرێ ئەمجۆرە دینە بێ هیچ جۆرە ناکۆکیەك لەگەڵ دەوری کارکردنە ڕۆژانەیەکاندا، بەکاربهێنرێ، چونکە چالاکیەکانی سنوردراوە بە زەمان و جێگە و شت و مەسەلە زۆر تایبەتیەکان. ئەم دینە جۆرێك چالاکی جادویی و هەلێك بۆ سەرقاڵبوون بە مەسەلە ناعەقڵانیەکانەوە لە بەرامبەر عەقڵانیەتی سەپێنراو لەلایەن دەزگا ڕەسمی و بیرۆکرات و دەورەکانی ژیانی ڕۆژانەدا، بۆ ئەو کەسانەی باوەڕیان پێیە، فەراهەم دەکات. لێکۆڵینەوەیەکی دوایی کە خاڵەکانی جێی تێڕوانینی ڤین بە شێوەیەکی ئەزمونی و هوشیارانە، دەسەلمێنێ (لۆهەرمەن ١٩٨٩) دەریدەخات کە پەیڕەوانی جادو و جادوگەری لە لەندەن و ناوچەکانی باشوری ئینگلتەرا، زوربەیان خوێندنی باڵایان هەیە و پسپۆران خاوەن هەلومەرجێکن کە پەروەردەی زانستیان دیووە و سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی کیمیایی و پیشەسازی وەك کامپیوتەرن.,

ڤین تەنانەت لە نوسەرانی وەك کەمپیل و ڤالیسیش زیاتر دەڕوات، چونکە جەخت لەسەر کۆمەڵێك کێشە دەکات کە کلتورە دینیەکانی خاوەن سیستەمی بەهایی گشتگیر، دوچارین. ئەم کلتورانە کە بوارێکی فراوان بە شتی پیرۆز دەدەن و داوای گونجانێکی توند لەنێوان بوارە تایبەتی و گروپیەکاندا دەکەن، لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا کە عەقڵانیەتی تەکنیکی باڵادەستە بەسەریدا و ناکرێ

لە ڕێگەی بەها گشتگیرەکانەوە یەکپارچە بکرێن، کۆمەڵێك کێشەیان بۆ خەڵکی دروستکردووە. ئەمجۆرە کلتورە دینیە کۆمەڵێك ململانێ و گرژی لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا دروستدەکات.

بەبڕوای فین دین تەنانەت لە کۆمەڵگای مۆدێرنیشدا دەتوانێت بمێنێتەوە، بەو مەرجەی دەور و خەسڵەتی خۆی بگۆڕێت . عەلمانیەت لە ڕاستیدا شێوازێکی دینی جیاواز کە لەگەڵ هەلومەرجی تازەدا دەگونجێ، بەرهەم دەهێنێ (بیکفۆرد ١٩٨٩، لا ١١٦).

«عەلمانیەت، دین لە کۆمەڵگای مۆدێرن ناکاتە دەرێ، بەڵکو جۆرێك دین نەشونما پێدەکات کە کارکردنی سەرەکی بۆ سەرتاسەری کۆمەڵگا نیە. پەیوەندی نزیکی نێوان کۆمەڵگا دنیاییەکان و هەندێك جۆری بڕوای دینی گروپی، لە مەیل بۆ جیاکردنەوەی قوڵترین هاندەرەکان و بالآترین بەها فەردیەکان لە بوارەکانی کرداری سیاسی و ئابوریەوە، سەرچاوە دەگرێت« (فین ١٩٧٢، لا ٣١).

شێوازەکەی فین گەلێك ئیمتیازی هەیە، بەتایبەتی جەختکردنی لەسەر عەلمانیەت وەك سنوری نێوان شتە پیرۆزەکان و دنیاییەکان کە خودی ئەم سنوربەندیە پەیوەندی بە ململانێ کۆمەلآیەتیەکانەوە هەیە، هەروەها جەختکردنی لەسەر ماهیەتی ئاڵۆز و زۆرجار دژ بەیەکی ئەم پرۆسەیە. بەهەرحاڵ کارەکەی فین جۆرێك کەموکوڕی تێدایە کە دەرئەنجامی وازهێنانی خۆویستانەیەتی لە پێناسەکردن و ڕونکردنەوەی زاراوەکان و چەمکەکانی یان دەرئەنجامی باسکردنی ڕاستەوخۆیەتی بۆ باسە سەرەکیەکان. بە بڕوای فین هەر هەوڵێك بەئاراستەی پێناسەکردنی وردی دین یان عەلمانیەت، لە ڕاستیدا ڕێگە لە ڕەنگدانەوەی مانا ئاڵۆز و زۆر جیاوازەکانی کە ئەم زاراوانە لە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکیدا هەیانە، دەگرێت. چونکە بە ئاشکرا مەبەستی ئەوەیە کە ئاڵۆزیەکانی ئەم مانایانە لە ناوەخنی شیکردنەوەکەی خۆیدا، جێ بکاتەوە. بە بڕوای ئەو هەر ئەم ئاڵۆزیانە زانیاری دیاریکراو لەبارەی ماهیەتی عەلمانیەتەوە بەدەستەوە دەدات، لەکاتێکدا »ئەو شیکەرەوانەی کە تەنها چەمکە روونەکان بە سنوری دیاریکراوەوە بەکاردەهێنن، لەم زانیاریانە مەحروم دەبن« (١٩٨٧، لا ٢٩). بە بڕوای فین ئەو وشانەی کە کارایی تەکنیکیان هەیە، سودێکی ئەوتۆی بۆ تەفسیری لایەنە ناکۆکەکانی عەلمانیەت نیە. لەم بانگەشانەدا سەردەرگومیەکی فراوان دەبینرێت. ڕەنگە ئەوە ڕاست بێت کە ئارەزووی سەقامگیرکردنی وردی چەمکەکان ڕێگە لە دەستگەیشتن بە زانیاریە سەرەکیەکان بگرێت، بەڵام لێرەوە نابێت بەو دەرئەنجامە بگەین کە لە باسکردنی مەسەلەکانی عەلمانیەتدا، دەبێ سود لە وشەی ئاڵۆز و ناکۆکئامێز وەربگیرێ. فین ماهیەتی ناکۆکئامێزی عەلمانیەت لەگەڵ ماهیەتی ناکۆکئامێزی ئەو چەمکانەی کە دەبێت ئەم پرۆسەیە وەسف بکەن و هەروەها لەگەڵ ئەو ناکۆکیانەی لەناو باس و تیورەکانی سەبارەت بە عەلمانیەتدا هەیە، تێکەڵ دەکات. فین بێئەوەی خودی پرۆسەی عەلمانیەت بناسێ ، لەکوێوە دەتوانێ بزانێت کە ناکۆکیەکان و نەبوونی ڕێکەوتن لەبارەی مانای عەلمانیەتەوە، دەتوانێ زانیاری سودمەند لەبارەی ئەم پرۆسەیەوە بەدەستەوە بدات؟ تێگەیشتنی فین بۆ پرۆسەی عەلمانیەت لە ڕاستیدا زۆر ناواخنیە و ئەوەندە پەیوەندی بە جیابونەوەی شتە پیرۆزەکان لە شتە دنیاییەکان نیە، لەکاتێکدا ئەو ئەم جیابونەوەیە بە خەسڵەتی ئەم پرۆسەیە دەزانێت. ئەم چەمکە بە

ئاشكرا پەیوەندی بە پێناسە گشتیترەكانی دین لە میتۆدی دۆركهایمی و وەزیفیەكاندا هەیە، چەمكی فین رەگی لەم میتۆدانەدا هەیە و ئەگەرچی زۆر رەخنەش لە رونكردنەوەی وەزیفیانەی دین دەگرێت، بەڵام پەیوەندی بەم میتۆدانەوە راستەوخۆ ناپچڕێنێت.

هەر ئەم ئاڵۆزی تێگەیشتن لە كاری فیندایە كە كاریگەریەكی زۆر دەكاتە سەر دیاریكردنی خەسڵەتی پرۆسەی عەلمانیەت وەك پرۆسەیەكی ناكۆكئامێز و قابیلی گەڕانەوە بۆ دواوە. بۆ نمونە مەیلی گەڕانەوە لە عەلمانیەت لە قۆناغی سێهەمدا كە هاوڕێی پەیدابوونی دینی مەدەنیە، بەئاشكرا لەسەر بناغەی تێگەیشتنێكی گشتگیر بۆ دین راوەستاوە. لەكاتێكدا لایەنە عەلمانیەكانی ئەم قۆناغە پێویستی بە تێگەیشتنێكی سنوردارتر هەیە. لە ئەنجامدا دیار نیە ئایا فین دەیەوێت دەریبخات كە پرۆسەی عەلمانیەت لە راستیدا شتێكی ناكۆكئامێز و دولایەنەیە، یان دەیەوێت بڵێت كە بە لەبەرچاوگرتنی چەمكە جیاوازەكانی دین كە لەناو باسەكانی عەلمانیەتدا رەواجیان هەیە، ئەم پرۆسەیە خەسڵەتێكی وا ناكۆكئامێزی پەیداكردووە. ئێمە نازانین ئەو دەیەوێت ناسینی ئێمە بۆ پرۆسەی عەلمانیەت زیاد بكات، یان دەیەوێت ناسینی ئێمە بۆ ئەو شتانەی لەبارەی ئەم پرۆسەیەوە گوتراوە، واتە باسە تیوریەكان و تیڕوانینەكان بۆ عەلمانیەت، پەرەپێبدا. پێدەچێت ئەو لە كاردا زۆرتر كاری دوهەم ئەنجام بدات، تا كاری یەكەم. لێرەوە رەنگە كاری ئەو رۆشنگەرانە بێت، بەڵام واپیشاندان كە كارێكی دی ئەنجام دەدات، گومڕاهكەرانەیە.

دواخاڵ كە دەبێ لەبارەی فینەوە بگوترێ ئەوەیە كە لێكۆڵینەوەكەی زۆرتر لەبارەی ویلایەتە یەكگرتوەكانەوە قابیلی بەكارهێنانە. **لەراستیدا زوربەی باسەكانی سەبارەت بە عەلمانیەت، پەیوەندیان بە جیهانی مەسیحی رۆژئاواوە هەیە، لەبارەی ئەوەی كە وڵاتە نامەسیحی و ناڕۆژئاواییەكان تا چ ئەندازەیەك لەژێر كاریگەری ئەم پرۆسەیەدان و بۆچی، كەمتر باسكراوە.** بەهەرحاڵ نوسەرانی كۆمەڵە وتارێك كە بەم دوایانە لەمبارەیەوە بڵاوكراوەتەوە، لەبارەی ئەگەری رودانی پرۆسەی هاوشێوەی عەلمانیەت لە جیهانی نارۆژئاواییدا، بەگشتی دودڵ بوون. پێررا دۆكوایرۆ (١٩٨٩) لەبارەی پەیدابوونی گروپە تازەكان و بەتایبەتی گروپی ئۆمباندا لە بەرازیل، دەڵێت كە ئەم گروپانە دژی ئەو تیڕوانینە بەڵگەی ئەوەن كە پیشەسازیبوون و عەلمانیەت لە شوێنەكانی تردا، وەك رۆژئاوا و جیهانی پێشكەوتوو، روداوێكی هاوشێوە لە لەناوچوونی دین دروستدەدەكات. **ئارێۆ ماند (١٩٨٩) دەریدەخات كە ئایدۆلۆژیای فەندەمینتالیزمی ئیسلامی لە شێوە جیاوازەكانیدا كە زوربەیان رەدی لیبرالیزم، ناسیۆنالیزم و سۆسیالیزم دەكەنەوە، گۆڕانێكی تازەیە كە بەپێچەوانەی چاوەڕوانیەوە عەلمانیەت و بیركردنەوەی مادی وەك كۆمەڵێك هێزی گەشەكردن، دروستنەكردووە.** بە بڕوای ریگان (١٩٨٩) لە مالیزیا فەندەمینتالیزمی ئیسلامی كۆپی بزوتنەوە دینیە تازەكانە كە لە رۆژئاوا پەیدابوون. ئەمجۆرە فەندەمینتالیزمە تێڕوانینێكی دینی تازەی لەبارەی كلتورەوە دروستكردوە كە بەگشتی كاری كردۆتە سەر هەموو لایەنەكانی ژیانی تازە. بە بڕوای ژول روست (١٩٨٩) لە ئەفریقادا كاردانەوە لە بەرامبەر گۆڕانە پیشەسازیەكاندا رەوتی نوێ و تازەی بەخۆوە گرتووە بۆئەوەی لەڕێگەی تێكەڵكردنی بواری پیرۆزەوە لە ژیانی رۆژانەدا، هەستی

یەکێتی دین و شوناسی کۆمەڵەیی لە خەڵکدا، بە زیندوویی بهێڵێتەوە.

مارتین (١٩٩١) بە بەراوردکردنی ئەوروپا، ئەمەریکای باکور و خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، ئەو دەرئەنجامە وەردەگرێ کە **عەلمانیەت دیاردەیەکی پتر ئەوروپییە و پەیوەندی بە ململانێی نێوان کەنیساکان و هێزە دنیایەکان لە مێژووی ئەوروپا لە سەرەتای قۆناغی تازەدا هەیە، ئەم ململانێیانە کە دینیان لە رۆژئاوادا تا رادەیەك لە بایەخ خستووە، لە جێگەیەکی دیدا رویان نەداوە.** بەهەرحاڵ ئەو دەڵێت کە ئەم ململانێیانە هێشتا تەواو نەبوون، رەنگە دین جارێکی دی جێگەی خۆی لە کۆمەڵگادا بکاتەوە.

هەرچەندە بوونی بەڵگەی وا لە جیهانی سێهەم و روو لەپێشکەوتندا، رەنگە دودڵمان بکات لەوەی کە عەلمانیەت دەرئەنجامی ناچاری مۆدێرنە بوون و پیشەسازیبوونە، بەلام ئەم ئەنجامگیریە هیچ بناغەیەکی راستی نیە. زۆرێك لە کۆمەڵگاکانی جیهانی سێهەم بە ئەندازەی بەریتانیای ئەو سەردەمە، پیشەسازی نەبوون، واتە هەمان ئەو کاتەی کە گروپی متودیزم و گروپە ناسازشکارەکانی دی لەنێوان چینی تازەی کرێکارانی پیشەسازیدا، لایەنگریەکی زۆریان پەیداکردبوو. ئەمڕۆ گروپی متۆدیزم یەکێك لەو گروپانەیە کە خێراترین دابەزینی لەناو گروپە مەسیحیەکاندا هەیە. مارتین (١٩٩١) لایەنگرانی تیورەی عەلمانیەت ئاگادار دەکاتەوە کە ئەوەندە پشت بەم بەڵگانە نەبەستن و توندبوونی بڕوای دینی لە ئەوروپای باشوردا، وەك نەتەوەگەری لەبەرچاو نەگرن و رووی دینیەکەی بە رێکەوت نەزانن.

راستیەکەی ئەوەیە کە ئێمە هێشتا نازانین عەلمانیەت لە بنەڕەتدا دیاردەیەکی مەسیحیە و تایبەتە بە رۆژئاواو یان دەرئەنجامی پیشەسازیبوون یان پرۆسەیەکی بەرفراوانتری مۆدێرنەیە. هەر لێرەوە **ولاتە نامەسیحیەکان یان نارۆژئاواییەکان تەنها لە حاڵەتێکدا عەلمانیەت ئەزموون دەکەن کە پیشەسازیبوونیان هاوڕێی رۆژئاواییبون یان مۆدێرنەیەك بێت لەسەر شێوازی رۆژئاوا.** ئەگەر عەلمانیەت دیاردەیەکی تایبەت بە مەسیحی بێت، بە دوور دەزانرێ کە ئەم ولاتانە ئەزموونی بکەن، چونکە رۆژئاوایبوون گەر روشبدات، دورە بەمانای مەسیحیبوون بێت.

## سەرچاوە

ئەم وتارە وەرگێڕانی فەسڵی ١٥ی ئەم کتێبەی خوارەوەیە:

مالکوم هیملتون: جامعەشناسی دین. ت: محسن سولاسی. تهران، چاپ اول ١٣٧٧. موسسە فرهنگی انتشاراتی تبیان؟

# ئەبێت چۆن بیر لە عەلمانیەت بكرێتەوە

ۆلفهارت پانینبێرگ[١]

لە ئینگلیزییەوە: عبدالله سیوەیلی

-١-

مەبەست لە بەعەلمانیكردن هەرچیەك بێت، ئەوا كەسانێكی كەم ناكۆكن لەسەر ئەوەی كە لەم سەدەیەدا كلتوری گشتی كەمتر كلتورێكی ئاینییە. ئەمە هەروا بە ئاسانی بریتی نیە لە ئاكامی جیاكردنەوەی كەنیسە و دەوڵەت كە یەكەمجار دوو سەدە بەر لە ئێستا رووی دا. جیاكردنەوەی لەم جۆرە دابڕانی كلتور لە ریشە ئاینییەكانی خۆی ناخوازێت. بۆ نموونە لە ئەمریكا (ئاینی لەلایەن دەوڵەتەوە بەرقەرار كراو) مانای كۆتایی هاتنی كاراكتەری مەسیحی و پرۆتستانتی كلتوری ئەمریكی نەگەیاندووە. لە كۆمەڵگای خۆرئاوایی تردا، لینكی نێوان دەوڵەت و كەنیسەی مەسیحی هەتا ئەم سەردەمەش بەشێوەیەكی كاریگەر بەردەوام بووە. بەڵام لەم كۆمەڵگایانەدا، دووبارە دەبینین بەڵگە هەیە دەیسەلمێنێت كە عەلمانیەت بەشێوەیەكی نموونەیی زیاتر پێشكەوتووە و پەرەی سەندووە وەك لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا.

بەعەلمانیكردن بە هۆی جیاكردنەوەی كەنیسە لە دەوڵەتەوە نایەتە دی، كە دەبێتە هۆی ئەو دابڕانەی هەنووكە كلتوری گشتی لە بەرامبەر ئاییندا بە خۆیەوە دەبینێ. بە تایبەت لە بەرامبەر مەسیحیەتدا، كە ئەمەش لە خۆیدا لە سەدەی حەڤدەهەمدا تۆوەكەی چێنرا.

كەش و هەوای گشتی عەلمانیەت متمانەی مەسیحیەكان بەو راستییەی كە بڕوایان پێیەتی كەم دەكاتەوە. لە كتێبی "ئیشاعاتی فریشتەكان (١٩٦٩)، پیتەر بێرگەر باوەڕداران وەك "كەمینەی خاوەن ئیدراك" وەسف دەكات، كەمینەیەك كە ستانداردەكانی مەعریفەیان جیاوازە لەوەی خەڵكی گشتی هەیانە. بێرگەر لە بارەی "سترەكتورەكانی مەعقولیەت" دەنوسێت. خەڵك لە باسكردنی ئەوەی كە برێكی دیاریكراوی واقیع مەعقولە، پێویستیان بە پشتگیری كۆمەڵایەتی هەیە. كاتێك پشتگیری لەمجۆرە لاواز دەبێت، خەڵكی پێویستیان بەوەیە كە حەتمیەتێكی تایبەتی بەهێز كۆبكەنەوە بۆ

پارێزگاری کردنی ئەو بڕوایانەی کە لە دەرەوەی هێڵن و تەبا نین لەگەڵ بڕوای ئەوانی دی لە دەوریان. شیکارەکەی بێرگەر شیکارێکی کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆژی ئەو بارودۆخەیە کە تیایدا خەڵکی خۆیان بە تەواوەتی لە دەرەوەی ئەو راستییەوە خۆیان دەبیننەوە کە رەنگە باوەڕیان پێی بێت. بێرگەر ئەنووسێت: "بێگومان کارێکی شیاوە کە لە دژی ئەو کۆدەنگیە کۆمەڵایەتیە بوەستینەوە کە چواردەوری داوین، بەڵام چەندین فشاری بەهێز هەن (کە خۆیان وەك فشاری سایکۆلۆژی لە ناو ئاگایی ئێمەوە بەدەر دەخەن) بۆ گونجاندن لەگەڵ تێڕوانین و بڕواکانی مرۆڤەکانی تر." ئەمە بە شێوەیەکی وورد بریتییە لە ئەزموونی مەسیحیەکان کە لە کلتورێکی وەهادا دەژین کە عەلمانیەت باڵادەستە.

لە ناو ژینگەیەکی عەلمانیدا، تەنانەت مەعریفەیەکی سەرەتایی دەربارەی مەسیحیەت – مێژووەکەی، تەعالیمەکانی، دەقە پیرۆزەکان، کەسایەتیە پێکهێنەرەکانی – کاڵ دەبێتەوە. ئەوە چیتر مەسەلەی رەت کردنەوەی تەعالیمەکانی مەسیحیەت نییە، کاتێ دەبینرێ کە ژمارەیەکی زۆری خەڵك خاوەنی تەمومژاویترین زانیاری نین لەسەر ئەو تەعالیمانە. ئەوە پەرەسەندنێکی بەرچاوە کە کەسێك دەبینێت کە مەسیحیەت چەند دامەزرێنەرە بۆ سەرتاپای چیرۆکی کلتوری خۆرئاوا. هەرچەندێك نەزانی مەسیحی بڵاوببێتەوە، رق و کینە دەربارەی مەسیحیەتیش زیاد دەکات. ئەو خەڵکەی کە جیاوازی نێوان (سۆڵی تەرسوس *Saul of Tarsus*) و (جۆن کالڤن *John Calvin*) نازانن، تەواو دڵنیان کە مەسیحیەت ئاینی سەرکوت کردنە. کاتێك خەڵکی لەم جۆرە چێژ لە ئاین لە "روحانیەت" وەردەگرن – وە چێژەکەشیان پەرچەکردارێکی سروشتییە بۆ سادەیی و بەر تەسکی کلتوری عەلمانی – ئەوا زۆر جار نەك بادەدەنەوە بەلای مەسیحیەتدا بەڵکو بۆ "ئاینە ئەلتەرناتیڤەکان".

لەم بارودۆخەی کلتوردا، گەیاندنی پەیامی مەسیحی کارێکی ئاسان نییە. ئەم قورسیە بەهۆی بەرێژەیی کردنی ئایدیای حەقیقەتەوە هێندەی بۆ داغان دەبێت. ئەمە گۆڕانێکی زۆر گرنگە لە عەلمانیەتی رۆشنگەریدا. بیریارە عەلمانیەکانی رۆشنگەری مەیدانخوازی مەسیحیەکانیان دەکرد کە هەستن بە بیانووهێنانەوە بۆ لاف لێدانەکانی خۆیان دەربارەی حەقیقەت لە ڕێگەی گفتوگۆی عەقڵانیەوە نەك بەهۆی ئایدیای لێبرکێکانیانەوە کە پێیان وایە حەقیقەتێك هەیە دەربارەی ئەو مەسەلانەی لە ناکۆکیدان. ئەمەش ئەمڕۆ ناتوانرێت گریمانە بکرێت. لە ڕوانگەی زۆرێك خەڵکەوە – لە نێوانیاندا زۆرێك لە مەسیحیەکان – ڕێبازەکانی مەسیحیەت تەنها چەند بیروڕایەکن کە رەنگە و ڕەنگیش نییە بەپێی پەسەندکردنەکانی تاکەوە بچەسپێنرێن، یان پشت بەوە ببەستێت کە ئایا ئەو ڕێبازانە لە بارەی ئەو پێداویستیانەوە دەدوێت کە بە شەخسی هەستیان پێدەکرێت.

ئەم لەبەریەك هەڵوەشانەی ئایدیای حەقیقەت – حەقیقەت کە پێویستی بە سەلماندنی من نییە بۆ ئەوەی حەقیقەت بێت – بەشێوەیەکی توند تێگەیشتنی مەسیحی بۆ تەبشیریەت و (میشن) داپڵۆسی. مانیفێستی تەبشیریەت جاران وەك گەیاندنی حەقیقەت بۆ ئەوانی دی سەیر دەکرا، لەبەرئەوە هەم ڕەوا بوو هەم گرنگ. بەڵام ئەمڕۆ کەسانێکی زۆر پێیان وایە کە پڕۆژەی تەبشیری بریتییە لە مەسەلەی سەپاندنی پەسەندکردنە شەخسییەکانمان و رق و کینەکانمان (کە کلتور دروستی کردون) بەسەر ئەوانی دیدا، ئەمەش نەك تەنها ناڕەواو نامەشروعە، بەڵکو تاوانیشە. لە

پشتەوەی مەسەلەی تەبشیریەتیشەوە، دەبێت لە خودی خۆمان بپرسین کە بۆچی دەبێت خەڵکی ئامێز بۆ بڕوای مەسیحی بکەنەوە هەتا بیرنەکەنەوە کە تەعالیمی پاپایی راستە. بەشێوەیەکی ووردتر، پرسیارەکە ئەوەیە کە ئایا تەنانەت مانای تیایە کە وا رابگەیەنرێت کە تەعالیمی مەسیحی راستە. ئایدیای حەقیقەت بەشێوەیەکی ڕەها ئایدیایەکی حەیەوییە بۆ بڕوای مەسیحی. تێکشکاندنی ئەو ئایدیایە بریتییە لە کلیلی بە مەشروعیەت کردنی کلتورێکی عەلمانی، چونکە ئایدیای حەقیقەت دەست لە بێ پەروای مەزنی عەلمانیەت دەوەشێنێت.

-۲-

عەلمانیەت و بەشێوەیەکی بەربڵاوتر، خودی مۆدێرنێتیش هەندێ جار وەك ئاکامی هەڵگەڕانەوە لە بڕوای مەسیحی لە قەڵەم دراوە. ئەمە بۆ نموونە تێڕوانینی تیۆلۆژیستی پرۆتستانتی سویسری کارل بارثە (*Karl Barth*)ە. بە پێی تێڕوانینی بارث، کلتوری مۆدێرن بوو بە هەڵگەڕانەوەیەك لە دژی بڕوای مەسیحی و بە ئامانجی دانانی مرۆڤ لە جێگەی خودا. دەتوانرێ زۆر بووترێ بۆ ئەو لێکدانەوەیە، چونکە واقیعی مرۆڤیی لە ڕاستیدا بۆتە سەرەکی لە کلتوری مۆدێرندا بەشێوەیەك کە مایەی بەراوردە لەگەڵ دامەزراوە ئاینییەکانی سەدەکانی زوو. بایەخدان بە مافەکانی مرۆڤ تەنها یەك لایەنی سەرقاڵبوونی مۆدیرنێتییە لەگەڵ مرۆڤدا. بەم جۆرە وا ڕوویدا کە تاکی مرۆڤ وەك بەرزترین بەهاو بنەمای (چاك) سەیر دەکرا.

بەهەرحاڵ شتێکی گوماناوییە کە ئەم گۆڕانکارییە لە سەرتاپاگیری خۆیدا وەك نموونەیەکی هەڵگەڕانەوە لە ئایین (ارتداد) دانی پیابنرێت. ڕەنگە کارێکی باش بێت گەر بڵێین کە جەختکردنەوەی بەهێز لەسەر مرۆڤ خاوەنی بنەڕەتێکی جیاکەرەوەی مەسیحییە. لەم رووەوە، مەسیحیەت بە هەمان شێوەی روحیەتی مۆدێرن خاوەنی مامەڵەیەکی گەورەیە، تەنانەت ڕەنگە کەسێك وا پێشنیار بکات کە روحیەتی مۆدێرن بەشداری کردووە لە ئازادکردنی ئاگایی مەسیحی لە شێواندنی دەستی دەمارگیری. بە دەربڕینێکی تر، پەیوەندی نێوان مۆدێرنێتی و بڕوای مەسیحی پەیوەندییەکی دژیەکە، ڕێگە نادات بە مەسیحیەکان کە مۆدێرنیتی بەشێوەیەکی یان بە ڕەفتارێکی ناشایستە ڕەت بکەنەوە. هەرچەندە کەلتوری مۆدێرن بە دەورە عەلمانی خوازەکەی خۆی بەشداری کردووە لە دابڕانی خەڵکێکی زۆر لە بڕوای مەسیحی، ئەوا کارێکی پێویستە بۆ مەسیحیەکان کە ئەو وانەیەی لەلایەن سەرهەڵدانی مۆدێرنیتییەوە وترایەوە فێری ببن و لەبیری نەکەن، ئەو وانەیەش بخەنە ناو ئاگایی مەسیحییەوە.

جیاوازی نێوان شانشینی عەلمانی و ئەو شانشینەی پێی دەووترێت ئاینیی یان روحی لە مێژووی مەسیحیەتدا شتێکی تازە نییە. بەهەرحاڵ، لە سەدەکانی پێشوودا جیاوازییەکە نەگەیشتبووە جیاکردنەوەی سیاسەت، ئابووری، یاسا، پەروەردە، هونەری عەلمانی لە کاریگەری روحی کەنیسە. بە پێچەوانەوە جیاوازی نێوان شتی ئایینی و عەلمانی خاوەنی بناغەیەکی مەسیحی بوو. ئەو بناغە مەسیحیە بریتی بوو لەو بەئاگاییەی کە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی باو ناتەواو و کاتی بوو. ئەو چیتر شانشینی خودا نەبوو. لە ڕووی هەر ڕێکخستنێکی کۆمەڵایەتی هەبووەوە، مەسیحیەت تەوازوعێکی ئێسکاتۆلۆژی (*eschatology*)یە. ئەمە کۆمەڵگا مەسیحیەکانی بەدوور گرت لە کلتوری ئاینیی تری

بە ئایین سواخ دراوی وەك ئیسلام. ئەمە ئیپمراتۆریەتی بیزەنتی جیاکردەوە لە ئیمپراتۆریەتی بەر لە رۆحی مەسیحی. لە ماوەی دوای کۆنستەنتینیە، هاوسەنگیەك هەبوو لە نێوان دەسەڵاتی قەشە و دەسەڵاتی ئیمپراتۆر، لە کاتێکدا لە رۆمای کۆندا خودی ئیمپراتۆر بریتی بوو لە بەرزترین پیاوی ئاینی.

لێك جیاکردنەوەی ئاینی و عەلمانی دووبارە وەك ئاکامی ریفۆرمەکانی سەدەی شانزە دووبارە گۆڕا، یان بەشێوەیەکی ووردتر، وەك ئاکامێکی جەنگە ئاینییەکان کە کۆتایی هاتنی کەنیسەی چاخەکانی ناوەڕاستی بەدوادا هات. کاتێك لە چەند ژمارەیەك وڵاتاندا هیچ پارتێکی ئاینی ناتوانێت بەشێوەیەکی سەرکەوتوو بڕوای خۆی بسەپێنێت بەسەر سەرتاپای کۆمەڵگادا، ئەوا یەکێتی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی دەبێت لە دامەزراوەیەکەوە سەرچاوەی گرتبێت نەك ئایین. لەوەش زیاتر، ململانێی ئایینی سەلمێندرا کە وێرانکەری رێکخستنی کۆمەڵایەتیە. لە نیوەی دووەمی سەدەی حەڤدەهەمدا خەڵکی بیرمەند بڕیاریان دا، ئەگەر بخوازرێت کە ئاشتی کۆمەڵایەتی بگەڕێندرێتەوە، کە ئاین و ناکۆکیەکانی سەرچاوە گرتوو لە دینەوە چوارچێوەبەند بکەن. لەو بڕیارەوە کلتوری عەلمانی مۆدێرن لەدایك بووە لە ماوەیەکی زەمەنیشدا ئەمە دەبێتە هۆی عەلمانیەت و سەرهەڵدانی کلتورێك کە بەشێوەیەکی رێك و پێك بە عەلمانی باس دەکرێت.

لە سەدەکانی پێشوودا، چێوەبەندکردنی ئایین لە خەیاڵ نەهاتوو بووە. تەنانەت لە سەدەی شانزەدا، ریفۆرمیست و کاسۆلیکەکان وەك یەك پێیان وابوو کە یەکگرتنی ئاینی شتێکی بنەڕەتییە لە یەکگرتنی کۆمەڵگادا. هەرچەندە ئەوانی جەختیان دەکردە سەر گرنگی یەکلاییکەرەوەی زەمیری تاك لە مەسەلەکانی بڕوادا، نە لوسەر و نە کالڤن بیریان لە ئەگەری لێبوردەیی ئایینی نەکردبووەوە. هەنگاونان بەرەو سەربەستی و لێبوردەیی ئایینی بۆ یەکەمجار لە هۆڵەنداوە دەستی پێکرد بە مەبەستی گەڕاندنەوەی ئاشتی نێوان ڕێبازی کاسۆلیك و پرۆتستانتی خەڵك، ئەمەش لە کۆتایی سەدەی شازدەدا ڕوویدا. کاتێك کە ویلیەمی ئۆرەنج ئیدیعای بۆ بنەمای لێبوردەیی ئایینی دەکرد، ئەو پێی وابوو کە لە ڕیزی تەعالیمەکانی لوسەر دەربارەی مەیل کردن بەلای زەمیر و رزگاری مەسیحیەتدا کاردەکات. لە راستیدا ولیەم هەنگاوێکی چارەنوسسازی نا بەرەو دامەزراندنەوەیەکی تەواوەتی رێکخستنی کۆمەڵایەتی و خودی کلتوردا.

ئەو گریمانە کۆنەی کە پێی وابوو کە یەکبوونی کۆمەڵگا یەکبوونی ئایین دەخوازێت بێ پشت و پەنا نەمایەوە لە لایەن عەقڵی باشەوە. ئەگەر دانیشتوان ملکەچی یاسابن و رێز لە دەسەڵاتی حکومەتی مەدەنی بگرن، دەبێت لەو باوەڕەدا بن کە ئەوان لە ڕووی ئاکاریەوە راستن کە بەو جۆرە مامەڵە دەکەن، ئەوا ئەوان هەروا بە سادەیی ملکەچی ئەوانە نین کە دەسەڵاتدارن، ئەگەر دەسەڵات بە رەوا دابنرێت، ئەوا دەبێت ئایین بە ناوی هەندێ دەسەڵاتەوە مومارەسە بکرێت کە لە پشت هەرەمەکێتی و هاندەری مرۆڤییەوەیە. ئەوانەی کە دەسەڵاتدارن و ئەوانەش کە بابەتی دەسەڵاتن لە لایەن ئاینەوە زۆریان لێکراوە. لە رێکخستنێکی لەم جۆرەدا حاکم و مەحکوم وا هەست دەکەن کە ئەوان لە بەرپرسیارێتیاندا بۆ دەسەڵاتێك کە لە سەرویانەوە یەکیان گرتووە.

ئەمڕۆ تێڕوانینێکی لەو جۆرەی مەشروعیەتی ئاکاری و رێکخستنی کۆمەڵایەتی ناوازەیە. ئەو تێڕوانینە کۆنە رەت نەکراوەتەوە چونکە بە هۆی

جەدەلەوە پوچەڵ کراوەتەوە. لەوەش زیاتر، بەهۆی هۆکاری پراگماتیکیەوە پشتگوێ خراوە: پێویستی بە پەلەی گەڕاندنەوەی ئاشتی کۆمەڵایەتی سەرباری ململانێ ئاینییە خوێناویەکان لەبەرچاوگرتنەکانی تری تێپەڕاند لە گرنگیدا. لە نائامادەبوونی شێوازە ئاینییەکانی بە مەشروعیەت کردنی حکومەت، تیۆرە ئەلتەرناتیڤەکان گەشەدەکەن. لە نێو ئەمانەدا لە هەموویان گرنگتر بریتییە لە ئایدیای حکومەتی نوێنەرایەتی. هەرچۆنێك بێت تا ئەمڕۆش مەعقولیەتی ئەم تیۆرانە بۆ شەرعیەتدان زیاتر پشت بە بایەخپێدانە پراگماتیکیەکان دەبەستێت وەك لە گفتوگۆی قەناعەتپێکەر.

-٣-

پاش جەنگەکانی ئایین، دامەزراوەی ئایینی کۆمەڵگا، یاسا، کەلتور، لەلایەن یەکێکی ترەوە جێگەی گیرایەوە، کە بە سروشتی مرۆڤ ناوزەد کرا. بەم جۆرە و لەوێوە سیستمەکانی یاسای سروشتی، ئاکاری سروشتی، تەنانەت ئایینی سروشتی سەریان هەڵدا. وە بێگومان تیۆرێکی سروشتی هەبوو بۆ حکومەت، کە لە فۆرمی تیۆرەکانی کۆنتراکتی کۆمەڵایەتیدا خرابووە ڕوو. تیۆری لەم جۆرە پێویستێتی بۆ حکومەتی مەدەنی دیاری دەکات بە مەبەستی دەستەبەرکردنی رزگاربوونی تاك لەسەر نرخی سەربەستی سروشتی تاکەکان (بۆ نموونە هۆبز)، یان بە مەبەستی دەستەبەرکردنی سەربەستی تاك لە ناو سنورداریيەکانی عەقڵ و یاسادا (بۆ نموونە لۆك). ئەو تیۆرانەی کە سروشتی مرۆڤ بەکاردەهێنن وەك دامەزراوەیەك بۆ ڕێکخستنی سیاسی، یاسایی و کلتوری وایکردووە کە ڕێگە خۆش بێت لەبەردەم نەتەوەکانی ئەوروپادا کە کۆتاییەك بۆ سەردەمی ململانێی جەنگی ئاینی دابنێت. هەروەها ئەوان کارێکی وایان کرد کە ئۆتۆنۆمی کۆمەڵگای عەلمانی و کلتور بەشێوەیەکی حەتمی سەربەخۆ بێت لە کاریگەری کەنیسە و ترادیسیۆنی ئایینی.

حسابی پێشینەی سەرهەڵدانی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی عەلمانی پەیوەستە بە (ویلهێلم دێلسی)یەوە. بێگومان تیۆری تریش هەن. ڕەنگە بەناوبانگترین تیۆر ئەمەی ماکس فێبەر بێت دەربارەی بنەڕەتەکانی سەرمایەداری مۆدێرن. بەپێی تیۆرەکەی فێبەر کاپیتالیزمی مۆدێرن تەنها بەهۆی فاکتەرە ئابوورییە پەتییەکانەوە بەرهەم نەهاتووە، بەڵکو لە ڕێبازەکەی کالڤن دەربارەی حەتمیەت و کاریگەری لەسەر رەفتاری مرۆڤەوە سەری هەڵدا. کالڤن ئەوەی فێرکرد کە هەرچەندە دەستوری ئەبەدی خودا کە فەرمان بە هەڵبژاردنی یان نکوڵی کردنی تاك دەکات بە پەنهانی دەمێنێتەوە، جا کەسێکی دیاریکراو هەڵدەبژێردرێت کە دەتوانرێت بە رەفتارەکەیدا درکی پێبکرێت. ئەگەر ئەو کارەکانی نوێکردنەوە ئەنجام بدات، ئەوا ڕەنگە کەسی لەم جۆرە بگەڕێتەوە بۆ هەڵبژێردراو. بەلای کەسێکی کالڤنییەوە پاڵنەرێکی بەهێز هەبووە بۆ ئەوەی کە بەشێوەیەك بژی شایستەی دووبارە ژیانەوە یان نوێکردنەوە بێت. لە ئەرکی دنیایی کەسێکدا، لە سەرنجدانە ویژدانیەکانی ئەرکەکان کە کەسێکی بۆ بانگهێشت دەکرێت، ڕێگە دەبڕێت بەرەو دووبارە نوێبوونەوە. هەروەها فێبەر دەڵێت کە زوهدگەرایی کاپیتالیستە کۆنەکان سەرچاوەی خۆی لە هیوا دنیاییەکانی روحانیەتی کالڤنیدا هەبووە. ئەو روحانیەتە بەعەلمانی کرا ئەویش کاتێك کە ئەو خۆتەرخانکردنەی لێی کەوتەوە خرایە خزمەتی زیادبوونی سەرمایەوە. بە بۆچوونی فێبەر دواجار ئەمە سیستمێکی سەرمایەی بەرهەم هێنا کە بە

ڕەفتارێکی تەواو سەربەخۆ لە هاندەری ئاینی کە پێشتر ئەمی دروست کردبوو، کاری دەکرد.

تیۆری تری بەعەلمانیکردن وایان ڕاگەیاندووە کە بڕوای مۆدێرن بە پێشکەوتن بریتییە لە بەعەلمانیکردنێکی هیوای ئێسکاتۆلۆژی مەسیحی. هیوا خواستن بۆ جیهانێکی باشتر چیتر ئاراستەی جیهانێکی تر نەدەکرا، بەڵام دەبێتە پرۆژەی مرۆڤیی بۆ باشکردنی ئەم جیهانە. کارل لۆویس دەڵێت کە فەلسەفەی مێژووی مۆدێرن لە ڕاستیدا بریتییە لە بەعەلمانی کردنێکی سیۆلۆژیای مەسیحی بۆ مێژوو" بریتییە لە بەرگێکی بەعەلمانی کراوی مێژووی ڕزگار بوون (خلاص). قەدەری خودا کە پرۆسەکە بەرەو هاتنەدی دەبات لەلایەن فەلسەفەیەکی پێشکەوتنەوە جێگەی گیرایەوە کە لەلایەن هێزی زۆر کاریگەری زانست و تەکنەلۆژیاوە جێگەی گیرایەوە کە بەڵێن دەدات بە شادمانیەکی دنیایی لە داهاتودا. زانست هەستا بە بەعەلمانیکردنی ئایدیای سیۆلۆژیانەی یاسا بە گۆڕینی بۆ ئایدیای یاسا نەمرەکانی سروشت، ئایدیای کەونی بێ کۆتا بریتی بوو لە بەرگێکی بەعەلمانی کراوی باوەڕێکی پێشوتر بە بێ کۆتایێتی خودا.

لەم تیۆرەو تیۆرەکانی تریشدا، ناوەڕۆکی ئاینی دەگۆڕێت بۆ ئامادە (ئەم دنیایی)، هانز بلومبێرگ لە نێو ئەوانەدایە کە نەیاری ئەم جۆرە تیۆرانەیە، چونکە ئەم تیۆرانە کلتوری مۆدێرن دەخەنە ژێر پابەندبوون بە ڕابوردووە مەسیحیەکەیەوە. ئەو تیۆرانە وا ڕادەگەیەنن کە ماددەو پێکهاتەی ڕاستەقینەی کلتوری مۆدێرن بەشێوەیەکی بنەڕەتی دەگەڕێتەوە بۆ مەسیحیەت. لە بەرامبەر ئەم تێڕوانینەدا بلومبێرگ دەڵێت کە مۆدێرنیتی خۆی تۆمەتە داپڵۆسێنەرەکانی ئاینی مەسیحی ئازاد کرد. ئەوە پاشماوەی مەسیحیەت نەبوو کە ناوەڕۆکی عەقڵی مۆدێرنی پێك هێنا بەڵکو ئۆتۆنۆمی مرۆڤ بوو. بەهەرحاڵ، لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستە بەو زووانە لەو تیۆریستانەی عەلمانیەت کە لە سەرەوە باسکران دانەماڵدراوە. ئەوان دووبارە باوەڕیشیان وابوو کە کەلەپوری ئاینی گۆڕدراوە بۆ شتێکی لە بنەڕەتدا نوێ – هێندە نوێ بە قەدەر ئەوەی کە پێشبینی دەکرێت کاتێك مرۆڤایەتی لە سەنتەردا جێگەی خوا دەگرێتەوە.

هەرچۆنێك بێت، نەنگییەکی چارەنوسساز لە هەردوو هەڵوێستەکەدا هەیە. لایەنی یەکەم وا ئیدیعا دەکا کە پرۆسەکانی بەعەلمانیکردن بەرپرسن لە گۆڕان لە کلتوری چاخەکانی ناوەڕاستەوە بۆ کلتوری مۆدێرن. لایەنەکەی تر گۆڕانکاری لە ڕووی ڕزگاربوون لە کلتورێکی لەلایەن ئاینەوە کۆنترۆڵ کراو لەبەرچاو دەگرێت. هەردوو لایەنەکە سەرهەڵدانی کلتوری مۆدێرن وەك پرۆسەیەکی ئایدیۆلۆژی سەرەتایی سەیر دەکەن. من پێم وایە کە واقیع بریتییە لەوەی کە گۆڕان لە پرسیاردا لەلایەن ئایدیۆلۆژیاوە پاڵی پێوە نەنراوە. ئەوە جەنگی ناوخۆی ئاینی و تێکشکانی ئاشتی کۆمەڵایەتی بوو کە دوورکەوتنەوە لە ئایدیای کۆنی ئەوەی کە کلتوری گشتی دەبێت لە یەکێتی ئاینیەوە سەرچاوە بگرێت، کردە کارێکی پێویست. هەر هەوڵدانێك بۆ هێورکردنەوەی ململانێیەکانی نێوان پارتە ئاینییەکان مایە پووچ بوون. ئەوانەی کە هەوڵیاندا لەگەڵ ئەم بارودۆخەدا هەڵبکەن لەو باوەڕەدا نەبوون کە لە هەوڵیاندا بۆ دۆزینەوەی بناغە و سەرچاوەی زیاتر بۆ ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی، لە عەقیدەی مەسیحی لادەدەن. بەشێوەیەکی ڕێژەیی و بە چەند ئیستیسنایەکی کەمەوە، ئەوان وەك مەسیحی موتەدەین لە خۆیان تێگەیشتبوون، ڕەنگە بەر هێرشی ئابروو بردن بکەوتنایە لەلایەن ئەو فکرەوەی

کە ئەوان ڕێگرن لەبەردەم ئیدعاکانی حەقیقەتی مەسیحی و ئاکاریەتی کاریگەری خەڵك.

با ئەمە بەشێوەیەکی جیاواز وەربگرین: ئازادبوونی مۆدێرن لە ئایین بریتی نەبوو لە نیاز، بەڵکو ئاکامی درێژخایەنی دووبارە ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگا بوو لەسەر دامەزراوەیەك نەك عەقیدەی ئایینی. ئەوانەی کە کلتوری گشتیان لەسەر چەمکاندنەکانی سروشتی مرۆڤ دارشتبوو، مەبەستیان نەبوو کەلێن لەگەڵ مەسیحیەتدا دروست بکەن. لە راستیدا ئایدیاکانی مەسیحیەت بەردەوام بوو لەسەر ئەوەی کە لە ڕووی کۆمەڵایەتیەوە کاریگەری خۆی هەبێت، هەرچەندە کە ئەوان بەرەبەرە بە تەواوی گۆڕان بۆ باوەڕی عەلمانی، کارێکی سەرسوڕهێن نییە، کە بە تێپەڕبوونی کات، زۆرێك لە خەڵکی بیریان چووەوە کە یەکەم جار ئەم ئایدیایانە لە کوێوە هاتوون.

لە بیرکردنەوەدا لە پەیوەندی نێوان مەسیحیەت و کلتوری مۆدێرن، زۆر گرنگە کە ئەم فاکتەرانە لەبەرچاو بگرین: یەکەم، مۆدێرنێتی لە سەرەتادا نەیاری عەقیدەی مەسیحی نەدەکرد. دووەم، نەبوونی لێکبوردن لە نێو مەسیحیەکاندا لە ماوەی (دوای – ریفۆرم) بەشێوەیەکی راستەوخۆ بەرپرس بوو لە سەرهەڵدانی کلتوری عەلمانیخواز. ئەوەی کە پێویستە مەسیحییەکان لەمەوە فێری بن بریتییە لە پێویستی بەپەلەی زاڵ بوون بەسەر (ئایدیا نابەوە بۆماوەییەکانیان) دا گەڕاندنەوەی چەند فۆرمێکی یەکبون لەناو خۆیاندا. سەرباری ئەوەش ئایدیا و جێبەجێکردنی تەساموح پێویستە تێکهەڵکێش بێت لەگەڵ تێگەیشتنی مەسیحی نەك تەنها بۆ سەربەستی بەڵکو خودی حەقیقەتیش. بەبێ ئەم گۆڕانانە – گۆڕانێك کە تەنها مەسیحیەکان دەتوانن ئەنجامی بدەن – شتێکی تەواو نامەعقولە گەر وا پێشبینی بکەین کە کلتوری مۆدێرن هێنانە دەرەوەی ئایین لە مەیدانی گشتی لەبەرچاو دەگرێتەوە. یادەوەری ڕۆڵی ئایین لە بنەڕەتەکانی مۆدێرنێتیدا بەشێوەیەکی بەهێز ئەو ئیحتیقارە مۆدێرنە بەهێز دەکات کە پێی وایە ئاین لە مەیدانی گشتیدا ناکۆکی دروستکەر، لێنەبووردە و تێکشکێنەری کۆمەڵگای مەدەنیە.

-٤-

لە ناو دڵی کلتوری مۆدێرندا زۆر لە تەم و مژ بەدی دەکرێت کە لە تێکەڵکردنی تێهەڵقورتێنانەی ئایدیا مەسیحی و نامەسیحییەکانەوە سەرچاوە دەگرێت. گرنگترین نموونە بریتییە لە ئایدیای مۆدێرن دەربارەی سەربەستی. ڕیشەیەکی مەسیحیانەی ئاشکرا هەیە لەو باوەڕەدایە کە هەموو مرۆڤەکان بۆ ئەوە لەدایکبوون کە ئازادبن و ئەو ئازادیەش ڕێزی لێبگیرێت. تەعلیمێکی ئینجیل هەیە کە دەڵێت مرۆڤەکان لەسەر شێوەی خودا دروست کراون و بۆ ئەوەش دروست کراون کە چێژ لە (پەیوەندی کردن لەگەڵ خوادا وەربگرن). لە راستیدا ئەوە تەنها پەیوەندی بەستن لەگەڵ خوادایە کە وا دەکات ئێمە سەربەست بین، بەپێی عیسا (یوحنا ٨: ٣٦) و (پۆل ٣: ١٧). لە کاتێکدا هەر مرۆڤێك بۆ ئەوە دروست کراوە بۆئەوەی بەو سەربەستیە شاد بێت کە لە پەیوەندی کردن بە خواوە بەدەست دەهێنرێت، کەچی ئەم جۆرە سەربەستیە بە تەواوەتی تەنها لە عیسادا هاتەدی لە ڕێگەی پاکبوونەوە لە تاوان و مردن. ئایدیای مەسیحیەت دەربارەی سەربەستی بەم جۆرەیە.

ئایدیای مۆدێرن دەربارەی سەربەستی، کە بەشێوەیەکی زۆر کاریگەر لەلایەن (جۆن لۆك)ەوە پێشنیار کرا، جیاوازە لە تێڕوانینی مەسیحیەت

لەوەدا کە تەنها تەرکیز دەکاتە سەر بارودۆخی سروشتی مرۆڤ. هەروەها لە مامەڵەکردن لەگەڵ ئایدیای رواقییە کۆنەکان دەربارەی یاسای سروشتیدا جیاوازە. رواقییەکان وایان فێردەکرد کە سەربەستی بنەڕەتی و یەکسانی مرۆڤەکان لە دەوڵەتی سروشتدا لەدەست چووە بەهۆی زەرورەتی ژیان لە ناو کۆمەڵگادا. لۆك وا بیری دەکردەوە کە رێبازی ریفۆرمی سەربەستی مەسیحیەت، بانگەشەکردنە بۆ ئەوەی کە سەربەستی رەسەن حەقیقەتێکە لەم ژیانەدا. بە پێچەوانەی تێڕوانینە ئازادکردنەکانی دواترەوە دەربارەی سەربەستی تاك، لۆك بڕوای وابوو کە سەربەستی پەتی بەزەرورەت یەکی گرتووە لەگەڵ عەقڵدا و بەو هۆیەشەوە بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ پەیوەست بووە بە یاساوە. لە هەڵوێستەکەی لۆکدا دەنگدانەوەیەك هەیە کە هی تێگەیشتنی مەسیحیە کە پێی وایە سەربەستی پشت بە یەکێتی دەبەستێت لەگەڵ باشدا و لەوێشەوە لەگەڵ خوادا.

بێگومان ئەمڕۆ ئایدیای باو و بەربڵاو دەربارەی سەربەستی لە کۆمەڵگاکانماندا، بریتییە لەو ئایدیایەی کە هەرکەسێك مافی هەیە کە بەو جۆرەی پێی خۆشە رەفتار بکات. سەربەستی پەیوەست نەکراوە بە هیچ چەمکێکی باشەوە وەك راوێژکارییەکی سەربەستی خۆی. بەهۆی نەتوانایی بوونی مرۆڤەوە لە مێژوودا، هەر ئایدیایەکی سەربەستی دەکەوێتە بەر مەترسی خراپ بەکارهێنانەوە. بەڵام جیاوازییەکی گەورە دەکات کە ئاخۆ جیاکردنەوەی نێوان بەکارهێنان و خراپ بەکارهێنانی سەربەستی تێبینی کراوە. کاتێك ئەمە تێبینی دەکرێت، کارێکی شیاوە کە مەیدانخوازی هاوکێشەی سەربەستی بە روخسەت بکرێت. ئەو تەمومژەی کە لەناو ئایدیای مۆدێرنی سەربەستیدا هەیە، یارمەتی ئێمە دەدات لە تێگەیشتن لە باشی و خراپی کلتورە عەلمانیەکان، هەروەها لە دەمارگیری کلتوری ئێمە دەربارەی سەلماندنی ئەو ناوەرۆك و ستانداردانەی کە بەهۆیانەوە خودی کلتور پێناسە دەکرێت. لە ڕووی ترادیسیۆنە کلتوری و بەهاییەکانەوە، ڕێبازێك یان ئاراستەیەکی بەکارهێنەرانە دەبێتە باو. هەر کەسە و بەپێی پەسەندکردنەکانی خۆی یان پێداویستییەکانی هەڵبژاردن دەکات. ئاوێزان نەبوونی ئایدیای سەربەستی لەگەڵ ئایدیایەکی چاك یان راستەقینەدا یەکێکە لە لاوازییە گەورەکانی کۆمەڵگا عەلمانیەکان.

-٥-

لەژێر کاریگەری بیرمەندانی وەکو ماکس فیبەردا، گریمانەی باوی مۆدێرنێتی بریتی بووە لەوەی کە بەعەلمانیەت کردن بەردەوام دەبێت تا هەموو لایەنەکانی رەفتاری کۆمەڵایەتی و (تاك)ی دەگرێتەوە، ئاینیش زیاتر بەرەو پەراوێز پاڵی پێوە دەنرێت. لەم بیست سی ساڵەی دواییدا سەلمێنرا کە بەعەلمانیکردن (یان وەك هەندێك پێیان خۆشە بە مۆدێرنیزەکردنی پێشکەوتووخواز ناوزەدی بکەن) رووبەڕووی گرفتی ئاڵۆز دەبێتەوە. رێکخستنی کۆمەڵایەتی بەعەلمانیکردنی تەواوەتی رێگە دەدات بە سەرهەڵدانی هەستێکی بێ مانایەتی: لە مەیدانی ژیانی سیاسی و کلتوریدا بۆشاییەك هەیە و ئەمەش دەستپێکی توندوتیژی نارەزامەندبوونی لێدەکەوێتەوە. لە ئاکامدا، کارێکی قورسە پێشبینی دوارۆژی کۆمەڵگای عەلمانی بکەیت. ئەمە پەیوەستە بە دوورودرێژی ئەوەی کە خەڵکی دەخوازن باجی بێ مانایەتی لە ئاڵوگۆڕی بەدەستهێنانی روخسەتی ئەوەی دەیانەوێت، بدەن. هەرچەندێك خەڵك زیاتر

هەست بە دڵنیایی و دڵئارامییەکانی خۆشگوزەرانی بکەن، رەنگە زیاتر خوازیاری لێبوردەیی ئەم گرژییە بن. لەلایەکەی تریشەوە، دژە کردارە ناعەقڵانیەکانیش پێشبینی نەکراون، بە تایبەت کاتێك کە هەستێك هەیە کە پێی وابێت دامەزراوەکانی کۆمەڵگا نامەشروعن. بارودۆخی کۆمەڵگای عەلمانی مۆدێرن زۆر لەوە لەرزۆکترە کە ئێمە دەمانەوێت دانی پیابنێین. ئەوانەی کە دان بە مەترسییەکەدا دەنێن بانگەشە بۆ چاکسازی ئەو تراديسيۆنانە دەکەن کە بەهۆیانەوە کلتور پێناسە کراوە، لەوە زیاتر تایبەتیش بۆ سەلماندنی کردنی ریشە ئاینییەکانی ئەو تراديسيۆنانە.

بانگەشەی لەو جۆرە بێگومان لە خود بەرژەوەندی کۆمەڵگای عەلمانیدایە. بەهەرحاڵ، ئایین بەم شێوەیە کەمتر پەرژینی هەیە لەوەدا ئایا ئەو بانگەشەیە لەبەرچاو دەگیرێ. بە پێچەوانەی ئەو دوودڵییەوە کە چەند دەیەیەك لەمەوپێش بەشێوەیەکی بەربڵاو لەلایەن خاوەن بڕواکانی عەقیدەی ئاینیەوە دەردەبڕدرا، ئێستا ئاشکرایە کە دوارۆژی ئاین کەمتر لەرزۆکە وەك لە دوارۆژی کۆمەڵگای عەلمانی. بەعەلمانیکردن دوورە لەوەی کە بریتی بێت لە هێزێکی ڕامالەری ڕێلێنەگیراو. هەرچەندێك بەعەلمانیکردن یان ئەوەی پێی دەوترێت بەمۆدێرن کردنی پێشکەوتووخواز پێش بکەوێت، ئەوا زیاتر پێویستییەك بۆ شتێکی تر بەرهەم دەهێنن کە دەتوانێت مانا لە ژیانی مرۆڤەوە بەدەست بهێنێت. مانای لەم جۆرە، ئەگەر بیەوێت کاریگەر بێت، دەبێت وەك بەخشراو تەماشا بکرێت" نەك بەخشراو بە ژیانمان لەلایەن خۆمانەوە، بەڵکو لەلایەن چەند دەسەڵاتێکەوە لە پشت کارامەیی خۆمانەوە. بوژانەوەی بزووتنەوە ئاینی و مەیلەو ئاینییەکان کە چەند دەساڵێك لەمەوبەر دەستی پێکرد بووە مایەی سەرسوڕمانی رووناکبیرە عەلمانیەکان، بەڵام دەتوانرا (وە توانراش) وەك ئاکامێکی حەتمی عەلمانیەت پێشبینی بکرابایە.

ئەم ئارەزووە تازە کراوەیە بۆ ئایین، هەمیشە بەلای مەسیحیەتدا لاینەدا. لە هەندێ لە کۆمەڵگاکاندا، لە چینەکانی هەموو کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا، بادانەوە بەلای مەسیحیەتدا وەك ئیستیسنایەك بەدەردەکەوێت. هۆکارێك بۆ ئەمەش بریتییە لە رق و کینەی ناو ئاگایی جەمعی کلتوری عەلمانی لە دژی مەسیحیەت وەك "ئایینی تەقلیدی". ئەمە یارمەتیدەرە لە روونکردنەوەی ئەو حەماسە بەربڵاوەی بۆ"ئایینی بەدیل" هەیە، هۆکارێکی تری ئەوەی کە بۆچی زۆرێك لە خەڵکی کەیفیان بەهەر دینێك دێت، بەڵام مەسیحیەت بەو شێوەیە بەدی کرا کەنیسەکان وەڵامی مەیدانخوازی عەلمانیەتیان دایەوە. ئەمەش من دەبات بەرەو خاڵی کۆتایی کە دەمەوێت باسی بکەم: دەبێت کەنیسەکان چۆن وەڵامی کلتوری عەلمانی بدەنەوە؟

-٦-

خراپترین شێواز بۆ وەڵامدانەوەی مەیدانخوازی عەلمانیەت بە شێوەیەکی رەها بریتییە لە گرتنەبەری ستانداردە عەلمانیەکان لە زمان، فکر، شێوازی ژیاندا. ئەگەر ئەندامانی کۆمەڵگایەك سەرتاپا بادەنەوە بەلای ئاییندا، ئەوا لەبەرئەوەیە کە ئەوان بە دوای شتێکی تری غەیری ئەو شتانەدا دەگەڕێن کە کلتور بۆی دەستەبەر کردوون. کارێکی دژە بەرهەمهێنییە گەر ئاینیان بە شێواز و مۆدێکی عەلمانی پێبدرێت کە بەشێوەیەکی لێزانانە رێکخراوە بە مەبەستی نەڕووشاندنی هەستیاری عەلمانیان. لەم پەیوەندییەدا، وا بەدەردەکەوێت کە کەنیسەکانی ئەمریکا دەبوو پەیامەکەی (دین کێلی

*Dean Kelly*) بە ناوەکی بکەن لەو کتێبەیدا کە چارەکە سەدەیەك بەر لە ئێستا نووسیبووی بە ناوی (بۆچی کەنیسە کۆنە پارێزەکان گەشەدەکەن). ئەوەی خەڵك دەیانەوێت لە ئاییندا دەستیان بکەوێت بریتییە لە بەدیلێکی مەعقول، یان لانی کەم تەواوکەرێك، بۆ ژیان لە کۆمەڵگایەکی عەلمانیدا. ئەو ئاینەی کە "زیاتر هەمان شتە" ئەگەر ئەوەی تیا نابینرێت کە مایەی رەزامەندی بێت.

من بەپەلەم لە زیادکردنی ئەوەی کە ئەمە بریتی نییە لە جەدەلیك بۆ ترادیسیۆنالیزمی مردوو. ئەو مۆدێلە کۆنەی ئەنجامدانی شتەکان لە کەنیسەکاندا رەنگە رەگەزی وایان تیابێت کە بەشێوەیەکی تاقەت پروکێن بێزارکەر و بێ مانابن. مەسیحیەت کە وەك بەدیلێك یان تەواوکەرێك بۆ ژیان پێشنیار کراوە لە کۆمەڵگای عەلمانیدا دەبێت هەم چالاکی بەخش و هەم مەعقول بێت. لە سەرو هەمووشیانەوە، مەسیحیەت دەبێت بەشێوەیەکی بەرجەستەیی جیاواز بێت و پێشنیاری جیاوازییەك بکات لەوەدا کە خەڵك چۆن بژین. کاتێك پەیام و سروت دەگونجێن، کاتێك کە قەراغە بێزارکەرەکان لادەبرێن، ئەوا خەڵك بانگهێشت دەکرێن بۆ گومانکردن لەوەی قەشە (پیاوی ئاینی) بڕوای بە شتێك نیە کە زۆر جیاوازتر بێت. ئاماژەکارییە مەعقول و قەناعەتپێکەرەکانی جیاکەرەوەی مەسیحی، بریتییە لە مەسەلەی بازاڕچێتی. ئەم مەسەلەیە پەیوەندە بەوەوەی کە کەنیسەکان چەند قەرزاری خەڵکن لە کۆمەڵگا عەلمانیەکانماندا: ئیدیعاکردن بۆ مەسیحی بەرزکراوە، بەڵگەی بەچێژی ژیانی نوێی مەسیح، بانگەشەکردن بۆ ژیان کە زاڵ دەبێت بەسەر مردندا.

هەروەك ئەوەی کە ئەمە جەدەلێك نیە بۆ تیرادیسیونالیزم (دەبێت تێبینیەکەی جۆرسلاڤ پەلیکان لە مێشکماندا بچەسپێنین کە پێی وابوو ترادیسیۆن بریتییە لە عەقیدەی زیندووی مردووەکان لە کاتێکدا ترادیسیۆنالیزم بریتییە لە عەقیدەی مردووی زیندووەکان)، ئەوا بریتیش نیە لە جەدەلێك بۆ فەندەمێنتالیزم. راشکاوانە دەڵێم کە زاراوەی فەندەمێنتالیست ئەمڕۆ بۆ ئیدانەکردنی هەر ئاینێك بەکاردەهێنرێت کە بە جدی دەستدرێژی دەکاتە سەر هەستی عەلمانیەت. مەبەستم لە فەندەمێنتالیزم ئاینەکە تێوەگلانی توانستی عەقڵی مرۆڤ ڕەت دەکاتەوە.

نەیاری کردنی راگەیاندنەکانی مەسیحیەت بۆ روحیەتی عەلمانیەت دەبێت هەمیشە بە دوای هاوپەیمانێتیەك وا بگەڕێت لەگەڵ عەقڵدا. ئەمە لەبارەی گونجاندن لەگەڵ ترادیسیۆنی مەسیحی کلاسیکیدا کە هەر لە سەردەمی کەنیسەی کۆنەوە، هەوڵیدا بۆ سەرخستنی هاوپەیمانێتییەك لەگەڵ عەقڵ و فەلسەفەی راستیدا بە مەبەستی پێشبڕکێکردن لەسەر مەشروعیەتی گەردوونی تەعالیمی مەسیحی.

عەلمانیەکان راستن کە رووبەروی ناعەقڵانیەت، توندڕەوی، نالێبوردەیی دەبنەوە کاتێك کە بە ناوی ئاینەوە دەردەکەون، تەنانەت کاتێك کە عەلمانیخوازەکان هەندێ جار وا دەکەن ناڕاستگۆیەتی ئاین بسەلمێنن. تەعالیمی راستگۆئاسای مەسیحی لەگەڵ هەموو ئەوانەدا کە لە کلتوری عەلمانیدا مەشروعن دەگونجێت، کاتێك کە تەرکیز دەکاتە سەر ئەو حەقیقەتەی کە روحیەتی عەلمانی لەوە زیاتر بە شایستەی سەرنجدان دانانێت. مەسیحیەکان دەتوانن بە متمانەوە ئەمە ئەنجام بدەن چونکە دەزانن کە، کتومت وەك ڕێبازەکانی مەسیحی کە رۆژگارێك بە ناوی عەقڵ و رێبازی عەقلانیەوە بۆ حەقیقەت تەحەدا دەکرا، ئاوها ئەمڕۆ عەلمانیەت خۆی بۆتە ناعەقڵانی. لەم

بارودۆخە هاوچەرخەماندا، بەڵێنی گەورە هەیە بۆ تازەکردنەوەی هاوپەیمانێتییە کۆنەکەی نێوان عەقیدەی مەسیحی و عەقڵ.

ئەو مەسیحیانەی کە گلەیی لە عەقڵ دەکەن، هەرچۆنێك بێت دەبێت ئامادەبن کە رەخنە قبووڵ بکەن و تۆوی رەخنە لەخۆگرتن لە جڤاتەکانیاندا بچێنن. رێچکەو فۆرمە تەقلیدییەکانی روحانیەت هاوشان لەگەڵ خودی ئینجیلیشدا، لە لێکۆڵینەوەی رەخنەیی ئیعفانەکراون. لێکۆڵینەوەی لەمجۆرە لەلایەن هاوپەیمانێتی عەقیدەو عەقڵەوە داوادەکرێ. متمانەی مەسیحی بە حەقیقەتی خوا و هێنانەدیەکەی دەبێت هێندە بە توانا بێت کە بەس بێت بۆ گریمانەکردنی ئەوەی کە حەقیقەت ملکەچ نەکات بۆ هەر دۆزینەوەیەکی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی. بێگومان چەندی فۆرمی رەخنەی تەحقیرکراو و شێوێندراو هەیە کە تێڕوانینی دنیاییانەی عەلمانی بە دوژمنی عەقیدەی مەسیحی لە قەڵەم دەدات. بۆئەوەی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی بگەشێتەوە، رەخنەی چەوتی لەم جۆرە دەبێت بە توندی رێگەی لێبگیرێت و بەرەنگاری لێبکرێت. چۆنێتی جیاکردنەوەی لێکۆڵینەوەی رەخنەیی و رەخنە بابەتێکە لێرەدا جێگەی نابێتەوە. هێندە بەسە کە بڵێین کە دەتوانرێت بکرێت و دەشبێت بکرێت. جەدەلی من ئەوەیە کە، گەر وا بیر بکەینەوە کە کارێکی زەرورە کە حەقیقەتی ئاشکرابووی خودایی لە لێکۆڵینەوەی رەخنەیی بپارێزین، ئەوا لە راستیدا ئێمە بێ بڕوایی خۆمان دەخەینە ڕوو. لێکۆڵینەوەی لەم جۆرە، کە ڕەنگە لە چەندین کاتیدا نارەحەتی دروست بکات، لە دواجاردا جوانی حەقیقەتی خوا دەڕازێنێتەوە. متمانەکردن بەو حەقیقەتە متمانەیەك لە بانگەشە و ژیاندا خراوەتە ڕوو، تەنها وەڵامی تەواو و شایستەیە بۆ تەحەداکردنی عەلمانیەت.

## پەراوێز

١-ۆلفهارت پانینبێرگ پرۆفیسۆری سیۆلۆژیای سیستماتیکییە لە زانکۆی میونخ و بەڕێوەبەری دامەزرێنەری پەیمانگای سیۆلۆژیای ئیکیۆمێنییە.

## سەرچاوە

*www. Goldenessays.com.*

# عەلمانییەتی فەرەنسی دژ بە ئاین نییە

ئەلعەفیف ئەلئەخزەر
لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

## عەلمانییەت چییە؟

عەلمانییەت وەکو لە فەرهەنگی (رۆبێر)ی فەرەنسی داهاتووە، بریتییە لە رێکخستنی سیاسی کۆمەڵگە بە جۆرێك کە دەوڵەت مومارەسەی هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی ئایینی نەکات و کڵێساش هیچ جۆرە دەسەڵاتێکی سیاسی نەبێت.

لە واقیعدا سێ پرانسیپی سەرەکی هەن کە عەلمانییەتیان لەسەر دادەمەزرێت، ئەو سێ پرانسیپەش بریتین لە:

یەکەم/ بێلایەنی دەوڵەت لە کاروباری ئایینیدا.

دوەم/ بێلایەنی قوتابخانە لە ئاست مەسەلەی ئایینیدا.

سێهەم/ رێزگرتنی ئازادی ویژدان و بیروباوەڕ.

بێلایەنی دەوڵەت لە کاروباری ئایینییدا، مانای وایە دەوڵەت یەکێك لە ئاینی هاولاتیانی خۆی ناکاتە ئاینی رەسمی، وەکو ئەوەی لە قۆناغی فیودالیزمدا ولاتانی ئەوروپی دەیانکرد و ئاینی کڵێسایەکیان دەکردە ئاینی رەسمی خۆیان و بەم کارەشیان ئەو کەسانەیان لە مافی هاولاتیبون بێبەش دەکرد کە سەر بە ئاینەکانی دیکەبوون، بەمەش ئەو خەڵکانە تەنها دەبوونە میوانێك لەو ولاتەدا یاخود حسابی (ذمي) یان بۆ دەکرا وەکو ئەوەی دەوڵەتی خەلافەتی ئیسلامی پەیرەوی دەکرد. دەوڵەتی عەلمانی وەك چۆن رێ بەخۆی نادات دەستبخاتە کاروباری ئاینییەوە، رێگەش نادات بە پیاوانی ئاینیی (ئیتر شێخ بن یان قەشە) خۆیان لە سیاسەت هەڵبقورتێنن، ئەمەش بۆ ئەوەیە تا هیچ یەکێك لەوان سیاسەت نەخەنە خزمەت ئاینی خۆیانەوە لە دژی ئاینی هاولاتیانی دیکە، کارێك کە رەنگە ببێتە مایەی چەوسانەوەی ئاینیی یاخود هەڵایسان و بەرپابوونی شەڕی ئاینیی.

بەمجۆرە یەکەمین پرانسیپی عەلمانییەت وەکو "محەمەد عەبدە" بە کورتی باسی لێکردووە بریتییە

له: ( نه ئاین له سیاسه‌تدا هه‌یه و نه سیاسه‌تیش له ئاین)دا، یاخود وه‌کو ئه‌وه‌ی "سه‌عد زه‌غلول" چڕتری کردۆته‌وه و ده‌ڵێت: (ئاین بۆ یه‌زدان و نیشتمانیش بۆ هه‌موان).

بێلایه‌نی قوتابخانه به‌رامبه‌ر به ته‌واوی ئاینه‌کان.. کاتێك له سه‌رده‌می پاشایه‌تیدا کاتۆلیکییه‌ت ئاینی ره‌سمی ده‌وڵه‌ت بوو له فه‌ره‌نسادا، ئه‌رکی قوتابخانه‌کانی ئه‌و وڵاته مێشك داشۆرینی خوێندکاره‌کانی بوو به پرانسیپ و به‌هاو سروتی ئاینیی ره‌سمی ده‌وڵه‌ت، به‌ڵام شۆڕشی گه‌وره‌ی فه‌ره‌نسا ئه‌م بارودۆخه‌ی گۆڕی.. لێره‌دا ده‌بێت ئاماژه بۆ ئه‌وه بکه‌ین که ته‌نها له سایه‌ی کۆماری سێهه‌مدا قوتابخانه‌ی عه‌لمانی هاته ئاراوه و بووه چوارچێوه‌یه‌ك بۆ له‌خۆگرتنی ته‌واوی گروپه ئه‌تنیکی و ئاینیی و مه‌زهه‌بییه‌کان له‌ژێر ناوی هاوڵاتیدا، ئه‌مه‌ش خاڵی هاوبه‌شی هه‌ره‌گرنگی سه‌رجه‌م پێکهاته‌کانی نه‌ته‌وه‌ی فه‌ره‌نسایه و له‌سه‌رو هه‌موو تایبه‌تمه‌ندیه‌کی مه‌زهه‌بی و ئه‌تنیکیه‌وه، به‌ڵام به‌بێ ئه‌وه‌ی ئه‌وانه دوچاری چه‌وساندنه‌وه بکات یاخود فه‌رامۆشیان بکات و بیانسڕێته‌وه.

بابزانین قوتابخانه‌ی عه‌لمانی فه‌ره‌نسی چۆن چۆنی ئه‌م ده‌سکه‌وته مۆدێرنه مه‌زنه‌ی به‌ده‌ستهێنا؟ سه‌ره‌تا به ڕێگرتن له هه‌موو پڕوپاگه‌نده‌یه‌کی ئاینی له به‌رنامه‌و پرۆگرامی خوێندندا ئه‌م کاره‌ی کرد.. هه‌روه‌ها ئه‌وه‌ی فه‌ره‌نسیه‌کان ده‌یخه‌نه به‌رده‌ست خوێندکاره‌کانیان ته‌نها زانیاری زانستی و به‌های ئینسانی یۆنیڤرسالیه که سه‌ر به هیچ ئاینێك نییه و دژایه‌تی هیچ ئاینێکیش ناکات. زانسته‌کان دژایه‌تی ئاین ناکه‌ن، به‌ڵکو ئه‌وه‌ی ئه‌وان ده‌یکه‌ن تاوتوێکردنی ئاینه به‌شێوه‌یه‌کی بابه‌تی تا تێیبگه‌ن، واته زانست وه‌ك هه‌ر دیارده‌یه‌کی کۆمه‌ڵایه‌تی مێژوویی له ئاین ده‌کۆڵێته‌وه، بۆ ئه‌وه‌ی په‌ی به میکانیزم و ڕۆڵ و یاسا تایبه‌تیه‌کانی به‌رێت. ئه‌ی بۆچی قوتابخانه‌ی عه‌لمانی فه‌ره‌نسی هه‌موو پڕوپاگه‌نده‌یه‌کی ئاینی یاساغ کرد؟ بۆ ئه‌وه‌ی ڕێگا نه‌دات ئاینێك ئاینێکی دی سه‌رکوت کات و نه‌هێڵێت شه‌ڕ و کێشه‌ی ئاینی روبدات، هه‌روه‌ها بۆ ئه‌وه‌ی هاوڵاتیه‌ك دروست نه‌بێت که ئاینه‌که‌ی بخاته پێش هاوڵاتیبونی و پێش به‌رژه‌وه‌ندی نیشتمانه‌که‌یه‌وه، وه‌کو ئه‌وه‌ی له‌مڕۆدا بزاوته ئیسلامیه توندڕه‌وه‌کان ده‌یکه‌ن.

سێهه‌مین پرانسیپی ده‌وڵه‌تی عه‌لمانی ئێشگرتنه به‌دیار پاراستنی مافی ئازادی ویژدان و بیروباوه‌ڕ، واته ده‌بێت ده‌وڵه‌تی عه‌لمانی مافی ته‌واوی هاوڵاتیانی خۆی بپارێزێت له‌وه‌ی بتوانن رێوڕه‌سم و سروته ئاینییه‌کانی خۆیان به‌جێبهێنن و ئازادیش بن له‌وه‌ی بڕوا به چ ئاینێك دێنن یاخود هه‌ر بڕوا به هیچ نه‌هێنن و په‌یڕه‌وی هیچ ئاینێك نه‌که‌ن.

ده‌وڵه‌تی فه‌ره‌نسی وه‌کو ته‌واوی وڵاتانی عه‌لمانی کاری به‌وه نییه بکه‌وێته پشکنینی دڵ و ده‌رونی خه‌ڵك (وه‌ك له فه‌رموده‌یه‌کی پێغه‌مبه‌ردا هاتووه) و مافی ئه‌وه‌ش به خۆی نادات چاودێر بێت به‌سه‌ر ئه‌قڵ و بیرکردنه‌وه‌ی هاوڵاتیانیه‌وه یان ئه‌وانه‌ی له‌و وڵاته‌دا په‌ناهه‌نده‌ن، هاوکات رێ به خۆشی نادات له هه‌ست و نیه‌ت و بیروبۆچونیان بپێچێته‌وه، به‌ڵکو ته‌نها له کار و کرده‌وه‌کانیان ده‌پێچێته‌وه گه‌ر هاتوو یاساشکێنیان کرد.

دروشمی ده‌وڵه‌تی عه‌لمانی له فه‌ره‌نسا و جیهاندا ئه‌و ئایه‌ته‌ی قورئانه که ده‌ڵێت: (لا إكراه في الدين)، هه‌روه‌ها په‌یڕه‌وکردنی ئه‌و ته‌فسیره‌شه که "محه‌مه‌د عه‌بده" له (تفسير المنار)دا بۆ ئه‌م ئایه‌ته‌ی ده‌کات و ده‌ڵێت: (واته‌که‌ی ئه‌وه‌یه: کێ ویستویه‌تی با باوه‌ڕبهێنێ و کێش نایه‌وێت با ده‌ستبه‌رداری

بێت و وازبهێنێت). بەڵام ئەوەی جێی سەرسوڕمانە ئەوەیە کە فیدراسۆنی کۆمەڵە ئیسلامیەکانی فەرەنسا (ئەمانە سەر بە گروهی ئیخوان موسلمینن)، ئەم پرانسیپە (قورئانییە – عەلمانییە) یان پێقبوڵ نییە کە تەئکید لەسەر ئازادی بیروباوەڕ دەکاتەوە، لەبەرئەوەی بە مەزەندەی ئەوان ڕەنگە ئەمە ببێتە مایەی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لە فەرەنسادا!! ئەوان ئەوە لەبیردەکەن کە دەوڵەتی عەلمانی بە هاوڵاتیانی خۆی ناڵێت چی حەڵاڵە و چی حەرامە لە ئایینی هەریەکەیاندا، چونکە ئەمە مەسەلەیەکە پەیوەندی بە ئیمانداران خۆیانەوە هەیە، ئەوەی دەوڵەت بە ڕێکوڕاستی بە هاوڵاتیانی دەڵێت ئەوەیە (چی لە ڕووی یاساییەوە نەك ئاینییەوە)، ڕێ پێدراوە و چیش یاساغە و ڕێگەی پێنادرێت.

لە وڵاتی عەلمانیدا یاسای گشتی وەکو یەك بەسەر هەمواندا جێبەجێ دەبێت (هاوڵاتی بێت یان پەنابەر)، ئیتر ئینتمای ئەتنیکی و مەزهەبی و ئاینیی هەرچیەك بێت.. سەبارەت بە حەڵاڵ و حەرامی ئاینیش ئەوا مەسەلەیەکە پەیوەندی بە گروپی ئاینییەوە هەیە و پابەندبوون و پەیڕەوکردنیشی جێهێڵراوە بۆ ویژدانی هەر ئیماندارێك خۆی و دەوڵەت و یاساکانی دەوڵەت دوورونزیك پەیوەندیان پێوەی نییە.

فەرەنسا بە خواست و ویستی خۆی نەبوو بە دەوڵەتێکی عەلمانی، بەڵکو بەناچاری ملی بۆ مەسەلەیەکی وادا. هەروەکو فەیلەسوفی هاوچەرخی فەرەنسی "ئەندرێ گلۆکسمان" دەڵێت: (دوورخستنەوەی ئاینزا بەشەڕهاتووەکان لەسەر کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات، بە تایبەتیش ئاینزای کاتۆلیکی و پرۆتستانتی لە دەوڵەت، مەرجی یەکەمین بوو بۆ ئەوەی فەرەنسا وەکو نەتەوەیەك مانەوەی مسۆگەر بێت و هەروەها ئەمەش یەکەمین هەنگاو بوو بۆئەوەی ئەو وڵاتە داخڵ بە مۆدێرنە بێت).

ئەو هەلومەرجەی زۆربەی وڵاتانی سەرزەمینی ئیسلام (وەکو ئێران و عێراق و سعودیە) تیایدان، بە هەلومەرجی دوێنێی فەرەنسا دەچێت و دەرەتانێکیش بۆ خۆلادان لە چەوسانەوەی ئایینی و ئەگەری هەڵایسانی شەڕی ئاینیی، ئەو چارەسەرەی فەرنسایە کە لە ئەمڕۆدا وڵاتانی شارستانی یان ئەوانەی ڕێگای شارستانی بوونیان گرتۆتەبەر، پەیڕەوی دەکەن. فەرەنسا چۆن چۆنی بوو بە دەوڵەتێکی عەلمانی؟

فەرەنسا لە ڕێی ئەو قوتابخانە عەلمانییەوە بەو پرۆسەیە گەیشت کە ئاین بە خوێندکارانی ناڵێتەوە، بەڵکو ئەوەی پێیان دەخوێنێت زانستی نوێیە، زانستێك یارمەتیان دەدات بۆئەوەی بەشێوەیەکی زانستی لە ئایین تێبگەن و بەمجۆرەش لە (دەمارگیری ئاینیی)، دەمارگیریەك کە دەبێتە مایەی تیرۆر و ئاژاوەگێڕی ڕزگاریان دەکات.

یەکەمین دیکۆمێنتی مێژوویی لە جیهاندا کە نێوانی دەوڵەت و کڵێسای لێکتری جیاکردبێتەوە و بواری کارکردنی هەریەکەیانی دیاری کردبێت، ئەو دیکۆمێنتە عەلمانییەیە کە ساڵی ١٩٠٥ پەرلەمانی فەرەنسی بڵاویکردەوەو تیایدا خەتێکی تۆخ لە نێوان کارکردنی هەریەك لە دەوڵەت و کڵێسا دەکێشێت و لێکیان جیادەکاتەوە.

یەکەمین بڕگەی ئەم بڕیارە پێدادەگرێت لەسەر ئەوەی: دەوڵەت ئازادی بیروباوەڕ دەپارێزێت و ڕێگاش لە مومارەسەکردنی ڕێورەسم و سروتە ئاینییەکان بەشێوەیەکی ئازادانە ناگرێت (...).

بڕگەی دووەم/ دەوڵەت وەکو ئایینی ڕەسمی ئیعتراف بە هیچ ئاینێك ناکات و یارمەتی دارایش

ناداتـه هـیچ ئاینێـك (...)، بـەڵام دەكرێـت خـەرجی تایبەت بخرێتە لیستی بودجەی (دەوڵـەت و هـەرێم و شـارەوانیەكان)، بـۆ كۆكردنـەوەی خێـر و كۆمـەك و ئەمـــەش تایبەتـــە بـــۆ دەســـتەبەركردنی ئـــازادی مومارەسەكردنی رێوڕەسمە ئاینییەكان لە دامودەزگا گشـــتییەكانی وەك قوتابخانـــەی ناوەنـــدی و دواناوەنـــدی و بێلانـــەكان و نەخۆشـــخانە و گرتووخانـەكان. دەوڵـەتی عـەلمانی فەرەنسـی وەكـو ئـاینیی رەسمـی ئـیعتراف بـە هـیچ ئاینێـك ناكـات و وەكـو یـەك بـە مـافی تـەواوی ئاینـەكان و لەوانـەش ئاینی ئیسلامی دەزانێت كە لـەو وڵاتـەدا خۆیـان رێـك بخـــەن و ئازادانـــە ســـروت و رێـــوڕەسمی خۆیـــان جێبەجێ بكەن.

بـە پشـت بەسـتن بـە برگـەی دووەم، دەوڵـەتی فەرەنســی یاســایەكی كــۆنی هەڵوەشــاندەوە كــە جـەختی لەسـەر ئـەوە دەكـردەوە، مـەترانی كڵێسـای كـاتۆلیكی بـە ئەنـدام لـە ئەنجومـەنی پیرانـی وڵاتـدا دەژمێـــردرێن، بـــەڵام ئـــەمڕۆ وەكـــو نوســـەر و رۆژنامەنوســـی فەرەنســـی "*A. gresh*" دەڵێـــت: (دەوڵەت دوودڵ نییە لەوەی بەشداریان لە لیژنەكانی بیركردنـەوەدا پێبكـات، وەكـو لیژنـەی بیركردنەوە لـە چـاككردنی رەفتـار و هەڵسـوكەوتدا و دەشـێت لـەم رووەوە بەشدارییەكی ئیجابی و كاریگەریان هەبێت).

هـــەروەها دەوڵـــەتی عـــەلمانی فەرەنســـی لـــە جێبــەجێكردنی ئیلتزامــی خــۆی، بەرامبــەر بــەوەی یارمــەتی دارایــی نەداتــە دامودەزگــا ئاینییــەكان، دەستی كێشایەوەو ٣٠٠ هـەزار عـەقاری خستەسـەر موڵـك و مـاڵاتی كڵێسـای كـاتۆلیكی و سـاڵی ١٩٢٠ هەستا بە تـەرخانكردنی سـەرمایەیەكی پێویست بۆ مزگەوتی بەناوبانگی پـاریس كە وەك رێزلێنانێك بۆ ئەو سەربازە موسڵمانانە دروست كرا كـە لـە جـەنگی جیهانی یەكەمدا، وەكو خۆبەخشێك چووبوونە ریزی سوپاوە بۆ بەرگریكردن لە فەرەنسا. ئەمەش بۆ خۆی بەڵگەیـە لەسـەر ئـەوەی عەلمانییـەتی فەرەنسـی دژی ئاین نییە، بەڵكو خزمـەتگوزاری پێشكەش بە ئاینی تــەواوی هاوڵاتیــەكانی دەكــات، ئەگــەر ئــەوە بــە پێویسـت بزانێـت. هـەروەها ئـازادی جێبـەجێكردنی سروت و رێوڕەسمە ئاینییەكانیان بۆ فەراهەم دەكات لـە هـەر بارودۆخێكدا بێت، بـەو مەرجـەی ئاسایشـی گشـتی نەشـێوێنن و هـەوڵی ئـەوە نـەدەن دەوڵـەت و قوتابخانە بكەنە لایەنگیر لە كاروباری ئاینییدا، وەكو ئـەوەی هەنـدێك رێكخـراوی تـاریكخوازی ئیسـلامی كاری بۆ دەكەن. وەك هەڵخەڵەتاندنی هەندێك كچانی موسڵمانی فەرەنسایی یان كچانی پەنابـەر لـەوێ، بۆ ئـــەوەی حیجـــاب بپۆشـــن و چارشـــێو بـــدەن بەســـەر خۆیانـــدا، ئەمـــەش وەك تەحـــەداكردنێكی یاسـاكانی رێگەنـەدان بـە پڕوپاگەنـدەی ئـاینیی لـە قوتابخانەی عەلمانییدا.

هەنوكـە پێـنج ملیـۆن موسـڵمان لـە فەرەنسـادا دەژین، دوو ملیۆنیان فەرەنسین و نیو ملیۆن لەوانە مومارەسەی رێوڕەسم و سروتە ئاینییەكانی خۆیـان دەكـەن. بـا ئەمـە بـە رەوشـتی شـیعەكانی عێـراق لـە سەردەمی "سەدام حسێن"دا بـەراورد بكـەین. سـاڵی ١٩٧٦ فڕۆكـەكانی بـەعس كەوتنـە بۆردومـانكردنی ئـەو شـیعانەی بـەرەو شـاری كەربـەلا دەچـوون بـۆ بـــەرزڕاگرتنی یـــادی "ئیمـــام حوســـێن"، لـــەو بۆردومانـــەدا ١٠٠ كـــەس كـــوژران و دوای ئـــەوەش "سەدام حسێن" سەردانی كەربەلای لە یـادی "ئیمام حوســێن"دا لـــێ قەدەغـــەكردن و ئـــەم حاڵەتـــەش بـــەردەوام بـــوو تـــا رۆژی هەرەســـهێنانی سســـتەمە خوێنرێژەكـەی لـە نیسـانی ئـەم سـاڵدا. لـە كۆمـاری ئیسـلامی ئێرانیشـدا ملیۆنـەها موسـڵمانی سـونە مەزهـەب بـە جۆرەهـا چەشـن دەچەوسـێنرێنەوە و سـەركوت دەكـرێن. بـۆ نمونـە سـونە مەزهەبـەكانی

شاری تاران لە کاتی هاتنە سەر کاری کۆماری ئیسلامیەوە، بێ پەروا لە هەوڵی ئەوەدان مۆڵەتی ئەوەیان پێبدرێت مزگەوتێکی تایبەت بە خۆیان دروست بکەن تا نوێژی هەینی تێدا بکەن، بەڵام هەوڵەکانیان بێهودە بوو.

سەروەختێکیش بێ وەرگرتنی مۆڵەت مزگەوتێکی لەو جۆرەیان دروستکرد، کەسانێکی نەناسراو کەوتنە تێکوپێکدانی و روخاندیان بەسەریەکدا! هەروەها شیعە مەزهەبەکانی عەرەبستانی سعودیە کە رێژەی لە ١٠٪ دانیشتوانی ئەو وڵاتە پێکدەهێنن، حاڵیان لە حاڵی سونە مەزهەبەکانی ناو ئێران چاکتر نییە. منداڵی شیعەکانی سعودیە رۆژانە لە قوتابخانەکاندا ئەو وانانەیان پێدەوترێت کە "محەمەد بن عەبدولوەهاب و ئیبن تیمیە" ئەوانی پێ تەکفیر دەکەن، هەرکەسێکیش گومان لە تەکفیرکردنی ئەوان بکات ئەوا ئەو کارەی وەك کوفر کردن بۆ لەقەڵەم دەدرێت، وەکو لە فتواکانی "ئیبن تیمیە"دا هاتووە.

قورئان خواردنی تەواوی گۆشتی ئەو باڵندە و پەلەوەرانەی بۆ موسڵمان حەڵاڵ کردووە کە ئەهلی کیتاب (واتە جولەکە و مەسیحی) سەریان دەبڕن، بەڵام زانا ئاینییەکانی عەرەبستانی سعودیە لە سەرەتای ساڵانی نەوەدەکانەوە خواردنی ئەو جۆرە شتانەی شیعەیان حەرامکردووە!

بۆ ئەوەی شەڕو ئاشوبێکی ئاینیی لە نێوان شیعە و سونە و لە نێوان موسڵمان و غەیرە موسڵماندا نەقەومێت، لەمسەر تا ئەوسەری سەرزەمینی ئیسلام، ئەوا پرۆسەی عەلمانییەت باشترین رێگا چارەیەکە بۆ رێگرتن لەو هەرایە. کاری رێکەوتیش نییە کە ئەستێرەی بەختی عەلمانییەت لە نێوان لاوانی عەرەبستانی سعودیە و روناکبیرانی ئەو وڵاتەو سەرجەم بوارەکانی خوێندن لە درەوشاندنەوەدایە و هەروەها پرۆژەیەکی دەستوری عێراقیش کە لەم مانگەدا بڵاوکرایەوە، جەخت لەسەر جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت و یەکسانی نێوان پیاو و ژن و هەڵگرتنی سزای لەسێدارەدان دەکاتەوە. هاوکات زۆربەی زۆری لایەنگرانی سەرۆك "خاتەمی" و ٣٠٠ ئایەتوڵڵا (کە ئایەتوڵڵا مونتەزیریشیان لەگەڵدایە) و رۆژی ٦ی ئەیلولی ئەمساڵیش "مستەفا خومەینی" نەوەی ئایەتوڵڵا "ئیمام خومەینی"یش چووە پاڵیان، داوا دەکەن کۆماری ئیسلامی وەکو کۆماری فەرەنسا ببێت بە کۆمارێکی عەلمانی. واتە ئاخوندەکانی ئەوێ دەستبەرداری دەسەڵاتی دەوڵەت بن و بگەڕێنەوە ناو حەوزە ئاینییەکانی خۆیان. هۆکاری ئەمەش چییە؟

هۆکاری ئەوەیە ئەمانە درکیان بەوە کردووە کە کۆماری ئیسلامی هەڕەشە و مەترسی نییە بۆ سەر ئیسلام. لە ساڵی ١٩٩٤ ئێرانییەکان وازیان لەوە هێناوە ناوی "عەلی و حسێن" لە منداڵەکانیان بنێن و دوو ناوی ئاگرپەرستی وەك "داریوش و ئەراش" یان بەلاوە پەسەندترە. هەروەها حوجەتولئیسلام "عەلی زوم" جێگری سەرۆکی شارەوانی تاران دان بەوەدا دەنێت کە ٧٥٪ کۆی خەڵکی ئێران و ٨٦٪ خوێندکاران وازیان لە نوێژکردن هێناوەو هامشۆی مزگەوتەکان ناکەن. بەڵام بابزانین کۆماری ئیسلامی بە چ شێوەیەك کەوتە وەڵامدانەوەی ئەم دوو مەترسیەی رووبەڕووی بۆتەوە؟

بۆ یەکەمیان هەستا بە قەدەغەکردنی ناونانی منداڵ بە ناوی غەیرە ئیسلامی و ئەمەش وایکرد زۆربەی منداڵان دووناویان هەبێت، ناوێکی رەسمی لەسەر ناسنامەکانیان و ناوێکی میللیش لەناو خەڵکیدا. بۆ رووبەڕووبونەوەی حاڵەتی دووەمیشیان کەوتە تەرخانکردنی مانگێکی تەواو لە ساڵدا، تا

خەڵکی تێدا هانبدرێت بگەڕێنەوە مزگەوت و لەسەر نوێژکردن و هامشۆی مزگەوتەکان بەردەوام بن، لەو مانگەشدا دامو دەزگاکانی راگەیاندن دەخرێنەگەڕ بۆ هاندانی هاولاتیانی ئێران تا رووبکەنەوە مزگەوتە چۆڵ و هۆڵەکان.. هەنوکە تەواوی مزگەوتەکانی ئەو ولاتە لە بەیانیاندا ١٠ نوێژکەر و لە نیوەڕوانیشدا ٢٠ نوێژکەری تێدا دەبینرێت، کەچی لە سەردەمی دەسەلاتی شاهنشادا مزگەوتەکان جمەیان دەهات.

تا ئێستاش فیدراسیۆنی کۆمەڵە ئیسلامیەکانی فەرەنسا کە سەر بە رێکخراوی ئیخوان موسلمینی نێودەوڵەتین، سورن لەسەر رەتکردنەوەی پرانسیپی ئازادی ویژدان و بیروباوەڕی قورئانی – عەلمانی..

بۆ زیاتر ئاشنابون و ئاگاداربون لەم مەسەلەیە کتێبی (عەلمانییەت لە گۆشەنیگایەکی جیاوازەوە) کە لە نوسینی "د. عەزیز ئەلعەزمەیە" و لەلایەن سەنتەری لێکۆڵینەوەی (الوحدة العربية – بيروت) لە چاپدراوە، بخوێنەرەوە.

## سەرچاوە

ئەو وتارە رۆژی دووشەممە بەرواری ١١ی ئۆگستۆسی ٢٠٠٣ لە رۆژنامەی (الراية القطرية) و (تۆڕی ئیلاف) لە ئینتەرنێتدا بلاوکراوەتەوە.

# ڕەخنەی سکیولاریی


کریستۆفەر نۆرس

لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید


**بەرایی**

ڕەنگــە باشـــترین ڕێگــا بـــۆ شــارەزابوون لـــەو جووڵەیەی کە لە مەیدانی ڕەخنەی ئەدەبیدا هەیە، بریتــی بێــت لــە گەڕانــەوە بــۆ چـاوگی مــەزنی ئــەو ڕەخنەیە لە کتێبەکەی سپینۆزا-دا *Spinoza* لە ژێر ناونیشانی "نامەیەک دەربارەی لاهوت و سیاسەت" *Theologico - political Treatise* (١٧٦٠)[1]. ئەم کارە هەموو ئەو بابەتانە دەوروژێنێ کە پەیوەندیدارن بە بابەتەکەمانـــــەوە، بــــەڵکو دەیگەڕێنێتــــەوە بـــۆ ئــەو ســـیاقەی کـــە پـــڕە لـــە دیـــالۆگی سیاســـی و ئایدیۆلۆجی و پەیوەندیدارن بە چەندین خاڵی ئەو بابەتانەی دەخرێنە ڕوو.. وەک:

١-مەســەلەی شــیکردنەوەی حەقیقــەت، یــان بــە مانایەکی دیکە توانای ئەدەب لە بەخشینی دیدێکی مەعریفی بە حوکم و تەفسیر، کە جیاوازە لە دیدە ئیستاتیکی و خەیاڵییە پەتیەکەی.

٢-پەیوەندیی نێوان ڕاڤەکردنی کتێبی پیرۆز و ڕەخنەی ئەدەبی عەلمانی، ئەو بابەتەی کە سپینۆزا وروژاندی و (ماتیو ئارنۆڵد ١٨٦٥-١٩٧٣) و (فرانک کیرمۆد *Frark Kermode*) و چەند کەسێکی تریش درێژەیان پێدا.

٣-دانانی ئەو تەفسیرانەی کە پشتئەستوورن بە گێڕانــەوەی چــیرۆک و هەڵوێســتیان لــە فەلســەفە و تیۆری سیاسی و مێژوو.

٤-ئاســتی ئــەو کاریگەرییانــەی کــە خــودی ئــەم پێوەرانــە وەریــدەگرن لــە مامەڵــەکردنیان یــاخود لــە ئاوێتــەبوونیان لەگــەڵ تەکنیکــەکانی خوێندنــەوەی ڕەخنەیی بەلاغی سۆرخکار *rhetorical close rediing* کە توێژەرانی ئەدەب پێی ئاشنان. بەر لە کۆتایی نوسینەکەشــم دیــدی خــۆم لــە ئاســت مەســـەلەی ڕۆمانەکـــەی ســـەلمان ڕوشـــدی دەردەبـــڕم (ئایەتـــە شەیتانیەکان *The satanic Verses* -١٩٨٨)، چونکە هێرشـــی فەندەمێنتالیســـتە ئاینیـــەکان[2] دژی ئـــەو ڕۆمانە زۆر بە ئاشکرایی لەو هێرشە دەچێ کە کرایە ســـــەر ســـــپینۆزا لـــــە لایـــــەن ئەندێشـــــەمەندە فەندەمێنتالیســـــــتەکانەوە، مەســـــــیحیەکان و جوولەکـەکان پێکـەوە. (هـەر بـۆ یادهێنانـەوە: سـاڵی ١٦٥٦ ســپینۆزا لــە پەرســتگای جوولەکــەکان لــە

ئەمستردام دەرکرا، هەروەها مۆرکی ئیلحاد و دەجەل خرایە پاڵ کتێبەکانی بەوەی "جولەکەیەکی یاخی لە دۆزەخدا ئەو کتێبانەی لەگەڵ شەیتاندا نووسیوە).

یەکێك لە لایەنە سەرەکیەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بریتیە لەوەی کە ڕەخنەی ئەدەبی لە پاڵ کۆششە فیکریەکانی چاخی ڕۆشنگەریدا *Enlightment* لەدایکبووەو گەشەی کردووە، کە ئامانجی بەو ئاڕاستەیەدا بوو سنوورێك بۆ پەلهاویشتنی دەسەڵاتی ئاینی و بزرکردنی ئەقڵ و گرنگیدان بە لاهوت دابنێ. واتە تیۆری ڕەخنەیی – ئەو چەمکە سانا و بەدەستەوە هاتووەی کە پەلی بەسەر هەموو قوتابخانە و هزرە پێکاهەڵپژاوەکاندا کێشاوە – نەدەگەیشتە ئەوەی کە ئەمڕۆ پێی گەیشتووە، گەر خاوەنی ئەو باکگراوندە مێژووییە نەبوایە کە سپینۆزا و بیریارە ئازادیخوازە هاوشێوەکانی لە ڕێگای کۆششە بوێرەکانیانەوە دایانمەزراند. پێویستە ئەم ڕاستیەمان لەیاد نەچێتەوە لە کاتێکدا کە بەهاکانی سەردەمی ڕۆشنگەری لەبەردەم هەڕەشەدان، نەك تەنها لەسەر دەستی فەندەمێنتالێستە ئاینیەکان، بەڵکو لەسەر دەستی بانگەشەچیەکانی سەردەمی پۆست مۆدێرنیزمیش، کە کەلەپوری ڕەخنەیی ئەقڵ ڕەتدەکەنەوە، بەو پێیەی وەك نیچە گوزارشتی لێکردووە جۆرێکە لە جۆرەکانی حەقیقەتی ستەمگەر کە خۆی بێگوناه و پاك نیشان دەدا (بڕوانە: ١٩٨٨، *Norris*). بەڵام بەهۆی بەرتەسکی ئەم دەرفەتەوە، من لە دوو توێی ئەم باسەدا داوا لە خوێنەر دەکەم بگەڕێتەوە بۆ بابەتەکانی وەك (تیۆری ڕاڤەکردنی دەقە پیرۆزەکان هێرمنیۆتیکا *Hermeneutics*، ڕەوتی مێژوگەریی نوێ *New Historicism*، شیتاڵگەری یاخود هەڵوەشاندنەوە *Deconstruction*، پاش بنیاتگەری و ڕەخنەی مارکسی و ...هتد)، بەو ئومێدەی کات و ئارەزوو فرسەتی زیاتر بدا. ئەم بەشە – وەك دیارە – نمایشکردنێکی وشك و ساردی بزاوتەکانی مەیدانی ڕەخنەی هونەری نییە، بەڵکو بەیەکگەیشتنێکی گەرمی هەموو بابەتە پەیوەندیدارەکانی وتووێژ و دیالۆگە تا ئەوپەڕی. بەهەرحاڵ من پێموایە ئەم جۆرە مەسەلانە لە گرنگترین ئەو بابەتانەن کە لە گۆڕەپانی ڕەخنەی ئەدەبی هاوچەرخدا هەن، بەجۆرێك ناکرێ لێیان تێبگەین بەبێ تێگەیشتنی دەروازە مێژویی و تیوریەکەی، کە دەسپێشخەری تیایدا دەگەڕێتەوە بۆ کارە پێشەنگەکەی سپینۆزا.

## ڕاڤەی دەقە پیرۆزەکان و ڕەخنەی عەلمانی

فرانك کیرمۆد لە کتێبێکیدا لە ژێر ناونیشانی (ئەفراندنی پەنهان *The Genesis of Secrecy* – ١٩٧٩)، دیدی خۆی دەخاتەڕوو بەجۆرێك زیاتر هانی وردبوونەوەمان دەدا، ئەو کتێبە لێکۆڵینەوەیەکە لە میتۆدەکانی ڕاڤەی دەقە پیرۆزەکان کە بۆ دەقی ئاینی و دنیاییش دەستدەدەن. کیرمۆد کە لە پێگەی کەسێکی بێلایەنی شارەزا بە دیوی ناوەوەی شتەکان دەنوسێ و هەڵوێستێکی ڕەخنەیی بەرامبەر ناوەڕۆکی کتێبی پیرۆز هەیە، سەرقاڵە بەو دیالۆگە بەردەوامەوە کە لە نێوان شیکردنەوەی فەندەمێنتاڵی و جۆرێکی دیکە لە شیکردنەوەدا هەیە کە ڕێگە بە داهێنان دەدا لە جۆری تێگەیشتندا و لە ئاست گوشارەکانی گۆڕانی کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆجیشدا توانای خۆگۆڕینی چالاکانەی هەبێ. لەم دۆخەدا گۆڕانێك یاخود لادانێك لە خوێندنەوەی پیشەیی *literal* (واتە ئەو خوێندنەوەیەی کە وەك میرات ماوەتەوە و لەلایەن کڵێساوە سەلمێنراوە) لە ئاستی دەقدا ڕوودەدا، خوێندنەوەیەکی دیکە دێتەگۆڕێ کە زۆر بە سانایی

پێکەوە گونجان لە نێوان دەقی پیرۆز و پێداویستیە هەنوکەییەکانی شیکردنەوەدا دەسازێنێ، کە لە ئەنجامدا ئەو نهێنیانە *Secrets* دەکرێنەوە کە سروشتێکی حیکایەتخوانی هونەرییان هەیە، یاخود ئەو مانایانە چنگ دەکەون کە لەو دەقە ئاڵۆز و شاراوانەدا هەیە کە بە نهێنی و خەسڵەتی تایبەتی بارکراون، بەجۆرێك کەسێك خاوەنی شارەزاییەکی تەواو نەبێت لە راڤەناسی و هێرمێنیوتیکا توانای ئاشکراکردنی ئەو نهێنیانەی نییە. کارلێکی نێوان خوێندنەوەی پیشەیی و خوێندنەوەی ئەدەبی، کێشمەکێشم و وتوێژێکی بەردەوام دەوروژێنێ سەبارەت بە دەقە کۆنەکان (دینیەکان و دنیاییەکانیش) بە تایبەتی لای خاوەن عەقیدە و کولتوورە جیاوازەکان. ئەمە خەسڵەتی هەموو کۆنێکی نەمرە *Classic* کە کیرمۆد پێناسەی دەکا بەو کارەی ماناکانی دەکرێنەوە بۆ پێویستیەکانی راڤەکردن و گوزارشتکردن لە هەموو چاخ و سەردەمێکدا، واتە تەنها دیدێك – ئیدی فەندەمێنتاڵی بێت یان نا – شارەزایی تەواوی تێدا پەیدا بکا، هەروەها ناتوانێ هەموو وزە شاراوە بارگەکراوەکانی سەرف بکا (بڕوانە: ١٩٧٥ و *Kermod*). ئەگەر دیدی فەندەمێنتاڵی بانگەشە بۆ ئەوە بکا کە بەگوێرەی وەحی یەزدانی، یان بەگوێرەی ئەو بەڵگانەی دەیهێنێتەوە، حەقیقەت *Truth* موڵکی خۆیەتی، ئەوا خاوەن دیدەکانی تریش ئەو مافەیان هەیە داوای ئەو دەسەڵاتە بکەن، یان لە رێگای چەند تێزێکی ئاڵتەرناتیڤەوە راڤەی واتاکان *Meanings*ی دەقەکان بکەن، واتە راڤەیەکی نوێ بخەنەڕوو بە زەینی ئەو کەسانەدا نەهاتووە کە خۆیان بە پاسەوانی کەلەپوور دەزانن، بەبێ ئەوەی خاوەن دیدێکی رەخنەگرانە بن.

لێرەوە، بەبڕوای کیرمۆد ئەو تەکنیکانەی کە لە بنەڕەتدا زانایانی بواری کتێبی پیرۆز بەکاریان هێناوە سەبارەت بە بانگەشەکردن بۆ قۆرخکردنی حەقیقەتی وەحی، پەڕیوەتەوە بۆ بواری لێکۆڵینەوە ئەدەبییە نائاینیەکانیش، بەجۆرێك رێگەی خۆشکردووە بۆ سەرهەڵدانی چەندین ئاراستەی پێکاهەڵپژاو لە مەیدانی تیوری رەخنەیی هاوچەرخدا، ئەم لێکچوونە زۆر بە ئاشکرایی دەبینین کاتێ گوتاری رەخنەیی پاش بنیاتگەری لە فەرەنسا دەخوێنینەوە، ئەو گوتارەی بایەخێکی زۆر دەدا بە: بەهای فرەواتایی *plural meaning*، خوێندنەوەی هەڵە تەنها لە پێناو دەربازبوون لە کۆتی پێشینان *reative misprision*[٣]، دەقئاوێزان[٤]، هەروەها بایەخدەدا بە پرۆسەی خوێندنەوە بەو پێیەی ئاوێتەبوونێکی ئیجابییە لەگەڵ شفرە و ئاماژەکانی دەقدا، کە شیکردنەوەی فەندەمێنتاڵی تەقلیدی لە توانایدا نییە ئەنجامی بدا (بڕوانە: ١٩٧٦، ١٩٧٥ و *Barthes*). بە بڕوای کیرمۆد لەم بەهایانە ناگەین تەنها لە رەوتی عەلمانی ئەو دەروازە تەقلیدیەدا نەبێ کە زانایانی بواری کتێبی پیرۆز بڕوایان پێیەتی کاتێ لە خوێندنەوەی ئینجیلەکاندا ئاماژە بۆ هاتنەدی *Fulfilling* پێشبینیەکی ئاڵۆزی تەورات دەکەن، یاخود دەرکەوتنی تەورات بە پێشبینی دەرکەوتنی مەسیح لە قەڵەم دەدەن. خوێندنەوەی هوشیارانەی دەقی پیرۆز جۆرە پرۆسەیەکی ئاڵۆزە کە رێگە خۆش دەکا بۆ تێگەیشتنی شفرەکانی و نزیکبوونەوە لە هێما و ئاماژەکانی" بەڵام خوێندنەوەی تەقلیدی پابەندە بەوەی کە ناوی دەنرێ کۆمەڵگای دەستنیشانکراو کە تەنها گروپێکی دیاریکراویش بڕوایان پێیەتی، رێگەش بە خۆی دەدا خاوەنی دیدێکی گشتی ئەوتۆ بێت کە چاوبپۆشێ لە ئاست ئەو کەلێنەی کە لە

نێوان شێوازەکانی بیرکردنەوە و هوشیاریدا هەیە لە ئێستا و رابردوودا (١٩٦٦ و *Charity*). رەنگە لە کاتەکانی ئارامی رێژەییدا کۆدەنگییەك لە ئاست رێچکەیەکی دیاریکراودا هەبێت کە بنەماو وردەکاریەکانی دیالۆگ دەستەبەردەکا، زۆر بە توندیش هەموو خوێندنەوەیەکی پەراوێزکراو یان لە رەوت دەرچوو رەتدەکاتەوە. بەڵام زۆرجار لە سەردەمەکانی داپڵۆسینی سیاسی و ئاینیدا گرێبەستی ئەو کۆدەنگییە لێکدەترازێ، شێوازەکانی خوێندنەوە و شیکردنەوە هەموویان دێنە گۆڕێ و تێکەڵی یەکدی دەبن، ئیدی بنەماکانی دیالۆگ بە پێچەوانەی چاخەکانی ستەمکاری سیاسی و داپڵۆسینی ئاینییەوە هەموو خوێندنەوە جیاوازەکان لەخۆ دەگرن.

تەوەری سەرەکی ئەم دیدەی کیرمۆد لەوەدا پوخت دەبێتەوە کە ئێمە لە پنتەکانی زیندویی کەلەپوور ناگەین (واتە لە دینامیەتی پێوەرەکانی پێکهاتەی کەلەپوور ناگەین) گەر لەو ناهاوسەنگییە بەردەوامەی نێوان هوشیاری تەقلیدی و هوشیاری داهێنەرانە نەگەین، هەروەها ئەوەش دەڵێ کە "تەوەری شیکردنەوەی هاوچەرخی کتێبی پیرۆز لەو بۆچوونەدا دێت و دەچێ کە دەڵێ ئەقڵی بەهێز لەگەڵ نوسراودا مامەڵە دەکا لەسەر حسابی ئەو بابەتەی لەسەری دەنوسرێ" ( *Kermode, 1979, P. 119*). سپینۆزا-ش خوازیار بوو شتێکی لەمجۆرە ئەنجام بدا، ئەو لە سەردەمی خۆیدا توانی پەیوەندی زۆر پیرۆزی نێوان دەلالەتی دەق و حەقیقەتی وەحی بپسێنێ، لەوێشەوە رەخنەی کردە پرۆسەیەکی ئازاد و کراوە بە رووی هەموو بابەتێکدا دوور لە هەر دەسەڵات و هەر دەستێوەردانێکی پاسەوانەکانی کەلەپوری ئاینی: "هەرچەندە سپینۆزا جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە کتێبی پیرۆز دەقێکی یەزدانی رەسەنە، بەڵام لە ئاستی تێگەیشتنی مرۆڤدایە، ئەو مرۆڤەی دوای بیرکردنەوە و تاوتوێکردن بڕوا بە ناوەڕۆکەکەی دێنێ، بەڵام نابێ ئەوە لەگەڵ حەقیقەتی وەحیدا تێکەڵ بکرێ چونکە تێگەیشتنی دەلالەتی کتێبی پیرۆز شتێکە و تێگەیشتنی ئەو حەقیقەتە شتێکی ترە. پێنج سەدە لە راڤەکردنی ئەقڵانی لە پشت سپینۆزا-وە بوو، بەڵام ئەو لە گەرمەی مەسەلەکانی سەردەمەکەی خۆیدا دەژیا. دەیزانی کە تێکەڵاوکردنی شیکردنەوەی دەقی پیرۆز لەگەڵ حەقیقەتی رەهادا دەبێتە هۆی خنکاندنی ئازادی ئاینی، بەم شێوەیە کتێبە بەهادارە ئاینیەکەی سپینۆزا لە ساڵی ١٦٧٠دا وەك کتێبێکی دژ بە ئاین دەرکەوت، ئەو رەوتە سەلەفییەش سەرکەوت کە توانی حەقیقەت زاڵ بکا بەسەر دەلالەتدا – ل: ١١٩".

ئەڵبەتە ئەمە یەکێك بوو لە هۆکارەکانی شێواندنی وێنەی سپینۆزا لای مەسیحیەکان و جولەکەکانیش. بەڵام کاتێك کیرمۆد یەکسانییەك دەسازێنێ لە نێوان "حەقیقەت *Truth*" و حەقیقەتی وەحی ئاینی – واتە حەقیقەتی وشەکانی یەزدان کە تایبەتە بە دەستەبژێرێك لە راڤەناساناوە – چاوپۆشی لە جۆرێکی دیکە لە حەقیقەت دەکا کە بە بڕوای سپینۆزا ئامانجی هەر لێکۆڵینەوەیەکی فەلسەفییە، کە پتەوترین ئامرازەکانی رەخنەگرتن لە نەریتە هەڵەکانی باوەڕ لەخۆدەگرێ. لێرەوە وەك دەردەکەوێ کیرمۆد ئەو دژبوونە ناوەکییە ناسەلمێنێ کە لەم زاراوەیەدا هەیە و لە سیاقی دەقەکەی سپینۆزا دەریهێناوە. چونکە حەقیقەت لەلایەکەوە دەرفەتێکی گریمانەییە کە دراوە بە زۆربەی راڤەناسان (پیاوانی ئاینی و زانایانی تەفسیر) بۆ سەپاندنی دەسەڵاتی خوێندنەوەکانیان بۆ دەقی پیرۆز بە گوێرەی ئەو مۆڵەتە یەزدانییەی

پێیان دراوه" لە لایەکی دیکەشەوە هێمایەکە بۆ توانای ئەقڵ بۆ تاقیکردنەوەی راستی و دروستی ئەو شیکردنەوانە، جا ئیدی سەرچاوەی ئەو شیکردنەوانە هەر شتێك بن، واتە گونجاندنیان لەگەڵ تواناکانی ئەقڵدا. ئەگەر نا ئەوا ناتوانین بەرەنگاری باڵادەستی دیدی تاکڕەوانە یان ئەو باوەڕە کوێرانەیە ببینەوە، کە بە بڕوای سپینۆزا زۆرجار زادەی تێکەڵاوکردنە لە نێوان دەلالەتی دەق و حەقیقەتی رەها.

ئەمەش یارمەتیمان دەدا تا لە سەرنجی هەندێ لەو کەسانە بگەین کە لەسەر کارەکانی کیرمۆد نوسیویانە لەو کاتەوەی کە کتێبی (ئەفراندنی پەنهان)ی داناوە، بە تایبەتی لەو راڕاییە دەگەین کە بەکارەکانیەوە دیارە لە دیاریکردنی ئەو فاکتەرانەی کە خوێندنەوە رەخنەییەکانی ئەویان جڵەوکردووە: ئایا ئەو فاکتەرانە زادەی فشاری دەزگا دەسەڵاتدارەکانن، یان رۆحی بەرەنگاربوونەوەی ئەو گۆڕانکارییەی کە بەرەنجامی فۆرمە فیکرییە باوەکانن کە هەموان لەسەری کۆکن؟ زۆرجار ئەو رەخنەیەی ئاڕاستەی کیرمۆد دەکرێ بەرگێکی ئایدیۆلۆجی بەبەردا دەکرێ، بەو پێیەی گومان لە بێگەردی تێزەکانی ئەو دەکەن و بە بڕوای هەندێکیشیان ئەو بە دەستی ئانقەست هەڵوێستی خۆی یەکلایی ناکاتەوە، لەلایەکەوە شەیدای هزرە پێشکەوتوخواز و رادیکاڵەکانی قۆناغی پاش تیوری بنیاتگەرییە، لە لایەکی دیکەشەوە بە جۆرێك لە جۆرەکان وابەستەی کەلەپوورە. یان بە دەربڕینێکی تر و دوور لە تێکەڵاوکردنی زاراوەکان: کیرمۆد لە یەك کاتدا بڕوای بە بەردەوامبوونی "کۆن" و چەقبەستنی کۆنیش هەیە. (بڕوانە: ١٩٨٧ و *Arac*). رەنگە مرۆڤ — لە روانگەیەکی سۆزدارییەوە — هەوڵبدا ئەوە بسەلمێنێ کە کیرمۆد سەرگەرمی پرۆژەی تیۆرێکی رەخنەییە بۆ سەرلەنوێ ئاشکراکردنی بەهای دەقەکان لە رێگای ئاشکراکردنی فرەواتایی ئەو دەقانەوە کە دەکرێ شیکردنەوەی زۆر تازەیان بۆ ئەنجام بدرێ. من لای خۆمەوە ئەم بابەتە یەکلایی ناکەمەوە، هێندەی مەبەستمە دەربارەی هەڵسەنگاندنی کیرمۆد بۆ کۆششەکانی سپینۆزا بپرسم کە پێش نەختێ پوختم کردەوە. بە بڕوای من ئەوەی کیرمۆد لەو بارەیەوە زیادی کردووە، واتە لە بارەی جیاکردنەوەی حەقیقەت و چەمکی دەق لەگەڵ دەلالەتی دەقدا، "حەقیقەت" دەخاتە پاڵ دەسەڵات و کەلەپور و باڵادەستیی دەزگا رەسمیەکان، لە کاتێکدا دەلالەتی دەق وابەستەی ئازادیی و بوێریی راڤەکارە لە بەرەنگاربوونەوەی هەموو ئەو شتانەدا، هەروەها وابەستەی خوێندنەوەی دەقەکانە لەبەر رۆشنایی بایەخە مێژویی و کولتوریە جیاوازەکان" دواتر "کۆن" — یان ئەو شتەی زاراوەی کەلەپووری بۆ بەکاردەهێنرێ — بە دوورە لەوەی ببێتە تەنها دروشمێك بۆ خزمەتکردنی سیستمێکی ئایدیۆلۆجی بەرتەسك. کیرمۆد بە جۆرێك تەماشای حەقیقەت دەکا وەك ئەوەی شتێکی پارێزراو بێت و گەنجینەی هەموو ئەو بەهایانە بێت کە بەرەنگاری کات و هەموو گۆڕانکاریەکان دەبێتەوە" بەڵام "دەلالەتی دەق" ئەو ئاستەیە کە هەموو فۆرمەکانی ئایدیۆلۆجیای بەرتەسك و هەموو ئاستەنگەکانی ئازادیی شیکەرەوە رەتدەکاتەوە، وەك ئەوەی باوەڕێکی کوێری بە حەقیقەتە رەهاکان هەبێت.

رەنگە هەڵوێستی کیرمۆد، لەم روانگەیەوە، لە هەڵوێستی رەخنەگرێکی یاخی دیکە بچێ کە ئەویش (هارۆڵد بلووم)ە *Harold Bloom* کە پێی وایە باشترین و کاریگەرترین خوێندنەوە ئەوەیە کە دەچێتە ململانێیەکی سەختەوە لەگەڵ دەقە

رەسەنەکاندا، هەروەك شاعیرەکان ئەنجامیان داوە (بۆ نموونە ململانێی ئۆدیب لەگەڵ شایەتەکانی تراجیدیاکەیدا). ئەوەش خوێندنەوەیەکە دەتوانێ ئیدعای ئەوە بکا کە رووبەڕووی جیهانی فەنتازیی دەق بۆتەوە و خاوەنی جیهانبینیەکە کە خوێندنەوەی تەقلیدیی توێژەرە فەندەمێنتاڵیستەکانی تێپەڕاندووە (بڕوانە: ٨٢ و ٧٦ و ١٩٧٣ و *Bloom*). بەڵام کیرمۆد جیاوازییەکی زۆری لەگەڵ بلووم –دا هەیە، چونکە ئەو پێی وایە چەندین ئاستەنگی بەهێز هەن کە رێ لە جێبەجێکردنی ئەم پرۆژە رەخنەییە بوێرانەیە دەگرن، لەوانە فۆرمەکانی "باڵادەستیی دەزگاکان و دەسەڵاتی رەسمی"، کە خاوەنی دیدێکی کورتبین و تێگەیشتنێکی دیاریکراون لە ئاست شیکردنەوە نوێیەکاندا. لەم خاڵەدا کیرمۆد لەگەڵ ستانلی فیش *Stanley Fish* هاوڕایە، بەوەی رەخنە پرۆژەیەکی باوی تێگەیشتنە کە پێویستی بە ئەندازەیەك لە پەیوەندیی و بەردەوامی (یان جیاوازی لەگەڵ خاڵە جێگیرەکان) هەیە، تەنانەت لەم سەردەمەی ئێستاشدا ئەو هەر دژی شتە جێگیرەکان دەوەستێتەوە و گومان لە هەر شتێکی بۆماوە دەکا (١٩٨٩ و ١٩٧٩ و *Fish*). بە کورتی کیرمۆد لە ئاست ئەم مەسەلەیەدا و لە هەڵبژاردنی یەکێك لەو دوو ئەگەرە خۆی بە دوور دەگرێ، چونکە هەردوکیان رۆڵێکی زیندوویان لە شیکردنەوە و رەخنەدا هەیە. مرۆڤ ناچارە بابەتەکە پوخت بکاتەوە چونکە هاوڕای (کیرمۆد)ە لەوەی کە واتا بەرهەمێکی پەتی شفرەکان و هەموو شیکردنەوەکانی کەلەپوورە، یان وەك زانایانی هیرمنیوتیکا دەڵێن خاڵی هاوسەنگی تاهەتاییە لە نێوان ئەوەی کە کەلەپوور لێی گەیاندووین و ئەوەی خوێنەرانی کۆمەڵگای هاوچەرخ مەبەستیانە و هەوڵدەدەن سەرلەنوێ لە کەلەپوور بگەن (بڕوانە: ١٩٧٩ و ١٩٧٥ و *Gadamer*). لێرەوە دەردەکەوێ کە هەموو شیکردنەوەیەکی نوێ و هەموو بەرەنگارییەك لەگەڵ ئەمری واقعی دەسەڵاتی رەسمیدا، پێویستە لەگەڵ نەریتەکاندا خۆی بگونجێنێ، تاوەکو ئەو خوێنەرە شایستانەی قسەیان لەو بارەیەوە هەیە لە مەسەلەکە بگەن.

ئەڵبەتە بە تەنها کیرمۆد خۆی لەم کێشەیەوە نەگلاندووە، بەڵکو لە راستیدا مەسەلەکە ئەڵقەیەکە لە ئەڵقەکانی "بازنەی راڤە"[(٥)] کە فەیلەسوف گەلێکی وەك هایدگەر *Heidegger* و گادامێر *Gadamer* باسی لێوەدەکەن، بەوەی راڤەکاری لە هەناوی سیاقێکی کولتووری دیاریکراوەوە سەرچاوە دەگرێ کە بارکراوە بەو ئایدیۆلۆجیا و بەهاو بایەخە مەعریفیانەی کە مەحاڵە بە تەواوی تەعبیریان لێبکرێ یان ببنە بابەتی لێکۆڵینەوەیەکی رەخنەیی بوێرانە، چونکە ئەو ئایدیۆلۆجیا و بەهایانە پشتئەستوورن بە خەسڵەتگەلێك کە لێیان جیانابنەوە، بە جۆرێك سەختە کارلێکیان لەگەڵدا بکرێ ئەگەر لەسەر بنەمای لێکگەیشتنی هاوبەش نەبێ (١٩٦٩ و *Palmer* – ١٩٧٩ و *Hoy*). ئیدی دەق ناتوانێ بە توندی بەرەنگاری ئەو بەهایانە ببێتەوە کە بەهای باون، یان خوێندنەوەیەکی رەخنەیی تازە بێنێتە گۆڕێ کە ئەویش توندوتیژ بێت و بەرەنگاری پێوەرە رەسمییە باوەکان ببێتەوە. واتە ناکرێ بەها باوەکان لە رێگای ئاڵتەرناتیڤێکی ئەقڵانی رۆشنگەرانەوە رەخنەبکرێ، چونکە دۆخێکی لەو جۆرە راپێچی بانگەشەیەکی درۆمان دەکا بەوەی بیرکردنەوەی ئازاد خاوەنی رێڕەوێکی مەعریفی و خاوەن دیدی سەربەخۆیە کە جیاوازە لەو ئایدیۆلۆجیا و واتا و خەسڵەتانەی کە ژیانێکی کولتووری دیاریکراو فۆرمەلە دەکەن و تایبەتمەندی

پێدەبەخشن. لێرەوە وەك لە خوێندنەوە رەخنەییە کۆنەپارێزەکاندا بەدی دەکرێ دەگەینە ئەو دەرەنجامەی کە هەموو دیدێکی رەخنەیی بێهودەیە گەر خاوەنی هێزی قەناعەت پێهێنان نەبێت (چونکە هەموو نەریتێکی گونجاو بەکەم دەگرێ)، یان ناچارە سازش لەسەر ئەو مەرجانە بکا کە پێشتر بڕیاریان لەسەر دراوە و لەلایەن ئاڕاستەیەکی رەخنەیی دیاریکراوەوە سەپێنراون. ئەگەر دیدی چەند بیریارێکی وەك گادامێر راست بێت بەوەی کە تێگەیشتن و پەی بردن بە شتەکان تەنها لە بازنەی راڤەکردندایە و پشتئەستوورە بە تایبەتمەندییە مەعریفییە شاراوەکان، ئەوا ناکرێ وێنای ئەوە بکەین کە چۆن خوێندنەوەی رەخنەیی لە هزر و بۆچوونە باوەکان دەترازێ، یان چۆن لە ئاست ئەو باوەڕە خۆڕسکەی کە لە دەروونی مرۆڤەکاندا رەگی داکوتیوە چاودەپۆشێ.

بە کورتی فەلسەفەی (بازنەی راڤە) خۆی دەخزێنێتە زیندانێکەوە کە خۆی بنیاتی ناوە، چونکە بوارێك بۆ رۆڵی بەهاکانی حەقیقەت و ساختەیی نامێنێتەوە، لە کاتێکی وادا دەست بەو عەقیدەیەوە دەگرین کە بۆ خۆمان سوودی هەیە، بەڵام هەمیشە ئەو بەڵگە ئەقڵیانەمان لێدەشارێتەوە کە رووبەڕووی دەبێتەوە.

لێرەدا دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ ئەو دەقەی کە لە کیرمۆد وەرگیراوە، تا ئەو هەڵەیەی سپینۆزا دەستنیشان بکەین کاتێ داوای دارشتنی تیۆرێکی نوێی کرد لە راڤەکاریدا کە باس لە پەیوەندیی نێوان دەلالەتی دەق و حەقیقەت دەکا. لە راستیدا خودی کیرمۆد گومان لەو داوایەی سپینۆزا دەکا و دەڵێ: "سپینۆزا ئەوەی دەرخستووە کە پرۆسەی شێواندنی دەلالەت لە پێناو گونجاندنی لەگەڵ ئەو دەلالەتەی کە باوە کارێکی نەشیاوە، دواتر لەو بارەیەوە رەخنە لە موسا بنمیمون[٦] دەگرێ کە پێشینێکی بەناوبانگی ئەوەو هەمان تۆمەتی دەخاتە پاڵ کە پێی وایە لە پێگەی ئەقڵ کەم دەکاتەوە و جۆرێك لە فاشیزمی سیاسی دێنێتە گۆڕێ" (*Kermode, 1979, P. 119*). دواتر پێویستە مرۆڤ لەخۆی بپرسێ: داخۆ ئەو پێوەرە چیە کە لە رێگایەوە حوکم بەسەر خوێندنەوەدا دەدەین بەوەی دەق دەشێوێنێ تا لەگەڵ واتای باودا بگونجێ؟ ئایا رەخنەی سپینۆزا لە موسا بنمیمون لە کتێبی (نامەیەك دەربارەی لاهوت و سیاسەت) لەو دیدەوە سەرچاوە دەگرێ کە هەموو شیکەرەوەیەکی کتێبی پیرۆز پێڕەوی دەکا، ئەو دیدەی کە لە خاڵی ئیدعاکردنی مافی راڤەوە دەستپێدەکا — هەمان ئیدعای فەندەمێنتاڵ کە لە مەسەلەکانی عەقیدەو شەریعەدا دەکرێن — بەڵام هێندە نابا چەند هەوڵێکی زیرەکانە دەخاتەگەڕ بەمەبەستی ملپێکەچکردنی دەق لە ئاست دیدێکی مەبدەئیدا کە بێلایەن نییە، هەر لەو روانگەیەشەوە رەخنەی لە "کابالیستە زیادەڕۆکان"[٧] دەگرت، ئەوانەی کە بە بڕوای سپینۆزا هیچ ئیش و کارێکیان نەبوو جگە لە لێکۆڵینەوەی شێواو و هەڕەمەکی لە دەلالەتی ئەدەبی کتێبی پیرۆز، لە کاتێکدا ساناترین یاسا بەراییەکانی لێکۆڵینەوەی مێژویی دەقیان پێشێل دەکرد. بەو کارەشیان توانیان لە بەرەنگاری دەق خۆیان دەربازبکەن و ئاستەنگ و جیاوازی و ئاستە پچڕپچڕەکانی سیاقی گێڕانەوە تێبپەڕێنن (وەك لە زۆربەی سەرچاوەکانی تەورات و ئینجیلەکاندا بەدی دەکرێ)، بەڵام ئەو تەواوی میتۆدەکەیانی خستە بەر گومانەوە.

سپینۆزا بە پێچەوانەوە پێی وایە شیاوترین دەروازە بۆ شیکردنەوەی دەقەکانی کتێبی پیرۆز بریتیە لە ئیجتهاد بە دیدێکی ئەقڵانی لۆجیکیەوە بە

مەبەستی سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی، واتە شێوازی هاتنەئارای ئەو دەقانە شیبکرێتەوە – بە دیاریکردنی دۆخە مێژوییەکانی دەقەکان و ئاستی باوەڕ و پێداویستی خەڵکی بۆیان و.. هتد – لە پێناو دەستنیشانکردنی هۆکارەکانی بەکارهێنانی ئەو تەکنیکە خەیاڵیانەی کە لەگەڵ ناوەڕۆکی ئەو پەیامەدا ناگونجێ کە بانگەشەی بۆ دەکەن. ئەمەش ئەوە دەخوازێ ئەقڵ رۆڵێکی چالاك بگێڕێ لە پرۆسەی ڕاڤەی رەخنەییدا تاوەکو لە دوو ئاڕاستە جیاوازەکەی فیکری رەخنەیی هەردوو قوتابخانە گەورەکە دووری بخاتەوە. چونکە سپینۆزا لەلایەکەوە پێی وایە کە ئەقڵ لە توانایدا هەیە (راڤەکاری) لە بانگەشەی مۆنۆپۆلکردنی حەقیقەت و راستگۆیی بپارێزێ، ئەو بانگەشەیەی کە هەوڵەکانی دەربازبوون لە کۆتی کەهەنوت (پیاوانی ئاین) لەباردەبا کە درۆ و راست تێکەڵی یەکدی دەکەن، بەوەی ئیدعای خاوەندارێتی دەسەڵاتێك و دیدێکی فەندەمێنتاڵ دەکەن کە لە سروشتێکی یەزدانییەوە سەرچاوەی گرتووە و تایبەتە بە دەستەبژێرێکی پیاوانی کەهەنوت، لێرەدا سپینۆزا سەرکەوتنێکی تەواوی بەدەستهێنا کاتێ داوای کرد مەسەلەکانی حەقیقەت – واتە راستگۆیی – لە میتۆدەکانی راڤە جیابکرێنەوە. بەڵام لەلایەکی ترەوە بە پێچەوانەی کیرمۆد –ەوە بە توندی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ڕەخنە ناتوانێ بەرەنگاری ئەو ئیدعا ساختانە ببێتەوە لە مۆنۆپۆلکردنی حەقیقەتدا ئەگەر میتۆدی ئەقلانیتر و رۆشنگەرانەتر لە راڤە و شیکردنەوەدا پێڕەو نەکرێ. ئەگەر نا، ئەوا بیرکردنەوە لە بازنەیەکی بۆشدا دەخولێتەوە، تەنها ئەو شتە دەسەلمێنێ کە لای خۆی دەستدەکەوێ، هیچ شتێك نابیستێ جگە لە زرنگانەوەی ئەقڵی خۆی، واتە خۆی لە "بازنەی راڤە"دا گیر دەکا، ئەو بازنەیەی کە دەقەکان بەگوێرەی ئەو راڤانە دێنێتە قسە کە لایەنگیرییەکی پێشوەخت سەپاندوویەتی. ئەو لایەنگیرییە جۆرێك لە باوەڕی پێشوەخت بە چەند دیدێکی فەندەمێنتاڵی بەڵگەنەویست و چەسپیو لە میتۆدی راڤەدا دێنێتە ئاراوە، کە دەسەڵاتەکانیان لە شەریعەت و نەریتەکانەوە وەرگرتووە، هەروەها (کارێکی وادەکا) کە بە چاوی رێزەوە تەماشای "حەقیقەت" بکرێ و –بەشێوەیەکی هەڵە– یەکسان بکرێتەوە بە وشەی یەزدانی پیرۆز. بەڵام لایەنگیریی پێشوەخت تەنها لەو دیدە سەلەفییە وشکەدا نییە، بەڵکو خەسڵەتی ئەو دیدە پێچەوانەیەشە کە باوەڕە بەڵگەنەویستە فەندەمێنتاڵەکان رەتدەکاتەوە، هەروەها هەندێ جار خەسڵەتی ئەو خوێندنەوە رەخنەییە تەحریفیەیە کە نکوڵی لە هەموو شتێك دەکا بە بیانووی ئازادی لە دامەزراندنی تیۆرێکی راڤەی نوێ. ئیدی ناتوانرێ لە راڤەکردنی دەقەکاندا هەڵپەی ئەو جۆرە لایەنگیرییە پێشوەختە جڵەو بکرێ کە لە پشت دەمامکی ئازادییەوە خۆی حەشارداوە، ئەوەش هیچی لێ سەوز نابێ جگە لە زیادەڕۆیی لە ئیدعای خاوەندارێتی بەهاو واتا و قۆرخکردنی حەقیقەت.

سپینۆزا دوو هەڵوێستی دژبەیەك وەردەگرێ، کاتێ پێی وایە کارێکی سەختە حەقیقەت و کۆششەکانی جامکردن و بزرکردنی ئەقڵ لێکبدرێن، چونکە حەقیقەت هانمان دەدا هزر بەگەڕخەین و باوەڕ نەهێنین بەو شتانەی کە لە کتێبی پیرۆزدا هاتوون تا ئەو کاتەی هەموو بەڵگەکانی لە تەرازوی ئەقڵی رەخنەیی دەدەین. ئەم هەڵوێستەی بە ئاشکرا لە هەموو کتێبەکانیدا بێ جیاوازی روون کردۆتەوە" مۆرکێکی تایبەتی بەخشیوە بە دیدی ئەو لە

شیکردنەوەی کتێبی پیرۆزدا، لەمبارەیەشەوە جەخت لەسەر دوو خاڵ دەکاتەوە:

یەکەم: دەقەکان بخوێنرێنەوە بە مەرجێ ئەوە لە یاد نەکەین کە چەندین دژبوونی ناوەکی و شتی پووچی تێدایە بە جۆرێك کەس گومانی لەسەر نییە، واتە ئەو بابەتانەی کە ئەقڵ سەرلەبەریان رەتدەکاتەوە.

دووەم: پێویست ناکا چاو لەم مەسەلانە بپۆشین بە بەڵگەی ئەوەی پەیوەندی بە وەحی یەزدانییەوە هەیە، بەڵکو پێویستە بیانگەڕێنینەوە بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەو سەردەمەی کە دەقەکانی تێدا نوسراوەتەوە.

بە کورتی سپینۆزا هیچ جۆرە تایبەتمەندییەك شك نابا کە لەو جۆرە چێژە رەخنەییەدا هەیە و لە ئامێزی راڤەکردنی دەقەکانی کتێبی پیرۆزدا پەروەردەکراون، کە تاوەکو ئێستا کاریگەرییەکەی بە دەمارەکانی رەخنەی ئەدەبی عەلمانی هاوچەرخدا دێت و دەڕوا. ئەو چێژەی کە هەروەك کیرمۆد دەڵێ دەکرێ لە چەند زاراوەیەکی رەخنەیی بنەڕەتی و باودا سۆراخی بکەین وەك (ئاڵۆزی و فرەواتایی، یان ئەو مانایەی کە چەند روویەکی هەیە *ambiguity*[٨]، هاودژی دیار *Paradox*[٩]، تەوس *irony*[١٠]، دەقئاوێزان، بەدخوێندنەوە.. هتد، لە ماوەی زیاتر لە پەنجا ساڵی رابردووشدا هەموو ئەم زاراوانە ببوونە بەشێك لە گوتاری رەخنەیی.

ئەگەر بەدیاریکراوی تەماشای سپینۆزا بکەین وەك موژدەبەخشێکی دیاری ئاڕاستەکانی تازەگەری لە تیورەی راڤەسازی (هیرمینیوتیکا) و فەلسەفەی مۆدێرنی ئەو تیورەیە، ئەوا تەنها زرنگانەوەی ئەو فیکرە هاوچەرخانەی ئێستامان بەرگوێ دەکەوێ کە کارەکانی لە سیاقی راستەقینەی خۆیان بەتاڵ دەکاتەوە. ئەمەش هەمان مەسەلەیە کە کاتی خۆی سپینۆزا هوشیاریی لە بارەوە دا، کاتێ بانگەوازی بۆ ئەوە کرد پرۆسەی راڤەکاری و شیکردنەوە لە سەفسەتەبازی بپارێزرێ، واتە بەتاڵکردنەوەی ئەو وزانەی کە سیاقی نوێ دادەتاشن و بە فێڵ و تەڵەکە سەرنجی خوێنەر پەرت دەکەن، لەبری ئەوەی سەرنجی لەسەر دیدێکی ئەقڵانی بۆ دەقە پیرۆزەکان چڕ بکاتەوە.

پاشان سپینۆزا گومانی لە موعجیزەکان، پێشبینیەکان، دەرکەوت و حاڵەتە ناسروشتیە غەیبییەکان و هەموو وێنە گومانبەخشەکانی باوەڕ هەبوو، کە خرابوونەگەڕ لە پێناو راکێشانی ئەقڵە ساویلکەو نەزانەکان، لە کاتێکدا هاوتای هیچ حەقیقەتێکی ئەقڵانی نەبوون. کاتێك شیکەرەوەکانی دەقی پیرۆز لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا هەوڵدەدەن ئەو وێنانە لەگەڵ پێداویستیەکانی راڤەکاریدا بگونجێنن ئەوا هەوڵی گومڕایی کردنی خەڵك دەدەن، چونکە لە کۆمەڵگا هاوچەرخەکاندا تاکەکان بەهیچ جۆرێك ئەو جۆرە فێڵانە بۆ قەناعەت پێهێنان قبووڵ ناکەن. بە گشتی دەتوانین ئاخاوتنی کتێبی پیرۆز بە گوێرەی دید و بۆچوونی پێشوەختی خۆمان تەفسیر بکەین، هەندێ جار بەگوێرەی هەڵگێڕانەوەی واتا ئەدەبیەکان تاوتوێی بکەین، هەندێ جاریش بە تەواوی گۆڕانکاری تێدا ئەنجام بدەین، تەنانەت گەر روون و رەوانیش بێت (*Spinoza, 1670, 1884 a, vol. 1, p. 117*). بەڵام ئەم دەروازەیە دەروازەیەکی درۆ و سەرچاوەی چەندین هەڵە و گومڕاییە" چونکە ئاستە باڵا و جدیەکانی تەفسیر دەگۆڕێ بە ئاستی نزم و سانا – واتە بەشێوەیەکی دڵڕفێن و سەرنج راکێش دەقەکان تەفسیر دەکات – بەڵام ئاستی باڵای تەفسیر پێویست دەکات دەقەکان لە سیاق و دۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی خۆیاندا شیبکرێنەوە. ترسناکی و سەرنجڕاکێشی ئەم جۆرە میتۆدە

لەوەدایە کە هەڵگری ئاسۆگەلێکی تازەی خوێندنەوەی رەخنەییە، کە لەگەڵ شیکردنەوەی فەندەمێنتاڵدا کێبڕکێ دەکا و بەرەنگاری دەبێتەوە" بەڵام خۆی لە خۆیدا جۆرێك لە "لابەلابردن" تێدایە، یان جۆرێك لە لادان لە دەلالەتە ئەدەبیەکەی، کە دەشێ هەموو پرسیارێکی جدی لە حەقیقەتی کتێبی پیرۆز لەباربەرێ و رێگا لەبەردەم پشتیوانان و بانگەشەچیانیدا دابخات.

کەواتە بە دڵنیاییەوە سپینۆزا — وەك کیرمۆد ئومێد دەکا — ناڵێت: پێویستە خوێندنەوەیەکی رەخنەیی و تازەی ئەوتۆ هەبێت کە خۆی لەگەڵ تەفسیری کۆندا بگونجێنێ و لە رێگای پێداچوونەوەیەکی رەخنەییەوە هەوڵبدا وردەکاریە دژەکان پێکەوە کۆبکاتەوە و قسە بێبناغەکانی شەرعیەتی رەها، یان "حەقیقەت" وەلابنێ. ئەو دەخوازێ شیکردنەوە و تەفسیر لە بانگەشەی حەقیقەتی چەسپیو ئازاد بکا، بەوەی کتێبی پیرۆز وەك گەنجینەی رێنماییەکانی یەزدان تەماشا بکرێ کە بۆ هەموو سەردەمێك دەستدەدا. ئەو کەسانەشی کە لە تەفسیردا ئەم میتۆدە پەیڕەودەکەن ئیفلاسی خۆیان و بێدەسەڵاتیان لە بەرەنگاربوونەوەی فریوەکانی تەفسیری خاوەن مەبەست و لایەنگیریی پێشوەخت رادەگەیەنن، ئەو تەفسیرەی هەمیشە پاڵپشتی لە رێنماییەکانی کەنیسە کردووە و لە هەموو سەردەمێکدا خۆی لەگەڵ دەسەڵاتدا گونجاندووە. ئەڵبەتە سپینۆزا خوازیار بوو دەسەڵاتی حەقیقەتی چەسپیو بخاتە بەرگومان، چونکە ئەو بانگەوازی بۆ ئازادکردنی کتێبی پیرۆز لە رێنماییەکانی کەسانێك دەکرد کە ئیدعای وەرگرتنی وشەکانی یەزدان و زانستی کتێبی پیرۆزیان دەکرد لە رێگای کۆششی غەیبی و دیدی راڤەگەرییەوە.

هەموو ئەو شتانە بەدیاریکراوی سپینۆزا–ی هاندا کە لە رێگای چەند ئامڕازێکی دیکەوە بە دوای حەقیقەتدا بگەڕێ، لەو رێگایانەش: زانیاری قووڵ لە یاساکانی زمان، رەخنەی مێژویی، توێژینەوەی ورد و بەراوردکار لە نێوان سەرچاوەی دەقە پیرۆزەکان، شیکردنەوەی دەزگا کۆمەڵایەتیەکان و ناوەرۆکی سیاسی عەقیدەی ئاینی و هەموو ئەو شتانەی پەیوەندییان بە توێژینەوەی رەخنەییەوە هەیە کە توانای هەڵسەنگاندنی بابەتییان هەیە. ئەو پێی وابوو گەربێتو بەدوای راڤەکردنی کتێبی پیرۆز بکەوین بەبێ لقەکانی دیکەی توێژینەوەکە، ئەوا جارێکی تر دەکەوینەوە هەمان بازنەی بەتاڵ و پڕشکست کە زادەی دەسەڵات و دەزگا رەسمیەکان و شتە یاساغەکانە، لەکارخستنی شێوازەکانی بیرکردنەوە و خوێندنەوەی رەخنەیی باویش دەبێتە هۆی لەدایکبوونی میتۆدێك کە پرۆسەی راڤەکردنی دەقە پیرۆزەکان دەشێوێنێ. بەگشتی هەر دەروازەیەك بۆ هەڵسەنگاندن و راستکردنەوە، پێویستی بە لەبەرچاوگرتنی فاکتەرە مادیەکان هەیە، وەك مێژوو، ئاڵۆزی، لایەنگیریی پێشوەخت، هەڵە و هاودژی لە گێڕانەوەکانی سەردەمی نوسینەوەی دەقەکان و...هتد. بەڵام لەو میتۆدە راڤەکارییەی کە لەسەر تێگەیشتنی دەق و بەستنەوەی مانا و دەلالەت و بەهاکانی کەلەپور بە تازەگەرییەوە دامەزراوە ئەم جۆرە فاکتەرانە کاریگەرییان نییە، چونکە هەموو ئەو بەهایانە لە بۆتەی بایەخە رەخنەییە هاوچەرخەکاندا دەتوێنەوە.

## پەراوێزەکان

١–بارۆك دی سپینۆزا (١٦٣٢–١٦٧٧) فەیلەسوفێکی هۆڵەندییە، لە خێزانێکی جولەکە کە رەچەڵەکیان پورتوگالی بووە لەدایکبووە، لاهوتی خوێندووە و توانای

له فەلسەفەدا دەرکەوتووە، بەهۆی دید و هزرە ئازادەکانیەوە تۆمەتبارکراوە بە ئیلحاد و دەرچوون لە ئاین، ئەو تۆمەتە خەریکبوو ببێتە هۆی کوشتنی لەسەر دەستی یەکێك لە جولەکە توندڕەوەکان. داوای لێکرا ببێتە مامۆستا لە زانکۆی هێدلبێرگ، بەڵام ئەو داوایەی رەتکردەوە چونکە پێی وابوو وەرگرتنی ئەو پۆستە کاردەکاتە سەر بۆچوونەکانی و ئازادی گوزارشتکردن. فەلسەفەی سپینۆزم *Spinozim* بە ناوی ئەوەوە ناونراوە کە بریتییە لەو فەلسەفەیەی لە کتێب و نامەکانی سپینۆزادا شیکراونەتەوە و ئاسانکراون، گرنگترینیان هەردوو کتێبی ئاکار و نامەیەك دەربارەی لاهوت سیاسەت-ە. سپینۆزا بابەتی ئەو نامەیەی روونکردۆتەوە لە ناونیشانێکی فەرعیدا کە تیایدا دەڵێ: "لەم کتێبەدا بەڵگە بۆ ئەوە دەهێنرێتەوە کە ئازادی فەلسەفاندن هیچ مەترسییەکی لەسەر خواپەرستی و ئاشتی وڵات نییە، بەڵکو بە پێچەوانەوە لەناوبردنی فەلسەفە دەبێتە هۆی لەناوچوونی ئاشتی و خواپەرستی". نامەکەی سپینۆزا شیکردنەوەیەکی رەخنەیی بوێرانەیە بۆ کتێبی پیرۆز و هەوڵێکی ئەقڵییە بۆ تەفسیرکردنی دەقی ئاینی لە سیاقە جیاوازەکانیدا کە وابەستەی بابەتە سیاسی و ئایدیۆلۆجیەکانن، بەدوور لە گێڕانەوە و چیرۆکی فەنتازی کە مۆرك دەبەخشن بە زۆربەی دیدە راڤەگەریەکان، بەتایبەتی لای موسا بنمیمون و هاوشێوەکانی، کە دواتر روونی دەکەینەوە.

٢-پێویستە لە بەکارهێنانی زاراوەی رەچەڵەکخوازی (الأصولية *Fundamentalism*) و ئەو وشانەی لەو زاراوەیەوە وەرگیراون و لە کتێبە هاوچەرخەکاندا زۆر بەکاردێن وریابین" چونکە ئەو زاراوەیە داڕشتنێکە زادەی فیکری مەسیحی خۆرئاواییە، لای مەزهەبە مەسیحیەکان و بەتایبەتی لای پێڕەوانی مەزهەبی پرۆتستانت، واتە تەفسیرکردنی هەموو وشەکانی کتێبی پیرۆز بەشێوەیەکی حەرفی کە دیدێکی بەرتەسك بۆ ئامانجەکانی شەریعەت لەخۆدەگرێ. بەڵام زاراوەکە بەشێوەیەکی گشتی بە مانای گەڕانەوە بۆ رەچەڵەکی یەکەمی شەریعەت بەکاردێ، کە ترس و نیگەرانیەکی ئەوتۆ ناخاتەوە، بەڵکو ئاراستەیەکی پەسەندە کە لەگەڵ خەسڵەتە خۆڕسکەکانی مرۆڤدا دەگونجێ کە یەزدان پێی بەخشیوە و لایەنی رۆحی لێکبوردن لەگەڵ هەموو جۆرە مرۆڤەکاندا لەبەرچاو دەگرێ، بەو پێیەی جیاوازیکاری لە دروستکراوانی یەزداندا نیە. بەڵام ئەم زاراوەیە لەم ساڵانەی دواییدا چەند واتایەکی سیاسی و کۆمەڵایەتی پۆشیوە بەجۆرێك خەریکە لە مانا بنەڕەتیەکەی دووری دەخاتەوە، بەڵکو خەریکە تەنها لە چوارچێوەیەکی دیاریکراودا بەکاربهێنرێ بۆ وەسفی بزوتنەوە ئاینییە توندڕەوەکان لە وڵاتە ئیسلامیەکاندا بەشێوەیەکی تایبەت. ئەو بزوتنەوانەی خاوەنی ئاسۆیەکی بەرتەسکن و نەزانن بە ئامانجەکانی شەریعەت و ئاین و سیاقی دەقە ئاینیەکان لە رووی کات و شوێن و دۆخە جیاوازەکانەوە، کە رەنگە مەبەست و ئامانجیان لە بنەڕەتدا ئاینی نەبێت، یان بەرهەمی ئەو بارودۆخ و ئاڵۆزییە بن کە لێرەدا دەرفەتی روونکردنەوەیمان نییە. بەهەرحاڵ ناکرێ زاراوەی ئسوڵیەت و فەندەمێنتاڵیزم تەنها بۆ ئەو بزوتنەوانە بەکاربێنین و چاو لە هاوشێوەکانیان لە وڵاتەکانی دیکەی جیهان، لە خۆرئاوا خۆرهەڵات و باکور و باشور، بپۆشین. زاراوەگەلێکی وەك: فەندەمێنتاڵیزم، فەندەمێنتاڵیست و...هتد، لەم بابەتەدا چەند جارێك بەکاردێت کە پێویستە لە چوارچێوەی خۆیدا لێیبگەین، واتە تەنها بۆ بزاوتە ئاینییە ئیسلامیەکان بەجیا لە ئاینەکانی دیکەی وەك مەسیحیەت، جوولەکە، هندۆس و بودیزم و.. هتد، بەکارنەهێنرێ.

٣-بەدحاڵیبوون یان بەهەڵەخوێندنەوە *misprision* خوێندنەوەیەکە شاعیرێك بۆ هۆنراوەیەکی بەهێز و بەناوبانگی شاعیرێکی بەرلەخۆی ئەنجامی دەدا،

بەجۆرێك دەیشێوێنێ و لە نرخەكەی دێنێتە خوارێ، بە مەبەستی خۆڕزگاركردن لە كۆت و باڵادەستی رابردوو، كاریگەری رابردوو لەسەر ئێستا، یان دەربازبوون لە كاریگەریی ئەو هۆنراوەیە لەسەر ویژدانی هەنوكەیی شاعیر. ئەم هەستكردنە بە گوشاری رابردو لەسەر ئێستا دزەدەكاتە نێو شیكردنەوەی خوێنەرەكان بۆ هۆنراوەكە، ئیدی واهەستدەكەن لەو كارە داهێنانەتر ئاستەمە.

رەخنەگری هاوچەرخ هارلۆد بلووم بانگەشەی بۆ ئەم جۆرە تیورە كرد لە كتێبەكەیدا لەژێر ناونیشانی "نیگەرانی لە گرێی چوونە ژێر كاریگەری *The Anxiety of Influence*"، بلووم پێی وایە هەستكردن بە باڵادەستی رابردوو لە ئێستادا گرێیەكە لای شاعیرەكان هەیە، چونكە وا هەستدەكەن كە نەریتەكانی كەلەپووری شیعریی كاریگەرییان لەسەر ویژدان هەیە و رێ لە كۆششەكانیان دەگرن بۆ خۆسەلماندن لە ئێستادا، بۆیە هەوڵدەدەن خۆیان لەو هەستە رزگاركەن و بەرەنگاری ببنەوە تا دەرفەتێك لەبەردەم جیهانبینییەكی تایبەتدا برەخسێنن. بلووم بڕوای بە تیوری نەوەكان هەیە، واتە هەستی ئیرەیی، یاخود حەسودی و دوژمنكاری، كە نەوە لە دوای نەوە دژی پێش خۆیان هەیانە، وەك چۆن شاعیرە رۆمانسیەكانی ئینگلیز لە ئاست میلتۆن-دا هەیانبوو، كە بە باوكی بزاوتی رۆمانسی لە قەڵەم دەدرا، هەوڵیان دا خۆیان لە (باوكایەتی) ئەو بە هەموو جۆرێ دەربازبكەن، بۆیە گوزارشتیان لە خۆیان كرد و سەربەخۆیی خۆیان راگەیاند. ئارەزووی شاعیر بۆ بەرەنگاربوونەوەی رابردوو فۆرمی بەدخوێندنەوەی هۆنراوە رەسەنەكە وەردەگرێ كە خاوەنی هێز و گەورەیی خۆیەتی و سەرلەنوێ داڕشتنەوەی بەجۆرێك یەكسان بێت بە هێز و ناوبانگی ئەو، بەڵام ئامانجەكەی شێواندن و لە نرخ دابەزاندنیەتی، تا شوێنی ئەو بگرێتەوە و بچێتە جێگای. ئەم نەریتە لای شاعیرە رۆمانسیەكان لە ئینگلتەرا بڵاوبۆوەو بووە دیاردەیەك، بۆنموونە شیلی لە یەكێك لە هۆنراوەكانیدا لە ژێر ناونیشانی "هۆنراوەیەك بۆ بای خۆرئاوایی" دژایەتی هۆنراوەیەكی پێشوتری ۆردس ۆرس دەكا بە ناونیشانی "ئاماژەكانی نەمریی". بلووم دەڵێ "نهێنی پەنهانی زۆربەی شاعیرانی سێ سەدەی رابردوو، بریتییە لە نیگەرانی لە باڵادەستی رابردوو، تا رێگاكان لەبەردەم بلیمەتی و كارەكانیاندا دانەخرێ".

٤-دەقئاوێزان واتە لەخۆگرتنی توخمەكانی دەقێكی ئەدەبی و تەوزیفكردنی لە دەقێكی ئەدەبی دیكەدا، دەقئاوێزان *Intertextuality* زاراوەیەكە خانمی رەخنەگر جولیا كریستیڤا *Jolia Kristeva* دایڕشتووە، ئاماژە دەكا بۆ ئەو توخمانەی كە پەیوەندی نێوان دەقە ئەدەبیەكان پێكەوە گرێدەدا، ئەم پێوەندییە تێكئاڵاو و بەیەكداچووانە چەند ئاستێك لەخۆدەگرێ وەك: هێما، ئاماژە، لە خۆ گرتن، هەڵێنجان، وەرگێڕان، لاسایی تەوسئامێز، نەیاری و چەند ئاستێكی تر. شیكردنەوەی ئەم دیاردە هونەرییە لای پێڕەوانی بنیاتگەری و پاش بنیاتگەری لە رەخنەی ئەدەبیدا بەدیدەكرێ، كاتێ تیوریزە دەكەن بۆ دەقەكان لەبەر رۆرشنایی پەیوەندییان بە دەقەكانی دیكەوە، یان پەیوەندیی ناوەكیان لەگەڵ خۆیاندا نەك لەسەر بنەمای واقعی دەرەكی.

٥-بازنەی راڤە *hermenutic circle* واتە شیكردنەوەی رەخنەیی توێكاری لە سەرلەبەری دەقدا، بەجۆرێك لە وردەكاریەكانی بگا وەك یەكەیەكی گشتگیر، واتە تێگەیشتن لە دەق لە سیاقە كولتوریەكەیدا كە بە مەعریفە و بەها رۆشنبیرییە دیاری نەكراوەكان موتوربەكراوە، دواتر دەبێتە جێگای بایەخی دەق، بەجۆرێك ناكرێ بە جیا لە ئاستە ورد و بەشە بچوكەكان تێبگەین. ئەم بابەتە لەلایەن فەلسەفەی ئەڵمانییەوە لە سەدەی نۆزدەوە بایەخی پێدراوە: فریدریك شلایرماخر *Schleiermacher*" هانز جۆرج گادامێر *Gadamer* لە شەستەكاندا گوزارشتی لەم تیورە كردووە لە رێگەی وتەزایەكەوە سەبارەت بە

تێگەیشتن لە ئێستا لە سیاقی رابردوودا. هەروەها پێچەوانەکەی راستە.

٦–موسا بنمیمون (١١٣٥–١٢٠٤ ز) میری فەیلەسوفە غەیرە موسڵمانەکانی ئەو سەردەمەی ئەندەلوسە. لە قوتابخانەی جولەکە و عەرەبەکانی قورتوبە خوێندویەتی تا بۆتە زانایەکی ئاینی گەورەی جولەکە، سوودی لە نوسراوە عەرەبیەکان دەربارەی فەلسەفەی ئەرستۆ و فەلسەفەی یۆنانی بە گشتی وەرگرتووە، چەندین کتێبی هەیە لەوانە: (السراج) کە بە عەرەبی نوسیویەتی، بریتییە لە نمایشکردنێکی مەنهەجی بۆ "میشنا"، هەروەها (دلالة الحائرین) کە لە بنەڕەتدا بە عەرەبی نوسراوە و زۆربەی بۆچوونەکانی بنەمایەکی عەرەبییان هەیە، وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عیبری و لاتینی و زمانە ئەوروپییەکانی دیکە، دەکرێ بوترێ کۆکەرەوەی لاهوت و فەلسەفەی جولەکەیە.

٧–کابالیزم *Kabbalism* فەلسەفەیەکی ئاینی نهێنی بووە لای گەورە زانا ئاینیەکانی جولەکە و چەند زانایەکی مەسیحی چاخی ناوەڕاست، لەسەر شیکردنەوەی سۆفیگەریانەی تەورات دامەزراوە، کە چەندین قسەی هەڵبەستراو و لابەلای تێدایە.

٨–ئاڵۆزی (یان فرەواتایی) واتە شیکردنەوەی رەخنەیی ماناکان بە هەموو رێچکەکان، چونکە بەشێك لە بەکارهێنانەکانی زمان بە چەندین شێوازی جیاواز لێکدەدرێنەوە، کە هەندێ جار بە فرەروخساری یان فرەئەدگاری ناودەبرێ. ئاڵۆزی یەکێکە لە چەمکە رەخنەییە بنەڕەتیەکان بۆ خوێندنەوەی شیعر بەتایبەتی لای بزاوتی رەخنەیی نوێ کاتێ ولیام ئیمپسۆن کتێبێکی نوسی لە ژێر ناونیشانی (حەوت جۆری ئاڵۆزی – ١٩٣٠). شایەنی باسە ئیمپسۆن بەرگری لە ئاڵۆزی دەکا و بە سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی شیعر لە قەڵەمی دەدا، نەك کەموکورتییەك کە زادەی وردنەبوونەوەیە لە بەکارهێنانی زمان. دیاردەکانی ئاڵۆزی لە ئاخاوتنی رۆژانەماندا زۆرن، بەڵام لە سیاقی خۆیاندا دەڕەوێنەوە.

٩–هاودژیی دیار (التناقض الظاهري) دەربڕینێکە یان وتەزایەکە کە لە رواڵەتدا نامەعقولی و هاودژی تێدایە، بەڵام کاتێ لێی ورد دەبینەوە دەردەکەوێ بنەمایەکی لە راستیدا هەیە، وەك ئەوەی کەسێك بڵێ: راستگۆترین شاعیر درۆزنترینیانە! (یان راستگۆترین ئەکتەر درۆزنترینیانە!. بەو مانایەی ئەکتەر بۆ ئەوەی رۆڵەکەی خۆی وەك خۆی ببینێ دەبێ بە تەواوەتی لە کەسایەتی راستەقینەی خۆی بێتە دەرێ – و.ك)، بەڵام هەندێ (رستەی هاودژی دیار) هیچ بنەمایەکی لە راستیدا نیە و هەستکردن بە تەوس دەبزوێنێ، وەك ئەوەی کەسێك بڵێ: ئەوەی دەیڵێم درۆیە. ئەمەش جۆرێکە لە رەفتاری تەوسئامێز *radical irony*. لە رەوانبێژی کۆندا باس لە (المقابلة) و مەجاز کراوە بە گشتی، بەڵام رەخنەگرە تازەکان بازنەی بەکارهێنانەکەیان بەرفراوانکردووە، پێیان وایە یەکێکە لەو ئامڕازە هونەریانەی کە شیعر پەنای بۆ دەبا لە پێناو دەرچوون لە شتە مەئلوف و باوەکان و بەرەنگاربوونەوەی نەریت و فۆرمە ئاساییەکان لە تێگەیشتن و بیرکردنەوەدا.

١٠–تەوس، یەکێکە لەو زاراوانەی کە لە رووی پێناسە و ناوەرۆکەوە سانا نییە. ئامڕازێکە زۆرجار لە نوسینە ئەدەبییەکاندا بە هەموو ژانر و فۆرمەکانیەوە بەکاردێت لەو رۆژەوەی مرۆڤ ئەدەبی ناسیوە، هەربۆیە (تەوس) چەندین جۆر و مانای هەیە: بەلاغی، رۆمانسی، رەفتاری، درامی، تراجیدی.. هەندێ جار پەیوەستە بە هەڵوێستێکەوە، هەندێ جاریش گەردوونی و گشتییە، جاری وایش هەیە تایبەتییە، لە هەندێ جۆر و ناوەڕۆکیدا پەیوەندی بە (هاودژی دیار)ەوە هەیە کە لە پەراوێزی پێشودا روونکراوەتەوە.

# ئایا عەلمانیەت ئامڕازێکە بۆ وێرانکردنی ئیسلام؟

**د. شاکر ئەلنابلوسی**

له عەرەبییەوە: هەڵکەوت عەبدوڵڵا

پیاوه ئایینیەکانی دامەزراوی ئایینیو هەندێ ئەکادیمیستی ئیسلامی پێیانوایە بانگەوازی عەلمانیەکان ئامڕازێکە بۆ وێرانکردنی ئیسلام وەك ئایینێك، چونکە ئەوانە تەنیا مەبەستیان ئەوە نییە: ئایینو دەوڵەت لێك جیابکەنەوەو ڕێگە لەوە بگرن ئایین دەستوەربداتە دەوڵەت یان دەوڵەت جڵەوبکات یاخود دەوڵەت ئایین وەك پەردەپۆشێکی ڕەوا بەکاربەرێت ــ وەك دەوڵەتی عوسمانی کردیو ئێستاش دەوڵەتە عەرەبیەکات دەیکەن ـ وەك عەلی عەبدولڕەزاق ساڵی ١٩٢٥ لە کتێبی "ئیسلامو شێوازەکانی فەرمانڕەواییکردن،"و خالید محەمەد خالید ساڵی ١٩٥٠ لە کتێبی " لێرەوە دەستپێدەکەین"دا باسیانکردوە، بەڵکو عەلمانیەکان دەیانەوێ عەلمانیەت بکەنە "ئامڕازێك بۆ بچووککردنەوەی ئایینو گۆڕینی بۆ کۆمەڵێك دەقی نائەقڵانی، میتافیزیقاو سروتو پەرستکاریی کە یەکەمینو دوائامانجی بەکاربردنی مرۆڤە لە ڕووی کەوتنە ژێردەستی دەسەڵاتو سۆڵتانەوە"، وەك ڕەزوان ئەلسەید لە گفتوگۆکەیدا لەگەڵ عەزیز ئەلعەزمەدا سەبارەت بە دواکتێبی "عەلمانیەت لە ڕوانگەیەکی جیاوازەوە"، هەروەها عەزیز ئەلعەزمە خۆی لە کتێبی "دنیای ئایین لە ئێستای عەرەبدا/ ل١٥٥"دا باسیکردوە.

لێرەوە، ئەوانە گریمانەی نیەتخراپیی عەلمانیەکان دەکەنو ئامانجی ڕووپۆشکراوی داواکاریی عەلمانیەکان ئاشکرادەکەنو کە بریتیە لەوەی ئیسلام دەبێ لە سنووری ئایین بووندا ڕاوەستێو هەردوو واتەی ئایینو دنیا لەخۆنەگرێت.

ئوسوڵییەکان دەڵێن: ئەگەر عەلمانیەکان ئایینی مەسیحی لە دەوڵەتەکەی جیابکەنەوە یان دەوڵەتەکە لە ئایینەکەی جیابکەنەوە، ئەوا نە ئایینەکە لەناودەچێتو نە دەسەڵاتداریش کۆتاییدێت، چونکە ئایین دەسەڵاتی دامەزراوی خۆی، هێزی خۆی، مەترسیی خۆی، پارەی خۆیو دەستوپێوەندی خۆی هەیە. لەبەر ئەوەی لە مەسیحیەتدا دوو دەسەڵات هەن: دەسەڵاتێکی ئایینی کە پاپا و پیاوە ئایینیەکان نوێنەرایەتیدەکەن، دەسەڵاتێکی

شارستانی که پادشا یان سەرۆك نوێنەرایەتیدەكات. کەچی وەك یوسف ئەلقەرەزاوی لە کتێبی "ئیسلامو عەلمانیەت ڕووبەڕووی یەکتر/ل٥٥"دا دەڵێت: "ئەگەر دەوڵەتێکی ئسلامی ئەوە بکات، ئەوا ئایین فەرمانڕەوایەکی بۆ نامێنێتەوە کە پشتگیریبکاتو هێزێکی بۆ نامێنێتەوە کە پاڵپشتی بێت..".

بەڵام ئەمە لە ڕووی واقعیەوە ڕاست نییە، بەڵگەش بۆ ئەمە چەند ڕاستیەکە، لەوانە:

❖ هەروەك مەسیحیەت، ئیسلامیش دوو دەسەڵاتی هەبوو: دەسەڵاتێکی ئایینیو دەسەڵاتێکی دنیایی. دەسەڵاتێکی ئایینی کە پێکهاتبوو لە پیاوەکانی دامەزراوی ئایینی، لە سەرووی هەموویانەوە موفتی گشتی یان شێخی ئەزهەر، دادوەری دادوەرەکان، ئەنجومەنی بالای فەتوادان، دەستەی زانایان، کۆمەڵەکانی توێژینەوەی ئیسلامی، سەرۆکی حیزبە ئیسلامییەکان، ڕێکخراوەکانی کارکردن بۆ چاکەخوازیو دوورکەوتنەوە لە خراپەکاری، ئیمامی مزگەوتەکان، قازییەکانی دادگا شەرعیەکان، وەزیرەکانی ئەوقاف، ڕاوێژکارە ئایینیەکان لە بانکە ئیسلامیەکان، مامۆستایانی ئابووریی ئیسلامی لە زانکۆکان، ڕەقیبە ئایینیەکان لە وەزارەتەکانی ڕاگەیاندن. ئەمانەش ژمارەیان لەوەی پیاوەکانی ئایینی مەسیحی زۆرترەو دەسەڵاتو هێزیشیان لەوەی ئەوان زیاترە کە لەم ڕۆژگارەدا هیچ جۆرە دەسەڵاتێکیان نییەو ناتوانن وشەیەك زەوتبکەت. ئەو پیاوانەی دامەزراوی ئایینی ئیسلام لە ڕێگەی وەزارەتەکانی ئەوقافو بانکە ئیسلامیەکانو دامەزراوە ئیسلامیەکانی خستنەگەڕی پارەوە جڵەوی پارە دەکەن (زۆربەی ئەم دامەزراوانە بەتایبەتی لە میسر، لەوانە کۆمپانیای ئەلرەیانو ئەلسعەد، مایەپووچبوون، بەڵام پاش ئەوەی پارەی پاشەکەوتکراوی مامناوەندحاڵەکانیان بەتالان برد. ئەم دامەزراوانە لەلایەن پیاوانی ئایینیەوە پشتگیریدەکرانو ئەوان فەتوایان بۆ دەدان، لە سەرووی هەموویانەوە شێخ محەمەد متەوەلی ئەلشەعراوی). لە ڕێگەی چاوەدێریکردنو دانانی پرۆگرامیشەوە لە زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان جڵەوی خوێندن دەکەن. هەروەها کۆنترۆڵی دادگای شەرعی دەکەنو بەهۆی یاساخکردنی هەر کتێبێکەوە کە بیانەوێ زاڵن بەسەر باری ڕۆشنبیریداو جڵەوی ڕاگەیاندنیش دەکەن، ئەو ڕاگەیاندنەی ڕێگەیان دەداتێ ڕەخنە لە ڕۆژنامەگەریو هەر دیاردەیەك بگرن کە مەبەستیانە، بەڵکو لە هەندێك وڵات کۆنترۆڵی خزمەتگوزارییە گشتییەکانیش دەکەن، وەك: (نەخۆشخانەکان، عیادەکان، کۆمەڵە خزمەتگوزارەکان، دایەندەو باخچەی مندالان، قوتابخانەی کچانو قوتابخانەکانی فێرکردنی قورئان). هاوکات دامەزراوێکی دنیاییش هەیە کە پێکدێت لە پادشا یاخود سەرۆك. کەواتە وەك مەسیحیەت لە ئیسلامیشدا دوو دەسەڵات: ئایینیو دنیایی هەن.

❖ ئێستا زۆربەی وڵاتە عەرەبیەکان نیمچە عەلمانین، نیوەی ڕێگەی ڕوەو عەلمانیەتیان بڕیوەو ئایینو دەوڵەتیان لێك جیاکردۆتەوە، بەڵام لێك جیاکردنەوەیەکی یەکجارەکی نا، بەڵکو لێك جیاکردنەوەیەکی ڕێژەیی. ئایا ئایینی ئیسلام لەو وڵاتانەدا پوکاوەتەوە؟

ئەوەی ڕوویدا تەواو پێچەوانەیە. ئایین هێشتا بێ بەڵایەو ئەوە بەدیدەکرێت کە دیاردەی گەڕانەوە بۆ ئایین برەویسەندوەو خۆبەستنەوە بە ئایینەوە لە ڕێگەی زۆربوونی ژمارەی مزگەوتەکانەوە لە زیادبووندایە، ژمارەی نوێژکەران لە زۆربووندایەو ژمارەی ئەوانەی دەچنە حەج بۆ زیارەتکردنی شوێنە

پیرۆزەکان ساڵ لە دوای ساڵ لە برەوسەندندایە، ئەمەش سعودیەی ناچارکردوە ساڵانە ژمارەی حەجکردوەکان دیاریبکات. هەروەها ژمارەی دەرچوانی پەیمانگە ئایینیەکان لە زۆربووندایەو ژمارەی نوێنەرەکانی گروپە ئیسلامیەکان بۆ پەرلەمانەکان لە زیادبووندایە. ئەمە وێڕای زۆربوونی ژمارەی کتێبە ئایینیەکان و سەرهەڵدانی گۆڤارە ئایینیە تایبەتمەندەکان بە ژمارەیەکی زۆر لە هەر وڵاتێکی عەرەبدا. ئەمانەو گەلێك ڕواڵەتی دیکە جەغت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئایین هەرگیز بەهۆی جیابوونەوە لە دەوڵەت کاریگەریی ناکەوێتە سەرو دەسەڵات و هێزی لەناو خودی خۆیدایە نەك لە دەرەوەی خۆی، لە خودی خۆیدایە نەك لە پیاوەکانیدا. ئەگەر ئایینی ئیسلامیش دەسەڵات و هێزی لە دەوڵەتەوە بەدەستهێنا و بەهۆی جیاکردنەوەی ئایین و دەوڵەت لەو دەسەڵاتە ترسا، ئەوا ئایینێکی لاوازدەبێت و پشتئەستوور بەخودی خۆی و ئەنجامی بەڵگەو سەلماندنەکانی خۆی بەهێزنابێت.

❖ ئوسوڵیەکان، لەوانە یوسف ئەلقەرەزاوی، دەڵێن: عەلمانیەت پرنسیپێکی هاوردەیەو دژی ڕەسەنایەتی و سەروەریی ئێمەیە، چونکە لە دەرەوەی خاکی ئێمەوە هاتوە. مەسیحیەکان زیاتر پێویستیان بە عەلمانیەت هەبوو بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی خۆیان لەگەڵ کلێسا، بەڵام عەلمانیەت لای ئێمە بۆ خۆی کێشەیەکە.(ئیسلام و عەلمانیەت ڕووبەڕووی یەکتر/ل٩٨).

**پرسیارەکە لێرەدا:**

بۆچی باوباپیرانمان پێش زیاتر لە دە سەدە وەرگێڕانی فەلسەفەو فیکری یۆنان و هەندێ لە بیرۆکەکانی فارس و نەتەوەکانی دیکەیان ڕەت نەکردەوە کە هاوردبویانن، فێریانبوون و گفتوگۆیان لەسەر کردن و کاریان بەهەندێکیان کرد؟ بۆچی ئەو ڕۆژگارە ئەو بیرۆکانە بە بیرۆکەی هاوردەی دوور لە دابونەریت و دژی سەروەری و ڕەسەنایەتیمان لە قەڵەم نەدرا؟ ئەو میللەتە کامەیە کە لەم دنیایەدا دابڕاو ژیان دەباتەسەر و هیچ لە کەسەوە ناهێنێ و هیچیش بۆ کەس نانێرێت؟ بێگومان ئەوە بانگەوازە بۆ سەرلەنوێ دابڕینی کولتووری کە بە درێژایی دە سەدە لەمەوبەر جیهانی عەرەب و ئیسلام نقومیبوو و ئێمەشی گەیاندۆتە ئەو تاریکستانەی ئیمڕۆ کە هیچ ڕووناکییەك جگە لە ڕووناکی ئەوی دیکە نییە ڕێکردنی خۆمانی پەنای پێ بەرین!

**لە ڕوویەکی دیکەوە:**

لە ڕوویەکی دیکەوە، وەك فەرەج فودە لە "ڕاستیی پیوار/ل١٠٠"دا دەڵێت:"ئایا ڕاستە عەلمانیەت خەمێکی خورئاواییانەیە نەك ڕۆژهەڵاتیانەو لە خۆرئاوا ڕەوایە، چونکە فەرمانڕەواییکردن بە هۆی ئایینەوە یان بەناوی ئایینەوە زۆرداربوەو ئێمە لە ڕۆژهەڵات شتی وەهامان بەخۆوە نەدیوە؟ پێموایە ئەگەر بەهانەی بوونی عەلمانیەت لە خۆرئاوا بوونی زۆرداریی فەرمانڕەوایان بووبێ لەسایەی کلێساوە، ئەوا بەهانەی بوونی عەلمانیەت لە خۆرهەڵات بوونی زۆرداریی فەرمانڕەواکانە لە سایەی (خەلیفە)دا، سوڵتانی خودا لەسەر زەوی، بکوژی هەرکەسێك کە بیەوێت و بەخشندەی خەڵات و بەڵا".

❖ هەندێك لە بیریارە عەلمانیەکانی عەرەب، وەك فوئاد زەکەریا لە "عەلمانیەت پێداویستیەکی ژیوارییە/ل٢٧٩"دا، ئەوە دووپاتدەکەنەوە عەلمانیەت ئەو شێوازەی ژیانە کە هەموو کاریگەرییەك یان ئاڕاستەکردنێکی ئایینی بۆ

ڕێکخستنی کۆمەڵگە ڕەتدەکاتە. ئەوەش شێوازێکی مەتریالیستانەیەو ئەنجامی پەرەسەندنی فەلسەفە ماتریالیستە نائایینیەکان پێکهاتوە. ئەمە هەڵەیەکی ڕاشکاوانەیە، چونکە دوورخستنەوەی کاریگەریی ئایین لەسەر ڕێکخستنی کۆمەڵگە بابەتێکی سیاسییەو کەسێکی عەلمانی موسڵمان ئەوە ڕەتدەکاتەوە ئایین ڕێکخستنی سیاسیی کۆمەڵگە ئاراستەبکات، هاوکات بەشێوەیەکی ئایینی ژیانی هاوسەرێتی پێکدێنێ بێ ئەوەی عەلمانیبوونی خۆی ڕەتبکاتەوە.

❖ ڕاستڕەوەکان دەڵێن ئیسلام لە ڕۆژی سەرهەڵدانیەوە جەغتی لەسەر ئەوە کردۆتەوە کە ئایین و دنیایە پێکەوە، لەکاتێکدا مەسیحیەت ئەمەی بەخۆوە نەدیوەو هەمیشە دنیایی و ڕۆحی لێك جیاکردۆتەوە.

بۆ وەڵامدانەوەی ئەوە دەڵێم: ئەو ئاخاوتنە بۆ سەردەمی مەسیح ڕاستە کە هەمیشە ئەوەی دووپاتدەکردەوە "ئەوەی هی قەیسەرە بیدەنە قەیسەر و ئەوەیش هی خودایە بیدەنە خودا"(دەڵێن ئەگەر مەسیح لە ڕۆژگاری خۆیدا بیتوانیبایە ئەوەی قەیسەر و خودای پێکەوە بەدەستبێنێ، ئەوا وەك محەمەدی پێغەمبەری دەکردو تەنیا بە دەسەڵاتی ڕۆحی ڕازی نەدەبوو، بەڵام ئەوکاتە هەلومەرجی سیاسی و کۆمەڵایەتی بۆ ئەو لەبارنەبوو، وەك بۆ محەمەدی پێغەمبەر لەباربوو. ئەگەرچی دۆخەکە زۆر درێژەی نەکێشا و زۆری پێ نەچوو کڵێسا، پاش هەڵکەوتنی دەرفەتی لەبار، ئەوەی قەیسەر و خودای پێکەوە زەوتکرد. بڕوانە ڕوونکردنەوەکانی هاشم ساڵح لە کتێبی "عەلمانیەت و ئایین/ل١٢٩و١٣٠"دا). بەو جۆرە مەسیحیەتیش وەك ئیسلام بوە هەڵگری هەردوو مەسەلەکە. ئەوەبوو کاتۆلیکیەت، پێش سەرهەڵدانی پرۆتستانیەت کە ئایینی زۆربەی هەرە زۆری مەسیحیەکان بوو، جڵەوکاری هەردوو واتاکە بوو. مانای زمانەوانی کاتۆلیکیەت هەمەلایەنبوونە، واتە ئایین و دنیا. بەو جۆرە لەباوەشگرتنی مەسەلەکانی دنیا لەلایەن ئایینەوە تەنیا لە ئیسلامدا نەبوە، بەڵکو مەسیحیەتیشی گرتۆتەوە.

❖ ئوسوڵییە تەسکبین و خاوەن ڕۆشنبیرییە ڕواڵەتکارە سنووردارەکان ئەوە دووبارەدەکەنەوە کە عەلمانیەت دوو ئامانجی بنچینەیی هەیە:

یەکەم/ دابڕینی تەواوەتی کۆمەڵگە لە ئایین و دەرفەتڕەخساندن بۆ پەروەردەکردنێکی نائایینی و دامەزراندنی سیستەمێکی سیاسی کە پەنا بە شەریعەت نابات و دامەزراندنی ئابووری لەسەر بنچینەی سوو.

دوەم/ دابڕینی لایەنێکی ڕەسەنی فیکری مرۆڤایەتی، واتە لایەنی ڕۆح، سروشی خودایی، دنیای غەیب و هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بە ئایینەوە هەیە، وەك ئەخلاق، باوەڕ و بڕوابوون بەخودا، لە فیکر و ژیان (ئەنوەر ئەلجوندی: هەرەسهێنانی عەلمانیەت/ل٢٠).

دەبێ هێما بۆ ئەوە بکەین کە عەلمانیەت جا لە خۆرهەڵات بێت یاخود خۆرئاوا، داخوازی دابڕینی تەواوەتیی کۆمەڵگە نییە لە ئایین، بەڵکو داوای ئەوە دەکات پیاوانی ئایین دەست هەڵگرن لە سیاسەت و دەستوەردانە ژیانی خەڵك لە ڕێگەی فرماندەرکردن و یاساخکردنەوە. چونکە خەڵك ئایینی خۆی دەناسێ و دوای چاکەکارییەکانی دەکەوێت و پێویستی بە پیاوانی دامەزراوی ئایینی و ئەو ژمارە زۆرەی شێخەکان نییە کە مەجلیسەکانیان پڕکردوە.

بانگەشەی ئەوەی عەلمانیەت خوازیاری دامەزراندنی ئابوورییە لەسەر بنچینەی سوو. ئیمڕۆ دەوڵەتێك نییە لەم دنیایەدا بە سعودیشەوە، مامەڵە بە بانکە بازرگانیەکان نەکات کە بەلای دامەزراوی ئایینیەوە بانکی سووخوازن. وێڕای ئەوە، خودی سعودیە لەبەر هۆکاری سیاسی و ئابووری ئەو بانکە

ئیسلامیانەی یاساخکرد کە پارەدارەکانی سعودیە لە سەرتاپای نیشتمانی عەرەبدا دایانمەزراندبوو. هەروەها شێخی ئەزهەر (شێخ سەید تەنتاوی) کاتێك موفتیمیسر بوو، لە نەوەدەکانو لە کۆنگرەی بانکە ئیسلامیەکاندا لە ئەسکەندەرییە فەتوای ئەوەی دا کە سوودی بانکەکان سوونییەو حەرامیش نییە.

لێرەوە تەواو دەردەکەوێت بەرژەوەندییە سیاسی، ئابووریو کۆمەڵایەتیەکان کە لەپشت فەتوا شەرعییەکانەوە خۆیان حەشارداوە، ناکۆکن بەیەکو لە دوائەنجامدا موسڵمانەکان ڕوەو سەرلێشێوان دەبەن. بۆیە لە کاتێکدا شێخ سەید تەنتاوی فەتوای ئەوە دەدات کە سوودی بانك سوونییەو حەرامیش نییە، بەو جۆرەش بانکە بازرگانیەکانی تر سودمەنددەبن، دەبینین شێخ یوسف قەرەزاوی ڕاوێژکاری شەرعیی کۆمەڵێك دامەزراوی بەرەکەی سعودی کە خاوەنی بانکی بەرەکەی سعودیو هەندێ دامەزراوی خستنەکاری پارەن لەسەر شێوازی ئیسلامی، فەتوای ئەوە دەدات کە سوود حەرامەو سوویەکی ئاشکرایە، ئەمەش لەپێناو پاراستنی بەرژەوەندیی ئەو بانکە ئیسلامیانەی قەرەزاوی ڕاوێژکاریانە. هەروەها پیاوە ئایینیەکانی سعودیەش هەڵوێستێکی ناکۆکیان هەبوە بەرامبەر بە سوودی بانکەکان. ئەوان هێرشیان نەدەکردە سەر ئەو بانکە بازرگانیانەی لە سعودیە کاریاندەکرد، چونکە دەسەڵات دەیپاراستن. هاوکات خوازیاری کردنەوەی لقی بانکە ئیسلامیەکان نەبوون لە سعودیە، چونکە دەسەڵاتی سیاسی وێڕای بڵاوبوونەوەی بە دنیای عەرەبداو بوونی ناوەندە سەرەکیەکانی ئەو بانکانە لە وڵاتە دراوسێکانی سعودیە (واتە بەحرەین)، گەرەکی نەبوو، ئەگەرچی دامەزرێنەرە سەرەکیەکانیشیان پارەدارەکانی سعودیە بوون.

سەبارەت بە بانگەشەی ئەوەی عەلمانیەت لایەنی ڕۆحی لە فیکری مرۆڤانە بەدووردەگریو ئایین تەواو دادەبڕێ لە فیکر و ژیان، دەڵێین هیچ کەسێك ناتوانێ ئەوە ئەنجامبداتو خودی ئایین لە ناوەوەڕا لە فیکر و ژیان دانەبڕێت. ئەزموونی کەمال ئەتاتورکی کۆمۆنیستانە ـ نەك عەلمانیانەـ چاکترین بەڵگەی ئەوەیە. وەك عادل زاهیر لە "بنچینە فەلسەفیەکانی عەلمانیەت/ل٣٨"دا دەریدەبرێ. عەلمانیەت ئامانجی گەلێك لەوە زیاترە کە لە دەستەویەخەبوون لەگەڵ ئاییندا کورتبکرێتەوە وەك پیاوە ئایینیەکان دەریدەبڕن. ئەو ئامانجانەش بریتین لە: "هێنانەدیی یەکگرتنی کۆمەڵایەتی، پاڵنان بە ڕەوڕەوەی بوژانەوەی ئابوورییەوەو دەربازبوون لە پاشکەوتوویی بە هەموو شێوازەکانیەوە. بەو جۆرە عەلمانیەت گرێدراوی پڕۆسەی نوێکردنەوەی کۆمەڵگەیە".

- ❖ ئوسوڵییەکان هاوڕان لەسەر ئەوەی ئیسلام پێویستی بەو دەقانە نییە کە بۆ دامەزراندنی دەوڵەت نووسراون، چونکە قورئان بە کامڵیو بێ کەموکوڕی هاتۆتە خوارەوەو پێویستی بە دەقی دیکە نییە بۆ دامەزراندنی شەریعەت. کەچی ئێمە دەزانین ئەو ئاقارە فیکرییەی ئیمامی شافعی نوێنەرایەتیدەکرد "گرفتێکی بنچینەیی چارەسەرکرد کە ڕووبەڕووی مۆسڵمانەکان ببوەوە، ئەویش ئەوەبوو کە دەقی قورئان سەبارەت بە پەرستکاریو یاسادانان یان مامەڵەکارییەکان بەس نینو پێویستە پەنا بە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ببرێت بۆ زۆرێك لە وردەکارییەکان"(محەمەد ئەحمەد مەحمود: هەندێك ئیشکالیەتی دەقی قورئانی/ل٥٥).

## تێبینی

ئەم بابەتە ڕۆژی ٢٠٠٣/٩/٢٢ لە ئینتەرنێتەوەو لە ماڵپەڕێ (ئیلاف) وەرگیراوە.

## مەرگی "ئێدوارد سەعید"



سەرەتای ئەم پایزە، مرۆڤایەتی بە مردنی پرۆفیسۆر "ئێدوارد سەعید" یەکێك لە قەڵەمە رەخنەگرە مەزنەکانی بواری فیکری لە دەستدا.. "سەعید" دوای ئەوەی دوانزە ساڵێك بە دەست نەخۆشی شێرپەنجەی خوێن (لۆکیمیا) وە گیرۆدە بوو، رۆژی پێنج شەممە بەرواری ٢٠٠٣/٩/٢٥ ماڵئاوایی لە ژیان کرد.

"ئێدوارد سەعید" لە رۆژی یەکی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٥ لە شاری قودس و لە خانەوادەیەکی مەسیحی هاتۆتە دنیاوە، لە تەمەنی سیانزە ساڵیدا بەناچاری لەگەڵ خێزانەکەیان فەلەستین جێدێڵن و لە وڵاتی میسر نیشتەجی دەبن. لە شاری ئەسکەندەریە پەیوەندی دەکات بە زانکۆی (ڤیکتۆریا) وە و هەر لەو سەر وەختەشدا هەریەك لە شا "حوسێنی" پادشای ئوردن و ئەکتەری ناسراوی میسر "عومەر شەریف" لەو زانکۆیەدا دەست بە خوێندن دەکەن.

بە مەبەستی خوێندنی باڵا باوکی دەینرێتە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و لەوێ لە زانکۆی (برینستۆن) بڕوانامەی ماستەر وەردەگرێت و دوای ئەوەش لە زانکۆی (هارڤەرد) بڕوانامەی دکتۆراش بەدەست دێنێت، کارانامەی دکتۆراکەشی لەسەر نوسەری ناسراو "جۆزیف کۆنراد" دەبێت.

پاش وەرگرتنی بڕوانامەی دکتۆراکەی و لە ساڵی ١٩٦٣ و بۆ ماوەی چل ساڵ، وەك مامۆستای زمانی ئینگلیزی و ئەدەبی بەراوردکاری لە زانکۆی (کۆلۆمبیا) لە ئەمریکا خەریکی وانە وتنەوە بووە.

"سەعید" لە ماوەی ٦٨ ساڵی تەمەنیدا گەلێك شاکاری گرنگی پێشکەش بە مرۆڤایەتی کردووە، لە بوارەکانی (فیکر و رەخنە و مۆسیقا و وتاری سیاسی و... هتد). رەنگە دیارترین ئەو بەرهەمانەی کە بۆ زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان وەرگێردراون و وەکو سەرچاوەیەکی فیکری و مەعریفی گرنگ لە ناوەندە ئەکادیمی و رۆشنبیریەکاندا سەیریان دەکرێت، بریتیین لە : (ئۆریانتالیزم، کلتوور و ئیمپریالیزم، ناشوێن، رۆڵی رۆشنبیر، نیشاندانی ئیسلام، فرۆید و غەیرە ئەوروپیەکان).

"ئێدوار سەعید" چەندێك بێریارێکی فەلەستینی– ئەمریکی – یۆنیڤێرساڵی مەزن بوو، هێندەش مۆسیقار و ئەکتیڤستو رەخنەگر و رۆشنبیرێکی ئۆرگانی چالاکیش بوو.

لە بواری سیاسیشدا ماوەی چواردە ساڵ ئەندامی پەرلەمانی فەلەستینی بووە لە تاراوگە، بەڵام دوای دانوستانی فەلەستین – ئیسرائیل و رێکەوتنامەی ئۆسلۆی نێوانیان، "سەعید" دەست لە کارکێشانەوەی خۆی راگەیاندو کەوتە رەخنەکردنی "عەرەفات" و رێکەوتنامەی ئۆسلۆ. ئەم دەساڵەی دوایی و کارکردنی زیاتری ئەو وەکو ئەکتیڤیستێك، کەمەکێك لە بواری فیکری دوور خستبووەوە و ئەوەندەی سەر قاڵی وتار و لێدوان بوو لەسەر مەسەلە و رووداوە رۆژانەکانی دنیا و بەتایبەتیش خۆرهەڵاتی ناوەڕاست، هێندە سەرقاڵی پرۆژەی فیکری گەورە نەبوو وەکو سەرەتاکانی.

هەرچۆنێك بێت مەرگی ناوادەی ئەم پیاوە مەزنە، سێیەم

زیانی گەورەیە کە لە سەرەتای سەدەی بیست و یەکدا و دوای لە دنیا دەرچوونی فەیلەسوفی ئەڵمانی "هانز جۆرج گادامێر" و بیریاری فەرەنسی "پییر بۆردیۆ" لە فیکری ئینسانی دەکەوێت.

-سەردەم-

- ٢٠٠٣/١٠/١٠

سلێمانی

## خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ئەمساڵ



خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبی ٢٠٠٣ کە هەمووساڵێك ئاکادیمیای سویدی دەیداتە نووسەرێکی ناوداری جیهانی، بەر رۆمان نووسی خوارووی ئەفریقا (جون ماکسویل کویتزی) کەوت، بە پێی ئەو زانیاریانەی لە ڕێگای ئەنتەرنێتەوە لە بارەی ئەم نووسەرەوە بە دەستمان هێنا یەکێکە لە ناودارترین نووسەری ئەم سەردەمەی جیهان و بەرهەمەکانی بۆ گەلێك زمان وەرگێڕراون - بە داخەوە خوێنەر و نووسەرانی کورد بە دەگمەن نەبێت بەرهەمیان نەدیوەو تەنانەت ناویشی نازانن.

کویتزی ساڵی ١٩٤٠ لە کیب تاون لەدایك بوەو هەر لەوێش بوەتە مامۆستای ئەدەب لە زانکۆ، پاشان چوەتە شیکاگۆ و دوای ئەوە لە ئوستراليا بوەتە مامۆستا و بەیەکجاری جێگیر بووە.

بابەتی رۆمانی کویتزی ئەو واقیعە تاڵ و سەختەی باشووری ئەفریقایە کە لە ژێر سایەی رەگەزپەرستی و کێشە سیاسی و کۆمەڵایەتیەکاندا لە حاڵەتی لێکترازان و پەشێویدایە، کەسایەتیەکانی بە کارەسات و هەمیشە لە دڵە راوکێو نامۆیدان. لیژنەی خەڵات پێدانەکە لە هەڵسەنگاندنی کارەکانیدا دەڵێت: رۆمانەکانی کویتزی توانایەکی گەورەی بەستنەوەو شیکردنەوەیان تیایە و "بێ بەزەییانە رەخنە لە ئەقڵانیەتی سەخت و ئاکارە ساختەکەی شارستانیەتی ئەوروپا دەگرێت"

هەروەها دەڵێت: "کویتزی لەو نوسەرانەیە بەردەوام بەرجەستەی چاکە و خراپە دەکات و لاوازی و بێ هێزیەکان لە مرۆڤدا دەردەخات، بەمەیش دەگاتە ئەو پرشنگە خودایيەی کە لە مرۆڤدا هەیە" کویتزی لە نووسیندا کاریگەریی کافکا و دیستوفسکی و دیفوی لەسەرە و هەمیشە بەرهەمەکانی جۆراوجۆرن و یەك ریتم نین.

کویتزی لە ١٠ی کانوونی یەکەمی ئەمساڵدا کە ڕێکەوتی یادی کۆچی دوایی ئەلفرید نۆبڵی دامەزرێنەری ئەم خەڵاتەیە لە ١٨٩٦ دا. لە ئاهەنگێکی رەسمیدا لە ستوکهۆڵم خەڵاتەکە لە شای سوید کارل کوستاف وەردەگرێت، نرخی خەڵاتەکە ١٠ مليون کرونی سویدی واتا ٣,١ مليون دۆلارە. کویتزی دووەم نووسەری ئەفریقای باشوورە دوای "نادین گوردیمیر" کە پێش دوانزە ساڵ ئەم خەڵاتەی درایە.

بەرهەمی کویتزی بریتین لەمانە:

١-زەوی بەرەبەیان ١٩٧٤

٢-لەناو دڵی وڵاتدا ١٩٧٧

٣-لە چاوەڕوانی بەربەرەکاندا ١٩٨٠

٤-ژیانی مایکل کای و سەردەمەکەی ١٩٨٣

٥-دوژمن ١٩٨٦

٦-سەردەمی ئاسن ١٩٩٠

٧-گەورەی پترس بورگ ١٩٩٤

٨-منداڵی ١٩٩٧

٩-شورەیی ١٩٩٦

١٠-لاویی ٢٠٠٢

ئەو خەڵاتانەی وەریگرتوون:

١-خەڵاتی وەکالەتی راگەیاندنی مەرکەزی لە باشووری ئەفریقا ساڵی ١٩٨٠.

٢-خەڵاتی (ئیریش تایمزی جیهانی).

٣-خەڵاتی "بوکەر"ی بەریتانی لەسەر رۆمانی "ژیانی مایکڵ کای و سەردەمەکەی" ساڵی ١٩٨٣.

٤-جارێکی تریش خەڵاتی "بوکەر"ی بەریتانی لەسەر رۆمانی "شورەیی" ساڵی ١٩٩٩ کە ئەمە یەکەمجارە نووسەرێك دووجار بەرندەی ئەو خەڵاتە بێت.

—سەردەم—

## گروپی رەخنە

**لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد**

*The Company of critics*

*Michael walzer*

*Basic books - newyork, 2002*

*P. 260*

نوسەری ئەم کتێبە پرۆفیسۆر "میکائیل ڤالتەر"ە. "ڤالتەر" مامۆستایە لە پەیمانگای خوێندنی باڵا لە زانکۆی برنستۆن لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. نوسەر بەر لەم کتێبە ژمارەیەك کتێبی دیکەی بەچاپ گەیاندووە، لەوانە: جەنگی ڕەواونارەوا.. لەم کتێبە تازەیەیدا "ڤالتەر" باس لە یانزە بیرمەند لە بیرمەندانی سەدەی بیستەم دەکات.

نەسکی یەکەم تەرخانە بۆ رۆشنبیری فەرەنسی "ژولیان باندا" کە بە کتێبی (خیانەتی رۆشنبیران) نێوبانگی پەیدا کرد. "باندا" ساڵی ١٨٦٧ لە شاری پاریس هاتە دنیاوەو لە هەمان شوێنیشدا ساڵی ١٩٥٦ کۆچی دوایی کرد. ساڵی ١٩٢٧ کتێبی (خیانەتی رۆشنبیرانی) بڵاوکردەوە و تیایدا کەوتە سەرکۆنەکردنی رۆشنبیران و بەوە تاوانباری کردن کە خیانەتیان لەو ئەرکە سەرەکیەی خۆیان کردووە کە بریتییە لە داکۆکی کردن لە (دادپەروەری و ئازادی و ئەقڵانیەت و دیموکراسی).

پاشان نوسەر نەسکێك تەرخان دەکات بۆ رۆشنبیری بەناوبانگی ئیتاڵیای "ئەنتۆنیۆگرامشی". "گرامشی" ساڵی ١٨٩١ لەدایکبووە و بە چەند رۆژێك دوای ئازادبوونی لە زیندان لە ساڵی ١٩٣٧دا دنیا بەجێدێڵێت. ئەم پیاوە خەباتگێڕێکی سیاسی وڵاتی ئیتاڵیا بووە و هەروەها یەکێکیشە لە دامەزرێنەرانی حیزبی شیوعی ئیتاڵی لە ساڵی ١٩٢١، دواتر و لە ساڵی ١٩٢٦دا دەبێتە سکرتێری گشتی حیزب.

"گرامشی" لەبەرئەوەی خەباتی لە دژی فاشیزم دەکرد، هەر لەو ساڵەدا دەستگیرکراو خرایە زیندانەوە. ماوەی دەساڵێك زیاتر لە زینداندا مایەوەو لەو ماوەیەشدا گرنگترین بەرهەمی خۆی نوسی کە بریتی بوو (مارکسی رەخنەگر).

"میکائیل ڤالتەر" نەسکێکی دیکەی کتێبەکەی تایبەت کردووە بۆ نوسەری بەناوبانگی فەرەنسا "ئەلبێر کامۆ" و هەڵوێستی ئەو لەسەر شەڕی جەزائیر. وەکو ئاشکرایە "کامۆ" ساڵی ١٩١٣ لە جەزائیر هاتۆتە دنیاوە و ساڵی ١٩٦٠ بە ڕوداوی ئۆتۆمۆبیل لە فەرەنسا گیانی لەدەست داوە. "کامۆ" سەر بە خێزانێکی نەدار و هەژار بووە و سەرەتا فەلسەفەی خوێندووە، پاشان بۆ ماوەیەکی کورت (١٩٣٤-١٩٣٧) پەیوەندی کردووە بە ڕیزەکانی حیزبی شیوعی فەرەنسیەوەو دوای ئەوە وازی لێهێناون.. هاوڕێی نزیکی "ژان پۆڵ سارتەر"ی فەیلەسوف بوو، بەڵام دوای ئەوەی کتێبی (مرۆڤی یاخی) بە چاپ گەیاند پەیوەندی نێوانیان تێکچوو.

نەسکی دوای ئەو تایبەتە بە بیرمەندی ئەڵەمانی "هێربرت مارکۆز" و تێڕوانینی ئەو بۆ ئەمریکا. وەکی دەزانرێت "مارکۆز" ساڵی ١٨٩٨ لە شاری بەرلین لەدایکبووەو ساڵی ١٩٧٩ لە نزیك شاری منشن کۆچی دوایی کردووە. یەکێکە لە ئەندامانی قوتابخانەی فرانکفۆرتی بەناوبانگ. پاش ئەوەی نازیەکان لە ئەڵمانیادا جڵەوی دەسەڵاتیان گرتە دەست، ئەو وڵاتەی جێهێشت و رویکردە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.. پاش ماوەیەکی کەم لە مانەوەی لەوێ کەوتە رەخنەگرتن لە کۆمەڵگەی ئەمریکی، لەبەرئەوەی بە بڕوای ئەو کۆمەڵگەیەکی بەرخۆری و داخراوە بەسەر خۆیدا، هاوکات تاکە کەس کۆنترۆڵ دەکات و دەیکاتە ئاژەڵێکی بەرخۆر و هەموو وزەیەکی یاخیبوون و شۆڕشگێڕیش لە ناخیدا دەکوژێت. لە گرنگترین کتێبەکانی: (ئەقڵ و شۆڕش – هیگڵ و گۆڕانی تیۆریای کۆمەڵایەتی – ١٩٤١، ئیرۆس و ژیار ١٩٥٥، مرۆڤی تاك ڕەهەند ١٩٦٤، کلتور و کۆمەڵگە ١٩٦٥، بەرەو ئازادی ١٩٦٩).

پاشان "میکائیل ڤالتەر" نەسکێکی تەواو تەرخان دەکات بۆ فەیلەسوفی بەناوبانگی فەرەنسی "میشێل فۆکۆ". "فۆکۆ" ساڵی ١٩٢٦ لە بواتێ لەدایکبووە و ساڵی ١٩٨٤ لە پاریس مردووە. ئەم فەیلەسوفە بە یەکێك لە گەورەترین رەخنەگرە کۆمەڵایەتیەکانی سەدەی بیستەم دەژمێردرێت.. لەم کتێبەدا "ڤالتەر" دەربارەی "فۆکۆ" دەڵێت: (کەسێك نییە میشێل فۆکۆ بخوێنێتەوەو گومان لەوە بکات کە ئەو رەخنەگری کۆمەڵایەتیە. فۆکۆ هەڵوێستێکی رەخنەیی زۆر توندی لە کۆمەڵگەی فەرەنسی و سەرجەم کۆمەڵگە ئەوروپییەکانی تر بە گشتی وەرگرت. بێگومان فۆکۆ یەکێکە لە گرنگترین فەیلەسوفە رەخنەگرەکانی سەدەی بیستەم. زمانی رەخنەیی ئەو زۆر توندەو لێوان لێوە لە توڕەبوون و یاخیبوون.. کتێبەکانیشی بریتین لە بانگهێشتێکی راستەوخۆ بۆ بەرخوردکردن: واتە بەرپەرچدانەوەی کۆمەڵگە یان ڕاستر بڵێین بەگژاچونەوەی ئەو دەسەڵاتە سەرکوتکەرانەی لە هەناوی هەموو کۆمەڵگەیەکدا هەن، چونکە ئەو پێی وایە تاکەکەس لە ژێر هەڕەشەی ئەو هێز و دەسەڵاتانەدایە).

پاشان نوسەری ئەم کتێبە پرسیارگەلێکی لەمجۆرە دەکات: (بەڵام لەژێر ناوی چیدا ئەم بەرخوردە دەکرێت؟ لە پێناوی کێدا دەکرێت؟ ئامانج لێیشی چییە؟ ئەڵبەتە ناتوانین وەڵامێکی تەواوی ئەم پرسیارانە بدەینەوە.. لەبەرئەوەی میشێل فۆکۆ بە ئاڵۆزی و نهێنی و دەمامکەوە دەمێنێتەوە. لەبەر ئەم هۆیەش ئێمە سیاسەتی ئەومان بە سیاسەتی تایبەت و دەگمەن ناونوس کردووە. دیدگای فۆکۆ بۆ سیاسەت و دەسەڵات و ئەو پەیوەندیانەی دەسەڵات کە لە کۆمەڵگەدا هەن لە دیدگای بیرمەندانی دیکە جیاوازترە، تەنانەت هەندێك پێیان وایە فۆکۆ تیۆریایەکی تەواو تازەی هێناوەتە ئارا کە پێشتر کەس پێی ئاشنا نەبووە).

تیۆریای کلاسیکی یاخود مارکسیزم سەبارەت بە دەسەڵات، پێ لەسەر دەسەڵاتی سێنتراڵ دادەگرێت کە بریتییە لە حکومەت و سەرۆك کۆمار و وەزیرەکان و ئیدارەی بیرۆکراسی و...هتد. بەڵام تیۆریای "فۆکۆ" گرنگی بە خوارەوەی پەیوەندیەکانی دەسەڵات دەدات نەك سەرەوە،

چونکە دەسەڵات لە بۆچونی "فۆکۆ"دا بە هەموو لایەکی جەستەی کۆمەڵایەتیدا ڕەگی داکوتاوە و بریتییە لە تۆڕێکی گرێچنی ئاڵۆز کە هەموان دەگرێتەوە، هەر لە پاسەوانی باڵەخانەیەکەوە تا سەرەك کۆمار.

بۆیە پێویستە خۆمان رابێنین لەسەر ئەوەی لەژێرەوە دەسەڵات ببینین نەك تەنها لەسەرەوەڕا. ئەم تیۆریایەش بەشێوەیەکی تایبەت بە سەر کۆمەڵگا مۆدێرنە پێشکەوتووەکانی خۆرئاوادا پراکتیزە دەبێت، لەبەرئەوەی تەکنۆلۆژیای کۆنترۆڵکردن لەوێدا بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر گەشەی کردووە. بە بۆچونی "فۆکۆ" کۆمەڵگەی کۆنترۆڵ بەرهەمی مۆدێرنەیە و کۆنترۆڵکردنی مرۆڤیش لە قوتابخانەوە دەستپێدەکات تا دەگاتە سەربازگە و فەرمانگەکان. بەمجۆرە دەزگاکانی مۆدێرنە جەستە و ئەقڵی مرۆڤەکان کۆنترۆڵ دەکەن و تەنانەت لە پشتی پەردەشەوە بەو شێوەی خۆیان دەیانەوێت ئاڕاستەیان دەکەن.

کەواتە ئەو ئازادیەی کۆمەڵگا مۆدێرنەکانی خۆرئاوا خۆیانی پێوە بادەدەن، بەو ڕادەیە گەورە نییە کە ئێمەی خەڵکانی وڵاتانی جیهانی سێهەم مەزەندەی دەکەین. بێگومان لەوێڕا پەراوێزێکی دیاریکراو لە ئازادی هەیە، بەڵام ئەم ئازادیە زیاد لە پێویست دیسپلین کراوەو چاودێری دەکرێت. لەبەرئەوە "فۆکۆ" کتێبە بەناوبانگەکەی خۆی لەژێر سەردێڕی (کۆنترۆڵ و سزا)دا بڵاوکردەوە.

"فۆکۆ" لەم کتێبەیدا دەستی کرد بە تاوتوێکردنی ئەو میکانیزمی دەسەڵاتەی لە کۆمەڵگەی بۆرژوازی فەرەنسی یاخود ئەورووپیدا لە ئارەدایە، توانیشی ئەوە بسەلمێنێ کە مرۆڤ بێئەوەی هەست بە خۆی بکات لەلایەن دامودەزگا مۆدێرنەکانەوە چاودێری دەکرێت.

بەڵام هەندێك بیریار پێیان وایە "فۆکۆ" لە ڕەخنەگرتنی مۆدێرنەو کۆمەڵگە مۆدێرنەکاندا زیادەڕۆیی کردووە، "یۆرگن هاپرماس"ی فەیلەسوفی ئەڵمانی لەم ڕووەوە ڕەخنەی لێدەگرێت و بە ئانارشیست و عەدەمی تاوانباری دەکات.. تەنانەت "هاپرماس" لەسەرکۆنەکردنی "فۆکۆ"دا دەگاتە ئەوەی بڵێت: (فۆکۆ لە هەوڵی ئەوەدایە کۆدێتا لە مۆدێرنە بگێڕێت یان لە چوارچێوەی ئەو هەڵبێت، وەکی ئەوەی مۆدێرنە زیندانێك یاخود قەفەزێك بێت). ئەم هەڵوێستە نێگەتیڤەش لە مۆدێرنە، بەلای هەندێکەوە نە هەڵوێستێکی نائەقڵانیە و بگرە ماڵوێرانکەریشە.. سەبارەت بە "ئەلبێر کامۆ" نوسەری ئەم کتێبە دەڵێت: (بەلای چەپی دیموکراسی و لیبرالیەوە ئەوا ئەلبێر کامۆ کەسێکی نمونەیە و شایەنی هەموو ڕێزێکە، ئەمەش بە پێچەوانەی سارتەرەوەیە کە زیاد لە پێویست شوێن کۆمۆنیست و ستالینیەکان کەوت و هەڵەی سیاسی کوشندەشی کرد).

"کامۆ" دوای ئەو مردنە پوچگەراییەی بە ڕوداوی ئۆتۆمبێل، لە کاتێکدا تەمەنی لە پەنجا و سێ ساڵێك تێپەڕی نەکردبوو، بوو بە ئەفسانەیەك. مردنی "کامۆ" بەو شێوە کتوپڕ و لەناکاوە، وایکرد نوسینەکانی و ژیانی بە ڕادەیەکی زۆر هاوجوت و هاوشێوەی یەکتری بن.

"میکائیل ڤالتەر" دەڵێت: (کامۆ وەکی زۆرێك لە رۆشنبیرە هەلپەرستەکان نەبوو کە شتێك بڵێت و شتێکی تر بکات، بەڵکو هەموان پێیان وایە کە کامۆ پیاوێکی مەبدەئی بووە و لایەنگری ماف و دادپەروەری بووە، بەڵام ساتەوەختێك لە ژیانی ئەودا هەیە کە لەو پرانسیپانەی

لایداوە یان لانی کەم خیانەتی دەرهەق کردون، ئەمەش لەسەروەختی شۆڕشی جەزائیریدا بووە).

لە سەردەمی شۆڕشی جەزائیریدا پیاوە دادپەروەرەکە پشتی لە دادپەروەری کرد، وەکی "سیمۆن دیبۆڤوار" لە یاداشتەکانیدا دەرهەق بە "کامۆ" دەڵێت. بەڵام نوسەری ئەم کتێبە دەیەوێت بەرگری لە هەڵوێستی "کامۆ" بکات لەسەروەختی جەنگی جەزائیرداو ئەو تۆمەتانەی لێ دووربخاتەوە کە بەلایەنگری کۆلۆنیالیەتی فەرەنسی تاوانباری دەکەن. "ڤالتەر" دەڵێت: (مەسەلەکان زۆر لەوەی ئێمە پێمان وایە ئاڵۆزترە. ئەو قۆناغە قۆناغێکی زۆر دژوار بوو، بۆیە مافی ئەوەمان نییە لەم پێگە ئارام و ئاسانەی ئەمڕۆوە بکەوینە دادگایکردنی خەڵك.. ئاسانە تۆمەت بدەیتە پاڵ کەسانێك، بەڵام گەر تۆ لە جێی ئەوان بیت و تێکەڵ بەو گێژاوە بیت، ئەوا تۆ چیت دەکرد؟ ئەوانەی دوای کۆتایهاتنی شەڕ خۆیان دەکەن بە قارەمان، شایەنی ئەوەنین خۆمانیان زۆر پێوە خەریك بکەین.. موزایەدەکردن بەسەر خەڵکانی ترەوە، چەندە کارێکی ئاسانە).

سەبارەت بە "هربرت مارکۆز" و کتێبە بەناوبانگەکەی (مرۆڤی تاك رەهەند)، "میکائیل ڤالتەر" دەڵێت: (ئەو کتێبەی بریتیە لە سرودێکی غەمگین و تەنزئامێز، سرودێك ئامانجی سەرکۆنەکردن و بوغز کێشانە لە ئەمریکا). "مارکۆز" سەروەختێك کتێبی (مرۆڤی تاك رەهەند)ی بڵاوکردەوە، سی ساڵێك بوو لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکادا دەژیا. ئەو ماوە زۆرەش دەرفەتی ئەوەی بۆ رەخساند تا بەباشی ئاشنای ئەو وڵاتە بێت.. ساڵی ١٩٣٣ و لەگەڵ هاتنە سەرکاری نازیەکان، "مارکۆز" ئەڵمانیای جێهێشت. کاتێکیش لە ساڵی ١٩٤٥ جەنگی دووەمی جیهانی کۆتایی هات، نەگەڕایەوە وڵاتی خۆی وەکی زۆربەی فەیلەسوفەکانی قوتابخانەی فرانکفۆرت بە تایبەت "ئەدۆرنۆ و هۆرکهایمەر"، بەڵکو ئەو پێی چاکتر بوو لە ئەمریکادا بمێنێتەوە، ئەو ئەمریکایەی ڕکی لێیەتی و خۆشی بەچارەی نایەت. بە بۆچونی "هیربرت مارکۆز" (مرۆڤی تاك رەهەند) بریتییە لە (مرۆڤی ئەمریکی) و مەبەست لێشی ئەوەیە کە ئەو مرۆڤە بە تەنها یەك رەهەند لە رەهەندەکانی مرۆڤ بیر دەکاتەوە کە ئەویش رەهەندی بەرخۆری مادییە.

بەڵام نوسەری ئەم کتێبە پێی وایە سەرەڕای ئەوەی "مارکۆزە" ماوەیەکی زۆر لە ئەمریکادا ماوەتەوە، بەڵام نەیتوانیوە بە باشی ئەمریکاییەکان بناسێت و پێیان ئاشنابێت. هەربۆیە حوکمدانی ئەو بەسەر ئەو وڵاتەدا ناهەقی تێدایە و تاڕادەیەکیش زیادەڕۆیی پێوە دیارە. راستە ئەو لە شەقام و ناو میترۆ و سوپەرمارکتەکاندا شانی بە شانیانەوە بووە، بەڵام ئاخۆ ئەمە بەسە بۆئەوەی بڵێین کە ئەو بەڕاستی میللەتی ئەمریکای ناسیوە؟

سەبارەت بە "ئەنتۆنیۆ گرامشی"ش، نوسەری ئەم کتێبە پێی وایە نمونەی بەرزی دەروەستی سیاسی و داکۆکیکردن بووە لە کێشەی چینە هەژار و چەوساوەکانی کۆمەڵگە. هەروەها نوسەرێکی بە توانا و خەباتگێڕێکی سیاسی دڵسۆزیش بوو. لە تەمەنی سی و پێنج ساڵیدا زیندانی کراو دوای یانزە ساڵ ئازادکراو بە ماوەیەکی کەمیش دوای ئازادکردنەکەی ماڵئاوایی لە ژیان کرد.. ئەو لە ترۆپکی تەمەنی لاویەتی و

چالاکیدا بوو کە فاشیستەکان تیرۆریان کرد.

ئیتر ژیانێکی نمونەیی یان پڕ تێکۆشانتر هەیە کە لە ژیانی ئەو مەزنتر بێت؟ ئەوەی جێگەی سەرنجیشە ئەوەیە کە لە زینداندا بە هەزاران لاپەڕەی نوسی و وەکی زۆر زیندانی تر خۆی نەدایە دەست نائومێدیەکی قوڵ. ئەو زانی چۆن ئەو ماوەیەی زیندان بقۆزێتەوە بۆئەوەی بەرهەمە سەرەکیەکانی خۆی تێدا بنوسێت. "ڤالتەر" پێی وایە کەشفی سەرەکی "گرامشی" ئەمە بوو: کۆمەڵگەی مەدەنی بۆرژوازی زۆر تۆکمە و بەهێزەو ئێجگار چڕ و پڕە و فرە ئاڵۆزیشە. لێرەوە ئەو پێی وایە دەوڵەت لە کۆمەڵگە سەرمایەداریە پێشکەوتووەکاندا، بەرهەمی توێژە سەردەستەکانی ناو کۆمەڵگەی مەدەنیە.. کەواتە دەوڵەت ئەو ئامرازەیە کە چینی باڵادەست لە کۆمەڵگەدا بەکاریدەهێنێت، لە پێناو جێبەجێکردن و هێنانەدی مەبەست و بەرژەوەندیەکانی خۆیدا. راستە دەوڵەت دەیەوێت سیفەتی بێلایەنی بداتە خۆی و تەنانەت لە هەوڵی ئەوەدایە خەڵکی قەناعەت پێ بکات کە بۆ هەموانە نەك بۆ چینوتوێژێکی دیاریکراو، بەڵام لە واقیعدا دەوڵەت خزمەت بە بەرژەوەندی چینی سەرمایەداری باڵادەست دەکات. ئەمەش ئاشکرای دەکات کە بێلایەنی دەوڵەت لە کۆمەڵگە پیشەسازیە سەرمایەداریەکاندا درۆیەکی گەورەیە.

سەبارەت بە "ژولیان باندا" نوسەری ئەم کتێبە دەڵێت: (ئەو نەوەد ساڵەی کە ئەو ژیا و تەواوی نوسینەکانی، بە بیری هیچ ڕۆشنبیرێکی فەرەنسادا نایەت، بەڵام کتێبەکەی دەربارەی خیانەتی ڕۆشنبیران تا ئێستاش هەر زیندووە. هەر ئەم کتێبەشە یادی ئەو بە زیندوویەتی رادەگرێت.. خوێندنەوەی ئەم کتێبە تەواو نابێت مادامەکی ڕۆشنبیرانێك مابن توانای ئەوەیان هەبێت خیانەت و ناپاکی لە پەیامەکەی خۆیان بکەن.

ژێدەرەکانی ئەم کتێبە پڕیەتی لە کەسایەتی و ڕوداوەکانی فەرەنسا لە سەدەی بیستەمدا، بۆیە ئێمە پێویستیمان بە یارمەتی و کۆمەکی ئەنسیکلۆپیدیا تایبەتیەکان هەیە تا لێی تێبگەین، ئەمە دەڵێین سەرەڕای ئەوەی کتێبەکە بە گڕوتینێکی زۆر و ڕەوانبێژیەکی راستەقینەوە نوسراوە.

### سەرچاوە

بیان الکتب، ژمارە (٢٤٠)، بەرواری (٩ی



ئەگەر هونەری چاپکردن یەکێك بێت لەو دەسکەوتانەی مۆدێرنە بەرهەمی هێنا، ئەوا هونەری وەرگێڕان پرۆسەیەکی مەزنترو بەردەوامی رۆشنگەرییە و ئەو دەروازە مەعریفەییەیە کە مرۆڤایەتی بە بەرهەمەکانی عەقڵ ئاشنا دەکات.

لێرەوە دەمەوێت باس لەوە بکەم کە وەرگێڕان پرۆسەیەکە کۆمەڵگا لە قۆناغی خۆ دروستکردندا پێی دەگات و هەرئەمیش میکانیزمێکی سەرەکی کرانەوەی کۆمەڵگایە

بەرووی کایەی مەعریفی دەرەوەدا.

وەرگێڕان بە چ فۆرم و لە پێناو چ بابەتێکدا بخرێتە کار. چیە خاڵی زیندوو راگرتنی ئەو بابەتەی وەردەگێڕرێت. کام وەرگێڕان دەتوانێت کرانەوەیەك دروست بکات کە کۆمەڵگا بە چەندین ژیار و تێزی جیاواز ئاشنا بکات. بێ ئەوەی هیچ کایەیەك لە ستراکتۆری کۆمەڵایەتی بەهاو دەستکەوتی خۆی لەو پرۆسەیەدا بدۆڕێنێت.

(شوان ئەحمەد) یەکێکە لەو وەرگێڕە جدییانەی توانیویەتی لە بواری وەرگێڕاندا بابەتگەلێك هەڵبژێرێت کە کایەی مەعریفی پێویستی پێیەتی و زمانێك لە وەرگێڕانەکانیدا بەکاربهێنێت کە خوێنەر هەست بە چێژی خوێندنەوە و ڕونی بکات لە تێگەیشتندا. ئەم کتێبە نوێیەی وەرگێڕ قسەکردنە لەسەر سێ چەمکی سەرەکی کە عەقلانیەتی خۆرئاوا بەرهەمی دەهێنێت و دەکەوێتە ژێر کاریگەری ڕەخنەی هەمان ئەو کۆمەڵگایانەوە.

هەروەك نوسەری وتار و لێکۆڵینەوەکانی ئەم کتێبە لە وتارێکدا دەڵێت (ئەوە لە خۆبایی بوون و بێ چاوڕوییە کە من بتوانم تەواوی ئاقارە فەلسەفیەکانی خۆرئاوا لە یەك وتاردا بخەمە ڕوو)

پێم وایە وەرگێڕیش هەمان قسە بۆ خۆی بەڕاست دەزانێت گەر بتوانێت لە ڕێگای ئەم کۆمەڵە وتارەوە فەلسەفەی خۆرئاوا و ڕۆشنگەری و ئەو دیاردانەی بەرهەمی دەهێنن ڕون بکاتەوە. بەڵام توانیویەتی فکری ئەوروپی لە خەسڵەتی ئاڵۆزی و نوخبەوی بونی قوتار بکات و ببێتە ئەو بابەتەی ئەقڵی کۆمەڵگای ئێمە بە سادەیی لێیتێبگات.

بەشی یەکەمی ئەم کتێبە تەرخانە بۆ فەلسەفە و فیکری سیاسی. کە چەند تەوەرێك دەگرێتەوە.

نوسەر دەیەوێت ئەوە نیشان بدات کە پاش ئەوەی ئەقڵ لە کۆت و بەندی تیۆلۆژی و تەقلیدی رزگاری دەبێت، چۆن ڕوبەڕوی قەیرانێکی قوڵتر دەبێتەوە، ئەو دەمەی عەقلانیەت لە ترۆپکی ڕۆشنگەری و سەرقاڵی مێژوو دروستکردنە. چۆن لە هەمان کاتدا دژەکەی خۆی هەڵگرتووە و بە ئاڕاستەیەکی وێرانکەر ڕوبەڕوی خۆی دەبێتەوە.

گرنگترین ئەو دیاردەیەی کە پرسیاری بەرهەم هێنا جەنگ بوو، جەنگ لە کایەی سیاسیەوە گوێزرایەوە نێو کایەی مەعریفی و چەندین پرسیاری جەوهەری و تێزی فەلسەفی بەرهەمهێنا..چونکە بە بڕوای ئەوان ئەقلانیەت بوە مایەی کارەسات و ماڵوێرانی و جەنگی جیهانی یەکەمیش سەرەتای ئەو گۆڕانە بوو کە لە تێڕوانین بۆ ئەقلانیەتدا دەرکەوت.

فەلسەفەی کانتیزم کە ترۆپکی ڕۆشنگەری بوو ڕووبەڕووی (هایدگەر) بوەوە، (هایدگەر) کەوتە ڕەخنەگرتن لە کەلەپوری ڕۆشنگەری کە کانتیزم نوێنەرایەتی دەکرد. هایدگەر کەوتە تێکوپێکدانی بنەماکانی میتافیزیقای خۆرئاوا (ڕۆح و لۆژیك و ئەقڵ).

ئەگەرچی (کاسیرەر) پێشنیاری دیالۆگ و گفتوگۆی کرد بۆ چاوخشانەوە بە فەلسەفەی (کانتیزم)دا، بەڵام (هایدگەر) داوای دەستبەرداری دەکرد لەو ترادسیۆنە ئەقلانیەی لە سەدەی هەژدەوە باڵادەستە، ئەم دەرکەوتنەی (هایدگەر)، سەرەتای سەرکەوتنی ئاقاری نائەقلانی بوو بەسەر ئاقاری ئەقلانیدا لە کایەی فەلسەفەدا.

دیارترین دادگایی کردنی ئەقڵ لەگەڵ جەنگی دووەمی جیهاندا

سەری هەڵدا بە پێشڕەوی فرانکفۆرتیەکان. قوتابخانەی فرانکفۆرت دەستی کرد بە تاوتوێکردنی مێژووی ئەقڵ هەر لە (ئەفلاتون)ەوە تا جەنگی دووەمی جیهانی..

جەنگ جارێکی تر هەموو خەونەکانی خۆشگوزەرانی کوشت و پێشکەوتنی هەڵگەڕانەوە بۆ دواکەوتن.

فرانکفۆرتیەکان دەیانپرسی، بۆچی مرۆڤایەتی لە شەڕێکی وا خوێناوی گلا؟ بۆچی شارستانیەتی ئەوروپی بایدایەوە بەلای بەربەریەتدا، لە کاتێکدا بە پێشکەوتنی گەورەی مادی گەیشتبوو؟

(ئادۆرنۆ) و (هۆرکهایمەر) وەڵامی قەیرانی ئەقڵیان بەم جۆرە دایەوە، بڕوابوون بە خەسڵەتی ناکۆتایی و رەهای پێشکەوتن کە بەرهەمی زانست و تەکنۆلۆژیایە.

ئەو دەمەی زانست بە تەنها بەسەر پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ و مرۆڤ و مرۆڤ و سروشتدا پراکتیزە دەبێت. ئەوە بەشتبونی کەینونەی کۆمەڵایەتی لێدەکەوێتەوە، ئەوان پێیان وایە سیستمی سەرمایەداری یەك مەبەست و ئامانجی هەیە ئەویش تێکشکاندنی فیکر و کۆنترۆڵکردنی ئینسانە بۆ ئەوەی وەکو مێگەل مامەڵەیان لەگەڵ بکرێت.

فرانکفۆرتیەکان پێیان وایە دەبێت ئەقڵ لە چنگی پۆزەتیڤیزمی سەرمایەداری قوتاربکەین. ئەقڵی خۆرئاوا پێویستی بە ڕەخنە لێگرتن هەیە لە پێناو تازەکردنەوەیدا.

نوسەر پێی وایە ئەگەر هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی جیهانی نەبوایە کەس نەیدەوێرا رەخنە ئاراستەی ئەقڵ بکات، بۆیە پێویستە قەیرانی ئەقڵ و ئەقلانیەتی خۆرئاوا لەم چوارچێوە گشتییەدا سەیر بکەین.

دواتر لە تەوەرەکانی تری ئەم بەشەدا نوسەر باس لە قۆناغی سێیەمی ڕەخنەگرتن لە ئەقڵی خۆرئاوا دەکات کە بەبڕوای ئەو گرنگترین و ترسناکترین قۆناغە. کەسایەتیە فەلسەفیە دیارەکانی ئەم قۆناغە بریتین لە (فۆکۆ و دێریدا و دۆلۆز) لەلایەك و (هاپرماس) و گروپەکەی لەلایەکی ترەوە.

کێشەی نێوان ئەم دوو گروپە تا ئێستاش لەلایەن فەیلەسوفە گەنجەکانەوە بەردەوامە وەك (لۆك ڤیری).

پێویستە ئاماژە بەوە بدەم کە تەوەرەکانی ئەم کتێبە هێندە فراوانە من ناتوانم باس لە هەمویان بکەم. ئەوەتا لە بەشی یەکەمدا تەنها خوێندنەوەم بۆ چەند تەوەرێکی کردوەو ئەوانی تر بۆ نوسینی بەپێزتر جێدەهێڵم.

بەشی دووەمی کتێبەکە باس لە مۆدێرنە و ڕۆشنگەری دەکات. نوسەر مۆدێرنە بە بەرهەمی عەقڵی ئەوروپی دەزانێت و دەڵێت بریتیە لەو سەرکێشیە قەشەنگەی ئەوروپا لە سەدەی شانزەوە دەستیپێکرد و بوە مایەی هاتنەدی ئەقلانیەت و کامەرانی و ئازادی لە کۆمەڵگاکانی خۆرئاوادا. هەروەها بوە مایەی تێکوپێکدانی ئەو بیروباوەڕە تەقلیدیانەی لە ڕابردودا باڵادەست بون، هەر ئەمەش بوە هۆی شەڕێکی دەستەویەخە لەگەڵ پیاوانی ئاینی و فەرمانڕەوا ستەمکارەکان.

کڵێسا توڕە نەبوو هەتا ئەو کاتەی فەیلەسوفەکان پێشکەوتن و ڕۆشنگەرییان لە ئاین جیاکردەوە. ئەم کارەش لەلای (تۆرگۆ) و لە ساڵی ١٧٥٣ دەرکەوت. ئەگەرچی (تۆرگۆ) پیرۆزترین زانستی خوێند لە سۆربۆن ئەویش تیۆلۆژیا بوو، وە

پێی وابوو مەسیحیەت روناکیەکی نوێیە و هەزار جار لە رووناکی ئەدەب و فەلسەفە مەزنترە. بەلام پاش چەند سالێکی کەم کەوتە جیاکردنەوەی ئاین لە رۆشنگەری و کەنیسەی جێهێشت و رویکردە بڕواهێنان بە ئاینی ئەقلانی.

پرۆسەی رەخنەگرتن لە کلێسا و ئاینی مەسیحی هەروا بە ئاسانی و بێ کێشە رووی نەدا، فەیلەسوفەکان کەمایەتی بون و روبەڕوی زۆرینەیەکی رێکخراو دەبون لە کۆمەلگا و پیاوانی ئاینیی، ئەو فەیلەسوفانەش (ڤۆلتێر و دیدرۆ و مونتسیکۆ... هتد) بون.

ڤۆلتێر بەرەنگارییەکی توندی بیروڕاکانی کراو لە پێناو نەکشانەوەی لە تێڕوانینەکانی ناچاربوو بەناوی خۆیەوە کتێب و نوسینەکانی بلاونەکاتەوە. ئەم بەردەوامیەی کردیە دامەزرێنەری فەلسەفەی دیموکراسی لە خۆرئاوادا.

لەگەل بەرەنگارییەکی توندی فێندەمینتالیستە کاتۆلیکەکان بەرامبەر بە ڤۆلتێر بەلام ئەو زۆر گەشبین بوو، وە دلنیابوو لەوەی دەتوانن شۆڕشێکی گەورە لە ئەقلی خەلکدا بەرپا بکەن. بەلام پرۆسەی یەکلایکردنەوەی یەکجارەکی لەگەل فێندەمینتالیزمی مەسیحی پتر لە سەدەیەکی خایاند، پاش ئەوەی کاتولیکی فەرەنسی بۆی دەرکەوت کە بیروباوەڕەکانی ڕۆشنگەری و عەقلانیەت و مۆدێرنە راستیەکی حاشاهەلنەگرەو بەری پێ ناگیرێت. پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە بۆچی رۆشنگەری لە ئەوروپا سەری هەلدا؟ بۆچی میللەتانی تر دواکەوتن؟

ئەمە ئەو پرسیارەیە کە نوسەر لە چەند تەوەرێکی ئەم بەشەدا رونی دەکاتەوە و هۆکارەکان باس دەکات.

لە تەوەرەی (هیگل و رۆشنگەری) باس لە روبەڕوبوونەوەی فەیلەسوف دەکات لەگەل ئاین، ئەو باجە زۆرەی لەو پێناوەدا دەیدا.

بەشی سێیەمی ئەم کتێبە باس لە دیاردەی فێندەمێنتالیزم دەکات. نوسەر فێندەمینتالیزم بە پەتایەکی ئایینی دەبینێت کە دوچاری هەموو ئاینێك دەبێت، ئەو شەڕە مەزهەبیەی بە درێژایی دووسەدە ئەوروپای پەرتپەرت کرد بەرەنجامی دەمارگیری ئاینی مەسیحی بوو. لە بەرامبەردا فەیلەسوفەکان چەمکی (لێکبوردن) یان پێشنیار کرد لە پێناو قبولکردنی یەکتردا. بەلام ئەم قبول نەکردنە لەناو تەنها ئاینێکدا بەهەمان شێوە ئامادەیی هەبوو ئەگەرچی جیاوازییەکان لە چەند مەسەلەیەکی لاوەکیدا بوو، هەروەك لە نێوان مەزهەبی (شیعە و سوننە) لە ئیسلامدا هەیە.

نوسەر لەم بەشەدا باس لە فێندەمێنتالیزمی ئیسلامی دەکات و دەلێت ئەبێت کۆمەلگاکانی ئێمە چەند سەدەی پێویست بێت تا هەمان ئەزموونی ئەوروپا تێپەڕێنێت.

نوسەر دەلێت کۆمەلگای عەرەبی زۆر لە ڕەوتی پێشکەوتن و شارستانیەت دواکەوت. هاوکات لە هەموو رویەکەوە لە هەلومەرجێکی ناهەموار و تراژیدیدا دەژین. بۆیە بە رۆشنبیرانی خۆرئاوا و بە سیاسەتمەدارانیش دەلێت (زۆر سەرتان سوڕنەمێنێ لەوەی لە ئێمە ڕودەدات، گالتەمان پێمەکەن و لاقرتێمان مەکەن لەسەر ئەوەی لەناو کێشەی فێندەمێنتالیزمدا نوقم بوین).

نوسەر ئاماژە بە شەڕی درێژخایەنی فەیلەسوفەکانی ئەوروپا دەدات لەگەل فێندەمێنتالیزمدا، پێویستە کۆمەلگای عەرەبی دان بە بونی

هەمان دیاردەدا بنێت و لە ئەزمونی ئەوروپا سودمەند بێت، چونکە فێندەمینتالیزم دیاردەیەکە تەواوی ستراکتوری کۆمەڵایەتی داگیردەکات و بەقوڵایی هەموو کایەکاندا ڕۆدەچێت و زۆرترین بەرگریکەر بۆ خۆی بەرهەم دەهێنێت.

ئەم خوێندنەوە کورتە حەقی کەمترین لە تەوەرەکانی ئەم کتێبەی داوەو فراوانی وتارو باسەکان وایکردووە بەم جۆرە بەسەریاندا گوزەربکەم.

## موسافیرێك لەوبەر سنوورەکانی (من) و زەماندا

**سەلمان روشدی**
**لە فارسییەوە: تارا شێخ عوسمان**

لە هاوینی ساڵی (١٩٦٧)دا کاتێك خۆرئاوا، بۆ دواجار گیرۆدەی چنگاڵی خۆشباوەڕیی بوو ڤایرۆسی خۆشباوەڕیی لاوانی خۆرئاوایی بە دروشمی (ئێمە سەردەکەوین) قایلدەکرد. ئەوکاتەی کە بێکاریی هیچ مانایەکی نەبوو و ئایندە بوونی هەبوو، من بیست ساڵان بووم، لە کتێبفرۆشی کامبیرج بەرگێك چاپی گیرفانی کتێبی (تەپڵی تەنەکە)م کڕی کە (رالف مانهایم) وەریگێڕابوو. لەو ڕۆژانەدا هەرکەس شتێکی باشتر لە کتێب خوێندنەوەی بۆ کات بەسەربردن هەبوو، مۆزیك‌و سینەما هەبوون، ئەوەشمان لەبیرنەچێ بیرۆکەی (جیهان دەبێت بگۆڕدرێت) هێشتا بازاڕی گەرم بوو.

موسافیرێك لەودیوی سنوورەکان لە منداو لەو ڕۆژانەدا وەك زۆربەی هاوقۆناغەکانم ساڵەکانی خوێندکاریم لە زانکۆ لە عاشقبوونم بە(بۆنۆڵ، گۆدار، جیترای، وایدا، وێڵز، برگمان، کۆرساوا، یۆنسکۆ، ئەنتۆنی، دیلان، لینۆن، جگر، لینگ‌و مارکۆزە) بەسەربردو دواتریش بێئەوەی بەخۆم بزانم عاشقی ئەو پیاوە دووسەرە بووم کە بەلای خوێنەرانی (گراس)ەوە بە (مارکس/ ئەنگلس)[1] ناسراوە. سەرەڕای ئەو سەرقاڵییە جۆراوجۆرەم ژیاننامەی(ئۆسکار)[2]منی تووشی جۆرێك لە خووگیریی کرد ، ئەو خووگیرییەم لە تەواوی ڕۆمانەکەو بەدرێژایی ڕۆمانەکە لە بەشی یەکەم واتە (رامن پانی) دایە گەورە ئانا تاکو چیرۆکی کەللەی ئەسپی ئاوی پڕ لە مارماسی‌و لە(گردلیمۆ)ەوە تا دژە وێنەی تەنگ‌وتاریکی ئانا واتە (چێشتلێنەری ڕەش) درێژەی کێشا. هەندێك کتێب هەن کە چەندین دەرگا بەڕووی خوێنەردا دەکەنەوە، چەند دەرگایەك لە نهێنیدا، چەند دەرگایەك کە پێشتر خوێنەر هیچ زانیارییەکی لەبارەیانەوە نەبووە، خوێنەرانێك هەن کە خەون بەوەوە دەبینن ببنە نووسەر، ئەوانە بەدوای سەرسوڕهێنەرترین‌و نامۆترین دەرگادا دەگەڕێن، بەدوای ڕێگایەکدا دەگەڕێن بۆ ئەوەی بتوانن لەبەند بەندی کتێبەکە بکۆڵنەوەو شیتەڵی بکەنەوە، بۆ ئەوەی بتوانن بچنە ناو ناوەڕۆك‌و ئەودیوی شتە نووسراوەکانەوەو خۆیان لەنێوان‌و پشت‌وپێشی دەستەواژەکاندا حەشاربدەن.

هەندێ خوێنەری تریش هەن کەسانێکن کاتێك کتیبێك دەگرن بەدەستەوە لەناو خەیاڵدا نقووم دەبن، بۆ ئەو جۆرە خوێنەرانە کە لە نەژادی (ئەلیس لە سەرزەمینی سەیروسەمەرەدا)ن، بۆ ئەو کۆچەرییە خەیاڵپلاوانە ، ئەگەر شانسیان هەبێت ، هەندێك کتێب هەن کە پاسپۆرتی سەفەریان بۆ دەردەکەن، پاسپۆرت بۆ نووسەربوون، سەفەر بۆ شتێك کە لە ناخی خۆیاندا هەیە، واتە نووسەربوون پاسپۆرت جۆرە کتێبێکە. پاسپۆرتەکانی من ئەو

بەرهەمانەن کە جەوازی پێویستیان دەرکردووە، ئەوانیش بریتین لە: فیلمی (مانا)ی ئایزنشتاین، شیعری قەلەڕەشەکانی تەدهیوزو ئەفسانەکانی (بۆرخیس)، (تریستان سندی ئەستەرن)، (کەرکەدەن)ی بەرهەمی (یۆنسکۆ)، لەو هاوینەی (١٩٦٧)یشدا (تەپڵی تەنەکە)ی (گۆنتەر گراس) بوو.

ئەو ڕۆمانە مەزنەی گۆنتەر گراس پێیدەوتم : بەهەموو تواناتەوە لێدە، چاوەڕوانیەکانت زیاد بکە، میلەکانی دڵنیایی تووڕدە ، ڕووبەڕووی دونیا ببەرەوە، لەبیرت نەچێ کە تەنیا بە نووسین دەتوانیت هەزارو یەك شت بپارێزیت (منالێی، بیروباوەڕەکان، شارەکان، دوودڵیەکان، خەونەکان، چرکەساتەکان، ڕستەکان، دایكوباب، عەشقەکان)، ئەو شتانەی وەك زیخ لەدەستدەردەچن.

من هەوڵم دا ئەم شتانە لە ئەنسکلۆپیدیای ئەو مرۆڤە بچووکە تەپڵژەنە (ئۆسکار)ەوە فێرببم ، هەروەها لە کتێبێکی تری گراس بەناوی (ساڵەکانی سەگی)یەوە فێربووم کە: ئەگەر کارێکت تەواو کرد، ئەو کارە لە سەرەتاوە دەست پێبکەرەوەو ئەمجارە باشتر ئەنجامی بدە، گۆنتەر گراس کوڕی بەناوبانگی دانتیسکە، لە ڕوخسارە هەرە گرنگەکانی ئەدەبیاتی کۆچەو ڕەنگە کۆچکەر ڕووخساری سەرەکی یاخود بەردی مەحەکی سەدەی بیستەم بێت، گراس وەك زۆربەی مرۆڤەکان، وەك زۆربەی کۆچەرەکان شارێکی لەدەستداوەو دواتر لە شتەکانیدا شاردوویەتییەوەو پاشان لە قووتوویەکی تەنەکەدا دووبارە دۆزیویەتییەوە. (پراگی کۆندێرا، دبلنی جۆیس، دانتسیکی گراس، دوورخراوەکان، ڕاکردووەکان، کۆچەران) شارگەلێکە زۆریان لە لابەلای شتەکانیاندا لەم سەدەی ئاوارەییەدا هەڵگرتووە. نابێت هیچ کەسێك سەرسەختی ئەم نووسەرانە بە کەم بگرێ. ئەوانە ناهێڵن ڕابردوویان وەك (گدانسك[٣])ی لێبێت، لەو شارەدا کە گراس لەگەڵ خۆیدا هەڵیدەگرێ، شەقامی لابسوگ هەمان لابسوگی ڕابردووەو ئەو بەندەرەی کە یەکێتی هاوپەیوەندی تیا درووستبوو. نەك بەناوی (لینین)ەوە، بەڵکو بەناوی (شیشۆ)وە ناودەبرێت. من لێرەدا پەیوەندیو خزمایەتییەکی تایبەتی لەنێوان شەقامی(بۆهولاهبیو سای)خۆمو گراسدا دەبینمەوە. من لە شەقامی (واردن) لە شاری بۆمبای گەورەبووم. ئیمڕۆ بەو شەقامە دەڵێن (بوهولاهبی سای)، من لە نزیك (فلروافونتن)ەوە چوومە قوتابخانە. ئەمڕۆ ئەو قوتابخانەیە لە نزیك (هوتاتماکوك)ەوەیە. هەڵبەتە ئەو ناوە ناکۆڵۆنیالیستانە تازانە مانای پشتبەخۆبەستنی دەوڵەتی سەربەخۆی دەگەیاند. بەڵام لەدەستدانی پەیوەستییەکانی ڕابردوو جۆرێکە لە لەکیسچوون. لەلایەکەوە گراس کۆچبەرێکی تەواونییە، کۆچبەری تەواو لەژێر گوشاری سێ جۆر حاڵەتی بێرەگوڕیشەییدا دەناڵێنێت: ئەو نیشتمانی لە دەستداوە، ڕووبەڕووی زمانێکی بیانی دەبێتەوە. ئەو دەچێتە ژینگەیەکەوە شێوەی دابو نەریتو ڕەفتاریان لەڕەفتارەکانی ئەو جیاوازنو هەندێجاریش دابو نەریتەکانی ئەو پێشێل دەکەن. هەر ئەمە کۆچبەر دەکات بە سیمایەکی گرنگ. ڕەسەنایەتیو نەژاد، زمانو ڕێسا کۆمەڵایەتییەکان سێ چەمکی گرنگی شوناسی مرۆڤن، کە پێناسەی مرۆڤ دەکەن. کۆچبەر ئەو کەسەیە کە ئەو سێ

بنەمایەی لێدزراوە، ناچارە خۆی سەرلەنوێ پێناسە بکاتەوەو جارێکی تر بەدوای پێناسەیەکی نوێی خۆیدا بگەڕێت.

بە دڵنیاییەوە، گراس نیشتمانەکەی لەدەستداوە، هەروەك ئاماژەشی پێدرا، دواتر زانرا کە لەگەڵ خۆی هەڵیگرتووە. هەروەها دەتوانرێ بگووترێ بەشێك لە زمانیشی شێوە زمانی پروسی خۆرئاوایی سەردەمی منداڵیی لەدەستداوە، ئەو شتەی پێویست بوو لەسەری لەناو نووسینەکانیدا پارێزگاری لێبکات. بەڵام لەم بارەیەوە دەبێت ڕاستگۆیانە بڵێم کە من بەسەر سەهۆڵدا هەنگاو دەنێم، چونکە ئاشنایی من بە زمانی ئەڵمانی وەك ئاشنایی گراسە بە زمانی ئۆردویی. بەهەرحاڵ ئەگەر چاو لەمە بپۆشرێت، زۆر سەختە بتوانرێت بگوترێ کە گراس نووسەرێکی زمانی بیانییە. ئەو لە کۆمەڵگەیەکدا دەژی دابو نەریتە کۆمەڵایەتییەکەی بەو ئاشنایە. لە ڕاستیدا وەك لە باسەکانیدا دەردەکەوێت ئەو نوێنەرایەتی کەلتوری ئەڵمانی بە هەردوو بەشی خۆرئاواو خۆرهەڵاتییەوە دەکات. ئەو کەلتورەی دەربڕین لە زمانی ئەڵمانیا دەدۆزێتەوە. لێرەوە ئەو پرسیارە زۆر ڕەوایە کە وێناکردنی گراسێکی نیوەکۆچبەر چەندە واقیعیانەیە. من هەستدەکەم ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە زۆر بەسودە، چونکە بۆ من گراس لە ڕووەیەکی دیبیەوە نووسەرێکی کۆچبەرە تا ئەوەی ئەو مەسەلەیە بە بەشەکان دیاری بکەین. کۆچکردن بۆ ئەودیوی سنورە میللییەکان بەهیچ جۆرێك تەنها شێوەی دەرکەوتنی ئەو دیادەیە نییە. ئەگەر مرۆڤ نزیکیی کەلتوری شارێکی گەورە بکاتە پێوانەیەکی جیهانی، لەو حاڵەتەدا بۆ نموونە سەفەرکردن لە ناوچەیەکی سکوتلەنداوە بۆ لەندەن لە هەندێ کاتدا حاڵەتێکی توندوتیژیی کۆچکردنە لەوەی کە لەشاری بۆمبایەوە شتومەك بپێچیتەوە بۆ لەندەن. بەڵام من حەزدەکەم لەم ئەنجامەوە بۆ دەستەواژەیەکی باڵاتر بڕۆم، چونکە (کۆچکردن)خۆی وەك ڕەمزێکی هەمەلایەنەی سەردەمانی ئێمە دەخاتەڕوو. ئەو وشەیە لە وشەی (جێگۆڕکێ)ی یۆنانییەوە وەرگیراوە، ئەمەش شێوەیەك لە کۆچکردن ڕووندەکاتەوە. کۆچکردنی ئایدیۆلۆژییەکان بۆ وێناکردن، کۆچبەران (مرۆڤە جێگۆڕدراوەکان)بەشێوەیەکی(بوو نگەرایانە) خوازەیین. ئێمە لە هەموو شوێنێك بەر کۆچکردن دەکەوین. ئەگەر ئەو حاڵەتە بە شێوەیەکی خوازەیی لەبەرچاوبگرین، ئێمە هەموومان کەسانی کۆچەرین.

گۆنتەر گراس کۆچەرێکە لە ڕابردووی خۆی، ئەم مەسەلەیە ئیدی بە شاری دانتسیکەوە ناوەستێ. وەك خۆی دەڵێت ئەو لە خێزانو ژینگەیەکدا گەورە بووە کە تێیدا وێنەی جیهانی نازییەکان وەك ڕاستیەکی بەرچاو بایەخی هەبووە، سەرەتا کاتێك ئەمریکییەکان لەدوای جەنگ دێن، گراسی لاو دەبیستێ بەڕاستی چی لە ئەڵمانیادا ڕوویداوە ئینجا لەوە دەگات جەوهەری نازییەکان جگە لە ساختەو درۆ هیچی تر نەبووە. چ ئەزمونێکە لەوە بگەی هەموو تێڕوانینە جیهانییەکانت هەڵەیە نەك تەنها هەڵە بەڵکو لەسەر بنەمای (هیولیەکی) ئەخلاقی بنیات نراوە، چەند ئەرکێکی سەختە، کەسێك کە ڕاستیی لەسەر وێرانەو کەلاوەیەك بنیات بنێتەوە. دەمەوێت بڵێم ئەم پرۆسەیە وەك حاڵەتی کۆچکردنی (منی کۆنە)یە بەرەو (منی نوێ). ئەوەتا لەدوای کۆتایی هاتنی جەنگی دووەمی

جیهانی گراس‌و ئەڵمانیا دەبوایە لە سنورێکەوە تێپەڕبوونایە، ئەمەش شتێکە هێندە قورس‌و کوشندەیە کە ناتوانیت وێنای بکەیت. کاتێك ئێمە گراس بە کۆچبەرێکی لەم جۆرە دادەنێین، خێرا پەی بەوە دەبەین ئەو بیٚ ڕەگوڕیشەییە سیٚ لایەنەی کۆچبەران ئازاردەدات بۆ گراسیش کە کەسێکە لەملاو ئەولای مێژووەوە کۆچی کردووەو درووستبووە. یەکەم بێڕەگوڕیشەیی لەدەستچوونی شوێنە، گراس تەنها (دانتسیك)ی لەدەستنەدا، بەڵکو بەتەواوی هەستکردنی بە نیشتمان وەك ژینگەیەکی ئارام‌و خۆش لەدەستداوە. نیشتمان چۆن دەیتوانی ئەو چۆنایەتییە بپارێزێت پاش ئەو هەموو شتەی لەپاش جەنگەوە لەبارەی نیشتمانەوە زانی.

بێڕیشەیی دووەم زمانە، ئێمە کاریگەریی قۆناغی نازییەکان بەسەر زمانی ئەڵمانییەوە دەزانین‌و گراسیش هەمیشە لەبارەیەوە قسەی کردووە. پێویستە بنیاتنانەوەی ئەم زمانە لە وێرانەکانەوە پارچە بەپارچە شتێکی چارەهەڵنەگربوو، چونکە زمانێك کە ئەهریمەن بە سادەیی دەنگی خۆی تیابینییەوە هەویرێکی ترسناکە. نوێنەرانی (ئەدەبیاتی وێرانەیی) کە خودی گۆنتەر گراس یەکێکە لە ڕووخسارە بەرجەستەکانی ئەو ئەدەبیاتە، ئەو ئەرکە گرانە ئەفسانە ئامێزەیان گرتە ئەستۆ، بۆ ئەوەی ئەو زمانە دووبارە دروستبکەنەوە، زمانەکەیان وردکرد بۆچەندین پارچەی بچووك‌و پارچە ژەهراوییەکانیان دوور فڕێداو ئەوانی دیکەیان دووبارە پێکەوە بەستەوە.

بێڕیشەیی سێیەم کۆمەڵایەتییە، لێرەدا دووبارە دەتوانرێت بگوترێت ئەو گۆڕانەی لە کۆمەڵگەی ئەڵمانی یان باشتر بڵێین لە ئەڵمانیادا روویدا، ئەو گۆڕانەی گراس لەگەڵیدا گەورە بوو بە پێست‌و گۆشتی تاقیکردەوە، هەروەك ئەو گۆڕانی بنەما کۆمەڵایەتییەی کۆچبەرێك لە وڵاتێکی تردا تاقی دەکاتەوە، چونکە ئەڵمانیای نازی لە زۆر ڕووەوە وڵاتێکی دیکە بوو. دەبووایە گراس ئەو وڵاتەو ئەو جۆرە بیرکردنەوەیە دەربارەی کۆمەڵگە لە هەستی خۆیدا بسڕێتەوەو جۆرێکی نوێی بیرکردنەوە فێربێت، هەربۆیە من گراس بە کۆچبەرێکی دووفاق دادەنێم، گەڕیدەیەك لەودیوی من‌و زەمانی چۆنیەتی تێڕوانینەکان کە لە نووسینەکانی ئەوو بەرهەمە ئەدەبی‌وگوفتارەکانیدا پەنهانە، لە زۆر ڕووەوە چۆنیەتی تێڕوانینی بەو شێوەیەی من لێی تێدەگەم کۆچبەرێکە. لەبەرئەوەیە بێڕیشەیی سیٚ لایەنە کۆچبەران فێردەکات: کە راستی بەدیهاتوویەکی هونەرییە، واقیعیەت تا ئەوکاتەی نەیەتەبوون بوونی نیە، ئەو واقیعیەتە دەتوانێت وەك هەر بەدیهاتویەکی دیکەی هونەریی باش بێت یان خراپ‌و دەشتوانێت دووبارە لەناوبچێت. یان ئەوەی کە گراس بەهۆی گەشتەکەیەوە بەناو مێژوودا فێری بوو گومان کردن بوو، لەوەبەدواوە گۆنتەر گراس گومانی لە هەموو ئەو کەسانە هەبوو بانگەشەی ناسینی ڕەهایان دەکرد، گومانی لە هەموو ڕوونکردنەوە کولییەکان‌و هەموو ئەو سیستمە فیکرییانە هەبوو کە بانگەوازی کامڵبوونیان دەکرد. لەنێو نووسەرە گەورەکانی جیهاندا گراس سەرقافڵەی هونەرمەندێکی بێیەقینە، هونەرمەندێك کە نیشانەی ناسینەوەی دەشیا پرسیارێك بێت ، ئەگەر کرمی لولپێچ[٤] بونی نەبووایە، ئەزموون ئەم فۆرمەی کۆچبەری، لێبوردن لە بەرامبەر

بۆچوونەکانی دیدا –کە ئەمەش چەند گرنگە –فێردەکات؟ لەبەرئەوە دەتوانرێ بگووترێ کۆچبەریی دەبێت ببێتە ڕاهێنانێکی بنەڕەتی بۆ ئەو کەسانەی کە دەیانەوێت ببنە سۆسیال دیموکرات. تۆزێک دەربارەی لولپیێچ: ئەم گیاندارە نەرمە سۆسیال دیموکراتە، کە لە لانە سەرسوڕهێنەرەکەیدا وێنەیەک لەئۆقرەیی و تێڕامان و ئاگایی و وریایی و گەشەکردنی لەسەرخۆو جێگیر دەبەخشێت، خزمەتی گران بەهای پێشکەش بە گراس کردووەو هەندێکجار بۆ ئەو بۆتە مایەی جنێوپێدان و سووکایەتی پێکردنیش، لەلایەن ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەگەشەکردنی خێرا هەیە حەز ناکەم خۆم تێکەڵ بەو ڕووبەڕووبوونەوەیە بکەم، بەڵکو تەنها دەمەوێت ئاماژە بەو خاڵە بدەم، کە هەندێ کات هەیە گراس وەک لایەنگرییەکەی بۆ داماڵینی چەکی ئەتۆمی بەهیچ شێوەیەک وەک لولپیێچ(ئارام )نیە، بەڵام من لولپیێچ بە نیشانەی ئەوە دەزانم کە گراس لە زۆرکات و لە زۆربەی وێنەو ئایدیۆلۆژیایەکاندا وا هەستدەکات لەماڵەوەیە نەک لە شوێنە ڕاستەقینەکانی خۆی، ئەمەش تایبەتمەندیی کۆچبەرەو دواجار ئەو بوونەوەرێکی خوازەییە.

ڕۆشنبیری کۆچبەر لەخۆیداو لەتواناکانی ناخیدا ڕیشەدادەکوتێ بۆئەوەی دونیا دابهێنێت و سەرلەنوێ دایبهێنێتەوە، ئەمەش دەتوانێ گرفتی زۆر بخاتەوە: ئایا ئەمە لەو مەسەلەیەدا پەنهانە کە هاوولاتیانی ویلایەتە یەکگرتووەکان، ئەو ولاتەی کەلتووری کۆچبەرێکی هەیە، هەندێك جار (بۆ نموونە لەهەڵبژاردندا)وێنەکان بەباشتر دەزانن لە واقع لەگەڵ ئەوەشدا عاشقبوون بە وێنەکان وزەیەکی بەزەبر پۆزەتیفانەیە کاتێك گۆنتەر گراس چیکۆسلۆفاکیا لە کارەکانی کافکاو بەشاربوونی ژاپۆنی ئەمڕۆ لەڕێی(ئالفرێد دوبلین)ەوە دەبینێ، لەم ڕێگەیەشەوە یارمەتی ئێمە دەدات کە زۆرترو ڕوونتر ببینین. نووسەرێك پەی بە سروشتی هونەری واقیعی بردبێ، کەم تازۆر ئەرکی سەرشانییەتی بەشداری لە دروستکردنی ئەو واقیعەدا بکات. لەوانەشە هەر لەبەر ئەوەبێت گراس شێلگیرانە لە بواری کاریگەریی کۆمەڵایەتیدا هەوڵدەدات و خۆشەویستییە گەورەکەی گۆڕیوە بۆ پایەی کارو بەپێی ئەوەش لەبارەی چەندین مەسەلەی وەک بۆمبی ئەتۆمی و بریندارکردنی فەزای تایبەتی لەڕێی زانیارییە بانکییەکان و لەبارەی پەیوەندیی نەتەوە دەوڵەمەندەکانی باکور لەگەڵ نەتەوە هەژارەکانی باشورو هەندێ مەسەلەی تریش کە ئەویان بێزار کردووە، هەڵوێستی وەرگرتووە. لێرەوەیە مرۆڤێك لەبارەی واقیعەوە مشتومڕ دەکات، پێویستە هاوکات داهێنەرو سیاسەتمەداریش بێت. جێگەی سەرسوڕمان نییە کە گراس لەکاتی نووسینی ئەدەبیاتدا سیاسەتیش دەکات و لە شیکردنەوەی پرسیارە سیاسییەکاندا، ئالۆزترین مەسەلەی ئەدەبی دەچێتە قسەکانییەوە.

گراس لە وتاربێژییەکیدا بەناوی (لەناوچوونی مرۆڤایەتی دەستپێکردووە) بۆ یەکەمین جار ئەو بەڵگە بنبڕە دەهێنێتەوە کە نووسەر بۆ یەکەمین جار لە مێژووی مرۆڤایەتیدا ناتوانێت حساب لەسەر ئایندە بکات. لەبەرئەوە (هەر کتێبێك کە دەینووسێت ماڵئاوایی کردنە لە شتە زیانلێکەوتووەکان، لە بوونەوەرە بریندارەکان لە ئێمەو لە کەللەی ئێمە، لەو کەللانەی کە

بیریان لە هەموو شتێك کردۆتەوە تەنانەت لە دەرئەنجامەکانیش). لاواندنەوەو وتنی سروودە خەماوییەکان لە ڕاستیدا پەرچەکرداری هەڵسەنگێنراوی نووسەرە کاتێك کە شەودادێت. لەگەڵ ئەم حاڵەشدا گراس لە دەرەوەی ڕۆمانەکانیدا، لە هەنگاوە سیاسییەکانیداو لە هەموو نووسینەکانیدا کەسێکی ترەو هێندە سەنگینە کە کەسێك قسەبکات ئەو دەڵێت: هێشتا نەمردووین، لەوانەیە ئێمە گرفتاری گەورەترین کێشە بین لەگەڵ ئەوەشدا هێشتا لەناونەچووین، لە هەرشوێنێك ژیان هەبێت لەوێدا لێکۆڵینەوەو ململانێ و بیروباوەڕو بەڵگاندن و بیرکردنەوە هەیە. هەموو ئەو چەمکە قورس و گرانانە لەڕاستیدا شتێکی سادە دروست دەکەن ئەویش ناوی ئومێدە.

### پەراوێزەکان

١-گۆنتەر گراس هەمیشە ناوی (مارکس و ئەنگلس)ی بە پێکەوەلکاوی دەنووسی (*MarXsengels*).

٢-ئۆسکار ماتسارات پاڵەوانی سەرەکی ڕۆمانی (تەپڵی تەنەکە) یە.

٣-شاری کۆنی دانتسك دوای جەنگی دووەمی جیهانی ناوی گۆڕا بۆ گۆدانسك.

٤-ئاماژەیە بۆ کتێبی (لەیاداشتەکانی لولپێچێك) کە لەوێدا لولپێچ ڕەمزە بۆ پێشکەوتن، گراس لەو کتێبەدا لەو بڕوایەدایە لولپێچەکان لە ئێمە خێراتر دەجوڵێن. لەوێدا ڕەخنە لە توندڕەویی خوێندکارەکانی زانکۆی ساڵی ١٩٦٨ دەگرێت لە فەرەنسا.



**جۆرج ئۆروێل:**

ناوی ڕاستەقینەی ئێریك ئارسەر بلێرە، لە ساڵی ١٩٠٣ دا، لە هیندستان لەدایکبووە، دواتر بە ناوە ئەدەبییەکەیەوە (جۆرج ئۆروێل) شۆرەتی پەیدا کردووە. دایکی بە ئەسڵ فەرەنسییەو باوکیشی ئینگلیزەو لە ماوەی داگیرکردنی هیندستاندا لە لایەنی بەریتانییەکانەوە، لە ئیدارەی بەریتانی فەرمانبەر بووە.

لە تەمەنی چوار ساڵییدا لەگەڵ خێزانەکەیدا دەگەڕێتەوە بۆ بەریتانیاو لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بەرەو بۆرما دەکەوێتە ڕێ و لەوێ پەیوەندیی دەکات بە هێزەکانی پۆلیسی بەریتانیاوەو هەتا ساڵی ١٩٢٨ لەوێ دەمێنێتەوە.

ئۆروێل بە یەکێك لە نوسەرەکانی "نەوەی ئۆدن" لە قەڵەم دەدرێت، ئەم ناوەش لەو نوسەرانە نراوە کە لە ماوەی (١٩٠٠ –١٩١٠) دا لەدایك بوون و ئۆدینی شاعیر ناودارترینیانەو لە ساڵی ١٩٠٧ دا لەدایك بووە.

لە ساڵی ١٩٣٤ دا، ڕۆمانی "ڕۆژە بۆرماییەکان " ی نوسی، ئەوەی لەوێ بینیبووی لەو ڕۆمانەدا تۆماری کرد و لە نێوانی دێڕەکانیدا داشۆرینێکی سەختی هاوڕەگەزە بەریتانییەکانی خۆی کرد، لەبەر ئەو کارە دزێوانەی دژی ئاسیاییەکان کردبوویان. ئەم نەوەیە، لە بوارەکانی چیرۆك و

ڕۆمان و شیعر و شانۆ، هەروەها لە زانستی تیوریدا، گەلێك ناوی ئەدەبیی گرتۆتە خۆی. تیایاندا هەیە ناوی بە سەرانسەری جیهاندا بڵاوبۆتەوە، هەشیانە تەنیا لە ناو خاکی بەریتانیادا ناسراوە: جۆن ستراسی ـ ١٩٠١ لەدایك بووە، فرانگ ئۆکرن ـ ١٩٠٣، ف . س. بریچێت ـ ١٩٠٣، لیمان ڕۆزمۆند ـ ١٩٠٣، ئافلین واف ـ ١٩٠٣، والتەر گرینوێد ـ ١٩٠٣، جیۆ فری هاوسهۆڵدا ـ ١٩٠٣، کریستۆف ئاشروود ـ ١٩٠٤، لوی ماك نیس ـ ١٩٠٧، ستیڤن سپیندەر ـ ١٩٠٩، سیان ئۆفیلیان ـ ١٩٠٠، ه. ی بیتس ـ ١٩٠٥، دی لویس سیسیل ـ ١٩٠٤، گراهام گرین ـ ١٩٠٤، پیتەر فلیمینگ ـ ١٩٠٧، جەیمس هانلی ـ ١٩٠١، ئەلیزابێت سیریگ ـ ١٩٠٠، زۆری تریش.

ئەوانە هەموویان، ئۆروێلیش یەکێکە لەوان، لە "وێرانە خاك" دا لەدایك بوون، بەڵام کاتێك پێگەیشتن، پشتیان کردە ئەو وێرانەیەو ئیلیەتیان جێهێشت تا بە تەنیایی "ڕۆژەکانی خۆی بە کەوچکی قاوە بژمێرێت"، لە نوسینەکانیان و کارە سیاسییەکانیاندا دووپاتیان دەکردەوە "ئەوەی وێران بوو جیهانی ئێمە نیەو ئێمە لەو وێرانەیە بەرپرسیار نین".

ئۆروێل و ئەوانیتر لە ساتەکانی خۆشگوزەرانیی ئابوریدا، بە هۆی فراوانبونی کۆلۆنیالّییانەی بەریتانیاوە کە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتە ترۆپك، هیچیان نەبینی جگە لە ژمارەیەکی زۆری کوژراوەکان لە بەرەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیدا، پاشان ریزەکانی بێکاران، ئینجا مانگرتنی کرێکاران و شەڕو شۆڕی سیاسیی لەماوەی (ساڵە ڕەشەکاندا)، واتە ماوەی بیستەکان، هەروەها لە ماوەی (ساڵە سورەکان، یان ساڵانی توندوتیژیی) واتە ماوەی سییەکانی سەدەی رابردوو، وەك مێژوونوسەکان ناوی ئەو دوو ماوەیەی مێژووی بەریتانیان ناوە، بەریتانیایان خوێناویی کرد.

کامەرانیی بەریتانیی و گەشبینی ئینتەلاکردوە بەفیز و دەماری نەتەوەیی (بەڵام هەرگیز بۆش و بێ مانا نا، بەڵکو لەسەر دەسکەوتی دیاری هەموو بوارەکان دامەزراو) کە دانیاڵ دیفۆ لە ڕۆمانەکەیدا مزگێنی پێدابوو، دوای ئەویش جیسترتۆن و ڕۆبێرت لویس ستیفنسن و هینری نیوبۆڵت و دۆگلاس جیرولاد و بەتایبەتی ریدیارد کلبینگی شاعیرو چیرۆکنوسی نێودارتر لەوان، ئاڵاکەیان بەرز کردەوە، لەو ماوەیەدا کە ئۆروێل و هاوتەمەنەکانی بە شەقامەکاندا دەسوڕانەوە، هەموو ئەمە گۆڕا بۆ زەلیلییەکی نیشتمانی و هەژارییەکی پشتشکێن، ئەگەر دەربڕینەکە دروست بێت، بە ڕادەیەك هاوتەمەنێکی ئۆروێل (چیرۆك و ڕۆماننوس ه. ی. بیتس، لە ساڵی ١٩٠٥ دا لەدایك بووە) لە سەرگوزشتەکەی خۆیدا، ئەوەی دێتەوە یاد کە جزدانەکەی دایکی تەنیا شەش پنسی تێدا بوو).

ڕەنگە لەبەر ئەم هۆیانەو زۆر هۆی تریش، ئۆروێل و زۆرێك لە هاوتەمەنەکانی، یەکەمین شت گوزارشتیان لە ڕەتکردنەوەی ئەو بیرانە کردبێت کە ریدیارد کلبینگ مزگێنیی پێدابوون، لەگەڵ "ئەو وانە ئیمپریالیستییەی" کلبینگ دەیویست بەریتانیا بە زەبری شمشێر فێری گەلانی سەر زەوی بکات. بە نیسبەتی جۆرج ئۆروێلەوە، کلبینگ جگە لە "ئیمپریالیستێکی سادیی بێ هەست و خاوەنی ڕەوشتێکی نزم و کێویی زیاتر، شتێکی تر نیە".
ئۆروێل ڕەخنە لە ئیلیەت دەگرێت

لەسەر ئەوەی داکۆکیی لە کلبینگ دەکات، دەڵێت "ئەوە نوسەرێکە داکۆکی لێ ناکرێت"

ژوانی دووەمی کوڕانی ئەم نەوەیە لەگەڵ هەژارییدا بوو، لەگەڵ هەژارییدا مەشقی نوسینیان دەستپێکرد، کوڕانی ئەم نەوەیە شایەت بوون بەسەر کارەساتێکی ئابوریی و کۆمەڵایەتییەوە، ناوی کوژراو و بریندارو ونبووەکانی بەرەکانی جەنگی یەکەمی جیهانیان دەبژارد، ئەوانەی رۆژنامەکان بە زنجیرە بڵاویان دەکردەوە، لە ساڵی ١٩٣٢ دا، ژمارەیان گەیشتە سێ ملیۆن کەس.

لەو ماوەیەدا جوڵانەوەی (بزوتنەوەی نیشتمانیی بێکارەکان)، بەپێی وەسفی هەندێك لە مێژوونوسانی ئەو ماوەیە، شەقامەکانی هەندێك لە شارەکانیان کردبوو بە گۆڕەپانی جەنگ. لە ساڵی ١٩٣٢ دا، رۆژنامەی دەیلی تێلیگراف، راپۆرتێکی بڵاوکردەوەو تێیدا رایگەیاند کە "ئەو خۆپیشاندەرانەی کۆمۆنیستەکان دنەیان دەدەن، شاری لەندەنیان ئیفلیج کردووە".

لە بەرامبەری چالاکییەکانی چەپی بەریتانیدا، راستی زێدەڕۆش چالاك بوو. فاشیستە بەریتانییەکان بە رابەرایەتی سەرۆکەکەیان، ئۆزالد مۆزلی، پێکهێنانی "یەکێتی فاشیستە بەریتانییەکان" یان راگەیاند.

هەر لەو ماوەیەشدا ئەو جۆرە رۆمانە تەشەنەی کرد کە رەخنەگران ناویان ناوە رۆمانی تێز، واتە ئەو جۆرە رۆمانەی خۆی تەرخان دەکات بۆ تێزێکی دیاریکراوی فەلسەفیی، ئاکاریی، سیاسیی، کۆمەڵایەتی.. هتد، تەنانەت ئەگەر هەندێکجار لە پێناوی ئەو بابەتەدا کە دەیانەوێت بیخەنە روو، قوربانیشیان دابێت بە ئاستە تەکنیکییەکە. بە رای ئێمە رۆمانی "رێگای وایگن پایەر *The Road to Wigan Pier*" کە جۆرج ئۆروێل لە ساڵی ١٩٣٧ دا بڵاوی کردەوە، لە توێی ئەم چەشنە رۆمانەدا پۆلێن دەکرێت.

بڵاوکەرەوەی بەریتانیی ناسراو، ڤیکتۆر گۆلانسیز، لەو پێشەکییەدا کە بۆ رۆمانەکە نوسیویێتی، دەڵێت "دەمێکە کتێبێکی وام نەخوێندۆتەوە کە تێیدا نوسەرەکەی بەم چالاکیی و زیندووییە هەست و سۆزە توڕەکانی خۆی دژی هەژاریی و چەوسانەوە وێنا بکات. ئەو ئەنجامەی خوێنەر لەم رۆمانە پوختەی دەکات، ئەوەیە ئۆروێل دەیەوێت خەڵك بەرەو سوسیالیزم و دژی فاشیزم و جەنگ هان بدات. ئەوە بانگەشەیەکە بۆ دامەزراندنی ئاپۆرایەکی گەورەی بەشخوراوەکان دژی رەتێنەرانیان.

ئەگەر گۆلانسیز لەوەدا کە دەیلێت، راستگۆ بێت، یان زێدەڕۆییەکی زۆری کردبێت ئەوا ئۆروێل ئەو رۆمانەی نەدەنوسی ئەگەر لە ماوەی منداڵی و هەرزەییدا نەکەوتایەتە ژێر کاریگەریی ئەو شتانەی بینیونی، یاخود بینینی رۆژانەی دیمەنەکانی گوزەرانی کرێکارانی بێکاری ناوچەی لانکشەرو یۆرکشایەر، کە لەکاتی خۆ ئامادەکردن بۆ نوسینی رۆمانەکەی سەردانی دەکردن. ئەو بابەتانەی نوسەرێك لە کارەکانی خۆیدا دەستیان بۆ دەبات، بە رای خۆی "ئەو سەردەمە دیاریان دەکات کە تێیدا دەژی".

ئەو ماوە مێژوویییەی ئۆروێل و نەوەکەی تێیدا ژیاون، ماوەیەکی "گەردەلولی و شۆڕشگێڕییە" بە گوزارشتی خۆی. بۆ ئەوەی نوسەر لەگەڵ خۆیدا تەبا بێت، پێویستە بایەخێکی زۆر بدات بە ساڵانی سەرەتای دروستبوونی خۆی، ئەگینا "هاندەری نوسین لە

لای خۆی دەکوژێت". لەبەر ئەوەی ئۆروێل لە سەردەمێکدا ژیاوە کە سیاسەت "لە هەواکەیدا"بووە، بۆیە خەمی سیاسی سەرقاڵی کردبوو، وەك چۆن نەوەکەشی سەرقاڵ کردبوو. ئەو ساڵانە دیاردەی ئەدەبی بە خەڵکەوە لکاوی بەخۆیەوە بینی، کە بە رۆژ بەیاناتی سیاسی هاندەرانە لە سەر شەقام و ناو کۆبوونەوە گشتییەکاندا بڵاو دەکاتەوە، ئێوارەش لە ناو گازینۆکانی لەندەندا، دەچێتە ناو دەمەتەقێ و مشتومڕی پڕ هەراو زەناوە، پاشان رۆژی دواتر خۆی دەبەخشێت بۆ بەشداریکردن لە شەڕو شۆڕی دوور لە وڵاتی خۆی، کە بەپێی قەناعەتە سیاسیی و ئایدیۆلۆجییەکانی، بە جەنگێکی دادپەروەرانە دەیانبینێت.

بە نیسبەتی ئۆروێل و نەوەکەیەوە، سیاسەت بە مانا فراوانەکەی و بە مانا حیزبییە تەسکەکەی، خوێی خۆراکی رۆژانەیان و پاساودەری چالاکیی رۆشنبیرییان و بگرە بوونیشیانە. ئەو ماوە مێژووییەی تێیدا لەدایك بوون و گەشەیان کرد، ماوەی دابڕانێکی سیاسی و رۆشنبیریی و ئاکاریی و ئاینییەکە بەریتانیای جەنگی یەکەمی جیهان تێیدا دەژیا، نەك تەنیا هەرەسهێنانی بنەما مادییەکانی ئینگلتەرەی پێش جەنگ، بەڵکو هەرەسهێنانی بونیادە ژووررووە ئاکاریی و ئاینییەکانیش، لێرەوە دەتوانین لێکیبدەینەوە بۆچی یاخیبوونمان لەو بوارانەدا هەموویان وەك جۆن ستراچی کە یەکێکە لە گرنگترین رەمزەکانی ئەو کاتە، رایگەیاندووە.

ئۆروێل لە وتارێکدا کە لە ساڵی ١٩٤٧ دا بڵاوی کردۆتەوە، دەڵێت:"ئەوەی ناوی دەنێم هاندەری سیاسی، لای نوسەرێك، مەبەستم لێی ئارەزووی ئەوەیە جیهان بەرەو ئاڕاستەیەکی دیاریکراو ببات و بەشداریی بکات لە گۆڕینی بیری خەڵکدا دەربارەی چەشنی ئەو کۆمەڵگایەی تێدەکۆشن بۆ خوڵقاندنی. دیسانەوە دەڵێم، هیچ نوسەرێك لە خەمی سیاسیی بەدوور نیە. ئەو رایەش کە دەڵێت هونەر هەقی نیە بەسەر سیاسەتەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا هەڵوێستێکی سیاسییە، ئەگەر ئەو ماوە مێژووییەی من تێیدا ژیام، ماوەی ئاشتی بوایە، ئەوا زۆر رێی تێدەچوو نوسینەکانم پڕبوونایە لە وەسف و رازاندنەوەی زمانەوانی و هیچی تر، رەنگە دووربوومایە لەو لایەنگیرییە سیاسیانەی ئێستا هەمن.

(...) حەوت ساڵم بە پیشەیەکی ناشایستەوە بەسەربرد ( لە پۆلیسی بەریتانیادا لە بۆرما)، دوای ئەوە تووشی هەژاری و هەستکردن بە نوشوستیهێنان بووم. ئەمەش رق و قینی سروشتیانەمی چەندهێندە کردەوە بەرامبەر هەموو چەشنێکی دەسەڵات، وای لێکردم بۆ یەکەمین جار هوشیارییەکی تەواوم هەبێت بە بوونی چینی کرێکاران، وەك چۆن پیشەکەم لە بۆرما فێری سروشتی ئیمپریالیزمی کردم. بەڵام ئەم ئەزمونانە بە تەواویی ئاڕاستەیەکی سیاسیی دیاریکراویان پێ نەبەخشیم. دوای ئەوە، هیتلەر و شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا...هتد هاتن. شەڕی ناوخۆی ئیسپانیا ١٩٣٦ ـ ١٩٣٧ و چەند روداوێکی تر بەشدارییان کرد لە روودانی چەند گۆڕانکارییەك لە ژیانمدا، ئیتر لەو رۆژەوە زانیم قەڵەمەکەم لە کوێدا دادەنێم. لە ساڵی ١٩٣٦ ەوە هەر کارێکم نوسیبێت، بەشێوەیەکی راستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ، دژی تۆتالیتاریزم بووە و لە پێناوی دیموکراسیی و

سوسیالیزمدا بووە، ئەویش بەپێی ئەندێشەکردنی خۆم بۆیان. بەلای منەوە شتێکی زەحمەتە، لە سەردەمێکی وەك ئەمەی ئێمە تێیدا دەژین، مرۆڤ بتوانێت خۆی لە نوسینی ئەم جۆرە بابەتانە لابدات).

هەموو ئەو شتانەی ئۆروێل نوسیونی، خۆیان داوە لە مەسەلە زۆر ئاگرینەکانی سەردەمەکەی. کتێبی "مەزرای گیانەوەران" ی وەکو تانەیەك بۆ "رۆژە بۆرماییەکان" نوسی، رۆمانی ١٩٨٤ یش کە تێیدا کەسێتی "براگەورە چاودێریت دەکات" ی داهێناوە وەکو رەمزێك بۆ هەموو کۆمەڵگایەك کە تۆتاڵیتاریزم فەرمانڕەوایی بکات. هەروەها سەدان وتاری سیاسی و رۆژنامەگەریشی نوسیوە، نەك تەنیا بۆ ئەوەی شایەت بێت بەسەر سەردەمێکەوە کە تا ئاستی مەستیی تێیدا ژیاوە، بە شێوەیەکی شەخسیی بەشداریی کردووە "لە شەڕی ناوخۆی ئیسپانیدا و بریندار بوونیشی بۆ نمونە" لە دروستکردنی رووداوەکانیدا، بەڵکو بۆ ئەوەی تێڕوانینی خۆی بۆ سەردەمێکی داهاتوو پێشکەش بکات کە دەشزانێت تێیدا ناژی، بەڵام سیماکانی بۆ نەوەکانی ئایندە بکێشێت. ئۆروێل لە نوسینی کارە رۆمانییەکانیدا پشت بە ئەزمونە تایبەتییەکانی خۆی و ئەو دیمەنانەی خۆی لە بۆرماو مەغریب و ئیسپانیا و ئینگلتەرە بینیونی دەبەستێت. لەبەر ئەوەی لە نزیکەوە خۆرهەڵات و خۆراوای تاقیکردۆتەوە، بۆیە توانیویەتی نەخۆشییە زۆر کوشندەکانی مرۆڤایەتی دەستنیشان بکات: دەمارگیریی نەتەوەیی، توندڕەویی ئاینیی، هەستکردن بە سەرکەوتوویی رەگەزیی، خۆپەرستیی خۆراوای پیشەسازیی، لە توێی ئەو ئەزمونە ئیمپریالیستییە خوێناوییەی دەوڵەتەکانی رابەرایەتیان کرد.

لە وتارێکدا کە دوابەدوای کۆتاییهاتنی جەنگی دووەمی جیهان نوسیویەتی، بە ناونیشانی (چەند تێبینییەك دەربارەی ناسیونالیزم) ئۆروێل وریای کردوینەتەوە لە مەیلی زیادڕەویی و توندڕەویی لە بیرو هەست و سۆز و هەڵوێستە سیاسیی و ئاینی و مەزهەبی و رەچەڵەکییەکاندا، کە نایانەوێت دان بنێن بە "ئەویتری جیاواز" دا، ئەگەرچی ئەو ئەویترە جیاوازە هەموو بەڵگەکانی جیهانی لە بەرژەوەندیی خۆیدا هەبێت. چونکە ئەو بەڵگانە سودیان چیە، کاتێك بەڵگەهێنانەوە پێشوەخت بە پێودانگی چاکە و خراپە ریز کرابن، بەوەش مرۆڤایەتی دابەش کردبێت بۆ چاکەکاران و خراپەکاران.

زیاتر لە نیو سەدە بەسەر ئەو وتارەدا تێپەڕیوە، هێشتا جیهان زیاتر و زیاتر بە دەستی چەشنەکانی دەمارگیرییەوە دەناڵێنێت. بەم مانایەش، شتێکی دوور لە راستی نیە، ئەگەر یەکێك بڵێت جۆرج ئۆروێل پێشبینی کردووە.

**سەرچاوە**

*www.elaph.com*

## سەرەتاکانی رۆشنگەری ئەڵمانی و دژواریی دابڕان لە سەدەکانی ناوەڕاست

**هاشم ساڵح**

**لە عەرەبییەوە: سامان عەلی**

بە بڕوای گێرهارد سۆدیری لێکۆڵیارو مامۆستا لە زانکۆی ساری ئەڵمانیا، لە دوادواییەکانی سەدەی حەڤدەیەم بە دواوە زانکۆ و ئەکادیمیستانی ئەڵمانیا دەستیانکردبوو بە بڵاوکردنەوەی

جۆرێکی تازە و نوێ لە هزر. ئەم هزرە کە هامڕابوو بە کردار و پراکتیك، پراگماتیزمی ئەقڵانی باڵی بەسەردا کێشابوو. ئینجا لە سەدەی هەژدەیەمدا ئەم رۆحە فیکرییە نوێیە تەشەنەی سەند و لە رێگای پەیتا پەیتا عەلمانیکردنی ژیانەوە بە هەموو بوارەکاندا بڵاوبۆوە و بەرگی پیرۆزیی و غەیبیاتی لە رووی شتەکان هەڵماڵی. ئەڵمانیا ئەم شێوازە نوێیەی هزری بە ئۆفکلارۆنگ واتە رۆشنگەری *Aufklarung* ناودێرکرد. ئیدی ئەم رۆشنگەرییە لە سیاقێکی ئاینیی و سیاسی ئێجگار تایبەتدا دەستی بە بڵاوبوونەوە کرد. ئەوێ رۆژێ ئەڵمانیا تازە لە شەڕی سی ساڵە هاتبووە دەر، ئەو شەڕەی کە داری بەسەر بەردی گوند و شارەکانی ئەڵمانیاوە نەهێشت و کاولکارییەکی زۆری لە وڵاتدا بەجێهێشت. ئەو شەڕە تایەفەگەرییەی کە لە نێوان ئەم دوو رێبازە ئاینییە سەرەکییەی وڵاتدا روویدا: رێبازی پرۆتستانتی و رێبازی کاتۆلیکی. بەم پێیە ئەو کاتە ئەڵمانیا خەریکی ساڕێژکردنەوەی زامەکانی و هێورکردنەوەی ئازارەکانی بوو. رۆشنگەری وەك بزاوتێکی توندی ناڕەزایی دژ بەو دەمارگیرییە ئاینییە سەریهەڵدا کە وای لە خەڵکی ئەڵمانیا کرد لەسەر شوناس یەکتری بکوژن، کتومت بە وێنەی ئەوەی کە لە شەڕی ناوخۆی لوبناندا روویدا.

لەم سەرو بەندەدا فەیلەسوفەکان بەشێوەیەکی ژیرانە دەستیانکردە رەخنەکردنی پیاوانی ئایین چونکە رەوایەتیەکی لاهوتی – تیۆلۆژیان بەسەر ئەم شەڕە تایەفەگەرییەدا دابڕی کە ئەڵمانیای تێکشکاند و گەنج و لاوی بەدەستەوە نەهێشت. لێکۆڵەرە هاوچەرخەکان باوەڕیان وایە سەرەتاکانی رۆشنگەری ئەڵمانی دەکەوێتە نێوان ساڵانی (١٦٨٠-١٧٢٠) واتە لە پاش شەڕی سی ساڵە (١٦١٨-١٦٤٨) بە ماوەیەکی کەم. مانای وایە رۆشنگەری ئەڵمانی وەك کاردانەوەیەکی راستەوخۆ بە رووی شەڕەکەو ئەو تاوانگەلە دڕندانەیەدا کە بەناوی داکۆکی لە ئایینی راست یاخود رێبازی دروستەوە لەوێڕا ئەنجامدران، سەریهەڵدا.

ئەوە بوو هەر لایەنێك لایەنەکەی دیکەی بەوە تاوانبار دەکرد کە لە ئایین لایداوە یاخود شێواندوویەتی یاخود لە ئامانجە راستەقینەکانی خۆی بەلارێیدا بردووە. بۆ نموونە کاتۆلیکییەکان لافی ئەوەیان لێدەدا کە نوێنەرایەتی ئەرتۆدۆکسیزمی مەسیحییەت، واتە رێبازی راستڕوا یاخود راڤەی کۆنی ئایین دەکەن و، پرۆتستانتەکانیان بە بیدعەکار ناودەبرد و بەدەرچوو و لادەر لە ئایینی مەسیحی تاوانباریان دەکردن. پرۆتستانتەکانیش دووقات وەڵامیان دەدانەوەو کاتۆلیکەکانیان بە دۆگما و بتپەرست و لادەر لە بنەما سەرەتاییەکانی ئینجیل تاوانبار دەکرد. لە ئاست ئەم ناکۆکییەدا کە بێ چارەسەر بوو، فەیلەسوفەکان هیچ چارێکی تریان نەبوو تەنها رەخنەکردنی عەقیدە باوەکان نەبێت، ئیدی چ عەقیدەی پرۆتستانتی بێت یاخود کاتۆلیکی. لە راستیدا ئەوان تەنها دوو رێگاچارەیان لەبەردەمدا بوو کە ئەمانەن: یان ئەوەتا بە تەواوی لە ئایین لابدەن، یان راڤەیەکی ئەقڵانی بۆ بکەن، واتە راڤەیەك کە لە هەموو راڤە ئاینیی و تایەفەگەرییەکان تێپەڕێنێت. لە دواییدا دەبینین هەردوو چارەسەرەکە پێکەوە هەتا رۆژگاری ئەمڕۆمان بەردەوام بوون. چونکە ئەگەر ئێمە

تەماشایەکی کۆمەڵگا ئەوروپاییەکانی ئەمێستا بکەین دەبینین چین و توێژێکی بەرفراوانی ئەم کۆمەڵگایانە چیدی باوەڕیان بە مانای باوی وشەی ئایین نەماوەو بە تەواوی لە پێڕەوکردنی دروشم و سروتە مەسیحییەکان دابڕاون و دوورکەوتوونەتەوە. هەرچی ئەو توێژانەشە کە بە ئایندار ماونەتەوەو کەمایەتی پێکدێنن، ئاینداریەکەیان بەشێوەیەکی گشتی ئاینداریەکی لێبوردوو ئەقڵانی کراوە، تەنها گروپێکی پەراوێزیی زۆر بچوک لە ئسوڵییەکان ماون کە تاسەی سەدەکانی ناوەڕاست دەکەن. ئەمەیە چارەنووسی کۆمەڵگا ئەوروپییەکان لە دوای تێپەڕبوونی دوو سەدە بەسەر بزاڤی رۆشنگەریدا. بەڵام ئێمە باسی سەرەتاکانی رۆشنگەری دەکەین نەك کۆتاییەکانی یاخود ئەو چارەنووسەی کە لە سەردەمی ئێستاماندا پێی راگەیشتووە. کەواتە با هەر لە سەرەتاکاندا بمێنینەوە تا بزانین چۆن چۆنی ئەم دیاردەیە کە رووخساری جیهانی گۆڕی و بووە دیاردەیەکی گەردوونی بە ئەندازەی دونیا، سەریهەڵدا، چونکە هەموو شتێك کاتی خۆی هەیە.

وا دیارە رۆشنگەری ئەڵمانی هەر لە سەرەتاوە شوێن هێڵێکی تیۆلۆژی دەکەوت کە رەخنەیەکی ئاراستە دژ بە کەلەپوری نەقڵکراو بەشێوەیەکی گشتی و لە دژی کڵێسا بە تایبەتی، دروست دەکرد. پاشان پەیتا پەیتا فەلسەفە شوێنی تیۆلۆژیای گرتەوەو شەریعەتی مەسیحی "یاخود یاسای کڵێسایی پیرۆز" بووە جۆرێك لە فەلسەفەی سیاسی. لە بری ئەوەی فەلسەفە ملکەچ بێت بۆ زانستی تیۆلۆژیای ئاینیی وەك بە درێژایی چەندین سەدە هەروا بوو، لە لاهوت ئازاد و تەنانەت گرنگتریش بوو.. ئەمە ئەو وەرچەرخانە بوو کە رووخساری ئەوروپای گۆڕی و رەنگدانەوە و ئەنجامگەلێکی بێشوماری لێکەوتەوە. سەیر لەوەدایە رۆشنگەری ئەڵمانی لە شانشینی ئیمپراتۆرییەت، یاخود لە پایتەختە گەورەکاندا سەریهەڵنەدا، بەڵکو لە شارە بازرگانی و زانکۆییەکانی لە نموونەی "لایبزیك" و "هاڵ" سەریهەڵدا. ئەوێ رۆژێ لایبزیك گەورەترین پێشانگای بازرگانی لەسەر زەمینی ئەڵمانیادا رێکدەخست، چونکە ژمارەیەکی زۆر لە بازرگانە دەوڵەمەندەکانی لەخۆگرتبوو. هەرچی زانکۆکانیشێتی بەڕووی بیر و ئایدیا نوێیەکاندا واڵا و کراوە بوون. ئەمە لە کاتێکدا کە ئەرتۆدۆکسیزمی لۆسەریزم "واتە ئاینیی مەسیحییەتی رێبازەکەی لۆسەر" چاودێری کاروبارەکانی دەکرد و رێگای بە خەڵکی نەدەدا کە لە بیرکردنەوەدا لە سنوری دیاریکراو تێپەڕن. پێویستە لێرەدا باس لە بیرمەندێکی نەناسراو بکەین کە لە سەرەتاکانی رۆشنگەریدا رۆڵێکی گرنگی گێڕاوە، مەبەستمان لەو بیریارەش کرێستیان تۆماسیۆس (١٦٥٥-١٧٢٨)ە، ئەگەرچی ئەم بیرمەندە کەسێکی ئیمانداریش بوو بەڵام بەهۆی بوێرییەوە لە تێگەیشتن و راڤەکردنی ئایینداا، لەلایەن ئەرتۆدۆکسیزمی مەسیحییەت، واتە فێندەمێنتالەوە سەرزەنشت و پرۆتیستۆ کرا. لە ساڵی ١٦٩٠دا رێگای وانە گوتنەوە یاخود بڵاوکردنەوەی گوتارەکانی لێ قەدەغەکرا، ئیدی ئەویش شاری لایبزیکی بەرەو پروسیا بەجێهێشت و لەوێندەر بەشداری لە دامەزراندنی زانکۆیەکی نوێدا کرد کە ئەویش زانکۆی "لاهال" بوو. ئەم بیریارە لە نێو کەسێتی

خۆیدا رۆشنگەری و رەخنەگەرایی لە ئاییندا یەکخستبوو. ئەمە وێڕای بوونی هەندێك لایەنی دیکە کە ئەم دوو تەوژم و ئاراستەیە لەیەکتر جوێ دەکەنەوە. بە پێچەوانەی پێشبینی ئێمەوە ئایدیا نوێیەکانی سەرەتاکانی یەکەمی رۆشنگەری بە تەنها لە نێوەندی فەیلەسوفان و ئەدیباندا بڵاونەبوو، بەڵکو هێدی هێدی لە نێوەندی زانایانی سروشت و یاساناسان و تەنانەت لەلای ئەو تیۆلۆژیستە لیبرالانەش کە بەشێوازێکی ئەقڵانی جیاواز لە شێوە تێگەیشتنی فێندەمێنتاڵەکان لە ئایین تێدەگەن، پێشوازییەکی گەرمی لێکرا. چونکە خۆ هەموو ئاینداران دۆگما یاخود دژ بە ئەقڵ نین و نابێت ئێمە بکەوینە بەرەی پەرگیری دژەوە. ئەمانە هەموو بەدوای رۆشنایی ئەقڵی سروشتیی ئازاد دا دەگەڕان و رێگای رەخنەکردنی باوەڕە بەمیرات بۆماوەکان و شکۆی پێشینانیان بە خۆیان دابوو. ئیدی دەستیانکردە وەرگێڕان و شیکردنەوەی گەورە ئیلهامبەخشانی رۆشنگەری ئەورووپی لە نموونەی: (فەرەنسیس بیکۆن، دیکارت، هۆبز، لوك، نیوتن، سپینۆزا و.. هتد). پێویستە لێرەدا بۆ ساتێك لەلای گەورە بیرمەندی یاساناس ساموئیل بیفندۆرف (١٦٣٢–١٦٩٤) رابووەستین کە داوای ئەوەی دەکرد یاسای سروشتی یاخود یاسای ئەقڵانی پەتی شوێنی یاسای کڵێسایی پیرۆز "واتە شەریعەتی مەسیحییەت" بگرێتەوە. ئەم داوایەی بیفندۆرف بە شۆڕشێکی بێوێنە تەماشا دەکرا. گرنگترین کتێبەکانی بیفندۆرف ئەمانەن: ((بنەماکانی یاسای گەردوونی، لەمەڕ مافەکانی سروشت و مرۆڤ، رەوشتی ئیمپراتۆرییەتی ئەڵمانی))... ئەم کتێبانەی بیفندۆرف هەر لەگەڵ دەرچوونیانداو بە هۆی ئەو رەخنە ژیرانەی کە ئاراستەی باوەڕە لاهوتییەکانی دەکرد، هەراو زەنایەکی زۆریان نایەوە. ناوبراو بڕوای وایە یاسای سروشتی زۆر لە یاسای کڵێسایی یاخود شەریعەتی مەسیحییەت گرنگترە چونکە لەسەر بناغەی حوکم و بڕیاری ئەقڵ دامەزراوە و بەسەر هەموو مرۆڤەکانیشدا دەچەسپێت، لە کاتێکدا کە یاسای کڵێسایی تەنها بەسەر مەسیحییەکاندا پراکتیزە دەبێت، تەنانەت بیفندۆرف پێی وابوو پەیمانی کۆمەڵایەتی نێوان مرۆڤەکان بناغەی ئەقڵانی رێکخستنی کۆمەڵگا و دروستکردنی دەوڵەتە. وەك ئاشکرایە تیۆریاکانی ئەم بیریارە کاریکردە سەر فەیلەسوفانی رۆشنگەری کە لە دواییدا هاتن، بەتایبەت جان جاك رۆسۆی خاوەنی کتێبە بەناوبانگەکەی "پەیمانی کۆمەڵایەتی".

بیفندۆرف بڕوای وایە ئەگەرچی مرۆڤایەتی کەموکوڕیی خۆی هەیە، بەڵام دەکرێت کۆمەڵگا لە رێگای ئەقڵەوە فەرمانڕەوایی بکات. هەروەها پێداگری لەسەر ئەم بنەما سەرەکییە دەکات: هەرچی شتێك کە بۆ کۆمەڵ – واتە کۆمەڵگا– بەکەڵك بێت دەبێت بکرێتە بنەمایەك لە بنەماکانی یاسای سروشتی تەنانەت ئەگەر ئەو شتە لەگەڵ ئامۆژگارییەکانی پیاوانی ئاییندا نەیەتەوە و ناکۆکیش بێت، ئینجا دەڵێت ئەوە مرۆڤەکان خۆیانن کە فەرمانڕەوایی خۆیان دەکەن نەك هێزێکی غەیبانی وەك ئسوڵییەکان دەڵێن. بەم پێیە هیچ "باڵادەستییەك" نییە و.. کەسیش بۆی نییە لافی ئەوە لێبدات کە نوێنەرایەتی خودا لەسەر زەمیندا دەکات و بەم پێیە مافی ئەوە بدات بەخۆی کە

فەرمانڕەوایی مرۆڤەکان بکات. بەمجۆرە تیۆرەی مافی خوداوەندی پادشاکانی ئەوروپا هەرەسی هێناو بەم هەرەس هێنانەش سەرەتای نوێگەری سیاسی دەستی پێکرد. پادشاکان مرۆڤن و مافی ئەوەیان نییە بڵێن ئێمە نوێنەرایەتی زاتی خودایی لەسەر زەمین دەکەین. خودا لەسەروو هەمووانەوەیە و کەسیشی بە زمانحاڵی رەسمیی بۆ خۆی رانەسپاردووە. سەرەتاکانی رۆشنگەری ئەڵمانی ئەم تایبەتمەندییە سەرەکییەی هەبوو: کاردانەوەیەکی توند لە دژی بیروباوەڕە تەقلیدییە بۆماوەکان. لەبەرئەوە دەتوانین تەنها بەشێکی "لایبنتز" بدەینە پاڵ رۆشنگەری. چونکە ناوبراو لە رێگای گونجاندنی کۆن و نوێ نەك رەتکردنەوەی هەموو کۆن، داوای ریفۆرم و نوێکردنەوەی دەکرد. لایبنتز بیریارێکی زۆر خۆشنود بوو، هەر بۆیە مرۆڤی وەك بەرپرسیار لە جیهان و قەدەر و چارەنووسی خۆی تەماشا دەکرد، بەم پێیە لایبنتز دەرفەتی ئەوەی بۆ ئێمە رەخساند کە جیهان بەشێوەیەکی سەربەخۆ لە دەستتێوەردانی هەر هێزێکی غەیبانی، تەنها هێزی ئەقڵ نەبێت، وێنا بکەین. خودا ئەقڵێکی رەهایە و گەردوونی بە گوێرەی یاساگەلێکی وردو دروستی سۆنگەیی ئەوتۆ رێکخستووە کە بە ئەندازەی تاڵەموویەك لێی لانادات. هەروەها دەیووت جیهانی ئێمە چاکترین جیهانە شیاو "ممکن"ەکانە، ئەگەرچی ئەم جیهانە بێ کەموکوڕی نییە، بەڵام نەدەتوانرا جیهانێکی لەم باشتر دروست بکرێت. بەمشێوەیە پەیتا پەیتا فیکری ئەڵمانی لە دەست تیۆلۆژیای کۆن ئازاد دەبوو، بەڵام دابڕان و جیابوونەوە کارێکی زۆر دژوار و سەختەو هەروا ئاسان نییە!... ئاسان نەبوو بۆ ئەڵمانەکان و بۆ خەڵکانی تریش بتوانن لەدەست ئەو تیۆلۆژیا ئاینییەیان ئازادبن کە لە منداڵییانەوە لەسەری گۆش و پەروەردە کرابوون و سەدان ساڵ بوو لە باوباپیرانیانەوە بە میرات بۆیان مابۆوە. دابڕانە ئەبستمۆلۆجییە گەورەکە واتە دابڕانی مۆدێرنە ئا لێرەدایە، بەڵام ئەم دابڕانە بەیەکجار رووی نەدا، بەڵکو بەچەند قۆناغێکی یەك لە دوای یەك بەئەنجام گەیشت و تەنها لە دوای سەد و پەنجا ساڵ لە کێشمە کێش و ململانێ، پاشان خەڵکی ئەوروپا توانیان تێیبگەن و لێی حاڵی بن!




یوسف یەڵدە*
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا

رۆماننوسی کۆلۆمبی "گابریل گارسیا مارکیز" کە خەڵاتی نۆبڵی بەدەستهێناوە، لە مانگی ئۆکتۆبەری رابردودا بەشی یەکەمی گەواهییەکانی (شهادە) لەسەر شێوەی بیرەوەری و لەژێر ناونیشانی (بژی تا بیگێڕیتەوە) کە دەربارەی ژیان و مێژو و ئەو رووداوانەی بە درێژایی تەمەنی تێیدا ژیاوە بڵاوکردەوە، لەم بیرەوەریانەدا تێڕوانینی راستییانەی رۆماننوس بۆ شتە تایبەتییەکان و ئەوانەی

پەیوەستن بە هەموو وردەکارییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و مرۆیی و سیاسییەوە پێشکەش بە خوێنەر کراوە.

لێرەدا گەواهییەکی دیکە هەیە، بەڵام ئەمجارەیان ئەم گەواهییە لەسەر زاری خودی دانەری ڕۆمانی "سەد ساڵ لە گۆشەگیری"دا نییە، بەڵکو لەسەر زاری "ماگۆ"یە، کە یەکێکە لە خوشکەکانی مارکیز و باس لەو ژینگە کۆمەڵایەتییە دەکات کە ڕۆماننوسی ناسراوی تێدا گەورە بووە.

"ماگۆ" دەڵێ.. من زۆر بچوك بووم و لەو بڕوایەشدام تەمەنم سێ ساڵان بوو کە دایکی خۆمم ناسی، بە شێوەیەکی گشتی من دایکی خۆمم نەدەناسی، ئەویش بە هۆی شوێنی لەدایکبونەکەمەوە بوو لە (باراتکیلیا) کە خێزانەکەمی تێدا نیشتەجێ بوو بوو. کاتێ تەمەنم گەشتە سیانزە مانگ باپیرم بردمی بۆ (ئاراکاتاکا)، ئەو ڕۆژەی دایکم هات بۆ ئەوەی بمبینێ، پورم کە پێیم دەوت"ماما" پێی وتم: (دایکت گەیشت)، کاتێکیش چاوم پێی کەوت، خۆم هەڵدایە باوەشی داپیرەمەوە و بە ترسەوە لەو خانمەم دەڕوانی کە داوای لێدەکردم لێی نزیك ببمەوە، بەڵام من ڕازی نەبووم بچمەلای، چونکە (ئەمە دایکم نییە)، پاش ئەوەی بۆ ماوەیەك لەگەڵمان مایەوە، لەگەڵیا ڕاهاتم، بەڵام ئەو گەڕایەوە بۆ (باراتکیلیا)، ئەو شوێنەی ئەندامانی خێزانەکەمانی لێبوو(باوکم و لویس ئەنریکی و عایدە)، منیش لەگەڵ باپیرم و داپیرەم و گابیتۆ "گابریل گارسیا مارگیز" مامەوە.

ئێمە لە (ئاراکاتاکا) دادەنیشتین، من و باپیرم و داپیرم و گابیتۆ و پورم"ماما" کە ناوە ڕاستییەکەی "فرانتیسکا میخیا"یە، ئەم پورەم هەر شوی نەکردو و کەسایەتییەکی بەهێز و سەنگین بوو، بۆ نمونە، کلیلی ئەو گۆڕستانەی لابوو کە مردوویان تێدا دەناشت، جارێکیان بەهۆی سەرقاڵ بوونییەوە بە کاری دیکەوە کلیلەکان لەبیر دەکات، دەبوو مردووەکە چاوەڕوان بێت تا ئەم بە خۆی و کلیلەکانییەوە بگات، کەس نەیدەوێرا قسەیەکی پێبڵێ کە بەدڵی نەبێت، هەر خۆشی ئامادەی قوربانییەکانی کڵێسا دەبوو، بیرم دێ ئێمە- من و گابیتۆ- هەستمان بە خۆشیی دەکرد کاتێ لەو نانی قوربانییەمان دەخوارد کە پێشکەشمان دەکرا.

باپیرم "نیکۆلاس ڕیکاردۆ میخیا" تا ڕۆژی لەدایکبونی گابیتۆ پیاوێکی بەڕێز و تەواو کۆنەپارێز بوو، هەر ئەمەش بوو وای لە دایکم کردبوو گەرچی دوور بە دووریش بێت، بەوپەڕی ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات، بەڵام هەر کە کوڕەزاکەی لەدایك بوو، بووە کەسێکی دیکە و گۆڕا، وازی لە توندوتۆڵییەکەی هێناو بووە کەسێکی دلۆڤان و بەسۆز، یاری لەگەڵ دەکردین، دەیکردینە باوەش، دادەنوییەوە تا وەك چوارپێ سواری پشتی بین. هاوڕێکانی سەرزەنشتیان دەکرد و دەیانوت: (ئەمە ماقولە! نیکۆلاس مارکیز، چۆن وا دەکەیت، تەماشا بویتەتە چی!).

باپیرم گابیتۆی زۆر خۆشدەویست، هەموو مانگێك، ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبونی بۆ دەگێڕا، هاوڕێکانی بانگ دەکرد تا بە بۆنەی لەدایکبوونی "گابیتۆ"وە ئاهەنگ بگێڕن، ئاژەڵی وەك دیاری بۆ دەهێناین، (توتی) و ئاژەڵی ترمان لە حەوشەی ماڵەکەماندا هەبوو. باپیرە "نیکۆلاس" هێجگار بەخشندە بوو.

ئێمە تەنها لەسەرمان بوو بڵێین: (هێی، بابە لیۆ، حەزمان ئا لەمەیە) ئیدی دەمودەست دەچوو بۆ ناوەندەکانی فرۆشتنی (ئەلغرینغوز) تاکو بۆمان بکڕێ، تا ئێستاش تامی ئەو ترێیەم لەبیرە کە لەناو سندوقەکاندا بۆی دەهێنایین. باپیرە هەموو شتێکی بە بڕێکی زۆر دەکڕی، هەرکاتێ "گابیتۆ" لەگەڵی بڕۆشتایە بۆ کڕینی شتێك، بەخێرایی دەگەڕایەوە بۆ ماڵەوە تاکو ئەو شتەی کە باپیرە بۆی کڕیووە پێشکەشی منی بکات، "گابیتۆ" ئاوابوو لەگەڵما، هەموو ئەو شتانەی کە دەیاندایە لەگەڵ من بەشی دەکرد،من لەو ماڵەدا بەختەوەر بووم، لەبیرمە، کاتێ ڕێیان پێدایین لەگەڵ گەورەکاندا لەسەر یەك سفرە دانیشین، سەرەتا باپیرە دادەنیشت، لەپاشان "گابیتۆ" لە لایەکی و منیش لە لاکەی دیکە، گەر بیرەوەریم خیانەتم لێنەکات، ئێمە هەموومان لەیەك جامدا ئاوی ساردمان دەخواردەوە، جامێکی فافۆنی دەسکدار، لە ناوەڕاستی ژەمە خواردنەکەدا دەمووت: (جامەکە چەور بووە) چونکە ئێمە هەموومان لە هەمان جام ئاومان دەخواردەوە و من چەوریم دەبینی پێوەی نوسابوو، بەهۆی گلەیی و گازەندەکانمەوە جامێکی دیکەیان بۆ دەهێنام کە ئاوی ساردی تێدا بوو.

باپیرەم زۆر دڵخۆش بوو لەگەڵمانا، دەڵێن دەربارەی بەسەرهاتێکی "گابیتۆ" دەیدایە قاقای پێکەنین، لە دوایدا ئەو بەسەرهاتەی بۆ من گێڕایەوە: گابیتۆ کاتێ بچوك دەبێ لە نزیك بەردەرگای ماڵەوە دادەنیشێ و لەو سەربازانە ڕادەمێنێ کە بەرەو دارمۆزەکان دەڕۆن، جارێکیان بە ڕاکردن خۆی دەکا بە ژوردا و ماندوبون بڕستی لێ بڕیوە و بە باپیرە دەڵێ: (بابە لیۆ! بابە لیۆ! مێگەلەکە تێپەڕین)، مەبەستی سەربازەکانە، ئەودەمی هێشتا بە باشی فێری قسەکردن نەبوبوو، باپیرە لێیدەپرسێ: (باشە، چیان پێ وتی؟) بچوکەکەش وەڵامی دەداتەوە: (خواحافیز-گابیتۆ-ی جوان)، "گابیتۆ" هەر لە بێشکەوە لاسار بووە.

ئێمە، من و "گابیتۆ" بەردەوام پێکەوە بووین، شتێك هەبوو وایلێدەکردم جار جارە بگریەم، ئەویش ئەوەبوو من ڕەشتاڵە بووم و "گابیتۆ"ش پێی دەوتم گوایە منیان لەسەر سەلوێنك دۆزیوەتەوە و من کچی "کیکا"م، ئەو خانمەی دەهات جلوبەرگی داپیرە و باپیرەی دەشت، "گابیتۆ" پێی دەوتم: (ئایا تەماشای خۆتت کردووە لە ئاوێنەدا چەند ڕەشتاڵەی؟ کەواتە تۆیان لە سەبەتەیەکی شەخەڵدا دۆزیوەتەوە، تۆ کچی -کیکا-یت و برایەکیشت هەیە ناوی -بابلیتۆیە-)، ئابەم شێوەیە وایلێدەکردم بگریەم، کاتێ باپیریشم دەهات شکاتم لێدەکرد، باپیرەش دەیوت ئەوە درۆیە و من کچە خۆشەویستەکەی ئەوم و کوڕی- کیکا- گابیتۆ خۆیەتی.

چیرۆکی سەبەتەی شەخەڵ بەردەوام بوو تا ئەو ڕۆژەی لەبەر هۆیەکی نەزانراو "بابلیتۆ" لێیدام، "گابیتۆ"ش "بابلیتۆ"ی گرت و لێیدا و پێی وت: (ئێستا دەبێ بڕۆیتەوە بۆ ماڵی خۆتان، دەبێ بە گریانەوە بڕۆیتەوە بۆ ماڵەوەتان)، لەو بڕوایەدام ئەوە یەکەمجار بوو کە گابیتۆ لە یەکێك بدات، چونکە ئەو کەسێکی لەسەرخۆبوو، پێشتر لەگەڵ هیچ مرۆڤێکدا دەمەقاڵەی نەبووە. ئەو نموونەی منداڵێکی نمونەیی و پاك و خاوێن بوو، دوور بوو لە هەموو هەڵەیەکەوە، بە پێچەوانەی "لویس ئەنریکی"یەوە، کە زۆر پیسوپڵۆخ بوو، گەرچی دایکم زۆر تێدەکۆشا پاکوخاوێن بێت.

دایکم دەیگێڕێتەوە جارێکیان هەردوکیانی بردووە بۆ ئەوەی ڕەسمێکیان بگرێ، گابیتۆ لە وێنەکەدا پاکوخاوێن دەرچووە، قژی داهێناوە و ڕوخساریشی ڕێک بووە، بە پێچەوانەی "لویس"ەوە، لویس گەرچی تەمەنی دوو ساڵان بووە، بەڵام هەستابوو بە کردنەوەی قەیتانی قۆنەرەکانی و قۆپچەی کراسەکەی. لویس یاری بە تۆپ دەکرد، کەچی گابیتۆ لەگەڵ منداڵانی دیکەدا لەبەردەرگا یاری دەکرد. جارێکیان باپیرە کۆلارەیەکی بۆ کڕی، گابیتۆش بەوپەڕی خۆشییەوە بەرزی دەکردەوە، بیرم نایە گابیتۆ یاری تۆپ تۆپێنی کردبێ یان وەك منداڵانی دیکە قیرە قیری کردبێ.

باشە با قسە لەسەر ئەو ڕۆژە بکەین کە لە ماڵ چووە دەرەوە بۆ (تورکس)، تورکس ئەو شوێنەیە پیاوانی سیاسی و باپیرە تێیدا پێکدەگەشتن، باپیرە هەندێ کاتی خۆی لەوێدا بە قسەکردن لەگەڵ ئەوانی دیکەدا دەبردە سەر، "گابیتۆ"ش کە لە باپیرە جیانەدەبووەوە، بەردەوام گوێی بۆ قسەکانیان دەگرت، بەڵام من تەماشای پێشەوەی ئەو کۆگایانەم دەکرد کە تایبەت بوون بە تورکەکان.

"گابیتۆ" لە قوتابخانەی (مونتیسوری) فێری خوێندنەوە بوو، باپیرە کاتژمێر هەشتی بەیانی لەگەڵمان دەهات بۆ ئەوێ و لەپاشان دەگەڕایەوە بۆ لامان. "گابیتۆ" زۆر هۆگری باپیرە ببوو، گوێی لە هەموو چیرۆکەکان دەگرت، ڕۆژێکیان (توتییەکە) فڕی و لەسەر لێواری تەنکی ئاوەکە نیشتەوە، باپیرەی حەفتاو دووساڵ هیچی پێنەکرا ئەوە نەبێت بەرەوڕووی ئەو پەیژە ڕۆشت کە تایبەت بوو بە پاکردنەوەی تەنکی ئاوەکان، سەرکەوت بەسەریدا تاکو توتییەکە بگرێ، بەڵام پێدەچوو قاچی لە شوێنی گونجاودا دانەنابێ، بۆیە بە پشتا کەوت، ئەم دیمەنە تراژیدییەم چاك لەبیرە، چونکە لە کاتژمێر شەشی بەیانیدا ڕویدا، هەموومان هاوارمان کرد (ئاه، بەربووەوە، بەربووەوە).. کاتێکیش هەڵیانگرتەوە، نەیدەتوانی هەناسە بدات، لەو دەمەوە باری تەندروستی ڕووی لە خراپ بوون کرد و کزو لاواز بوو، کەس نەیدەزانی لەکاتی کەوتنەکەیدا توشی چی هاتووە.

دوای سێ ساڵ باپیرە لە "سانتامارتا" و لە ماڵی "خوانیتۆ"ی مامم کۆچی دوایی کرد، پێدەچێ ئەو ڕوداوە قورساییەکی زۆری لەسەر گابیتۆ جێهێشتبێ، چونکە مردنی باپیرە زۆر لە مردنی دکتۆر"خوبینال ئۆربینۆ"ی ڕۆمانی (خۆشەویستی لە زەمەنی کۆلێرادا) دەچێ، ئەویش لە کاتێکدا دەمرێ کە هەوڵدەدات توتییەك بگرێ کە لەسەر دارێك نیشتووەتەوە.

*یوسف یەڵدە: ڕۆژنامەنوسێکی عێراقییە و لە سدنی دادەنیشێ.

### سەرچاوە

بەشی ڕۆشنبیری ماڵپەڕی "دار الحیاة"